# سەردەم

39/

حوزەیرانی

2005/

ساڵی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی





ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


–سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك


-دیموكراسی كلاسیك ........ داڤید هێڵد ........ (لە ئینگلیزییەوە: د. ئەلبێرت عیسا)...3
-نیكۆڵۆمەكیاڤیللی ........ د. موسا ئیبراهیم ........ (لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد)... 25
-قانوون و هێز ........ (لە عەرەبییەوە: ئاسۆ كەریم)... 39
-دەنگانێك لە چەرخی بەردینەوە ........ گێرالد تراوفێتەر ........ (لە ئەڵمانییەوە: نزار سابیر)... 45


## فایلی ژمارە

### میشێل فۆكۆ- فەیلەسوفی هۆڵی هەشتەم


-میشێل فۆكۆ: دابڕانی بەردەوام! ........ 56
-میشیل فۆكۆ........ (لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد)...58
-دەروازەی فۆكۆناسی ........ (شاهۆ سەعید)...65
-بونیاد و مانا: میشیل فۆفۆ ........ (لە فارسییەوە: ڕێبوار سیوەیلی)...98
-لە گریمانەی سەركوتەوە بۆ دەسەڵاتی چاودێركەر بەسەر ژیاندا ........ (لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی)...111
-فۆكۆ بیریاری مۆدێرنە ........ (لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد)...129
-جوانناسی بوون لای فۆكۆ ........ (لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف)...136
-فۆكۆ و مۆدێرنیتە ........ (لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی)...150
-فۆكۆ و سیاسەت ........ (لە عەرەبییەوە: سەردەم)...155
-میشیل فۆكۆ، حەقیقەت و دەسەڵات ........ (لە فارسییەوە: فەرەیدون بێوار)...158
-لە كۆمەڵگەی سزاوە بۆ كۆمەڵگەی كۆنترۆڵ ........ (مەریوان وریا قانع)...164
-فۆكۆ لەیاد كە ........ (ڕێبوار سیوەیلی)...173
-سیاسەت، ڕۆشنبیر، دەسەڵات ........ (لە عەرەبییەوە: هەڵكەوت عەبدوڵڵا)...185
-نوسینە سەرەكییەكانی میشیل فۆكۆ ........ (لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد)...192
-چەمكی گوتار لە فەلسەفەی میشیل فۆكۆدا ........ (لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵڵا)...197
-فۆكۆ و سنورەكانی دورترین ئەزمونی مرۆیی ........ (لە عەرەبییەوە: دانا ئەحمەد)...203
-فەلسەفەی ڕۆشنگەری لە نێوان كانت و فۆكۆدا ........ (لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد)...210
-میشیل فۆكۆ و بەندیخانە ........ (لە عەرەبییەوە: ئازاد بەرزنجی)...213
-فۆكۆ لەمڕۆدا ........ (لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع)...217


**نرخی (1200) دینارە**

# دیموكراسی كلاسیك: ئەسینا

داڤید هێلد
لە ئینگلیزیەوە: د. ئەلبێرت عیسا

لەسەدەی پێنجەمی پێش زایین ئەسینا وەك شار- دەوڵەتێكی شكۆمەند لەنێوان چەندەها دەسەلاتی یۆنانی نەیاردا سەریهەڵدا[1]. هۆكارەكانی ئەم شكۆمەندییە و گەشەسەندنی شێوە ژیانی دیموكراتیكی بێهاوتا لێرەدا جێی بایەخی سەرەكی نین، بەلام پێویستە هەندێك تێبینی بخەینە روو.

لە ساڵی (800 تا 500 پ.ز)، هەندێ نموونەی مەدەنی شارستانییەت وردە وردە لە جیهانی یۆناندا دروستبوون. چەندەها كۆمەڵگەی بچووك و بە توندی بە یەكەوە بەستراو باوەشیان كردبوو بە كەناری دەریادا و هەندێكیشیان بەدوور لەدەریا دروستبوون . لەسەرەتادا، ئەم شارانە بەشێوەیەكی نموونەیی لەلایەن دەزگای پادشایەتییەوە كۆنترۆڵ دەكران، بەلام دوایی و بەتایبەتی پاش چەند پێكدادانێكی توند و تیژ، هەندێ تیرە و هۆز خۆیان بەسەریاندا دەسەپاند. نووسەرێك بەشێوەیەكی سەرەكی ئەم شارانە وەسف دەكات وەك ناوەندی نیشتەجێبوونی جوتیار و خاوەن زەوییەكان:

لەشارە بچووكەكانی ئەم سەردەمە، جوتیارەكان لەناو چوار دیواری ئەم شارانە دەژیان و هەموو رۆژێك دەچوونە سەر كێڵگەكان بۆ كاركردن و بەشەو دەگەڕانەوە ماڵەوە (هەر چەندە رووبەری ئەم شارانە پڕ بوو لەپانتایی كشتوكاڵی كەدانیشتووانی لادێ تیایاندا دەژیان). رێكخراوی كۆمەلایەتی لەناو ئەم شارانەدا... دەوەستایەوە سەر حوكمی ئەوانەی كەخانەدان بوون و خانەدانیەتی ویراسی بەسەر باقی دانیشتووانی شار بەشێوەیەكی سەرەكی مومارەسە دەكرا، لەرێگەی حوكمڕانی تەنیا ئەنجوومەنێكی ئەریستۆكراتیكەوە.

گەشەكردنی زەوی و بازرگانی ئەوبەر دەریاكان، بەتایبەتی پێشكەوتنی ئەو شارانەی وروژاند كەشیوێنێكی باشیان هەبوو لەكەنار دەریادا. هەندێ لەمانە چەند سەردەمێكی گەشەسەندنی وردە وردەییان بەخۆیانەوە بینی.

بەردەوامی سیاسی ئەم شار- دەوڵەتانە كە لەسەرەتادا دروستبوبون، تێكدرا، بە هاتنە كایەی ئەو (زۆردارانەی) یان ئەو ئۆتۆكراتانەی (510-

650پ.ن) کەنوێنەرایەتی بەرژەوەندی ئەو کەسانەیان دەکرد کەتازە دەوڵەمەند بوو بوون، لەڕێگەی خاوەنداریێتی زەوی یان لەڕێگەی پیشەی کڕین و فرۆشتن و بازرگانییەوە. پەیڕەوی (نیزامی) تیرەگەری و هۆزگەری ڕێگەی خۆشکرد بۆ چەندین ڕژێمی زۆردار، بەلاّم سەقامگیری ئەم ڕژێمانە وای دەکرد کەهاوپەیمانیەتی و یەکگرتن لەنێوان شارەکاندا بەشێوەیەکی جێگییر نەمێنێتەوە. زیادبوونی سامانی هەندێك نەدەبووە هۆی چاکبوونی بارودۆخی چینە هەرەهەژارەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کەخاوەنی زەوی یان کیلّگەی بچوك نەبوون. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان گوشاری لەسەر ئەوانەی کە جیاوکیان (ئیمتیان) یان هەبوو زیادکردو لەنەنجامی ئەمە فشارێکی کۆمەلاّیەتی بەهێز دەستی پێکرد. لەپێناو هێشتنەوەی هاوسەنگی دەسەلاّت، دەستکرا بە هەندێك سازشکاری لە سیاسەتی گشتی شارەکان و ئەم سازشانەش کە کران بە تایبەتی لەئەسینا بەلاّم لەشارەکانی دیکەش، ئۆتۆنۆمی ئابووری جوتیارە بچووکەکان و مام ناوەندی و هەندیّ توێژی چێنەرەکانی بە هێز کرد. پاشان دۆخی ئەم گروپانە چاکتر بوو لە ڕێگەی چەند گۆڕانکارییەکی گرنگ لەسەر ئاستی ڕێکخراوی سەربازیی، کەتا رادیەك ڕێگەیان خۆشکرد بۆ هێنانە کایەی جوتیار و چێنەری زەنگین کە ماکێکی سەرەکیان پێکدەهێنا بۆ بەرگریکردن لەکۆمەڵگا. لە ڕاستیدا، ئەم گۆڕانکاریانە بوون کە کاریگەری خۆیان سەر ئاییندەیستروکتوری سیاسی شار — دەوڵەتەکە هەبوو.

لەگەلّ فراوانبوونی کوێلایەتی، بواری چالاکی ژمارەیەکی زۆر لە هاوولاّتی سەربەخۆ فراوانبوونێکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی. دروستبوونی ئابوری کۆیلایەتی لەکانزا و کشتوکالّ و هەندێك کاری پیشەسازی بچووك (کە هەر وەك تێبینی دەکرا) لە پڕ بووە هۆی گەشەسەندنەوەی شارستانییەتی یۆنانی. ئیتر هاوولاّتی ئازاد ڕاستەوخۆ دژی باکگراوەندی ڕەنجبەرە کویلەکان دەوەستایەوە. کۆمەڵگای شارە یۆنانییەکان وردە وردە هەستی شوناس و هاوکاریان زیاد بوو. بەم شێوەیە، هێڵی جیاکەرەوە لەنێوان هاوولاّتیان و کۆیلە و توێژەکانی دیکەی میللەتدا دروستبوو، ئەمەش خەڵکی ئەو کۆمەڵگایانەی دەگرتەوە کەلەویّ نێشتەجێببوون. ئەم شوناسەش لەڕێگەی خوێندەواریەوە بەهێزبوو، هەروەها یاریدەدەرێکیش بوو بۆ بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵکردنی خەڵکی و سەرچاوە ماددیەکان، هەر چەندە جیهانی یۆنانی کۆن بەشێوەیەکی سەرەکی بریتی بوو لە کولتورێکی زارەکی.

ئەو گۆڕانکاریانەی ڕێگەیان خۆشکرد بۆ کۆمەڵە یاسایەکی نووسراو و نەنووسراوی شەرعی کە نەوە دوای نەوە بەردەوام بوون، دوابەدوای چەند تازەگەرییەکی دەستووری شارە دەوڵەتەکان هاتن. لەوە دەکات کەلەنیوەی سەدەی شەشەم، یەکەم کۆمەڵی سیاسی (دیموکراتیك) هاتبێتە کایەوە لە (*Chios*)، هەرچەندە ئەوانی دیکەش بەتایبەتمەندی و شێوازی تایبەتی خۆیانەوە وردە وردە دروستبوون، لەکاتێکدا ئەسینا وەك لوتکەی ئەم پێشکەوتنە دەردەکەوێت، کولتوری سیاسی نویّ لەڕێگەی شارستانیەتی یۆنانی بەباشی بلاّو دەبێتەوە. بەم شێوەیە، ئەمە ڕێگە خۆشدەکات بۆ ئازادکردنی هاوولاّتیگەری سەربەست. پێویستە جەخت بخرێتە سەر ئەوەی کە هاتنە کایەیی دیموکراسی سەردەمانێك لەئەنجامی تاکە کۆمەڵێك لەڕووداو نایەتە دی و گەشەکردنی ئەم دیموکراسیانە لە ئەنجامی پرۆسەیەکی بەردەوامی گۆڕانکاری دەردەکەویّ لەماوەی چەند نەوەیەك.

هەرچۆنێکبێت، ئەم پرسیارەی خوارەوە خۆی دەسەپێنیّ: بۆچی ئەو گەشەسەندنەی باسمان

لێکرد بو بەهۆی خولْقاندنی جۆرێك لەدیموکراسی؟ ئەمە پرسیارێکی سەختەو وەلاَمەکەی ئەوەندە ئاسان نیە. لەنێوان ئەو فاکتەرانەی پێویستە جەختیان لەسەر بکرێت، ئەوەیە کە دەرکەوتنی هاوولاَتیگەریەکی ئابووری سەربازی سەربەخۆ لەناو چەند کۆمەلْگەیەکی بچوك و توندوتۆلْ، رەنگە خۆراك ببەخشیَ بەشێوازێکی دیموکراتیك لە ژیان. گۆرانی سیاسی لەناو چوارچێوەی ئەو کۆمەلْگایانە هاتە کایەوە کەبریتیبوون لەچەند هەزارێك و لەنزیك یەکتریەوە دەژیان و لەسەر ئاستی جوگرافی و کۆمەلاَیەتیش، سەنتەری شارستانیەت یان ژیانی گوندیان پێکدەهێنا[2]. پەیوەندی لەنێوان ئەم کۆمەلْگایانەدا تارادەیەك ئاسان بوو. دەنگ و باس زوو دەگەیشت، هەرچەندە بە نارێك و پێکی و کاریگەری رێکخستنی تایبەتمەندیە کۆمەلاَیەتی و ئابووریەکان زۆر بوو. لەم بارودۆخەدا، خەلْکی نەیاندەتوانی لە هەندیَ مەسەلەی بەرپرسێتی سیاسی و جۆری ئاستەنگەکان بەرامبەر بەشداری سیاسی دوور کەونەوە کە لە لایەن کۆمەلْە گەورەو ئالْۆزەکان دەخرایە روو هێشتا ئەوەندە واتادار نەبوو. ئەم فاکتەرانە (قەوارەو ئالْۆزی و رێژەی نەگونجانی سیاسی) گرنگی خۆیانیان هەیە لەبواری تێوری دیموکراتیکدا، هەرچەندە دەبیَ بلْێین کەنەمانی دیموکراسی کلاسیکی یۆنانی، تەنها گوزارشت نییە لە ونبوونی یەکێك لەو هەلە مێژوویانە بۆ هاوبەشی کردنێکی چر و فراون لەکاروباری گشتی، بەلْکو بۆ وەبیرخستنەوەیشە کە هەتا لەئەسیناش پێکهاتەی دیمۆس (*Demos*) تەنها بریتیبوو لەو نێرە بالْقانەی کە لەبنەمالْەی ئەسینیەکان بوون[3].

## ئیدیالْ و ئامانجی سیاسی:

گەشەکردنی دیموکراسی لە ئەسینا بو بە هۆی سەرچاوەی سەرەکی ئیلهام بۆ بیری سیاسی نویَ. سەردەم دوای سەردەم ئیدیالْە سیاسییەکانی (بۆ نموونە یەکسانی نێوان هاوولاَتیان، ئازادی، رێزگرتن لە یاسا و عەدالەت)، فۆرمێکی بە بیری سیاسی لە خۆرئاوادا بەخشی، هەر چەندە هەندیَ بیرۆکەی سەرەکی هەن کە بەشێوەیەکی راستەو خۆ سەرچاوەیان لە یۆنانەوە نەگرتووە، بۆ نموونە وەك ئەو چەمکە لیبرالْە نوێیەی کەروناکی دەخاتە سەر ئەوەی کۆمەلْگای مرۆیی بریتیە لە تاکەکان کە مافیان هەیە. هەر چۆنێك بێت، میراتی یۆنانی بە هیچ شێوەیەك بە بیَ رەخنە لەلایەن بیرمەندە گەورەکانی یۆنانەوە قبولْناکرێت، کە بیرۆکە و کولتوری یۆنانیان شیکردۆتەوە بە توسیدیدو (460–399 پ.ن) و ئیفلاَتۆن (427–327 پ.ن) و ئەریستۆشەوە (384–322 پ.ن). کاری رۆشنبیری ئەمانە پرە لەو هەلْسەنگاندنانەی کە بەشێوەیەکی بەردەوام، روو بە رووی سنوری تیوری و پراکتیکی دیموکراتیك دەبێتەوە. سەرنج راکێشە کە تیۆرناسێکی گەورەی دیموکراسی یۆنانی کۆن، نووسین و بیرو باوەرەکانی بە درێژی و پاساوکراو مامەلْەی شار– دەولْەتی (*polis*) دیموکراتیکی کلاسیکی بکەن. تۆماری ئەم کولتورە گەشبووە و لەلایەن سەرچاوەی جیاواز و نووسینی بچربچر و کاری رەخنەیی و دژکاری و دۆزینەوەی مێژوونووس و شوێنەوارناسانەوە کۆکراوەتەوە.

ئیدیالْ و ئامانجەکانی دیموکراسی ئەسینایی بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر گێرێنراوەتەوە بۆ ناشتنی (مرۆڤێك)، لەوتەیەکی بەناوبانگی (پێریکلێس – *Pericles*)[4] کەجەنەرالْ و سیاسییەك و هاوولاَتییەکی دەرکەوتووی ئەسینا بوو. لەوانەیە ئەم وتەیە (30) سالْ پاش پێشکەشکردنی، (لەلایەن توسیدیدەوە) رێکخرابێت، بیەویَ مەدح و سەنای هێز و گرنگی ئەسینا بکات. دوو برگە هەن کە بەتایبەتی شایستەی ئەوەن تیشکیان بخرێتە سەر:

(ڕێ بدەن بابڵێم کە سیستەمی حکومەتەکان لاسایی دەزگاکانی دراوسێکانمان ناکاتەوە. ئەمە زیاتر ئەو حاڵەتە دەگەیێنێ کە ئێمە مۆدێلێکین بۆ ئەوانی دیکە، نەك لاساییکەری خەڵکی دیکە. دەستوورەکەمان پێی دەووترێت دیموکراسی، چونکە دەسەلأت لەژێر دەستی کەمینەدا نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەرجەم میللەت. کاتێك دەویسترێت ناکۆکی نێوان خەڵکی چارەسەر بکرێت، هەموو کەسێك یەکسانە بەرامبەر بە یاسا. کاتێك دەویسترێت تاکێك پێش تاکێکی دیکە بخرێتە مەوقعی بەرپرسێتی گشتییەوە، گرنگ نییە ئەو تاکە ئەندامی چینێکی تایبەتی بێت، ئەوە گرنگە ئەو تاکە توانایەکی ڕاستەقینەی هەبێت. هیچ کەسێك ئەگەر توانای خزمەتی دەوڵەتی هەبێت، نابێت بەهۆی هەژاریەوە بخرێتە دەرەوەی بازنەی سیاسیەوە وهەر لەبەر ئەوەی ژیانی ئێمە کراوە و ئازادە، ژیانی ڕۆژانەشمان لەسەر ئاستی پەیوەندی لەگەڵ یەکتریدا بەهەمان شێوەیە. ئێمە دراوسێی نزیکی خۆمان ناچار ناکەین ئەگەر بەڕێگەی خۆی خۆشی لەشت ببینێت و بەخراپ تەماشای ناکەین ئەگەر ئازار بەخەڵکی بگەیێنێت، هەر چەندە تەماشای خراپ زیان ناگەیێنێت. ئێمە ئازاد و لێبوردەین (*Tolerant*) لە ژیانی (شەخسی) خۆماندا، بەلأم لەکاروباری گشتیدا بەگوێرەی یاسا ڕەفتار دەکەین، چونکە یاسا جێگەی ڕێزێکی قوڵە بۆ ئێمە.

ئێمە ملکەچی ئەوانەین کەدەیانخەینە دۆخی دەسەلأتەوە و ملکەچی یاساکانین، بەتایبەتی ئەو یاسایانەی دانراون بۆ پاراستنی ئەوانەی قورساییان کەوتۆتە سەر و بۆ بەرگری کردن لەو ڕێسا نەنووسراوانەی کە ڕێزنەگرتن لێیان دەبێتە هۆی شورەییێکی بەرچاو... لای ئێمە هەموو تاکێك تەنها بە تەنگی خۆیەوەنییە، بەڵکو بەتەنگ کاروباری دەوڵەتیشەوەیە: هەتا ئەوانەش کەزۆر سەرقاڵی کاری خۆیانن، بەشێوەیەکی فراوان زانیارێکی زۆریان هەیە سەبارەت بەسیاسەتی گشتی. ئەمە تایبەتمەندییەکی ئێمەیە. ئێمە ناڵێین ئەگەر مرۆڤێك غەمی سیاسەتی نەبێت، مرۆڤێکە خەریکی کاروباری خۆیەتی. ئێمە دەڵێین ئەمە هیچ کاری نییە لای ئێمە. ئێمەی ئەسینایی (خەڵکی ئەسینا)، بەش بە حاڵی خۆمان. بڕیار لەسەر سیاسەت دەدەین یان بڕیارەکانمان ملکەچ پێ دەکەین بۆ گفت و گۆ کردن: لەبەر ئەمە هیچ ناکۆکییەك نابینین لەنێوان ووشە و کردار. خراپترین شت ئەوەیە مرۆڤ ڕەفتار بکات، پێش ئەوەی ئەنجامەکانی ئەم ڕەفتارە بەشێوەیەکی شیاو تاقیبکاتەوە و ڕاڤەیان بکات). (***Thucydides, The peloponnesian War, pp. 145, 147***)

لەم بڕگانە دەتوانرێ زۆر خاڵی گرنگ هەڵێنجێنرێ. گۆمانی تێدا نییە، پێریکلیس کۆمەڵگەیەك وەسف دەکات کە هاوولأیانی دەتوانن و لە ڕاستیدا دەبێت بەشداری بکەن لەدروست کردن و هاندانی ژیانێکی پێکەوەیی. لە ڕەواڵەتدا، هاوولأتیان بەربەست نابن لەهاوبەشییان لەکاروباری گشتی کەدەکەوێتە سەر پلە و پایەو سامان. دێموس (*Demos*) دەسەلأتی سەروەری هەیە، واتە بەرزترین ئۆتۆریتای (*authority*) هەیە لە ڕاپەڕاندنی وەزیفەی یاسادانان و دادوەریدا. چەمکی "هاوولأتیگەری" ئەسینایی پابەندە بە هاوبەشیکردن لەم وەزیفانەدا، واتە هاوبەشی کردنی ڕاستەوخۆ لە کاروباری دەوڵەت، هەروەك پێرکلیس دەڵێت: (ئێمە ناڵێین ئەگەر مرۆڤێك غەمی سیاسەتی نەبێت، مرۆڤێکە خەریکی کاروباری خۆیەتی. ئێمە دەڵێن ئەمە هیچ کارێکی نییە لای ئێمە). خەسڵەتی دیموکراسی ئەسینایی بریتیبوو لەخستنە سەر ئەستۆی پرێنسیپی فەزیلەی مەدەنی: خۆ تەرخان کردن بۆ شار – دەوڵەتێکی کۆماری و ملکەچبوونی ژیانی شەخسی

بۆ کارووباری گشتی و باشی گشتی "بواری گشتی" و "بواری شەخسی" پێکەوە بەستراونەتەوە، هەر چەندە وەك پێریکلیس جەخت دەکاتە سەر ئەوەی لێبۆردەیی (*Tolerance*) شتێکی پێویستە لەپێناوی ئەوەی خەڵکی بتوانن لەڕێگەی خۆیانەوە خۆشی لەشت ببینن، بەڵام دەبێت بووترێت کە لەدیدی یۆنانی کۆنەوە فەزیلەی تاك هەروەك فەزیلەی هاووڵاتی تەماشا دەکات. خەڵکی دەتوانن تەنها بەشێوەیەکی شیاو تەواوکەری خۆیان بن و وەك هاووڵاتی ڕێزدارانە بژین لەناو و لەڕێگەی پۆلیسەوە (*Polis*)، چونکە ڕەوشت و سیاسەت لەناو ژیانی کۆمەڵگەی سیاسیدا تواوبوونەوە. لەم کۆمەڵگەیەدا هاووڵاتی ئەرك و ماف هەبوو، بەڵام ئەم مافانە خەسڵەتی تاکەکان نەبوون و ئەم ئەرکانەش لەلایەن دەوڵەتەوە نەسەپێنرابوون، کە خۆی تەرخان کردبوو بۆ شێوەیەك لە ژیان لەپێناوی پاراستنی ئامانجە شەخسییەکانی تاکەکان. ئەرك و ماف هاووڵاتی بەشێوەیەکی گونجاوتر پابەندبوون بەپلە وپایەی خۆیەوە، ئەمانەش دوا بە دوای بوون بە هاووڵاتییەوە ئەهاتن وەك هاووڵاتی: ئەمانە بریتیبوون لەماف و ئەرکی "گشتی". "ژیانی چاك" ئیمکانی هەبوو تەنها لەناو پۆلیسدا (*Polis*)، واتە لەناو شار — دەوڵەتدا.

ئەو جیاکاریە (*Distinctions*) تایبەتیە تازانەی کەهاتنە کایەوە لەگەڵ نیکۆلۆ مەکیەڤیللی (*Niccolo Macchiavelli, 1469 – 1527*) و تۆماس هۆبز (*Thomas Hobbes 1588-1679*) لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵ، لەنێوان بەرپرسە تایبەتییەکان و هاووڵاتی، لەنێوان خەڵك و حکومەت، بەشێکنین لەفەلسەفەی سیاسی شار — دەوڵەتی ئەسینایی. لەبەر ئەمە، ئەم شار— دەوڵەتە ئاهەنگی چەمکی هاووڵاتیگەرێکی ئەکتیڤ و بەیەکداچوو دەگێڕێ لەناو پرۆسەیەکی خۆحوکمکردن. حکومکەران دەبوایە حوکمبکرانایە.

سەرجەم هاووڵاتیان چاویان بەیەکتری دەکەوت بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکەن وبڕیار بدەن ویاسا دابنێن.

پرێنسیپی حکومەت بریتیبوو لەپرێنسیپی شێوەیەك لەژیان: هاوبەشیکردنی راستەوخۆ، هەروەها پرۆسەی حکومەت خۆی دەوەستایەوە سەر ئەوەی کەپێریکلێس ئاماژەی بۆ دەکات، "دانوستاندنی گونجاو" واتە گفتوگۆی ئازاد و بێسنوور کە دەکرێ لەرێگەی ئیزێگۆریەوە (*Isegoria*)، واتە ماف یەکسان بۆ قسەکردن لەناو جەمعییەیەکی سەروەردا مسۆگەر دەکرێت. داوا دەکرا بڕیارو یاساکان لەسەر تاوانبارکردن بمێننەوە نەك تەنها لەسەر نەریت و رێسا و توندوتیژی. یاسای دەوڵەت بریتیبوو لەیاسای هاووڵاتی. لەبەردەم یاسادا هەموو کەسێك یەکسان بوو، لەبەر ئەمە هەر وەك پێریکلێس باسی دەکات "ئێمە یاسا دەپارێزین". یاسا بەرامبەر ستەمکاری (*Tyranny*) دانراوە و ئازادیش پێشنیاری ڕێز لێنان بۆ یاسا دەکات. هەر وەك نووسەرێك دەڵێت : "تاکی ئەسینایی هێمای خۆی نەدەکرد کە بەتێکڕایی ناچار نییە، بەڵام جیاکاریەکی توندی دەکرد لەنێوان ناچار بووندا دەکرد کەبریتیبوو لەملکەچی بۆ ویستی سەرکوتکاری (*arbitrary*) مرۆڤێك و ملکەچی بۆ ئەوەی بە گوێرەی یاسا دان ئەنێ بەو حوکمەی ماف هەیە ڕێزی لێبگیرێ و لەبەر ئەمە بەم واتایە خۆی خۆی دەسەپێنێ". ئەگەر یاسا بەشێوەیەکی گونجاو دابنرێ لەناو چوارچێوەی ژیانێکی پێکەوەیی، بەشێوەیەکی ڕەوا دەبێ ملکەچی بۆ بکرێ. بەم واتایە، چەمکەکانی حوکمی یاسا و پرۆسەی گونجاو و حکومەتی دەستووری لەناو سیاسەتی شار — دەوڵەت، گوزارشتی پێشینەیی خۆیان دەدۆزنەوە.

لەوە دەکات کە ئەسینایییەکان بە تێکڕایی شانازیان بەخۆیان دەکرد، لەسەر بنچینەی ژیانێکی سیاسی "ئازاد و کراوە" کە لەناویدا هاووڵاتیان

دەیانتوانی توانا و کارامەیی خۆیان بەدی بێنن و پەرەیان پێبسێنن. بێگومان بەشێوەیەکی روون دان بەوەدا دەنرا کەهەموو کەسێك بۆ نموونە، توانای سەرۆکایەتی و سەرکردایەتی لەشکر و هێزی دەریایی ئەسینایی نەبوو. دان نرا بە جیاوازی لە توانا و شایەنداریێتی (*merit*)، بەڵام کاتێك پێریکلێس بە شانازییەوە بانگەواز دەکات بۆ ئەوەی "شاری ئێمە پەروەردەی یۆنان دەکات"، بەتاییبەتی باسی لەشێوازێك لە ژیان دەکرد کە لەناویدا "هەر یەکە لە هاووڵاتیانی ئێمە لەهەموو ڕوویەکی ژیانەوە، توانای ئەوەی هەیە خۆی وەك فەرمانڕەوایەکی رەوا و خاوەنی کەسی خۆی نیشان بدات، زیاتر لەوەش ئەمە بکات بەئازادیەکی بێهاوتا و بەهرە زۆریەکی بێهاوتا (*Thucydides, The Peloponnesian War, pp. 147-148*). لەڕێگەی سەربەخۆیی و پایە و پەروەردە و هونەر و ئایین و لەسەروو هەمووشیانەوە لەڕێگەی هاوبەشیکردن لەژیانی گشتی شار، تاك دەیتوانی "هێزە ماددییەکان" و ئامانجی باشی گشتی بەدیبهێنێت. هەروەها واتای دادپەروەری بەتەواوەتی بریتیبوو لەزامنکردن و ڕێکخستنی رۆڵ و شوێنی هاووڵاتی، لەناو شار — دەوڵەتدا .

یەکێك لەبەرچاوترین گێڕانەوەکان سەبارەت بەدیموکراسی کۆن، دەتوانرێ لە "سیاسەت" ی ئەریستۆ بدۆزرێتەوە کە لەنێوان (335 و 323 ی پ. ز) نوسراوە. "سیاسەت" کتێبێکە بەشێوەیەکی گشتی بەهیچ جۆرێك لایەنگەری راست بێژ نییە بۆ دەزگا دیموکراتییەکان. ئەم گێڕانەوەیە " داخوازی و پلە و ئامانجەکانی" دیموکراسی شیدەکاتەوە و بە روونی ئاماژە دەکات بۆ خەسڵەتە تایبەتییەکانی ژمارەیەك لەڕژێمە دیموکراسییەکانی یۆنان. دووەم بڕگە لەوانەیە جوانترین و کورتترین ئاماژەیەك بێت بۆ دەزگا کلاسیکییەکانی دیموکراسی، ئەم گێڕانەوەیە شایستەی ئەوەیە بەدرێژی دابڕێژرێ:

"پرێنسیپی بنەڕەتی دەستووری دیموکراتیك بریتییە لەئازادی. خەڵکی بەبەردەوام ئەمە دەڵێن و مەبەستیان لەوەیە تەنها لەم جۆرە دەستوورەدا تاکەکان ئازادن، چونکە دەڵێن هەموو دیموکراسیەك ئامانجەکەی ئازادییە. "حوکمکردن بەنۆرە" ماکێکی ئازادییە و لە راستیدا بیرۆکەی دیموکراتیکی دادپەروەری بریتیە لەیەکسانی ژمارەیی، نەك ئەو یەکسانیەی دەوستێتەوە سەر شایەنداریێتی ***merit*** و کاتێك بیری دادپەروەری سەردەکەوێ، جەماوەر ***multitude*** دەبێ سەروەر بێت و ئەوەی زۆرینە بڕیاری لەسەر ئەدات، دوواهەمین شتە و بریتیە لە دادپەروەری. لەبەر ئەوە دەڵێین پێویستە یەکسانی هەبێت لەنێوان هاووڵاتیاندا. ئەنجامی ئەمە ئەوەیە لە ڕژێمە دیموکراتییەکاندا هەژارەکان زیاتر دەسەڵاتی سەروەرییان هەیە لە دەوڵەمەندەکان، چونکە ئەوان ژمارەیان زیاترە و بڕیاری زۆرینە سەروەرە. ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی ئازادی کە دیموکراتەکان دەیکەن بە پرێنسیپی کۆتایی دەستوورەکەیان. ئەوی دیکە بریتیە لەوەی تۆ بژیت وەك خۆت حەزی لێدەکەیت، لەبەر ئەوە دەڵێین ئەمە بنەمای ئازادیە و پێچەوانەکەی، واتا بژیت بەو شێوەیەی ئارەزوو ناکەیت بنەمای بەکۆیلەبوونە. ئەمە دووەم پرێنسیپی تەواوی دیموکراسیە و لەمەوە ئەو بیرۆکەیە سەرچاوە دەگرێ کەدەڵێ ئەگەر دەکرێ لەلایەن کەسەوە حوکم نەکرێی یاخود بەلایەنی کەمەوە بەنۆرە و بەدوایەکدا هاتن سەرەکیترین ماکی دیموکراسییە، بەراستی ئەم پرێنسیپە مەرجێکی بنچینەییە بۆ پێناسەکردنی دیموکراسی. ئەمە واتا (حوکمبکرێ لەڕێگەی پرۆسەی بەدوایەکهاتن)، هاوبەشی دەکات لە (بنیادنانی) ئازادی کە لەسەر یەکسانی دەوەستێت.

لەم شتە بنەڕەتیانەوە و لەشێوەی حوکم کەبەم شێوەیە هێما دەکرێت، دەتوانرێ ئەم خەسڵەتانەی خوارەوە لە دیموکراسی هەڵێنجێنرێ: (1)

هەڵبژاردن بۆ دەزگاکان لەلایەن هەمووانەوە و لەنێوان هەمواندا. (2) حوکمی هەموو بەسەر هەر یەکێك و حوکمی هەر یەکێك بەسەر هەمووداا بە نۆرە. (3) لەڕێگەی پشکەوە (اقتراع) ئەندامی دەزگاکان دادەنرێن، هەموویان یان ئەوانەی ئەزموون یان شارەزاییان نییە. (4) ماوەی "بەرپرسێتی" هیچ دەزگایێك نابێ بوەستێتەوە سەر خاوەندارێتی یان سەر پێچەوانەکەی. (5) هەمان مرۆڤ نابێ دوو جار لە هەمان دەزگا کار بکات یان ئەگەر کردی دەبێ بە دەگمەن بێ و کەم کەس دەبێ بیکەن، وەك ئەوانەی پەیوەندییان هەیە بە کاری جەنگەوە. (6) ماوەی کورت بۆ کارکردن لەدەزگاکان یان تا دەتوانرێ زۆرترین خەڵك بەشداریان تێدا بکەن. (7) هەموو دەبێ ئەندام بن لەدەستەی سوێنخۆران (هیئە المحلفین) کە لەلایەن هەموانەوە هەڵدەبژێردرێن و فەرمانی دادوەری دەردەکەن، لەسەر سەرجەم یان زۆرینەی ئەو بابەتانەی زۆر گرنگ و باڵان، وەك ئەوانەی پەیوەستن بە دەستوور و پشکنین و گرێبەست لەنێوان تاکەکاندا. (8) کۆمەڵە (*Assembly*) وەك دەسەڵاتی سەروەرە لەهەموو شتێکدا یان بەلای کەمەوە لە زۆربەی بابەتە هەرە گرنگەکاندا، کارمەندانیش دەسەڵاتی سەروەریان نابێ بەسەر هەموو شتێکەوە یان تا دەتوانرێ بەسەر کەم کەسەوە هەیانبێت. (9) دەبێ مووچە بپرێتەوە بۆ ئەوانەی لەناو جەمعییە و دادگا و دەزگاکاندا کار دەکەن (یان هەر چۆنێك بێت لەناو دەزگا و دادگا و ئەنجوومەنی جەمعییەوە یان لەناو ئەو دەزگایانەی تیایاندا ژەمی خواردن پێکەوە ناچارییە. (10) هەروەك چۆن لە دایکبوون (لەناو خێزانێکی خانەوادەدا) و سامان و پەروەردەی باش نیشانەی بەرچاوی ئۆلیگارکین، هەروەها پێچەوانەکەیان، واتا لەدایکبوون لەناو خێزانێکی ئاسایی و داهاتی (دەرامەتی) نزم و کارە میکانیکییەکان، دادەنرێن بەخەسڵەتی تایبەتی دیموکراسی. (11) نابێ ماوەی فەرمانڕەوایی هەمیشەیی بێت و ئەگەر هەر دەزگایەك پاش گۆڕانکاری بەردەوام بێت، دەبێ دەسەڵاتی لێ بسێنرێتەوەو بەرپرسەکانی دەبێ لەو پاڵێوراوانە هەڵبژێردرێن کە لەڕێگەی پشکەوە (اقتراع) دەردەچن .

ئەمانەن خەسڵەتە گشتییەکانی ڕژێمە دیموکراسییەکان. (*Aristotle, The Politics, pp. 362-364*)..

لەڕوانگەی ئەریستۆوە، بۆ دیموکراتێك ئازادی و یەکسانی بەشێوەیەکی لەناویەکچوو بەسراونەتەوە بەیەکەوە.

دوو پێوەر هەن بۆ ئازادی: (1) حوکمبکەیت و حوکمبکرێت بەنۆرە و (2) ژیان لەسەر بنچینەی هەڵبژاردن. لەپێناو جێگیرکردنی یەکەم پێوەر وەك پرێنسیپێکی سەرەکی، حوکومەت پێویستییەکی بنەڕەتی هەیە بە یەکسانی: بە بێ "یەکسانی ژمارەیی"، "جەماوەر" ناتوانێ سەروەر بێ. "یەکسانی ژمارەیی" واتا یەکسانی لە دابەشکردنی پراکتیکی حوکمکردن (کە لەلایەن دیموکراتە کلاسیکییەکانەوە ئاماژەی بۆ دەکرێ) دەشێ بەدیبهێنرێ، چونکە (1) مووچە دەدرێ بەوانەی هاوبەشی دەکەن. بەم شێوەیە کاتێك لەسەر ئاستی سیاسی هاوبەشی دەکەن، بارودۆخیان بەرەو خراپی ناڕوات. (2) هاووڵاتیان دەسەڵاتی یەکسانیان هەیە لەکاتی دەنگداندا و (3) لەپرێنسیپدا، دەرفەتی یەکسانی هەیە بۆ ئەوانەی بەرپرسێتی دەزگایەك وەردەگرن. بەم شێوەیە یەکسانی بنچینەی پراکتیکی ئازادییە و هەروەها بنچینەی ئەخلاقی ئازادیە، چونکە باوەڕکردن بەوەی خەڵکی دەبێ "مافی" بەشداریکردنی یەکسانی هەبێ لەحوکمکردندا، پاساوی یەکەم پێوەری ئازادی دەکات "حوکمبکەیت و حوکمبکرێت بە نۆرە". کاتێك کەئەم خستنە

ئەستۆیە بەهێزە بۆ یەکسانی، ناگونجی لەگەڵ ئازادی (هەروەك زۆر کەس باسی لێدەکەن بەئەریستۆشەوە)، کاتێك ئەمە ناگونجێ لەگەڵ ئازادی هەروەك لەلایەن دوەم پێوەرەوە روون کراوەتەوە، (واتە ژیان لەسەر بنچینەی ئەوەی حەزی لێدەکەیت) دیموکراتەکان لەگەڵ ئەوەدان پێویستە سنور بۆ ئەوە دابنرێ کە ئازادی هاوولاّتی بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە دەستوەرنەداتە ئەوەی هاوولاّتیەکی دیکە. چەند هاوولاّتی بۆنەی هەبێت بۆ پرێنسیپی "حوکم بکەیت و حوکم بکرێت بە نۆرە"، ئەو مەترسیانەی کە پەیوەستن بە یەکسانییەوە کەم دەبنەوەو لەبەر ئەوە هەردوو پێوەری ئازادی دەتوانن بە یەك بگەن.

لە ڕوانگەی ئەریستۆوە، دیموکراسی کلاسیکی ئازادی دەسەپێنیٚ و ئازادیش یەکسانی دەسەپێنیٚ. ئەم مەسەلەیە وای لە ئەریستۆ کرد کە سەبارەت بە دیموکراسی ئەوەندە شت نەدرکێنیٚ.

## خەسڵەتە دەزگاییەکان

ئەو دەزگایانەی لەلایەن ئەریستۆوە وەسف کراون (لە دووەم برگە)دا، پەردە لەسەر ڕووی سروشتی ڕیشەیی دیموکراسی کۆن هەڵدەماڵن. سەرسوڕهێنەرە کەمارکس و ئینگلس ئەمەیان وەك سەرچاوەی ئیلهامی خۆیان وەرگرتووە. مۆدێلی پەیڕەوی دیموکراتیك و کۆمونەی (*Commune*) پاریس ساڵی 1871 وەك ژمارەیەکی بەرچاو لە خەسڵەتە گشتییەکانی ئەسینا، خاڵیان بەژێردا هێنراوە. وێنەی روون کردنەوەی ژمارەی 1،1 پێکهاتەی دەزگای ئەسینا دەردەخات.

سەرجەم هاوولاّتیان جەستەی سەروەری ئەسینایان پێکدەهێنا: واتا کۆمەڵە. کۆمەڵە زیاتر لە چل (40) جار لە ساڵێکدا کۆدەبوەوە و (6000) هاوولاّتی ژمارەی یاساییان لەکۆبوونەوەیەکدا تەواو دەکرد، (واتا کەمترین ژمارەی یاسایی بۆ جێبەجێکردنی کاروبار). سەرجەم مەسەلە سەرەکییەکانی وەك چوارچێوەی رەوا بۆ هێشتنەوەی پەیڕەوی گشتی، دارایی و باجی ڕاستەوخۆ، دوورخستنەوە *ostracism* و کاروباری دەرەوە (مەزەندە کردنی ڕێژەی ڕاپەراندنی کاروباری سەربازی و دەریایی، دروستکردنی هاوپەیمانییەتی، ڕاگەیاندنی جەنگ و ئەنجامدانی ئاشتی)، دەهێنرانە بەردەم هاوولاّتیان کە کۆدەبوونەوە بۆ گفت و گۆ کردن و بڕیاردان. کۆمەڵە بڕیاری لەسەر بەرپرسێتی سیاسی دەوڵەتی ئەسینایی دەدا، کاتێك لەلایەکەوە ڕێککەوتنی تەواو بەکۆمەڵ *unaninimty* کە بە یۆنانی پێی دەووترا *homonoia* دەبینرا، وەك ڕێگەیەك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لەپێناوی بەرژوەندی گشتی، لەلایەکی دیکەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا بەئەگەریی جیاوازی گەورە لەنێوان راوبۆچون وپێکدادانی بەرژوەندی تاکەکەسی دادەنرا. ئەو کێشانەی چارەسەرێکیان بۆ نەدەدۆزرایەوە، کۆمەڵە دەیخستە دەنگەوە بۆ بەدیهێنانی حوکمی زۆرینە. دەنگدان ڕێگەیەك بوو بۆ دەرخستنی جیاوازی راوبۆچون، هەروەها بۆ پیشاندانی میکانیزمی شێوەی کارکردن لەپێناوی بەشەرعی کردنی چارەسەرێك بۆ کێشە پێویستەکان. لەوانەیە یۆنانیەکان ڕێگەیی دەنگدانی رەسمیان داهێنابێ بۆ ئەوەی رەوایی بدەن بە بڕیارەکان لەکاتی بونی جیاوازی راوبۆچوندا، بەلاّم هەماهەنگی*Consensus* ئاواتی هەموان بوو، زۆر روونیش نییە ئایا زۆربەی کێشەکان دەخرانە دەنگەوە یاخود نا.

وێنەی روونکردنەوەی ژمارە 1،1: دیموکراسی کلاسیکی، ئەسینا: (لەدەستووری کلیستێنەوە وەرگیراوە. چاکسازی کلیستێن لەساڵی 507 پ.ز کراون)




**سەرچاوە:**

*Finley (1963,1983), Sabine (1963), Anderson (1974).*

## میتۆدی هەڵبژاردن یان پاڵاوتن (انتقا) کردن:

1-پاڵێوراوانی ناوچە کارگێرییەکان کەبەرێژەی قەبارەیان هەڵدەبژێرران بۆ ئەوەی "نوێنەراییەتیان بکەن" لەئەنجوومەن یان لەدەزگاکانی دیکەدا. لەپێشدا پاڵێوراوان لەڕێگەی پشکەوە (اقتراع) دیاری دەکران. دوایی "کاندیدەکان" دەخرانە ناو سندوقی پاڵێوراوانەوە. بۆ دواهەمین جار، ئەو پاڵێوراوانەی کە لەکاردا بوون لەسندوقەکە دیسانەوە لەڕێگەی پشکەوە (اقتراع) دیاری دەکران. دەووترا دەبێ هەلی یەکسان بدرێ بە هەموو کەسێك کە دەیەوێ بەرپرسێتی وەربگرێ. ماوەی بەرپرسێتی کورت بوو، هاوکات بواری خۆ هەڵبژاردن بۆ دوەم جار نەبوو. سەرجەم کادیرە هەڵبژێردراوەکان مووچەیان هەبوو بەرامبەر ئەو خزمەتەی کەپێشکەشیان دەکرد، چونکە لەکاتی دیاری کراودا ئامادەی کۆمەڵە دەبوون .

2-ئەمانە لەڕێگەی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆوە لەلایەن هاووڵاتیانەوە دیاری دەکران و مافی خۆهەڵبژاردنەوەیان هەبوو .

3-کۆمیتە بەنۆرە ڕێکدەخرا لەلایەن ئەنجوومەنەوە و بۆ یەك لەسەر دەی ماوەی ساڵانەی دەزگاکە کاریدەکرد .

کۆمەڵە جەستەیەکی فراوان بوو کەکارنامەی خۆی ئامادە دەکرد و ڕەشنووسی(*DRAFT*) یاسایی دائەنا و سەنتەرێکی بنەڕەتی بوو بۆ پێشوازیکردن لەدەستپێشخەریی سیاسی و پێشنیازی نوێ. ئەنجوومەنی (500) بەرپرس بوو لە ڕێکخستن و پێشنیازی بڕیاری گشتی و لەلایەن لیژنەی (50) و سەرۆکەکەی کە سادە و لێهاتووبوون هاوکاری دەکرا، (بێ گومان سەرۆکی لیژنەی – 50– تەنها بۆ یەك ڕۆژ دەیتوانی بەرپرسێتی وەربگرێ).

دادگاکان لەسەر هەمان شێوەی کۆمەڵە ڕێکخرابوون، بەڵام وەزیفەی ڕاپەڕاندن لەشاردا لەلایەن دادپرسان (حاکمەکان) جێبەجێدەکرا، هەر چەندە دەسەڵاتیان پارچە پارچە (بەش بەش) کرابوو لەڕێگەی میکانیزمێك کەشوێنەکانی دابەش دەکرد بەسەر ئەنجوومەنی (دەکەسی) دا، واتا دەکەسدا. سەرجەم "کارمەندەکان" هەڵدەبژێردران بۆ ماوەی یەك ساڵ بەبێ دووبارەبوونەوە، واتا بۆ دووەم جار مافی هەڵبژاردنیان نەبوو. پاشان لە پێناوی دوورکەوتنەوە لە مەترسی سیاسەتێکی دەسەڵاتخوازیی یان معمیلچیەتی (*CLIENTAGE*) پەیوەندیدار بە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆوە، چەندین میتۆدی پاڵاوتن بەکار دەهێنران بۆ هێشتنەوەی بەرپرسێتی کارگێڕە سیاسییەکان و سیستەمی دەوڵەت، وەك نۆرە لەئەرکدا و پشك "اقتراع" و هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ.

## تایبەتمەندی بێهاوتای دیموکراسی کۆن

نۆژەنی (*INNOVATIONS*) نائاسایی دیموکراسی ئەسینایی بەشێوەیەکی فراوان، گوزارشتی لەتایبەتمەندی بێهاوتای خۆی دەکرد. تایبەتمەندی شار– دەوڵەتی (*POLIS*) کلاسیکی بریتیبوو لەیەکیتی و هاوکاری و هاوبەش کردن و هاوولاٚتیگەریەك کەزۆر کەسی نەدەگرتەوە. دەوڵەت بەشێوەیەکی قوڵ ڕۆدەچووە ناو ژیانی هاوولاٚتیانەوە، واتا زۆر لایەنی ژنانی هاوولاٚتیانی دەگرتەوە، بەلاٚم ڕێژەیەکی کەم لەخەڵکی سەرقاڵی ژیانی دەوڵەت بوون. هاوولاٚتیان هاوبەشییان دەکرد نەك تەنها لە چالاٚکییەکانی وەك کارگێری و خزمەتی سەربازیی و یاسادانان و خزمەتی سوێندخۆران و بۆنەی ئایینی و یاری و فیستیڤاڵ، بەڵکو هەروەها لە چاودێری کردن و کونترۆڵ کردنی ئەو خەڵکە زۆرەی نەیان دەتوانی ڕۆڵیان لە ناو کاروباری دەوڵەتدا هەبێت.

پێش هەموو شتێك، کولتوری سیاسی ئەسینایی بریتیبوو لەکولتورێکی تایبەت بەباڵغی نێرینە. تەنها ئەو پیاوانەی تەمەنیان لەبیست ساڵ زیاتربوو ماڤ هاوولاٚتیگەریان هەبوو. دیموکراسی کۆن بریتیبوو لەدیموکراسی باوکسالاری (*PATRIARCH*). ژنان ماڤ سیاسیان نەبوو و سنور دادەنرا بۆ مافە مەدەنییەکانیان، هەر چەندە ژنان لەم باریەوە زیاتر مافیان بەدی دەهێنران. دەستکەوتەکانی دیموکراسی کلاسیکی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیدار بوون بەئەرکی ماڵ کە لەلایەن ژن و منداڵەوە جێبەجێدەکران و بەو کارانەی کە لەسەر ئاستی سیاسی ئیعتیرافیان پێ نەدەکرا .

خەڵکێکی زۆر لە ئەسینا نێشتەجێبوو بوو، ئەوانیش ماڤ هەڵبژاردنیان نەبوو بۆ بەشداریکردن لەڕاپەراندنی کاروباری فەرمی (ڕەسمی). ئەمانە پێکهاتبوون لەو "کۆچکەرانەی" خێزانەکانیان چەند سەدەیەك لەوەوبەر لەئەسینا نێشتەجێ بووبوون. لەوانەیە توێژێکی فراوانی ئەوانەی لەسەر ئاستی سیاسی پەڕاوێز کرابوون، بریتیبوون لەخەڵکی کۆیلە. وامەزەندە دەکرێ ڕێژەی کۆیلەکان لانی کەم بریتیبوو بێت لە (3–2)، لە هاوولاٚتیانی ئازادی ئەسینا لەسەردەمی پێریکلێسدا. ژمارەی کۆیلە دەگەیشتە (100000–80000). کۆیلەکان لە سەرجەم بوارەکانی کشتوکاڵ، پیشەسازی و کارگە وکاروباری ماڵ بەکاردەهێنران. لەوە دەکات کە کۆیلایەتی ئەسینایی و دیموکراسی دوو شتی دابەشنکراووبووبن. جیاوازی نێوان بنچینەی رەسمی (رووکەش) و بنچینەی واقیعی ژیانی سیاسی ئەسینایی سەرسۆرهێنەرە. چەمکی کلاسیکی وەك "یەکسانی سیاسی" دوور بوو لەبیرۆکەی "یەکسانی دەسەلاٚت" بۆ هەموو باڵغەکان. یەکسانی سیاسی شێوەیەك بوو لەیەکسانی لە نێوان ئەوانەی هەمان باری کۆمەلاٚیەتیان هەبوو، واتا ئەوانەی پیاو بوون و لەئەسینا لەدایك بووبوون. تەنانەت دوایش هەروەك بەکورتی باسی لێدەکەین، یەکسانی دۆخی کۆمەلاٚیەتی بەڕاستی گوزارشتی نەدەکرد لە فرسەتی سیاسی یەکسان بۆ هەمووان. دیموکراسی ئەفسانەیی بەشێوەیەکی توند و تۆڵ بەسرابووەوە بەوەی پێی دەووترێت زۆرداری هاوولاٚتیان. بەم شێوەیە ئەگەر بتوانین بەشێوەیەکی ڕەوا ئاماژە بکەین بۆ ئەسینا وەك ڕژێمێکی دیموکراسی، دەبێ بەلایەنی کەمەوە ئەم مەسەلەیە باس بکرێ. دەبێ بووترێ کە بێگومان سیاسەتی ئەسینایی کۆن بەشێوەیەکی فراوان بنچینەیەکی نادیموکراتی هەبوو، بەلاٚم پێویستە جەخت لە سەر ئەوە بکرێت کەهەروەك (فاینلی) دەڵێ: کە هەڵبژاردن لە نێوان "حوکمی کەمینە" یان "حوکمی زۆرینە" شتێکی پر لەواتابوو، ئەو "مافانەی" گروپە جیاجیاکان

داوایان دەکرد بۆ خۆیان و خەباتیان بۆ دەکرد، ئەوەش واتایەکی زۆر گەورەی هەبوو، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا " زۆرینە" کەمایەتییەکی خەڵکەکەی پێکدەهێنا.

پێویستە هەردوو دەستکەوتە گرنگەکان و سنوری تەسکی دیمووکراسی ئەسینایی لە بەرچاوبن. ئەگەر یەکێك بەشێوەیەکی کاتی ئەو کێشانە بخاتە لاوە کە پە یوەندیدارن بەئەندامێتی تەسك لە ناو دەوڵەت یان ئەو تەنگەژەو پێکدادانەی ئەنجامدەدران و زیاتر جەخت بخاتە سەر خەسڵەتە ناوخۆییەکانی پەیڕەوی دیموکراسی نوێ، لەوانەیە بتوانێ ئەو گرفتە واتابەخشانە ببینێ کە لەلایەن فۆرمە نوێکاریەکانی سیاسەتی ئەسینابییەوە دروست دەکران، ئەو گرفتانەی نەیانهێشت "کە دیموکراسی" زیاتر لەسەدەی چوارەم و پێنجەمی (پ.ز) بەردەوام بێت.

مێژووی تۆمار کراو ئەوەندە زانیاری قوڵمان ناداتێ سەبارەت بەئەزموون و پراکتیکی دیموکراسی کۆن. بەڵام یەکێك لە گێڕانەوە هەرە سەرنجڕاکێشەکان کە لەلایەن کسێنۆفۆنەوە *Xenophon* بەدی هێنراوە، ڕوخساری نێگەتیڤ و خراپیمان بۆ ڕووندەکاتەوە. لەو پارچە بڕگانەی خوارەوە کسێنۆفۆن زۆر لەو خەسڵەتە دەزگاییانە ڕوون دەکاتەوە کە لەوەو پێش ئامادەکرابوون و وەسفی هەندێك ڕووداو و گفتوگۆ دەکات لە دەوروبەری (406 پ،ز).

ئەم ڕوونکردنەوەی کسینۆفۆن ڕوناکی دەخاتە سەر هەردوو قەوارەی بەرپرسێتی سیاسی سەرسوڕهێنەر کە لەئەسینادا بەرهەم هێنرابوون: هاوبەشی کردنی ڕاستەوخۆی هاوڵاتیان لە پرۆسەی بڕیاردان و هەندێ سەرچاوەی پەیوەست بەو گیروگرفتانەی بەرەنگاریان دەبونەوە. ئەم بڕگانە ئاماژە دەکەن بەسەرکەوتنی هێزێکی دەریایی ئەسینایی بەناوبانگ کەزۆر دەریاوانی مردوی پاش خۆی بەجێهێشتبوو. ئەوانەی کەبەرپرسێتی ئەو هەڵمەتەیان وەرگرتبوو تۆمەتبار کرابوون، لەبەر بەجێهێشتنی ئەو پیاوانەی لەناو ئەو کەشتیانەدا مابوونەوەکە کەنوقم بووبوون.

لە نێوان ئەو گێرانەوانەی کە لەبەر چاومانن، دەبێ وەبیر بخرێنەوە کە ئەم چیرۆکە لەلایەن یەکێکەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەوەندە لایەنگەری بیرۆکەی دیموکراسی نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە دڵنیایی ڕوونکردنەوەیەکی شیاو پێشکەش دەکات سەبارەت بە ژیانی سیاسی کە لەبەر ئەوە شیاوی داڕشتنییەتی.

"لەکاتی گەڕانەوەدا، خەڵکی سەرجەم جەنەڕاڵەکانیان لەنووسینگە دوورخستەوە، جگە لە (کۆنۆن *KONON*). دوو لە جەنەڕاڵەکان کە بەشداریان کردبوو لە شەڕەکەدا (پرۆتۆماکۆس و ئەریستۆجێن *PROTOMACHOS-ARISTOGENES*) نەگەڕانەوە بۆ ئەسینا. کاتێك کە شەشەکەی دیکە (پێریکلێس –کوری پێریکلێسی بەناوبانگ–، دیۆمێدۆن، لیسیاس، ئەریستۆکراتیس، ترازیللۆس، ئێراسینیدێس) گەیشتن، ئەرکێدێمۆس کە ئەو سەردەمە پیاوێکی سیاسی سەرکردە و سەرپەرشتیاری سند□قی یارمەتی بوو بۆ جەنگ، پێشنیازی سزادانی ئێراسینیدێسی کرد و هێنایە بەردەم دادگای عەدالەت... دادگا بریاریدا کەئێراسینیدێس بخرێتە ژێر چاودێریەوە (توقیف) بکرێ. پاش ئەمە جەنەڕاڵەکان دەستیان کرد بەباسکردنی جەنگ و توندوتیژی زریانەکە لە ناو ئەنجوومەندا. پاشان، تیمۆکراتیس (*TIMOKRATES*) پێشنیازی کرد ئەم جەنەڕاڵانە بخرێنە ژێر چاودێری و بهێنرێنە بەردەم کۆمەڵە و ئەنجوومەنیش خستنیە ژێر چاودێریەوە.

پاشان، کۆمەڵە کۆبووەوە و هەندێ کەس و بە تایبەتی تێرامێنێس (*THERAMENES*) هێرشیان بردە سەر جەنەڕاڵەکان و وتیان دەبێ بانگ بکرێن،

بۆ ئەوەی باسی ئەوە بکەن بۆچی فریای ئەو پیاوانە نەکەوتن کە نوقم بـــوون... پاشان هەر یەك لە جەنەڕاڵەکان بە کورتی دەستیکرد بەداکۆکیکردن لەخۆیان، چونکە کاتیان پێ نەدرا بۆ ئەوەی ووتار بخوێننەوە هەروەك یاسا پێشبینی دەکرد. ئەمانە باسی ڕووداوەکەیان کرد: خۆیان دەستیان کرد بە جۆلأنەوە لە ناو دەریادا بە شوێن ڕاونانی دوژمن و ئەرکی ئەوەیان پێسپێردرا کاپتنەکانی کەشتی ڕزگار بکەن کە خەڵکی بە توانا بوون و وەك جەنەڕاڵ خزمەتی خۆیان کردبوو لە ڕابردوودا... ئەگەر سەرزەنشتی یەکێك بکرایە دەبوایە ئەوانە سەرزەنشت بکرانایە کە ئەرکی فریاکەوتنیان پێسپێردرابوو. ئەمانە وتیان "ئێمە قسەی ناڕاست ناکەین بۆ ئەوەی سەرزەنشت بکرێن، هەر لەبەرئەوەیە ئێستا تاوانبارمان دەکەن. ئێمە سورین لەسەر ئەوەی توند و تیژی زریانەکە ڕێگەی فریاکەوتنی لێگرتین". لەبەر ئەوە، سەرکردەکان و زۆری دیکە کە هاوبەشیان کردبوو لە هەڵمەتە دەریاییەکەدا شاهیدیان دابوو. بە چەند گفت و گۆیەك و چەند قسەیەك خەریك بوون کۆمەڵەکە ڕازی بکەن.

زۆر لە هاوولأتیان هەڵسابوون بۆ ئەوەی کەفالەتیان بکەن. هەر چۆنێك بێت، دوایی بریاریاندا بەدواخستنی کۆبوونەوەی کۆمەڵە بۆ ڕۆژێکی دیکە، چونکە نەختێ درەنگ بوو نەدەکرا دەنگەکان ئەژمار بکرێن و دەبوایە ئەنجوومەنیش پێشنیاز بکات سەبارەت بە جۆری دادگایی کردنی ئەو پیاوانە.

پاش ئەمە فێستیڤاڵی ئەپەرتوریە[5] هاتە پێشەوە. لە ناو ئەم فێستیڤالەدا باوك و خێزانەکانیان پێکەوە کۆدەبوونەوە. بەم شێوەیە تێرامێنێس و لایەنگەرانی توانیان ئامادەکاری بکەن بۆ ئەو پیاوانەی کە جلی ڕەشیان لەبەر کردبوو سەریان تاشرابوو زۆریان هاتبوونە فێستیڤاڵەکەوە بۆ ئەوەی ئامادەی کۆمەڵە بن. ئەمانە ئەڵێی خزم و کەس و کاری ئەوانە بوون کە لە ناو چوو بوون و کەللیکسێنۆسیشیان تێدابوو کە هێرشی دەبردە سەر جەنەڕاڵەکان لە ناو ئەنجوومەندا. پاشان کۆبوونەوەی کۆمەڵە دەستیپێکرد و ئەنجوومەنیش لەڕێگەی کەللیکسێنۆوە پێشنیازی خۆی پێشکەشکرد، بۆ ئەوەی بخرێتە دەنگدانەوە (*MOTION*) کە پێکهاتبوو لەم دێرانەی خوارەوە: "بریاردرا لەو کاتەوەی لە کۆبوونەوەی پێشووی کۆمەڵە گوێ لەوتارەکانی جەنەڕاڵەکان گیرا، ئەو جەنەڕلأنەی کە تاوانبار کراون، سەرجەم ئەسینایيەکان دەبێ دەست بکەن بە هەڵبژاردنی (لەڕێگەی پشکەوە) ئەوانەی کە لە ناو بەڕێوەبەرایەتی هەڵبژاردن دەژین و بۆ هەر کۆمەڵەی کە لە سنووری ناوچەی هەڵبژاردن دەژین (*CONSTITUENCY*) دەبێ دوو سندوقی هەبێ و بۆهەر یەك لەمانە بانگەوازکەرێك[6] (*HERALD*) بانگەواز دەکا، بۆ ئەوەی هەر کەسێك پێیوایە ئەم جەنەڕالأنە هەڵەیان کردوە لە ڕزگارکردنی ئەوانەی سەرکەوتنیان بەدی دەهێنا لە جەنگە دەرياییەکە، دەبێ دەنگی خۆی بخاتە ناو سندۆقی یەکەمەوە و ئەوەی بە پێچەوانەوە بیر دەکاتەوە دەبێ دەنگی خۆی بخاتە سندۆقی دووەم.

ئەگەر بریار درا ئەمان هەڵەیان کردووە، ئەوا دەبێ سزای مردن وەربگرن و بدرێنە دەست دەستەی یانزە[7] کەسەکە و دەست بگیرێ بەسەر سامانیاندا". پاشان، پیاوێك هاتە پێشەوە و وتی من لە نوقم بوون ڕزگارم بووە، لەڕێگەی خۆهەڵواسینەوە بە بەرمیلێکی ئارد و ئەوانەی نوقم بوون پێیان وت ئەگەر ڕزگاری بێت بە خەڵکی بڵێ جەنەڕاڵەکان نەیانتوانی ئەوانە ڕزگار بکەن کە نەبەزانە شەڕیانکرد لەپێناوی نیشتیماندا .

پاش ئەوە، فەرماندرا کە کەللیکسێنۆس ئامادە بێت لە بەردەم دادگا، چونکە پرۆپۆزەلێکی نارەوای دابوو. ئێوریپتێلێمۆس (*EURYPTOLEMOS*)ی کوری پێزیەناکس (*PEISIANAX*) و هەندێکی دیکەش بوون بە کەفیلی. هەندێك لەخەڵکی ڕەزامەندی خۆیان دەربڕی، بەڵام زۆربەی جەماوەر هاواریان کرد و وتیان شتێکی چەپەڵە ئەگەر خەڵکی نەتوانن ئەوە بکەن کە ئارەزوویان لەکردنی هەیە. لیکیسکۆس (*LYKISKOS*) بایەخی بەم بابەتەدا و پێشنیاری کرد هەتا ئەو فەرمانە بکێشرێتەوە، ئەوانەی خاوەنی ئەو فەرمانە بوون پێویستە دادگایی بکرێن بە هەمان شێوەی جەنەراڵەکان. هەروەها کاتێك جەماوەرەکە دەستی کردەوە بە هاواری ڕازی بوون، ئەوان ناچاربوون فەرمانەکە بکێشنەوە.

بەم شێوەیە هەندێ ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی ئاشکرایان کرد کە ڕەوا نییە پێشنیاز بۆ گفتوگۆ (*motion*) نەخەنە دەنگەوە. لەم کاتەدا کەللیکسێنۆس دیسانەوە هاتەوە سەر (سەکۆ) کە و هەمان سکاڵای خستە پێشچاو دژی ئەوان، وەك هەمان شێوەی ئەوەی کرابوو دژی ئێدریپتۆلێمۆس و خەڵکەکە هاواریان کرد لەبەر ئەوەی ئەگەر پێشنیازەکە بۆ دەنگدان بەرپەچ بدەنەوە، ئەوان دادگایی دەکرێن. ئەمە ئەندامانی کۆمیتەی ترساند و هەموو قبوڵیان کرد پێشنیازەکە بخەنە دەنگەوە، جگە لە سۆکرات کوڕی سۆفرۆنیسکۆس *(sophroniskos)*. سۆکرات وتی هیچ ناکات، چونکە ئەمە دژی یاسایە.

پاشان ئێوریپتۆلێمۆس هەڵسایە سەر پێ و بەم شێوەیەی خوارەوە داکۆکی لە جەنەراڵەکان کرد:

خەڵکی ئەسینا، من هاتمە سەر ئەم بەرزەکە، لەلایەکەوە لە پێناوی تاوانبارکردنی پێریکلێس کە هەر چەندە خزممە و دیۆمێدۆن کە هەر چەندە برادەرمە، لەلایەکی دیکەوە لە پێناوی داکۆکی کردن لێیان و لەلایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوەی پێشنیازی هەندێ ئیجرائات بکەم کە لەوانەیە لە بەرژەوەندی هەموو کۆمەڵگا بن... ئەو شتانەی من پێشنیازیان دەکەم وادەکەن هیچ هەڵەنەکەن، نەمن ونەیەکێکی دیکە. واتان لێدەکەن بە هۆشمەندیەوە بڕیاربدەن لەسەر سزادانی ئەوانەی، بەهەڵە ڕەفتاریان کردووەو بەئارەزووی خۆتان سزایان بدەن بەکۆمەڵ بێت یان تاك تاك. ئەوەی من پێشنیازی دەکەم بریتیە لەوەی پێویستە ڕێگەیان پێبدەن بەلایەنی کەمەوە بۆ یەك ڕۆژ کە داکۆکی لە خۆیان بکەن. بەم شێوەیە ئێوە چاوێك دەخشێننەوە بەسەر بڕیاری خۆتان و ئەوەی ئەوانی دیکەش... خەڵکی ئەسینا، تکایە دادگاییەکی ڕەوایان بکەن...، دادگاییەکی جیاواز بۆ هەر یەکەیان. ئەگەر ئەم شێوازە ڕێنمایی بکرێ، ئەوانەی هەڵەیان کردووە سزایەکی گەورە وەردەگرن و ئەوانەی تاوانیان نییە ئازاد دەکرێن. ئەمە بە بڕیاری ئێوە دەبێت ئەی خەڵکی ئەسینا. ئەو پیاوانەی هەڵەیان نەکردووە نابێ لە سێدارە بدرێن. بەم شێوەیە ئێوە دوای ڕێنماییەکانی ڕەحم و شەفەقە دەکەون و مەرجەکانی ئەو سوێندە دەپارێزن کە بۆ دادگایی کردنی شەرعی خواردووتانە... لە چی دەترسن و چی واتان لێدەکات بەپەلەیەکی بێسنوور ڕەفتار دەکەن ؟"

پاش ئەم باسە، ئێوریپۆلێمۆس پێشنیازی کرد دەبێت ئەو پیاوانە بە گوێرەی فەرمانی دادوەری *(kannonos)* دادگایی بکرێن و هەر یەکە بە جیا (نەك بە کۆمەڵ). پێشنیازی ئەنجوومەن بریتیبوو لەوەی هەموویان حوکم بدرێن لەڕێگەی تەنها یەك دەنگدانەوە. کاتێك گشت دەستیان هەڵبڕی بۆ بڕیار دان لەسەر دوو پێشنیاز، لە پێشدا دەنگیان دا بۆ پێشنیازی ئێوریپتۆلێمۆس، بەڵام کاتێك مێنێکلێس *(menekles)* سوێندی خوارد و

ناڕەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر ناڕەوایی ئەم کارە، دیسانەوە کەوتنە دەنگدان و پێشنیازی ئەنجوومەن پەسەندکرا. پاشان سەبارەت بەو هەشت جەنەڕاڵە دەنگیاندا کە بەشداریان لە جەنگەکەدا کردبوو. (لەئەنجامدا) دەنگدانەکە لە بەرژەوەندی ئەوان نەبوو، و ئەو شەشەی کە لەئەسینا بوون لە سێدارەدران.

کەمێك دوای ئەوە، ئەسینایییەکان پەشیمان بوونەوە و دەنگیان دا بۆ ئەوەی کە لە پێشدا دەبێ سکاڵاکان دژی ئەو کەسانە پێشکەش بکرێن کە میللەتیان هەڵخەڵەتاندووە و دەبێ کەللیکسێنۆسیش لە نێوان ئەوانەدا بێت. (بەم شێوەیە) سکاڵا پێشکەش کرا دژی چواری دیکەش کە خرانە ژێر چاودێریەوە (توقیف کران) لەلایەن کەفیلەکانیانەوە، بەڵام دوایی لە کاتی ئاژاوەیەکی مەدەنیدا، ئەمان ڕایانکرد پێش ئەوەی دادگایی بکرێن. (پاشان) کەللیکسێنۆس گەڕایەوە بۆ شار، بەڵام هەموو کەسێك ڕقی لێبووەوە و (دواتریش) لەبرسا مرد. *(Xenophhon, History of Greece 107, in Rodewald C., Democracy: Ideas and Realities, London, 1974, pp . 2-6)*

ئەم چیرۆکەی کسێنۆفۆن بەرپرسێتی فەرمانبەر و هاووڵاتیان دەردەخات، بەرامبەر کۆمەڵە و کۆنترۆڵی میللی ئەفسەرە سەرکردەکان و گفت و گۆیەکی فراوان و کراوە و بڕیاردان لەڕێگەی کۆبوونەوەی جەماوەر و هەندێ خەسلەتی دیکەی شار–دەوڵەتی ئەسینایی. هەروەها هەندێ لایەنی دیکەش ڕوون دەکاتەوە سەبارەت بەوەی چۆن بەشداریکردنێکی چڕ دەوەستایەوە سەر: پشت بەستن بە توانای هونەری ووتاربێژی (*Oratory*)، پێکدادان لە نێوان گرووپی سەرکردەی نەیار، پەیوەندی و پیلان گێڕان لە ناو چوارچێوەی تۆڕی ناڕەسمیدا، دەرکەوتنی تاقمی (*Faction*) دژ بەیەك بۆ هاندانی بڕیاری بەپەلە و یەکلاییکەرەوە دروست دەکران، دۆخی تایبەتی کە وای دەکرد کۆمەڵە دوچاوی وروژاندن و هەڵچوون بێتەوە، بناغەی لاوازی هەندێ بڕیاری میللی و ئەگەریی ناسەقامگیری سیاسی بارودۆخی کۆمەڵە، پەیوەندیدار بە نەبونی هەندێ سیستەمی پشکنین لەسەر ڕەفتاری سەرچل.

لەو کاتانەی دواییدا ژمارەیەك لە پشکنینی دەستووری دروستکران و خزێنرانە ناو ستروکتوری دیموکراسی ئەسینایی، لە پێناو پاراستنی ئەم دیموکراسیە دژی بڕیاری بەپەلە کەنەدەتوانرا بەرپەرچ بدرێنەوە . ئەم گۆڕانکاریانە هەوڵیاندا بەلانسێك بدۆزنەوە بۆ سەروەری میللی لەڕێگەی چوراچێوەیەکی دەستوری کە توانای هەبێت ڕێبازو یاساکان بپارێزێ، هەرچەندە دەتوانرێ گومان لەوە بکرێت کە ئایا ئەم گۆڕانکاریانە بەسبوون بۆ ئەم مەبەستە یان نا، واتە ئایا ڕێبازی دەستوری بە تەنها بەسە یە بەرامبەر نەیارەکان (*opponents*).

لەوە دەکات سیاسەتی ئەسینای نائاساییانە چڕو پێشبڕکێداربوو. پاشان ئەوانەی کەشوێنی بەرزیان داگیر کردبوو لەکۆمەڵەو ئەنجومەندا لە خێزانە خانەدانەکان بوون، واتە دەستەبژێرێکی دەوڵەمەندو ساماندار بوون کە کاتی تەواویان هەبوو پەیوەندی دروستبکەن و بەرژەوەندی خۆیان جێ بەجێبکەن. زۆر جار شەڕی سیاسی بەشێوەیەکی فراوان فۆرمێکی شەخسی وەردەگرت و زۆر جاریش ئەمە بە لابردنی ئۆپۆزسیۆنەکان کۆتایی ئەهات، لە ڕێگەیی دوورخستنەوە (*Ostracism*)[8] یان کوشتنەوە، چونکە سنوری دەسەلات ڕێکنەخرابوو لەلایەن سیستەمێکی حکومی یان دەستوری پتەو.

بێگومان ئاسانە زێدەڕەوی بکرێت لە گێرانەوەی بوونی ئەم شەڕ و پێکدادانانە، بۆ ئەوەی جەخت لەسەر ڕاستی گێڕانەوەکەی کسینۆفۆن بکرێتەوە، وەك ڕاڤەکردنی سیاسەتی ئەسینایی و

بۆ ئەوەی ئەوە لەبیر بچێتەوە کە بۆ ماوەیەکی بەرێژە دوورودرێژ ئەسینا سەقامگیریەکی سیاسی بە خۆیەوە بینی. لەگەڵ ئەوەشدا سەقامگیری سیاسی ئەسینا زیاتر لەچوارچێوەی مێژوویی ڕاڤەدەکرێت، وەك "دەوڵەتێکی داگیرکەری سەرکەوتوو"[9]، نەوەك لە ڕێگەی شێوەی کارکردنی ناوخۆیی سیستەمی سیاسی. شایستەی ئاماژە پێکردنە کە پێکدادانی سەربازیی سەرکەوتوو لە گەڵ پێشکەوتنی ئەسینادا دەڕۆیشت. ئەوەی ڕاستیبێت کەم ساڵ هەبوو تیایدا شەڕێکی سەربازیی یان جەنگێك ڕانەدەپەڕێنرا. بێگومان سەرکەوتنی سەربازی کەڵکی ماددیی هەبوو بۆ نزیکەی سەرجەم توێژەکانی هاوڵاتیگەری ئەسینایی، کەبیگومان بەشداریان دەکرد لەبنیادنانی بنەمایەکی هاوبەش لە نێوانیاندا. لەوە دەکات کاتێك سەرکەوتن بەردەوام دەبوو، ئەم بنەمایانەش بتەوتر دەبوون.

## ڕەخنە

مافە یەکسانەکانی هاوڵاتی لە بەشداریکردن لە کۆمەڵە، باسکردنی ئەم مافانە لەناو کۆمەڵەدا و وەرگرتنی بەرپرسێتی کاروباری گشتی، کاتێك ئەمانە ڕێگەیان خۆش نەدەکرد بۆ بنیادنانی دەسەڵاتی یەکسانی بۆ هاووڵاتیان، ئەمانە هەمووی بەسبوون تا بەسەرسوڕمان و ترسەوە لەلایەن ڕەخنەگرە هەرە بەناوبانگەکانی ئەسینا و لەنێوانیان ئیفلاتۆن پەیر بکرێن. لە "کۆماردا" ئیفلاتۆن دەستی تاوان رادەکێشێت بۆ دیموکراسی و ئەمەش پێویست دەکات چەند چرکەیەك باسبکرێت، چونکە چەند ڕەخنەیەك دێنێتەبەرچاو کە ئەمڕۆش باسدەکرێ و لەلایەن هەندێك خەڵکی دیموکراتی ڕەوا دەوترێ کە دیموکراسی تەنها واتای دەنگدان دەگەیەنێ و زیاتر لەدەنگدان بەشێوەیەکی دەوری (چەرخی) دەگەیەنێ.

بێگومان جەنگی پیلۆپۆننییز کە بە بەزینی ئەسینا کۆتایی هات، روناکی گرت لە گەنجیەتی ئەفلاتۆن. کاتێك ئەفلاتۆن وریا بووەوە لەو هەلأنەی پەیوەندیان هەبوو بە بەزینی شارەکەو نزم بوونەوەی ئاستی سەرکردایەتی و ئاستی ئەخلاقی و یاسایی کە کۆتایی هات بەدادگایی کردن و لەسێدارەدانی سۆکرات لە (399 پ.ن)، گەیشتە ئەوقەناعەتەی کە کۆنترۆڵی سیاسی پێویست بووبخرێتە ژێر دەستی کەمایەتییەوە.

ئەو دیدەکانی خۆی دژی چوار جۆر لەدەستوور هێنایە مەیدان: تیمارکی بریتیبوو لەسیستەمێکی حوکم کە لەسەر مۆدێلی ئەرستۆکراسیەتی سەربازیی سپارتە بنیادنرابوو، (ئۆلیگارکی)، واتا (حوکمی دەوڵەمەند)، دیموکراسی (واتاحوکمی گەل) وتیرانیەت (واتا حوکمی تەنها دیکتاتۆرێك).

کاتێك باس لە دیموکراسی دەکات، ئیفلاتۆن بەشێوەیەکی سەرەکی ئەزموونی خۆی لەئەسینا نەخشەسازی دەکات. ئیفلاتۆن ڕەخنەی هەبوو لە سەرجەم لایەنەکانی هەر چوار دەستورەکان و هەروەها بە توندی هێرشی دەبردە سەر دیموکراسی وەك شێوەیەك لەکۆمەڵ کە مامەڵەی خەڵکی بە شێوەیەکی یەکسان دەکات پێناسەی دەکرد، بەڵام خەڵکی یەکسان نین لەنێوان خۆیاندا و ئەوە دەستەبەر دەکات کە "هەموو تاکێك ئازادە ئەوە بکات کەدەیەوێ *Plato,The Republic, pp. 315-316.*

ئەم ئاماژە پێکردنە "یەکسانی سیاسی" و "ئازادی" بەلای ئیفلاتۆنەوە، خەسلەتی تایبەتی و بنچینەیی تایبەتمەندی دیموکراسی پێکدێنێ.

دیموکراسی لە چەند خاڵێ وە بەساو شکستی هێناوە. ئەمانە لە ناو دوو گوزارشتی مەجازی لەناو(کۆماردا) دا دەتوانرێن بەدیبکرێن: ئەوەی کاپتنی کەشتیەك و ئەوەی "ئاژەڵێکی گەورەو

بەهێز. شایستەی ئەوەیە بە کاپتنی کەشتیەکە دەست پێبکەین:

گریمانە بکە کە بارودۆخی شتەکان یان کەشتیەکان بەم شێوەوەی خوارەوە بێت. کاپتنەکە یان خاوەنی کەشتیەکە گەورەترو بە هێزترە لە باقی دەستەی مەلەوانەکان لە کەشتیەکەدا، بەڵام نەختێ گوێ گران و کورت بین و سنوردارە لەلێخورینی کەشتیەکە. تاقمی مەلەوانەکان هەموویان شەڕ لەگەڵ یەکتری دەکەن سەبارەت بەچۆنیەتی رابەریکردنی کەشتیەکە. هەریەکە بیردەکاتەوە دەسکی سەوڵی کەشتیەکەی بەدەست خۆیەوە بێت. ئەمانە هیچیان فێری هونەری رابەریکردنی کردنی کەشتی نەبوون و ناتوانیین بڵێین: کەتا ئێستا یەکێك فێری کردبێتن یان هەندێ کاتیان بردبێتە سەر بۆ دراسەکردنی. لەڕاستیدا دەڵیین: کەئەمە ناتوانرێ فێربکرێ و ئامادەن ئەو کەسە لەناو بەرن کە بەپێچەوانەی ئەمە شت دەڵێ: ئەمانە هەموو کاتیان بۆ جولآنەوە بەدەوری کاپتنەکەداو تەرخاندەکەن و هەوڵ وتەقەلا دەدەن سەوڵی کەشتیەکەی لێبسێنن. ئەگەر دەستەیەك سەرکەتوو تر بێت لەوەی دیکە، ئەوا رکەبەرەکانیان دەیان کوژن و فرێیان دەدەنە ناو دەریاکەوەو کاپتنە پیاو چاکەکە لەرێگەی دەرمانی سڕکەر یان مەی یان هەر چ رێگەیەکی دیکەوە بێت، فرێی ئەدەنە سەر زەوی و خۆیان کۆنترۆڵی کەشتیەکە دەکەن‌و و هەرچی لەناو کەشتیەکەدا هەیە وەریدەگرن بۆ خۆیان، هاوکات گەشتە دەرياييەکە دەگۆرن بۆ ئەوەی کەهێمای دەکەیت وەك گەشتێکی لەزەت و سەرخۆشی. لەکۆتایدا، ئیعجابی خۆیان بۆ ئەو پیاوە دەردەبرن کەدەزانێ لەریگەی بەکارهێنانی هێزەوە بێت یاخود لەرێگەی فێڵەوە چۆن دەستی یارمەتی ڕادەکێشێ، لەپێناوی کۆنترۆڵکردنی کاپتنەکە و ستایشیکردنی توانای رابەریکردنی کەشتیەکە و شێوەی لێخوڕینی و زانیاری سەبارەت بەدەریا دەکەن و هەموو کەسێکی دێکە تاوانباردەکەن بەوەی بێ کەڵکە. ئەوان بیر لەوە ناکەنەوە کەرابەری راستەقینە ئەگەر بیەوێ بەراستی کۆنترۆڵی کەشتی بکات، دەبێت دیراسەی چوار وەرزی ساڵ و دۆخی ئاسمان و ئەستێرەکان و باو سەرجەم ئەم بابەتانە بکات کەپەیوەندیان بەپیشەکەیەوە هەیە. ئەوان وابیردەکەنەوە کە تارادەیەك مەحالە یەکێك ئەو شارەزاییە پیشەییە پەیدا بکات کەپێویستە بۆ کۆنترۆڵی کەشتی و شتێك نیە پێی بوترێت هونەری دەریایی (دەریاگەری). کاتێك هەمویان دەچنە ناو کەشتیەکە، ئایا دەریاوانەکان نین کە لە ناو کەشتی وادا پابەندن بەوەی کە تەماشای دەریاوانە راستەقینەکە بکەن، وەك شتێکی بێ کەڵك بۆ ئەوان؟".

"کەشتی لێخوری راستەقینە" ئاماژە دەکات بەکەمینە کەکارامەیی و شارەزاییەکی پێویستی هەیە و داخوازی گەورەی ئەوەیە بەشێوەیەکی رەوا حوکم بکات، چونکە خەڵکی (واتە دەستەی مەلەوانەکان) لەسەر بنچینەی ئارەزووی لەپڕو سۆزو حوکمی پێشینە کاروباری خۆیان دەبەن بەرێوە. نە ئەزمونیان هەیەو نە زانیاری سەبارەت بە هونەری دەریا گەری، واتە سەبارەت بە حوکمی سیاسی. جگە لەمەش، ئەوان تەنها ئیعجابیان هەیە بۆ ئەو سەرۆکانەی کەخۆلەپێشبەرن: "ئەو سیاسەتمەدارانە... بەشێوەیەکی پێویست رێزیان لێدەگیرێت... کەخۆیان بەبرادەری خەڵکی پیشان دەدەن". هەموو ئەوانەی تێکەڵی جەماوەر (خەڵکی) دەبن و دەیانەوێ میللی بن لەنێوانیاندا، دەتوانرێن بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەراورد بکرێن... بە دەریاوانەکان". سەرۆکایەتیەکی تەواو بوونی نیە لەرژێمێکی دیموکراسیدا و سەرۆکەکان پشت دەبەستن بەلایەنگری میللی و لەو گۆشەیەوە رەفتار دەکەن،

لەپێناو پەیداکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی و ناوبانگی (شەعبیەت).

ملکەچبوون بۆ داخوازی میللی و پشت بەستن بەستراتیجیەتی سیاسی کەدەڵێ چەند دەتوانرێ "بفرۆشرێ"، لاواز دەبێت. (لە رژێمی دیموکراسیدا) خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی دوورە پەرێز دەوەستنەوە لەحوکمی بەئاگا و بریاری سەخت و هەڵبژاردنی ناڕەحەت و ئەو راستیانەی کەدەبنە هۆی دەمەبۆڵە. دیموکراسی ژێر و هۆشمەند پەراوێزە دەکات.

زیاتر لەوەش، داخوازی ئازادی و یەکسانی سیاسی پچراون لەهێشتنەوەی دەسەڵات و پەیرەو و سەقامگیری. کاتێك تاکەکان ئازاد دەبن لەوەی ئەوە بکەن کەئارەزویان لێ هەیە و داوای مافی یەکسانی دەکەن بەئیعتبار بۆ توانا و بەشداریکردن، لەماوەیەکی کورتدا کۆمەڵێکی جیاواز و سەرنج راکێشەر دێتەکایەوە. هەر چۆنێك بێت، لەماوەیەکی درێژدا ئەمە ئەنجامەکەی بریتی دەبێ لەنقوم بوون لەناو ئارەزوو و بەرەڵایی، کەرێز ناگرێ بۆ دەسەڵاتی سیاسی و ئەخلاقی دادەتاشێ. ئیتر گەنجان ناترسن و رێز ناگرن لەمامۆستای خۆیان و بەبەردەوامی بەرەنگاری ئەوانە دەوەستنەوە کە لەخۆیان گەورەترن و ئەمانەش "لاسایی گەنج دەکەنەوە" (*The Republic.p.383*).

لەماوەیەکی کورتدا، "هۆشی هاوڵاتیان ئەوەندە هەستیار دەبێت کەبچوکترین ئاستی بەربەست هەستپێدەکرێ وەك شتێکی ناهەموار (*Intolerable*) هەتا ئەوەی کە بۆ دوایەمینجار... کاتێك کەسوور دەبن لەسەر ئەوەی مامۆستایان نەبێت (گەورەیان نەبێ) هیچ رێزێك بۆ یاسا دانانێن..." (*P.380*).

"فیزو زمان تاڵی" وەك "چاك رفتاری" تەماشادەکرێت، "دەرچوون لەدابونەریت وەك ئازادی وزێدەڕەویکردن وەك بەخشندەیی و بێ شەرمی وەك ئازایەتی تەماشا دەکرێن" (*P.380*). "یەکسانی لەخۆشیدا" (المتعه) بەشێوەیەکی ناڕاست، زەمینە بۆ پیاوی دیموکرات خۆشدەکات و وا دەکات رۆژ دوای رۆژ بژی، بە بێ بایەخدان بەئایندەیی خۆی. بەو پێیە، یەکگرتنی کۆمەڵایەتی لاواز دەبێت و ژیانی سیاسی رۆژ دوایی رۆژ بەش بەش دەبێت و سیاسەت پڕ دەبێت لەناکۆکی نێوان باندەکان. بەدڵنیاییی ململانێی بەهێز نێوان بەرژەوەندیە تایبەتیەکان (شەخسیەکان) سەرهەڵدەدات، چونکە هەر تاقمە لەبری ئەوەی کار بکات بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت، هەوڵ ئەدات دوایی بەرژەوندی خۆی بکەوێت. بەرپرسیەتیەکی گشتی لەپێناوی کۆمەڵگەو دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەبێت بەشتێکی مەحاڵ.

کاروباری گشتی بەشێوەیەکی نەگۆڕ رێگە خۆش دەکات بۆ فێڵ و پیلان دانان دژی یەکتری و ناسەقامگیری سیاسی: سیاسەت دەبێ بەئارەزو و بەرزخوازیەکی بێهاوتا. هەموو داخوازیەك بۆ نوێنەرایەتی کردنی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگا، لە راستیدا گوزارشت دەکات لە نوێنەرایەتی کردن بۆ خۆ و لە ئارەزوویەکی خۆپەرستانە بۆ دەسەڵات.

ئیفلاتۆن بیری دەکردەوە ئەوانەی دەوڵەمەندن یان ئەوانەی لە دۆخی دەسەڵاتدان، بەدڵنیایی هێرشیان دەبرێتە سەر وپێکدادان لەنێوان هەژارو دەوڵەمەند زۆر توندوتیژ دەبێت. ئەوە دووپاتی دەکاتەوە کە لەم بارودۆخەدا رێی تێدەچێت دیموکراسی هەرەس بێنێت. "لەوانەیە هەموو ئەو زێدڕەویەك پەرچەکردارێکی (رد فعل) توندو تیژ بەرهەم بێنێت... بەم شێوەیە لەوانەیە یەکێك لە ئازدایەکی ئەوپەڕەوە بڕوا بەرەو ملکەچیەکی ئەوپەڕ" (*P.385*). لە کاتی شەڕ لەنێوان باندەکاندا، سەرکردەکان وەك پێشەوا داکۆکی دەکەن لەمەسەلەی خۆیان وبەرێژە ئاسانە بۆ ئەم سەرکردە میللیانە داوای (حمایەی شەخسی) بکەن، لەپێناو

پارستنیان دژی هێرش بردنەسەریان. لەم شێوە دۆخەدا، پاڵەوانە میللیەکان زۆر نزیکن لەوەی کە "جڵەوی دەسەڵات" بگرنە دەست. کاتێك دیموکراسی نوقوم دەبێت لە ناو ئاژاوەو ناکۆکیدا، پاڵەوانە میللیەکان وەك خەڵکێك دەبینرێن کە بەروونی شتەکان دەبینن و بەرێوەیان دەبەن و پەیمان ئەدەن هەموو بەرەنگاریەك کپ بکەنەوە. پشگیری کردن لەستەمکارێك دەبێت بە رێگا چارەیەکی سەیر. بەڵام بێگومان کاتێك جڵەوی دەسەڵات دەگرنە دەست، ئەم ستەمکارانە عادەتیان وایە کە دەسەڵات تەنها بۆخۆیان بهێڵنەوە.

بەلای ئیفلاتۆنەوە، ستەمکاری بۆ خۆی چارەسەرێکی مسۆگەر نەبوو بۆ کێشەکانی دیموکراسی. ستەمکاران بەدەگمەن "دەریاوانی راستەقینە پێکدێنن". لەدووەم گوزارشتی بەناوبانگ کەباس لە "ئاژەڵێکی گەورەو بەهێز دەکات" (واتا جەماوەری میللی)، ئیفلاتۆن ئەوە روونده‌کاتەوە هێندە بەس نییە دەسەڵاتدار بزانێ چۆن کونترۆڵی ئاژەڵەکە بکات لەرێگەی دیراسەتکردنی هەوەس و ویست و نەریتەوە. ئەگەر بایەخ بدرێ بە ئاژەڵەکە و مەشقی پێبکرێ، گرنگە بزانرێ کام زەوق و ئارەزووی "جێی ئیعجاب یان شەرمن و کامیان باش یان خراپن و کامیان راستن یان هەڵەن" (*P.288*). بەکورتی، بۆچونی ئیفلاتۆن بریتییە لەوەی کێشەکانی جیهان ناتوانرێن چارەسەر بکرێن تا فەیلەسوفەکان حوکم نەکەن، چونکە تەنها ئەوان تونای هارمۆنیزەکردنی ماکەکانی ژیانیان هەیە لەژێر حوکمی ژیریدا (الحکمە) ".

بەگێرانەوەی قسەکانی سۆکرات،ئیفلاتۆن باوەڕی وابوو کەفەزیلەت بریتییە لە "مەعریفە" و"ژیانی باشیش" بۆ هەریەك لە تاکەکان و کۆمەڵگاکان، بریتییە لەدیاردەیەکی بابەتی واتا بوونی هەیە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەوەی کەزووبەزوویی دێتە پێش چاو و لەرێگەی لێکۆڵینەوەی سیستماتیك دەتوانیین لێی تێبگەین. زانینی فەیلەسوف پاساوی ئەوە دەکات کە فەیلەسوف گونجاو بێت بەموومارەسەی دەسەڵات. توانای فەیلەسوف لەودایە کە شتەکان رێکبخات، بەو شێوە گونجاوەی کەوادەکات پرینسیپی حکومەت ببێ بەپرینسیپی دیسپۆتیزمی رۆشنگەر *Enlightened Despotism*.

درێژەی بۆچونی ئیفلاتۆن زیاتر لەمە لێرەدا جێگەی بایەخی ئێمە نییە. ئەوەندە بەسە بزانرێ کە هۆکاری بۆچونی ئەو لە –کۆماردا– پەیوەستە بەئارەزوی وەڵامدانەوە بۆ پرسیارێك: "دادپەروەری چییە"؟ ئەگەر لەچەمکی دابەشکردنی سروشتی کارەوە دەست پێبکەین کە لەناویدا چینی تاکەکان دەتوانن رۆڵی خۆیان ببینن (وەك فەرمانڕەوا و سەرباز و رەنجبەر)، ئەرکی فەیلەسوف دەبێ بەیەکێك لەو شتانەی کەلێکۆڵینەوەی لەسەردەکرێ سەبارەت بەم دابەشکردنە، لەپێناو (1) هاندانی فەزیلە تایبەتیەکانی هەریەك لەم کارانە (ژیری، ئازایەتی و خۆڕاگرتن). (2) دڵنیابوونەوە لەوەی تاکەکان کاری خۆیان بەتەواوی دەکەن. تاك و دەوڵەتەکان تەماشا دەکرێن وەك چەند هەموکێکی ئۆرگانیك، (واتا چەند گیانێکی بەیەکەوە بەسراو) و کاتێك هەموك (واتا کۆمەڵ) باش کار دەکات، سەرجەم تاکەکان کاری خۆیان بەجێ دێنن و پێداویسیتیەکانی خۆیان رازی دەکەن و خۆیان تەواوکەری خۆیان دەبن. بەم شێوەیەش لەناو دەوڵەتێکی بەهێز نیشتەجێ دەبن و لێهاتو و پڕ لەئارامی دەژین. بڕوانە لەژێر ئەم بارودۆخەدا، دادپەروەری دەتوانێ بێتە کایەوە و ژیانێکی ئاسودە بەدیبێت. لەڕوانگەی ئیفلاتۆنەوە، بەشێوەیەکی گشتیتریش لەوەی بیری یۆنانی کۆن، شایەنی وەبیرخستنەوەیە کە ئەو ئازادیەی دەوڵەت دەیەوێ زامنی بکات ئەوەندە پەیوەست نیە

بەئازادی تاك خۆیەوە، بەڵكو بەتوانای جێبەجێكرنی رۆڵی تاك لە ناو گەردوندا. هەروەك نووسەرێك بەشێوەیەكی گونجاو ئاماژەی پێدەكات، ئەم تیۆریە بەشێوەیەكی ئاشكرا و دیار جیاوازە لەوەی كەیەكێك وێنای پەیوەندیە كومەلأیەتیەكان بكات لەچوارچێوەی پەیمانێك یان رێكەوتننامەیەك – لەنێوان خەڵكی وەك تاك، دواییش دەوڵەت وێنابكات بە قەوارەیەك كەبەپلەی یەكەم بەرپرس بێت لەزامن كردنی ئازادی هەڵبژاردن . ئەم هزرە كە لەناو نەریتی لیبراڵی سەدەی حەڤدەهەمدا بلأوە، شتێك بوو كەبۆ ئیفلأتۆن قابیلی نەفرەت (لعنە) بوو.

نووسینی ئیفلأتۆن بەشێوەیەكی توند داكۆكی لەبیرۆكەی یەكیەتیەكی تەبا دەكات لەنێوان "گشتی" و "تایبەتی"، (واتا لەنێوان ئەو بوارانەی كەپەیوەندیان هەیە بەدەوڵەتەوە و ئەوانەی بە تاكەكان – تێبینی وەرگێر). دەوڵەت بارودۆخ زامن دەكات، بۆ ئەوەی هاوولأتی پیشەی خۆی مومارەسە بكات .

ئەو بۆچوونەی كەئیفلأتۆن لە – كۆمار–دا دەیخاتەڕوو، تا ڕادەیەك، لەناو نووسینەكانی دیكەی بەتایبەتی وەك "سیاسەتمەدار" و "یاساكان" كەدوای "كۆمار" نووسراون، وەك خۆی نامێنێتەوە. ئەم كتێبانە زانیاری ئەدەن سەبارەت بەوەی لە دەوڵەتێكی واقیعیدا كەبەرامبەری دەوڵەتی ئیدیالی (میسالی) دەوەستێتەوە، حوكمكردن ناتوانێ بەردەوامی خۆی هەبێت بەبێ بوونی هەماهەنگی و بەشداری كردنی میللی. هەروەها جەخت خراوەتە سەر گرنگی حوكمی یاسا وەك شێوازێك بۆ دەورەدانی رەوایی دۆخەكانی دەسەلأتی "گشتی"، (واتە پادشا فەیلەسوفەكان). بەشێوەیەكی واتەبەخشینەوە، تیۆری "دەوڵەتی تێكەڵ " كە ئیلیمێنتەكانی پادشایەتی و دیموكراسی تێكەڵ دەكات، ئەو بۆچوونانە پێشبینی دەكات كەدوایی لەلایەن ئەریستۆوە و هەروەها لەلایەن مۆنتسكیۆشەوە بە واتا گشتیەكەی پەرەی پێسەنراو فراوانكرا. بیرۆكەی "دەوڵەتی تێكەڵ" كەپرینسیپە جیاجیاكانی رێكخستن روون دەكاتەوە، لەپێناو دانانی یەك بەرامبەر ئەوی دیكەو بەدیهێنانی بالانسێك لەنێوان هێزە سیاسیەكان، بێگومان واتایەكی خۆی هەیە لەمێژووی تیۆری و پراكتیكی سیاسیدا. لەوانەیە ئەمە یەكەم نوسەر بووبێ ئەم بیرۆكەیەی رێكخستبێ، هەرچەندە دڵنیانین لەوە. تیۆری "دەوڵەتی تێكەڵ" یان جیاكردنەوەی دەسەلأتەكان، دواتر روونەدەكرێتەوە كاتێك بیری مەكیەڤێللی و لۆك و مۆنتسكیۆش دەگرێتەوە. بۆ پێشكەشكردنی ئێلێمێنتی دیموكراسی بۆ ناو ئەو دیدەی كەحەزیدەكرد بەرجەستە بێت لەناو سیستمێكی حوكمكردن، شتێكی ئەو تۆ نەبوو بۆ مۆدێلێكی دیموكراتی نوێ.

ئەو مۆدێلە كلاسیكیەی كە لەمۆدێلی ژمارە (1) بەشێوەیەكی كورتكراو داڕێژراوە و ئەو رەخنەیەی كەئاراستەی كراوە، هەردوكیان كاریگەریەكی بەردەوامیان هەبووە بۆ سەر بیری سیاسی نوێی خۆرئاوا، یەكەمیان وەك سەرچاوەیەكی ئیلهام بۆ زۆر لەبیر مەندی دیموكراتیك و ئەمەی دوایش وەك ئاگاداركردنەوەیەك بۆ مەترسیەكانی سیاسەتی دیموكراتیك. هەرچۆنێك بێت، نەمۆدێلەكەو نەرەخنە لەسەری، كاریگەریەكی تیۆری وپراكتیكی هەبووە كەبتوانێ بڕواتە ئەودیوی شار– دەوڵەتە كۆنەكان. هەتا رۆسۆ (1712–1778)و دواتریش تەنانەت ماركس و (1818–1883) و ئێنگلسیش (1820–1895)، ئەم مۆدێلە بەشێوەیەكی چڕ روونكرابوەوەو شینەكرابوەو هەروەها داكۆكی لێنەكرابوو، هەرچەندە راستەوخۆ لەلایەن بیری سیاسی ئەوروپییەوە لەگەڵ رێنسانس و شار–

کۆماره گەشەبووەکانی ئیتالیاوە سەریهەڵدایەوە. رەخنەی ئیفلاتۆن لەگەڵ سەرنجە رەخنەییەکانی بیرمەندە سیاسیەکانی یۆنان، کاریگەریەکی قوڵ و تایبەتیان پەیداکرد لەسەردەمی (بەریژە) نویدا. هەروەك نوسەریك بە شیوەیەکی گونجاو ئاماژەی پیدەکات، نوسینەکانی ئیفلاتۆن سەبارەت بەسنورداریتی ئەخلاقی دیموکراسی "نە لەهیزو نە لەگرنگیان هەرگیز بۆڕ نەدراون".

چۆن بەشیوەیەکی جدی پیویستە رەخنەو باسی مۆدیلەکانی دیکەی دیموکراسی بکەین، ئەمە شتیکە کەدەبیّ دوایی شیبکەینەوە. گومانی تیدا نیە، بۆچوونی هاوجوت لەگەڵ دیدی ئیفلاتۆندا لەسەر ئاستی میژوویی گرنگیەکی تایبەتی هەبووە. هەروەك رەخنە گریکی تیوری دیموکراتیك بەشیوەیەکی راست جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە " بیرمەندە سیاسیەکان بە تەوژمیکی زۆرەوە سوربوون لە سەر چەوتی دەستورە دیموکراتیەکان و ناڕیکووپیکی سیاسەتی دیموکراتیك و چەپەڵی کارەکتەری دیموکراسی". هەتا سەرەتای سەدەی هەژدەهەم هیچ کەسیك لەوانەی کە بەفراوانی تیڕوانینەکانیان تۆمار کراون، بیری لەوە نەکردۆتەوە کەدیموکراسی ریگەیەکی خوازراوی سیاسی ریکوپیکە.

دەتوانین هۆکارەکانی لەناوچونی دیموکراسی کۆن، لەدۆخی هاتنە کایەی ئیمپراتۆرەکان و دەوڵەتە بەهیزە سەربازیەکاندا، بگەریننەوە بۆ فاکتەرە ناوخۆییەکان و ریژەی سامانی ئەوبەر دەریاکان. دەوڵەتی ئەسینایی پشتی بەسیستمیکی بەرهەمهینان دەبەست کە بەشیوەیەکی فراوان پشتی بە (بازوی) کۆیلەکان بەستبوو، کۆیلەکان کە بەسەرو هەموو شتیکەوە کاریان دەکرد لە کانگاکانی زیوی لۆرییۆن (*Laureion*) کەمەسرەفی دانەویڵەی هینراوی بەشیوەیەکی باش دائەپۆشی. ستروکتوری ئابووری لەباربو بۆ شڵەژان و ناکۆکی ناوخۆیی و دەرەکی، لەوە دەکات کە لەبنەڕتدا سروشتی دیموکراتیکی دەوڵەت ئەم لەباربونەی زیاد دەکرد. لەبەر ئەم هۆیە، نەبوونی ناوەندیکی دیموکراتیك گرفتەکانی بەڕیوەبردنی ئابووری سەخت تر کردبوو، هەروەها سیستمی ناوچەیی وپیشەیی کڕین و فرۆشتنی فراوان کردبوو. بەرامبەر کیشەی ریکخستن و تەنسیق و کۆنترۆڵ ودارایی دەوڵەت لەلایەکەوەو، پەلاماردانی دەوڵەتە موونافسەکان لەلایەکی ترەوە، ئەسینای دیموکراتیك کە بە شیوەیەکی بەردەوام هیرشی دەبرایە سەر (ووردە ووردە) لاواز دەبوو.

شار- دەوڵەتی ئەسنایی هەندیك خەسڵەتی هاوبەشی هەبوو لەگەڵ کۆماری رۆما. هەردوکیان بەزۆری بریتیبوون لەکۆمەڵی ڕووبەڕوبونەوە و کولتوری زارەکی، لەگەڵ چەند ماکیکی هاوبەشی میللی لەبەریوەبردنی کاروباری حوکەمەت و ئەوەندە پیکنەهاتبوون یاخود بەهیچ شیوەیەك پیکنەهاتبون لە (سیستمی) کۆنترۆڵی بیرۆکراتی مەرکەزی. هەردووکیان بەدوای ئەوەدا دەگەڕان پشگیری هەستی (قوڵ) بۆ ئەرکی گشتی و نەریتی فەزیلەی مەدەنی یان بەرپرسیتی بەرامبەر "کۆمار" بکەن، لەبوارە جیاجیاکانی مەملەکەتی گشتی. لەناو هەردوو کۆمەڵی ریکخراو لەناو دەوڵەتدا (*Polities*) دەوڵەت پیشینەیی هەبوو بەسەر داخوازیەکانی هاووڵاتییان. هەر چۆنیك بیت، هەندیك رۆشنبیری هاوچەرخ بەشیوەیەکی گشتی هیڵ بەژیر ئەوەدا دینن کە ئەگەر ئەسینا بریتیبوبیّ لەکۆماریکی دیموکراتیك، رۆما بەشیوەیەکی بنەڕەتی پیکهاتبوو لە سیستمیکی ئۆلیگارکی. سەرەڕای دەرکەوتنی هەندیك تیڕوانینی یۆنانی سەبارەت بەدەوڵەت لەناو بیری هەندیك بیرمەندی رۆمانی (بەتایبەت لەوەی سیسرۆن 106-43پ.ز)، هاوکات سەرەڕای هاتنە کایەی هەندیّ جوتیار کەلەشار لەدایك بووبون و بوونی کۆیلەی ئازادکراو

و لەناو کۆمەڵگەی سیاسیدا، بەڵام دەستەبژێرەکان خۆیان سەپاندبوو بەسەر سەرجەم لایەنەکانی سیاسەتی رۆما. مێژووی سەربازیی رۆما- سەرکەوتنی بێهاوتا لەفراوانبوونی ناوچەیی و داگیرکردنەکانی - یارمەتیمان ئەدات تێبگەین چۆن وبۆچی رۆما پشگیری دەکرد، لەبەرپرسێتی روکەش بۆ هاوبەشی کردنی میللی لەلایەکەوە وکۆنترۆڵی میللی سنورداری هەبوو لە واقیعدا لەلایەکی دیکەوە. بەم پێیە لەجیهانی کۆندا، زۆر گرنگە کە لەمیراتی ترادیسیۆنی یۆنانی کلاسیکەوە و لەمۆدێلی دیموکراسی ئەسینایییەوە بەتایبەتی، کۆتایی بهێنرێ بەهزرو پراکتیکی مێژووی دیموکراسی.

**بەکورتی: مۆدێلی ژمارە (1)**

**دیموکراسی کلاسیکی**

- پرینسیپەکانی پاساوکردن: هاووڵاتیان دەبێ یەکسانی سیاسیان هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانن ئازادبن لەحوکمکردن وحوکمکردنیان.
- خەسڵەتە گرنگەکان: هاوبەشیکردنی راستەوخۆی هاووڵاتیان لەوەزیفەی یاسادانان و دادوەریدا.
- کۆمەڵەی هاووڵاتیان دەسەڵاتی سەروەری هەیە.
- بواری دەسەڵاتی سەروەر بۆ سەرجەم کاروباری هاوبەش لە شاردا.
- میتۆدی شێوازی جیاجیا بۆ (انتقاء) کردنی کاندیدەکان بۆ کاروباری دەوڵەت (هەڵبژارنی راستەوخۆ، پشك، تناوب).
- ئەو جیاکاریە (امتیازات) نیە کە هاووڵاتی ئاسایی جیادەکرەوە لەفەرمانبەری گشتی.
- جگە لەهەندێك دۆخی تایبەت کەپەیوەستن بەجەنگەوە، هەمان شوێنی بەرپرسێتی دووجار وەرناگیرێ لەلایەن هەمان کەسەوە.
- بۆ هەموو کەسێك، ماوەی کەم بۆ بەرپرسێتی.
- مووچە بۆ هەموو کەسێك کەبەرپرسێتی خزمەتی گشتی وەرگرتووە.
- مەرجە گشتیەکان:
- شار- دەوڵەت بچوکە.
- ئابووری کۆیلایەتی کەکاتی "ئازاد" بۆ هاووڵاتیان بەرهەم دێنێ.
- خزمەتی ماڵی (ماڵداری)، واتا کار بۆ ئافرەت و کاتی زیادە بۆپیاوان لەپێناو هەستان بەئەرکە گشتیەکان (ئەرکی دەوڵەت).
- تەرخانکردنی هاووڵاتیگەری تەنها بۆ ژمارەیەکی کەم لە (هاووڵاتیان).

## پەراوێزەکان

1-بەرامبەر ووشەی یۆنانی "پۆلیس"، زاراوەی شار- دەوڵەت یان جار جار شار-کۆمار بە کار دێنم. ئەو مەسەلانەی کە هەڵوێستی رۆشنبیران بە هێز دەکەن لە بەکارهێنانی "شار- کۆماردا" (واتا ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندیدارن بەوەی کە چ کاتێك بیرۆکەی "دەوڵەت" بۆ یەکەم جار دارێژراوە) لە بەشەکانی ئایندەدا رون دەکرێنەوە.

2-لە سەدەی پێنجەمدا ئەسینا بۆ ماوەیەکی درێژ گەورەترین شار- دەوڵەتی پێکدەهێنا: ژمارەی دانیشتوانی بە لە نێوان 30،000 بۆ 45،000 مەزەندە دەکرێ.

3-بە دەگمەن هاووڵاتیەتی دەبەخشرا بە خەڵکی دیکەو ئەمەش بە رەزامەندی کۆمەڵە دەبوو کە بریتی بوو لە گرنگترین ئۆرگانی بڕیاردەر.

4-تێڕوانینی پێریکلێس بۆ پرینسیپی دیموکراتیك سەبارەت بە یەکسانی ئاماژە دەکات بۆ داهێنانێکی راستەوخۆی شایەدارێتی. گێڕاتەوەی ئریستۆ، بە پێچەوانەوە جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کە بیرۆکەی دیموکراتیك سەبارەت بە یەکسانی بریتیە لە یەکسانی هەل و مەرج. لێدوانی ئەریستۆ سەبارەت بەم دوو جۆرە

لە یەکسانی، لە "سیاسەتدا" یەکێکە لە کۆنترین باسی ئەم جیاکاریە گرنگە. (بڕوانە: *Aristotle, The Politics, pp. 195-198*).

5–ئەپەتوریا فێستیڤاڵێکی کۆنی یۆنانیەکانە کە ساڵانە لە شارەکانی یۆنان دەکرا. لە ئەسینا لە مانگی ئۆکتۆبەرو نۆڤەمبەری هەموو ساڵێك دەکراو سێ ڕۆژی دەخایاند و بەو بۆنەیەوە سەرجەم هۆزەکان کۆدەبونەوە، بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کاروباری خۆیان. ووشەی "ئەپەتوریا" لەوانەیە واتای "پەیوەندی هاوبەش" بگەیێنێ. لە فێستیڤاڵی ئەپەتوریا گرنگترین ڕۆژ ئەوەی سێهەم بوو. لەم ڕۆژەدا، ئەو منداڵانەی کە دوایین ڕۆژی فێستیڤاڵەکە لەدایکدەبون، لە لایەن باوکیان یان ڕاسپاردەی باوکیان پێشکەش دەکران و پاش سوێند خواردن سەبارەت بە شەرعیەتیان، ناویان لە سەر لیستێکی تایبەت تۆمار دەکرا (تێبینی وەرگێڕ).

6–لە مێژوی یۆنانی کۆندا بەرەنگەوازکەر ئەو تاکە بو کە لە ناو خەڵکدا دەگەڕا و ئیعلانی ئەنجامی هەڵبژاردنی دەکرد و شێوازی دەنگدتنی ڕێکدەخست (تێبینی وەرگێڕ).

7–وەرگێڕی ئەم بڕگەیە دەستەی یانزە پێناسە دەکات وەك دەستەی فەرمانبەران کە لە ڕێگەی پشکەوە هەڵدەبژێردران و لە نێوان چەند کارێکی دیکەدا، کاری لە سێدارە دان و بەند کردنیان ئەنجام دەدا (*Rodewald*، *Ibid.*، *1974*، *p. 128* ).

8–لە یۆنانی کۆندا، زۆر جار ئەو کەسەی سەرپێچی دەکرد یان موعاریزێکی بێزارکەر بوو، لە ڕێگەی دەنگی میللیەوە لە شار دور دەخرایەوە بۆ ماوەی پێنج یان دە ساڵ (تێبینی وەرگێڕ).

9–ئەم هەمو خاڵانە لە لایەن فاینلیەوە بە شێوەیەکی جوان ڕون کراونەتەوە. (بڕوانە: *Finley M.I, Politics in the Ancient World, Cambridge*).

## سەرچاوە

*David Held, Models of Democracy, Polity Press, Cambridge, 1993*.

# نیکۆلۆ مەکیاڤیللی
(1527-1469)

د. موسا ئیبراهیم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەرایی:**

نیمچە دوورگەی ئیتالی بە درێژایی ڕۆژگار، گۆڕانکاری مێژوویی گەورەی یەك بە دوایەكی بەخۆیەوە بینیووە. لەم ناوچەیەدا شارستانیەتی ڕۆمانی بەهێز دروست بوو، كە توانی حوكمڕانی ناوچەكانی دەریای سپی ناوەڕاست و زۆربەی زۆرری ناوچەكانی جیهانی كۆن بكات. هەر لە سەر خاكی ئیتاڵیاش كڵێسا دامەزرا و گەشەیسەند و ململانێ لە نێوان دەسەلاْتی ئایینی و دنیایدا هاتە گۆڕێ. سەرەڕای ئەوەی لە كۆتایی سەدەی پانزە و سەرەتاكانی سەدەی شانزەدا لە تەواوی ئەورووپای خۆرئاوادا دەوڵەتی نیشتمانی دروست بوو، بەلاْم ئیتاڵیا هەر بە پارچە پارچەیی مایەوە و بەسەر پێنج دەسەلاْتی لۆكاڵی ناكۆك و دژ بەیەك دابەش بووبوو:

1-شانشینی ناپۆلی لە باشوور.
2-دۆقیەی میلانۆ لە باكوری خۆرئاوا.
3-كۆماری ڤینیسیا لە باكوری خۆرهەلاْت.
4-كۆماری فلۆرنسا.
5-دەوڵەتی پاپ (ڤاتیكان) لە ناوەڕاست.

ئەم دەسەلاْتە لۆكاڵیانە بە دەگمەن نەبێت ئاسایش و ئارامیان بەخۆیانەوە نەبینیووە، هەمیشە لەشەڕدابوون دژ بە یەكتری و ولاْتانی بیانیش چاویان تێبڕیبوون. لەسەردەمی "مەكیاڤیللی"دا كۆمەڵگەی ئیتالی حاڵەتێك لە هەڵگەڕانەوەی بەرەو كوفر و بتپەرستی بەخۆیەوە دەبینی، حوكمڕانەكانیش بۆ تێركردنی ئارەزووەكانیان پەنایان دەبردە بەر هەموو ئامرازێكی نائەخلاقی. تەنانەت لە ڕۆژگاری ئەودا پاپاكان لە فەرمانڕەوا دنیاییەكان چاكتر نەبوون، بەڵكو ئەوانیش وەك فەرمانڕەواكانی تر بووبوونە حاكمی ناوچەیەك و دەسەلاْتی خۆیان فەرز كردبوو.

لەوەها هەلومەرجێكدا هێزێكی گەورەی وا لە ئیتاڵیادا دروست نەبوو، تا بتوانێت تەواوی ئەو ولاْتە یەكبخات. پارچە پارچەیی ئیتاڵیا و ناكۆكی نێوان دەسەلاْتە لۆكاڵیەكانی ئەو ولاْتە، زیاتر هانی فەرەنسی و ئیسپانی و ئەڵەمانیەكانی دەدا چاو لە خاكەكەیان ببڕن.

"مەکیاڤیللی" وەکو زۆربەی ئیتاڵیەکانی ڕۆژگاری خۆی، پێی وابوو کڵێسا لەو هەلومەرجە بەرپرسیارە. چونکە ئەگەرچی (پاپا) لەوە لاوازتر بوو ئیتاڵیا لە ژێر سایەی دەسەلاتی خۆیدا یەکبخات، بەلام هێزی ئەوەی هەبوو ڕێ لە هەر فەرمانڕەوایەکی تر بگرێت بەو کارە هەڵبستێت.

پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکانی پاپا، بووبووە مایەی ئەوەی ولاتانی بیانی دەست لە کاروباری ئیتاڵیەکان وەربدەن. کارێك کە بووە مایەی ئەوەی "مەکیاڤیللی" لە نوسینەکانیدا گاڵتە بە کڵێسا بکات، چونکە هاوپەیمانێتی پاپا لەگەڵ ولاتانی بیانیدا زۆر جار ڕێگای ئەوەی بۆ خۆش دەکردن بە بیانووی یارمەتیدان و بەهاناوە چوونەوە، دەست لە کاروباری ناوخۆی ئەو ولاتە وەربدەن.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، بەلام لە ڕووی ئەقڵی و هونەریەوە کۆمەڵگەی ئیتاڵی زۆر پێشکەوتوو بوو، هەروەها لە کۆمەڵگاکانی دیکەی ئەوروپا ئازادتر بوو، هەر بۆیە ئامادەبوو بە گیانێکی ژیرانە و دوور لە هەڵچونێك ڕووبەڕووی جیهان بێتەوە[1].

## بە گشتی:

"مەکیاڤیللی" ساڵی 1469 لە فلۆرنسا و لە بنەماڵەیەکی خانەدان و دەوڵەمەند هاتۆتە دنیاوە. "نیکۆلۆ"ی باوکی پارێزەرێکی ناودار بووە و دایکیشی شارەوایەکی چاکی لە شیعرداناندا هەبووە. سەبارەت بە سەردەمی لاوێتی "مەکیاڤیللی" شتێکی ئەوتۆ نازانین، هێندە نەبێت کە حەزی بە خوێندنەوەی کتێب بووە و پەیوەندیەکی بەرفراوانیشی لەگەڵ نووسەران و بیریارانی ئەو قۆناغەدا هەبووە، بوونی ئەو پەیوەندیانە بووە مایەی ئەوەی ببێتە خاوەن ڕۆشنبیریەکی لیبرالی گەورە، لە بواری یاسا و سیاسەت و مێژوو فەلسەفەدا. ئەمەش لە ساڵی 1498 تا کۆتایی سەردەمی کۆماری لە 1512 و گەڕانەوەی بنەماڵەی مدیتچی بۆ حوکمڕانی، بەهۆی دەستتێوەردانی بیانی لە کاروباری ناوخۆی ئیتاڵیا ڕێگای بۆ خۆشکرد ماوەی چواردە ساڵ، پۆستی ڕاوێژکاری گشتی دەوڵەتی فلۆرنسای پێ بسپێردرێت.

کارکردن لەو پۆستەدا پێویستی بە نوسینی ڕاپۆرت گەلێکی زۆر هەبوو، دەربارەی کاروباری ناوخۆ و دەرەوەی دەوڵەت. زۆرجاریش "مەکیاڤیللی" لەگەڵ وەفدەکاندا بۆ گفتوگۆ و دانوستاندن دەنێردرایەدەرەوە، هەموو ئەمانەش وایان لێکرد شارەزایەکی چاکی لە کاروباری ولاتانی بیانی هەبێت، لەگەڵ بەئاگابوون لە بارودۆخی حوکمڕانی ناوخۆی فلۆرنسا.

ئەو ئەرکە جۆراو جۆرانەی پێی دەسپێردراو ناردنی بەردەوامیشی بۆ دەرەوەی ئیتاڵیا (لەوانە چوار جاریان بۆ فەرەنسا بوو)، دەرفەتێك بوو بۆ ئەوەی بەهرەکانی خۆی وەك ڕاپۆرت نوسێك و دیبلۆماتێك بسەلمێنێ. ئەم فەرمانبەرە چالاك و دیارە خزمەتگوزاری ژیرانە و دڵسۆزانەی زۆری پێشکەشکرد، ئەمەش وایکرد بە پلە و پایەیەکی گرنگ و شایستە بگات، بەلام گەڕانەوەی بنەماڵەی مدیتچی بۆ سەر کورسی حوکمڕانی لە ساڵی 1512 بووە مایەی دەرکردنی "مەکیاڤیللی" لەسەر کارەکەیی و دوور خستنەوەی لە ولات.

ئەمە وایکرد بە شێوەیەکی گۆشەگیرانە لە *sain casciano* بژی و ماوەی دوانزە ساڵ بە هەژاری و نەبوونی بەرێتە سەر. لەوێوە کەوتە بیرکردنەوە لە سیاسەت بە شێوەیەکی گشتی و لە چارەنووسی ئیتاڵیا (ئیتاڵیا، ئەو نیشتمانە خۆشەویستەی بەدەست ناکۆکی ناوخۆوە دەیناڵاند و بنەماڵە حوکمڕانەکانی و هێزە بەکرێ گیراوەکانیان وێرانیاندەکرد و ولاتانی بێگانە چاویان تێبڕیبوو)، بەشێوەیەکی تایبەتی.

(کاتێك بە گەرمی کەوتە خوێندنەوەی مێژوونوسانی سەردەمە کۆنەکان، خوێندنەوەی ئەو شتانەی بە ئەزموونی دوورودرێژی خۆی لە بواری کاروباری گشتیدا بەراورد دەکرد. ئەزمونی ئەویش ئەزمونی چاودێرێکی وردبین و چاوکراوە بوو لە ئاست واقعی سەردەمی خۆیدا، کە تاڕادەیەکی زۆر سەردەمێکی تاڵ و ناهەموار بوو)[2].

"مەکیاڤیللی" لەو تەنهایی و گۆشەگیرییەدا کتێبەکانی نووسی و گرنگترین بەرهەمە سیاسیەکانیشی بریتی بوون لە: (میر) و (دەمەتەقێ). یەکەمین کتێبی کە (میر) بوو، نێوبانگێکی زۆری پەیداکرد و (قەدەریش ویستی وابوو ئەم کتێبە ببێتە مایەی نێوبانگێکی سەیر و نائاسایی بۆ نوسەرەکەی، لە پاش مردنی)[3].

"مەکیاڤیللی" ئەم کتێبەی پێشکەش بە فەرمانڕەوای نوێی فلۆرنسا کرد، تا نیشانی بدات کە لێهاتووی و لێزانی و ڕادەی تێفکرینی لە چ ئاستێکدایە، هەروەها بۆ ئەوەی هانی بدات ئیتاڵیا یەکبخاتەوە، بەتایبەتی کە پاپا خۆشی سەر بە بنەماڵەی مدیتچی بوو.

بیروبۆچوونە سیاسیەکانی "مەکیاڤیللی" لە هەردوو کتێبی (میر) و (دەمە تەقێ)دا بە ئاشکرا خۆیان بەیان دەکەن. کتێبی (میر) کە چارەسەری حکومەتە مۆنارکیەکان دەکات و باسی شێوازی حوکمڕانی و ئەو ئامرازانە دەکات کە دەبنە مایەی بەهێزبوونی دەوڵەت، هەروەها باس لەو سیاسەتە گشتیانەش دەکات کە دەوڵەت دەگەیەننە ئامانج و ئەو هەڵانەشی دەبنە مایەی شلۆق بوون و داڕمانی، ڕێوشوێنە سەربازی و سیاسیەکان دوو سەرەکیترین ڕەگەزی ئەو کتێبە پێکدێنن. "*maxey*" دەڵێت: (کتێبی میر کتێبێکی عەمەلیە کە باس لە هونەری حوکمڕانیکردنی سەرکەوتوو دەکات)[4]. هەروەها "*Dunning*" دەڵێت: (ئەوەی مەکیاڤیللی لەم کتێبەدا پێشکەشمانی دەکات شێواز و فەلسەفەی حوکمڕانی کردنە، زیاد لەوەی تیۆریایەك بێت دەربارەی دەوڵەت)[5].

"مەکیاڤیللی" ڕێگاچارەی سیاسی و سەربازی بە تەواوەتی لە پێودانگە ئاینی و مۆراڵیەکان جیا دەکاتەوە. بە بۆچونی ئەو مەبەستی سەرەکی لە سیاسەت پارێزگاری کردنە لە هێزی سیاسەت و زیادکردنی ئەو هێزەیە، تاکە پێودانگێکیش کە "مەکیاڤیللی" سیاسەتی پێ هەڵبسەنگێنێ سەرکەوتنیەتی لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئەو سیاسەتە دڵرەقانە و ستەمکارانەیە یاخود ناڕەوایە. لەم ڕووەوە "مەکیاڤیللی" لە کتێبی (میر)دا دەڵێت: (من پێموایە هەموو کەسێك ئەو بۆچونەم پەسەند دەکات کە میر چۆنی دەوێت و لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا هەر چیەك دەکات، بێ گوێدانە بەها مۆراڵی و ئاینییەکان، چونکە فەزیڵەت و کاری چاکەی وا هەیە کە دەبنە مایەی شلۆقبوون و ڕمانی دەسەڵاتەکەی، وەك چۆن خراپەکاری واش هەیە کە دەبێتە مایەی گەشەکردن و سەرکەوتنی)[6].

لە کتێبی (میر)دا چارەسەری کێشە و کار و بارەکانی دەوڵەتی پاشایەتی و حکومەتە ڕەهاکان دەکات، بەڵام لە (دەمەتەقێ)دا لەبەر فراوانبونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەکۆڵێتەوە، بەپێی مێژووی ڕۆمانی کە "تیتۆس لیفیۆس" نوسیویەتی. لە هەر دوو ئەو کتێبەدا کارەکتەری "مەکیاڤیللی" و بیر و بۆچوونە تایبەتیەکانی بە ئاشکرا دیارن، وەك: (گوێنەدانی بە ڕێسا مۆراڵیەکان و جیاکردنەوەی مۆراڵ لە سیاسەت، هەروەها باوەڕبوونی بەوەی حکومەتی سەرکەوتوو لەسەر هێز و فرت و فێڵ و مامەڵەکردنی ژیرانە دادەمەزرێت).

بەکورتیەکەی دەتوانین بڵێین: (ئەو سیاسەت لە پێودانگەکانی دیکە جیا دەکاتەوە و وەك ئامانجێکی تایبەتیش لە بارەیەوە دەنووسێت). لە (میر)دا "مەکیاڤیللی" بۆ ئەو سستمی حوکمڕانییە

پەرۆش نەبوو کە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا کاری پێکراوە، چونکە پێیوابوو جۆرە حوکمڕانییەکی لەو جۆرە ناشێت لە ئیتاڵیادا پەیڕەو بکرێت، بەتایبەت لەوسەردەمو زەمانەدا کەئەو کتێبەی تێدا نووسیوە.

لە هەردوو کتێبی (میر) و (دەمەتەقێ)دا، "مەکیاڤیللی" مامەڵە لەگەڵ واقیعدا دەکات زیاد لەوەی گرنگی بە تیۆرە سیاسیەکان بدات، لەمبارەیەوە دەڵێت: (مەبەستم ئەوەیە شتێك بنووسم، ئەوەی دەیخوێنێتەوە سودمەند بێت لێی، لەبەرئەوە چاکتروایە باس لە شتە واقیعیەکان بکەم، نەك خۆم بە مەسەلە خەیاڵی و تیوریەکانەوە خەریك بکەم. بەتایبەت کەسانێکی زۆر بیریان لە کۆمار و میرنشینی وا کردۆتەوە کە لە دنیای ئێمەدا بوونیان نەبووە، ئەو شێوازەشی ژیانی پێدەکەین، زۆر لەوە جیاوازترە کە ئەو کەسانە بیریان لێکردۆتەوە)[7].

ئەگەرچی زۆر کەس باس لە ناکۆکی و وێکنەچوونی نێوان ئەو دوو کتێبەی "مەکیاڤیللی" دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی دیکەیانە. مەبەستی "مەکیاڤیللی" لە نوسینی کتێبی (میر) گەڕانەوە بووە بۆ سەر کارەکەی لای بنەماڵەی مدیتچی، هاوکات دەیویست چارەسەری ئەو بارودۆخە ناهەموارە بکات کە ئیتاڵیا دەیگوزەراند و یەکیەتیەکی نیشتمانی پتەوی بۆ دەستەبەر بکات.

## جیاکردنەوەی سیاسەت لە مۆراڵ:

کاریگەریەکی قوڵ کە "مەکیاڤیللی" لەسەر کایەی دەوڵەت ناسی و هونەریی دەسەلاٚت بەجێی هێشتبێت، لێکجیاکردنەوەی سیاسەت و مۆراڵە. ئەوداوا دەکات سیاسەت کایەیەکی سەربەخۆ بێت و لەسەرو مۆراڵەوە بێت، ئەمەش تەئکیدکردنەوەی ئەو بۆچوونەیە کە دەوڵەت بۆخۆی ئامانجە و بەهایەکی ڕەهایە، بۆچونێکی واش هاوشانی ئەو ئایدیا ڕەشبینیە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ.

ئەو کێشانەی تایبەتن بە توانستی سەربازی و سیاسی، "مەکیاڤیللی" یان زۆر سەرقاڵکردبوو، لە نەسکەکانی 12 و 13 و 14ی کتێبی (میر)دا، باس لەوە دەکات کە پێویستە میر گرنگی و بایەخی زۆر بداتە مەشقی سەربازی، ئەگەر نا ئەوا دەسەلاٚتی لە دەست دەچێت: (پێویستە میر جگە لە جەنگ و فێربوونی ڕێسا و پێداویستیەکانی شەڕ، ئامانجێکی دیکەی نەبێ و بیر لە هیچی تر نەکاتەوە و بە هیچ هونەرێکی ترەوە خۆی خەریك نەکات)[8].

دەوڵەت چییە؟ ڕۆڵی چییە؟ ئەمانە پرسیارگەلێکن "مەکیاڤیللی" بایەخیان پێ نادات. دەوڵەت هەیە و پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت و بەهێز بکرێت، ئەگەر پێویستیشی کرد چاکسازی تێدا بکرێت.

تەنها ئامانجێك لە سیاسەتکردن بریتییە لە گەشەدارکردن و شکۆمەندکردنی دەوڵەت، ئامانجێکی لەمجۆرەش لەسەرو چەمکی چاکە و خراپەوەیە کە مرۆڤەکان بە پێی مۆرالی باو باسی لێدەکەن. سیاسەتی ڕاستەقینە بە دیهێنانی ئەو ئامانجەیە، ئیتر ئەگەر سیاسەتێکی ناڕەواو زاڵمانەش بێت و تەنانەت ئەگەر لە ڕووی شەرعیشەوە پەسەند نەبێت. بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی سیاسی دیاریکراو، "مەکیاڤیللی" بەکارهێنانی هەرچی ئامرازە بە ڕەوا دەزانێت، تەنانەت کوشتن و درۆکردنیش: (بەرگریکردن لە نیشتمان هەمیشە کارێکی باشە، بە بەکارهێنانی هەرچیەك بێت)[9]. بەلاٚم دەبێت فەرمانڕەوا ئەو کارانە بە نهێنی بکات. بەکارهێنانی ئامرازی نا ئەخلاقی بۆ پاراستنی کورسی حوکمڕانی و تۆکمەکردنی کارێکی ڕەوایە، بەلاٚم پێویستە فەرمانڕەوای ژیر ئەو کارە بە وردی و لێزانی و نهێنیەوە بکات، تا لە هەموو کاتێکدا بتوانێت پەرچەکردارەکانی ناو کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکات. "مەکیاڤیللی" زۆر جار باس و ستایشی

دەسکەوتەکانی بەکارهێنانی شێوازی نا ئەخلاقی و زۆرزانانەی کردووە بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسیەکانی کەسی فەرمانڕەوا. ئەم بۆچونانەشی کە لە وتەزای (هەموو ئامرازێك ڕەوایە بۆ گەیشتن بە مەبەست) چڕدەبێتەوە، بەر پرسیارە لە ناوبانگ خراپی ئەو. (دەوڵەت لای ئەو نازانێت موراڵ چییە و ئەوەشی دەیکات پەیوەندی بە مۆراڵ و بێ مۆراڵیەوە نییە، چونکە مەسەلەیەکی وا کەم تا زۆر بۆ دەوڵەت گرنگ نییە، لە بەڕێوەبردنی سیاسەت و کاروباری حوکمڕانیدا تەنها یەك پرانسیپ شك دەبەین بۆ ئەوەی کارێکی پێ هەڵسەنگێنین، ئەو پرانسیپ و پێوەرەش بریتییە لەو دەرەنجامانەی لەو کارە دەکەونەوە، ئەگەر دەرەنجامەکان بە سوود بوون، ئەوا کارەکە کارێکی باشە و خۆ ئەگەر دەرەنجامەکانیشی زیان بەخش بوو، ئەوا ئەو کارە هەڵەیە)[10].

ئەگەرچی بەردەوام لە ستایشی ئەو فەرمانڕەوایانەدا بووە کە لە پێناو پاراستنی پلەو پایەی خۆیان و بەهێزکردنی دەوڵەتەکانیاندا پابەندی مۆراڵ نەبوون، بەڵام زۆر لە نووسەران پێیان وایە "مەکیاڤیللی" خۆی کەسێکی خراپ و بێ مۆراڵ نەبووە، بەڵکو لە ژیانی تایبەتیدا بە پێچەوانەوە ناسك و بە بەزەیی بووە و ڕێزی هەموو شتە جوانەکانی ژیانی گرتووە، بە تایبەت هاوڕێیەتی و خۆشەویستی[11].

مەبەستی ئەو لە جیاکردنەوەی سیاسەت لە مۆراڵ ئەوە بوو، سیاسەت بۆ خۆی ببێتە ئامانجێك و زانستێکی سەربەخۆ بێت جیاواز لە هەموو ئیعتیبارەکانی تر. ئەم جیاکردنەوەو هەڵاوێردکردنەی سیاسەت لە هەموو شتەکانی دی، پێچەوانەی سەرجەم فیکری پێشووە کە سیاسەت و مۆراڵ و شتەکانی تری پێکەوە گرێ دەدا. لەبەرئەوە بایەخی "مەکیاڤیللی" لەوەدایە یەکەم کەسە هەوڵی تاوتوێکردنی دیاردەی سیاسەت و بە تایبەتیش دیاردەی حوکمڕانی کردنی دابێت، بەجیا لە مەسەلەکانی دی و جیاواز لە سەرجەم لێکۆڵینەوە فەلسەفی و تیوریەکان. بەمجۆرە بناغەی سەرەتایی زانستێکی تایبەت و سەربەخۆی داڕشت کە (سیاسەت ناسی) بوو، هەروەها هێنانە ئارای دەستەواژەی نوێی (دەوڵەت) و مەبەست لە دەوڵەت، بە پێشدەسخەری ئەو بوو. ئەمەش شتێکی سەیر نییە، لەبەرئەوەی کۆی نوسینەکانی تایبەت بوون بە دەوڵەت و حوکمڕانی، بەڵام وتەزای (دەوڵەت) ڕەهەندێکی تایبەت و سەربەخۆی وەرنەگرت، بەڵکو لای ئەو لەگەڵ (نەتەوەو میر)دا تێکەڵ دەبوو[12].

## ئایین و مۆراڵ لای "مەکیاڤیللی":

"مەکیاڤیللی" پیاوی دەوڵەت بوو، نەك پیاوی ئایین و مۆراڵ. ئامانجی ئەو یەکخستنەوەی ئیتاڵیای پارچە پارچە بوو، بەزەبری هێز و زۆر. پێی وابوو کارێکی واش بەبێ بنەبڕکردنی گەندەڵی مۆراڵی و ئایینی کە لەو قۆناغەدا ئیتاڵیای گرتبووەوە، نەدەکرا. (لەبەرئەوە مۆراڵ و هەموو جۆرە درۆزنە خواپەرستیەکی دایە بەر ڕەخنە و ڕاشیگەیاند کە مەسەلەی دەوڵەت و کێشەکانی، ناچنە ژێر باری ڕستێك بەهای پوچ و بەتاڵ یان لە چوار چێوەی تیۆلۆژیادا بخولێتەوە)[13].

"مەکیاڤیللی" لەو ڕووەوە گرنگی بە ئایین دەدات کە چەند خزمەت بە دەوڵەت بکات و شکۆمەندی بپارێزێت، پێشی وایە دەبێت ئایین لە خزمەت سیاسەت و ئامانجەکانیدا بێت. لێرەوە "مەکیاڤیللی" هێرشی کردە سەر ئایینی مەسیحی، لەبەرئەوەی پەیڕەوو پڕۆگرامەکانی لەگەڵ خواست و ئامانجەکانی سیاسەتدا ناگونجێت. فەزیلەتی مەسیحی داوای ملکەچی و کەساسی دەکات، بە پێچەوانەی ئایینە کۆنەکانەوە کە بانگهێشتی نەفس بەرزی و بەهێزی دەکرد. لەمبارەیەوە دەڵێت: (ئایینە کۆنەکان جەختیان لەسەر ئەو فەزیلەتە

خۆڕسکه شەڕانگێزانه دەکردەوه که میللەتی بەهێز و ئازادیان دروستدەکرد. هەروەها باسیان له خۆشویستنی کارو شکۆی دنیایی دەکردەوه و بەڕێزەوه باسیان له سوپاسالار و دەسەڵاتداران دەکرد، بەختەوەری گەورەیان دەرگیری نەفس بەرزی و هێزی لەش و لار کردبوو، تەئکیدیان له هەموو ئەو شتانه دەکردەوه که مرۆڤیان دەکرده بوونەوەرێکی ترسناک، بەڵام مەسیحیەت که ئایینی ئێمەیه وامان لێدەکات رێزێکی کەم بۆ شکۆی ئەم دنیایه دابنێین و ستایشی زیاتری ئەو کەسانه دەکات که هیچ له بارەدا نەبوون و کاتی خۆیان بۆ تێڕامان و بیرکردنەوه لەو دنیا تەرخان دەکەن. کاتێکیش داوامان لێدەکات بەهێز بین، بەر له هەر شتێ بۆ ئەوەیه بتوانین لەبەرامبەر ئیش و ئازارەکاندا دان به خۆماندا بگرین. هەروەها له پێناو چونه بەهەشتدا، داوا له مرۆڤەکان دەکات هێرش و پەلاماری کەسانی خراپەکار قبوڵ بکەن و بەرپەرچیان نەدەنەوه. ئەم دیینەی ئێمه بەختەوەری گەوره به خاکی بوون و گەردن کەچی و نەفرەت کردن له شته دنیاییەکانەوه گرێ دەدات و، هەموو ئەمانەش وا دەکەن میللەتان لاوازبن و ببنه نێچیرێکی ئاسان بۆ ئەو شەڕانگێز و خراپەکارانەی له بۆسەدان بۆمان)[14].

ئەم پەرەگرافه لـه نوسینەکانی "مەکیاڤیللی" دەیسەلمێنێ کـه کەسێکی بێ باوەڕنـەبووه، بەڵکو باوەڕی به پەیامی ئایین و ئاکار هەبووه و بوونیانی بـه گـرنگ بـۆ کۆمەڵگـه زانیـوه و وەك دوو شـتی کاریگەر لەسەر ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەیر کردوون، بەڵام له بەراوردکردنی ئایینەکان بەیەکتری زیاتر بـه ئایینـه کۆنـەکان سەرسام بووه. کاتێك کـه رێگـا بـه فـەرمان ڕەوایـان دەدات بـۆ گەیشـتن بـه ئامانجـەکانیان ئـامرازی نـا ئـەخلاقی بـەکاربهێنن، هەرگیز گومانی لەوه نییه که دەبێت دەوڵەتی بەهێز لەسەر بنـەمای مۆراڵێکی پتـەو دابمـەزرێت. ئـەوەتا سەرسـامی زۆری خـۆی بـەو فەزیلەتـه مـۆراڵی و مەدەنیانـه ناشـارێتەوه کـه ڕۆمانیـەکان لـه کۆنـدا و سویدییەکان له ڕۆژگاری خۆیدا خاوەنی بوون. ئەو پێی وایه ئەو فەزیلەتانـه هـەروا لـه خـۆڕا نـەهاتوون، بـەڵکو بـەرەنجامی ئـارامی ژیـانی خێزانـی و سەربەخۆیی و جدیەته له ژیانی تایبەتیدا، هەروەها بەرهـەمی خـاکی بوونـه لـه هەڵسـوکەوتی ڕۆژانـەو دڵسۆزی و لەخۆبووردەییه له جێبەجێکردنی ئەرکە گشـتیەکاندا، بـەڵام کـۆی ئـەم فەزیلـەت و مۆراڵانـه دەسـتی هـیچ فەرمانڕەوایـەك ناگرێـت یـان ناچـاری ناکەن بەوەی مودارای ئەو رێسا مۆراڵی و ئایینیانـه بکـات کـەهاوڵاتیانی بڕوایـان پێیـەتی. بـەمجۆره "مـەکیاڤیللی" لەدەوڵەتـدا دوو پێـوەری بـۆ مـۆراڵ دانـابوو: یـەکێکیان بـۆ کەسـی فـەرمانڕەواو ئـەوی دیکەشـیان بـۆ هـاوڵاتی ئاسـایی. یەکـەمیان بـەو ئاستی سەرکەوتنه دەپێورێت کەکەسی فەرمانڕەوا لەئـەنجامی پارێزگـاری کـردن لەدەسـەڵاتەکەی و بەهێزکردنی دەوڵەتەکەیدا بەدەسـتی دێنێت، بەڵام دووەمیان بەڕادەی ئەو هێزه دەپێورێت کـەرەفتاری تاکەکەس له کۆمەڵگەدا بەرجەسته دەکات یان بەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەش بەکۆمەڵگەی دەکات.

کاتێـك "مـەکیاڤیللی" تەئکیـد لـەوه دەکاتـەوه نابێـت کەسـی فـەرمانڕەوا پابەنـدی ئـەو رێسـا مۆراڵی و ئایینیه بێت کەئاڕاستەی کۆمەڵگه دەکات، لـەوێوه سەرچاوه دەگرێت کەئەو پێی وایـه کەسـی فـەرمانڕەوا لـەدەرەوەی ئـەو گروپەیـه کۆمەڵگـەی لێ پێکـدێت یـاخود ئـەو حاڵـەتێکی تایبەتـەو ئەمـەش وادەکـات لەسـەرو کۆمەڵگـەو ئـەو رێسـاو ئایینـەوه بێـت کەکۆمەڵگـه پـەیڕەوی لێـدەکات. دوای هـەموو ئەمانـه ئـیتر سـەیر نییـه ببیـنین مـۆراڵ و ئـایین بـۆ "مەکیاڤیللی" گرنگیەکی ئەوتۆیان نییه، تەنها لەو ڕووەوه نـەبێت کەدەوڵـەت بتوانێـت سـودمەند بێـت لێیـان، ئەگـەر ئاوڕیشـیان لێ بداتـەوه لـەپێناو پاراستن و هێشتنەوەی شکۆمەندی دەوڵەتدایه.

## سروشتی مرۆڤ:

سەرەکیترین گریمانەیەك "مەکیاڤیللی" نوسینەکانی لەسەر داڕشتبێت، ئەوەیە کەخۆپەرستی و دوو دڵی و سپلەیی و خراپەکاری، لەخەسڵەتە سەرەکیەکانی سروشتی مرۆڤایەتین. بۆیە داوا لەفەرمانڕەوایان دەکات کاتێك حوکمی میللەتان دەکەن، ئەم حەقیقەتە لەبەرچاو بگرن. خۆپەرستی بەئاشکرا لەمرۆڤدا دیارە، ئەوەتا هاوڵاتی ئاسایی حەزی بەوەیە ژیان و موڵك و ماڵاتی پارێزراو بێت و زیاتریان بکات، هەروەها خۆپەرستی فەرمانڕەوایانیش لەوەدایە کەحەزیان لەهێزو دەسەڵاتی زیاترو زۆرترە.

لێرەوە "مەکیاڤیللی" دروستبونی حکومەت دەگەڕێنێتەوە بۆ لاوازی تاکەکەس و بێ توانیی لەبەرگریکردن لەخۆی دژ بە دەستدرێژی کەسانی دی، ئەگەر هێزی دەوڵەتی لەپشت نەبێت. حەزی مرۆڤ بۆ خاوەنداریێتی و بەدەست هێنانی هێزی زیاتر، بەرەو شەڕانگێزی دەبەن. ئەمەش دەبێتە مایەی پشێوی، ئەگەر هێزێك لەپشت یاسا نەبێت.. لەبنەڕەتدا دەسەڵاتی فەرمانڕەوا لەو گریمانەیەوە سەرچاوە دەگرێت کەبەردەوام ئەگەری پشێوی و نائارامی لەئارەدایەو تەنها شتێکیش ڕێی پێ بگرێت، هێزی فەرمانڕەوایە کەبەتوندی بەرپەرچی هەموو دوژمنکاری و هەڕەشەیەك بۆ سەر ئاسایشی تاکەکەس دەداتەوە.

بەمجۆرە "مەکیاڤیللی" پێی وایە پێویستی بوونی فەرمانڕەوا لەوێوە دێت کەکۆمەڵگە لەپشێوی قوتار بکات، بوونی هەرجۆرە لاوازییەکیش لەحوکمڕانیدا، دەبێتە مایەی نەمانی دڵنیایی و پەلاماردانی یەکتری، بەمەبەستی خۆسەپاندن و زیادکردنی سەروەت و سامان. پێویستە فەرمانڕەوای سەرکەوتوو سروشتی مرۆڤ شارەزابێت، هاوکات دەبێت بەر لەهەر شتێك کاربکات بۆ ئەوەی ئاسایش بۆ ئینسانەکان و پاراستنی موڵك و ماڵاتیان دەستەبەر بکات، لەبەرئەوەی ئەوانە گەورەترین خواست و ئارەزووی مرۆڤن.

سەبارەت بەخۆپەرستی دەڵێت: (خەڵك کاتێك موڵك و ماڵاتیان لێ زەوت دەکرێت، بەڕادەیەك دڵتەنگ و خەمبار دەبن زیاتر لەوەی بۆ مەرگی باوك و برای خۆیان خەفەت بارین، لەبەرئەوەی مردوو بیر دەچێتەوە، بەڵام پارەو سامان هەرگیز بیرناچێتەوە)[15]. هەروەها دەڵێت: (بەگشتی مرۆڤەکان سپڵەو دووڕوون و حەز بەوە دەکەن لەمەترسی دووربن و زۆر چاو برسین.. ئەگەر بەکەڵکیان بێیت، ئەوا لەگەڵتان و خوێنی خۆیانت بۆ دەڕێژن و ژیان و منداڵ و هەرچیەکیان هەیە، لەپێناوتدا بەختی دەکەن، بەڵام کەبارت کەوتە لاری، ئەوا دێن بەگژتداو لێت ڕادەپەڕن)[16]. خەڵك وادەژین و ڕێگا چارەیەکیش نییە بۆ ئەوەی بگۆڕێن یان چاك ببن. (سروشتی مرۆڤ وەك مانگ و ڕۆژ وایەو ناگۆڕێت. مرۆڤەکان لەدایك دەبن و دەژین و دەمرن، بەڵام بەردەوام بەهەمان ڕێساو یاسا سەرمەدیەکان ڕەفتاردەکەن و بەردەوامیش ملکەچی هەمان حەزو ئارەزوون)[17].

ئەم بۆچوونانە دەرهەق بەخۆپەرستی و خراپەکاری وەك ئەنگێزەیەکی گشتی ئینسانەکان، تەنها وەك حاڵەتێك جێ گرنگی پێدانی "مەکیاڤیللی" نەبوون، بەڵکو گرنگی پێدانی ئەو بەم شتانە لەبەرئەوە بوو کەلەناو ئیتاڵیادا تەشەنەیان سەندبوو، وەك دیاردەیەکی پەیوەست بەشلۆق بوونی کۆمەڵگە ئیتاڵی کە لەبنەڕەتدا بێ دەسەڵاتی و لاوازی فەرمانڕەواکانەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئومێدی چاککردنی ئەم کۆمەڵگەیەش بەرای ئەو، تەنها لەڕێگای سیستمێکی حوکمڕانی پادشایی ستەمکاری بەهێزو تواناوە دەبێت. ئەو گەندەڵیە

ئەخلاقیەی لەناو هاولاتیاندا بلاوبوتەوە لەلایەكو كەمتەرخەمی فەرمانرەوایانیش لەجیبەجیكردنی ئەركی سەر شانیان لەلایەكی تر، وادەكات هینانە ئارای سستمیكی حوكمرانی میللی كاریكی مەحال بیت.

"مەكیاڤیللی" پیی وایە هەندیك جار مروڤ دەتوانیت بەكاری چاكەش هەلبستیت، تەنانەت هەرچی سیفەتی جوانو باشەیە دەیداتە پال رومانیە كونەكان، بەلام ئەمە وەك حالەتیكی تایبەتو دەگمەن سەیر دەكاتو بەلای ئەویشەوە نابیت سیاسەت پشت بەحالەتە تایبەتو دەگمەنەكان ببستیت. لیرەوە تیدەگەین بوچی سەرسام بووە بەسستمی حوكمرانی كوماری لەسەردەمی رومانی كوندا، بوچی باوەری بە پیویستی بوونی دەسەلاتیكی رەها هەبووە تا لەسەردەمی خویدا حوكمرانی كومەلگەی گەندەلی ئیتالی بكات.

"مەكیاڤیللی" پیی وایە سستمی كوماری دیموكراسی چاكترین سستمی حوكمرانییەو بو ئەو میللەتانە دەگونجیت كەپابەندی ئاكاری چاكەن، بەلام ئەو میللەتانەی پابەندی ئایینو مورال نابن، وەكی میللەتی ئیتالی دارماو، ئەوا هیچ سستمیكی حوكمرانی بەكەلكی نایەت جگە لەسستمیكی ستەمكاری رەها نەبیت. سستمیكی حوكمرانی لەمجورە لەریی بەكارهینانی زەبرو زورەوە، دەتوانیت ئەخلاقی چاك لەهاولاتیاندا بچینیت. هەر كاتیكیش ئەم كارە كرا، ئەوا دەكریت سستمیكی حوكمرانی كوماری- دیموكراسی دابمەزریت. لیرەوە "مەكیاڤیللی" دەلیت: (سستمی كوماری- دیموكراسی تەنها بو سویسراو چەند ناوچەیەكی ئەلەمانیا گونجاوە، لەبەرئەوەی ژیانی مەدەنی لەو شوینانەدا بەپاكژی ماوەتەوەو هاولاتیانیش خاوەنی ئەخلاقی چاكەن).

## سیاسەتی ناوخویی:

لای "مەكیاڤیللی" ئامانج لەسیاسەت، پاراستنو زیادكردنی هیزی دەولەتە، پیوەری سیاسەتی راستەقیەنەش سەركەوتنە لەبەدیهینانی ئەو ئامانجەدا، بەبی گویدانە ئەوەی ئەو سیاسەتكردنە رەوایە یان نارەوایە.

لەبەریەك هەلوەشانو دابەشبوونی ئیتالیا بەسەر چەند دەسەلاتیكی لوكالیداو بوونی فەرمانرەوایەكی گەندەل لەتروپكی دەسەلاتی هەریەك لەو ناوچانەدا، كە لەهولی بەرژەوەندی تایبەتی خویاندا بوونو بەرژەوەندی نەتەوایەتی ئیتالیایان پشت گوی خست بوو، "مەكیاڤیللی" یان ناچار كرد داوای دروست بوونی میر یاخود فەرمانرەوایەكی بەهیز بكات، تابتوانیت كومەلگەی گەندەلی ئیتالی لەو واقیعە سیاسیە ناهەموارە دەربهینیت، بو ئەم كارەش میربوی هەیە هەموو ریگا چارەیەكی سیاسی بگریتەبەر تەنانەت ئەگەر ریگا چارەی نائەخلاقیش بیت، ئەمەش لەپیناو بەدیهینانی ئامانجی گەرەدا كەبەدیهینانی یەكیەتی خاكی ئیتالیایە.

بو ئەم مەبەستەش میر بوی هەیە زیاد لەدەمو چاویكی هەبیت، تالەگەل ئەو هەلومەرجە سیاسیەدا بگونجیت كەپییدا تیپەر دەبیت. لەكتیبی (میر)دا ئەو خەسلەتانە دەژمیریت كەپیویستی سەركردەی بەهیزو سەركەوتوو هەلگریان بیت، ئەو خەسلەتانەش بەپیداویستی كاری سیاسی سەركەوتوو دادەنریت. لەناوخودا دەبیت میری نوی (كەدەسەلاتی بەمیراتی بو نەماوەتەوە)، ترسیكی تەواوی لەنەیارەكانی هەبیتو لەهاوریكانیو شوین كەوتوانیشی زور بەئاگابیت. پیویستە نەیارانو ئەوانەی ئیرەیی پیدەبەن لەناو بەریت، ئەویش بەسەپاندنی قورسترین سزا بەسەریاندا. بەلام سەبارەت بەهاولاتیان، كاتیك بەقسەو بەنەرمی

نواندن مل نادەن، ئەوا دەبێت میر بەبەکارهێنانی هێـز (واتـە بەچـەك‌و تفـاقی تـازە کەلەگـەڵ یاسـا نوێیەکانـــدا بگونجێـــت)، ئـــەو کـــارە بکـــات. "مـەکیاڤیللی" دەڵێـت: (وەی بـەحاڵی مـیری بـێ دەسـەڵات)، کاتێك ئەمـەش دەڵێت وێنـەی قەشـەی دۆمێنیکی *Savonarole* لەخەیاڵدایە کەچۆن کاتێك خەڵکی فلۆرەنسا متمانەیان پێی نەما، لەبەرئەوەی هێـزی پێویسـتی نـەبوو تاخـەڵکی ناچـار بکـات بگەڕێنەوە بۆ ئیمانداری[18]، شکستی هێناو سەری تیاچوو.

شـتێکی جوانـە ئەگـەر مـیر مرۆڤێکـی نـەرم‌و نیان‌و بـەڕێزو لێبوردەو دڵسـۆز بێـت، بـەڵام جیهان بەو شێوەی کەهەیەو سروشتی ئینسانیش، ڕێگـەی ئـەوەی پێنـادەن.. شـتێکی چـاکە مـیر لافـی ئـەوە لێبدات خاوەنی ئەو سیفەتە جوانانەیـە، بەڵام گەر بەڕاستی خاوەنی ئەوا نەبێت ئەوا تیادەچێت. لاف لێـدانی مـیر بـەوەی خـاوەنی ئـەو خەسـڵەتانەیە کارێکی باشـەو بگـرە پێویستیشـە، لەبەرامبـەر ڕای گشـــتی وڵاتەکەیـــدا. (لەئـــەنجامی خوێندنـــەوەی بەرهەمـــەکانی مـــەکیاڤیللی دەتـــوانین تیۆرییایـــەك دەربـــارەی پڕوپاگەنـــدە کـــردن– بـــەزمانی ئـــەم سـەردەمە– بـەدی بکـەین، کەئاڕاسـتەی ڕای گشـتی دەکـات‌و لەسـەر بنەمایـەکی دوو فـاقی دامـەزراوە کەبریتیـە لـەهێزو دوو ڕوویـی‌و هـەر دەوڵـەتێکیش بەپێی بەرژەوەندیەکانی بەکاریان دەهێنێت)[19].

شتێکی چاکە گەر میر ناوبانگی بەلێبوردەیی ڕۆیشـتبێت‌و بـەفیعلیش بتوانێـت وابێـت، بـەڵام دڵرەقییـەك کەبەشـێوەیەکی بـاش پراکتیـزە بکرێـت، دەتوانێـت دەسـەڵاتی مـیر بهێڵێتـەوەو لەگەڵیشـیدا دەوڵەت بپارێزێت. هەروەها کارێکی چاکە گـەر مـیر بـەڕێزو دەسـت کراوەبێـت، بـەڵام ئـەم شـتانە گـەر بەوجۆرە بێت کەخـەڵك لێی تێدەگات، ئەوا دەبێتـە مایەی زیان پێ گەیاندنی.. میری ئاقڵ نابێت گوێ بەوەبدات خـەڵکی پێی بڵێن ڕژدو پیسـکەیە (چاکتر وایـە پیسـکە بێـت– ئەمـەش وات لێـدەکات بەسـوك سـەیر بکرێیـت بـێ ئـەوەی ڕقیـان لێـت بێـت–، نـەك لـەژێر بـاری ناچـاریدا ببیتـە دز، کارێـك کـە لەیـەك کاتـدا ڕووبـەڕووی ڕك‌و بەسـوك سـەیر کردنـت دەکاتەوە)[20].

هـەموو میرێـك حـەز بـەوە دەکـات هاوڵاتیـانی بەکەسـێکی بەبـەزەیی بـزانن نـەك وەك مرۆڤێکـی دڵڕەق سەیری بکەن، بەڵام نابێت گوێ بەوەش بدات کـە بـە دڵڕەقـی تاوانبـار بکرێـت، گـەر ئـەوە ببێتـە مایەی یەکیەتی‌و یەکڕیزی هاوڵاتیەکانی[21].

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە کەئایا چاکترە مـیر کەسـێکی خۆشەویست بێت یـان کەسـێك بێت خـەڵك لێـی بترسـن؟ "مـەکیاڤیللی" لـەوەڵامی ئـەم پرســـیارەدا دەڵێـــت: (پێویســـتە لێـــی بترســـن‌و خۆشیشـیان بوێـت، بـەڵام مادامـەکی ئەسـتەمە ئـەو دوانەپێکـەوە کۆبکاتـەوە، ئـەوا چـاکتر وایـە لێـی بترسـن نـەك خۆشـیان بوێـت، چـونکە خـەڵك سـڵ لـەمیرێك ناکاتـەوە خـۆی لای خـەڵك خۆشەویسـت بکـات، بـەڵام نـاوێرن خراپـە دەرهـەق بـەوە بکـەن کەترسیان لێیـەتی. پێویستە میر خەڵك بترسێنێ‌و خـۆی لـەرق‌و تـوڕەیی میللـەت بـەدوور بگرێـت، لەبەرئـــەوەی ڕق‌و تـــوڕەیی کـــارێکی ترســـناکەو پێویسـتە خـۆی لێ لابدات. بۆ ئەوەی خـۆی لـەڕق‌و تـوڕەیی میللـەتیش بپارێزێـت، دەبێـت دەسـترێژی نەکاتـە سـەر مـاڵ‌و سـامانی هاوڵاتیـان یـاخود دەسترێژی نەکاتە سەر ناموسی ژنەکانیان)[22].

## سیاسەتی دەرەکی:

ئەو سیاسـەتە دەرەکیانـەی "مەکیاڤیللی" میر ناچـار دەکـات پـەیڕەویان لێبکـات، زیـاتر ئاشـکرای دەکەن کـەبیرو بۆچـونەکانی زبـرو توندڕەوانـە بوون. ئەمـــەش بەرهـــەمی ئەزمونـــە دوورو درێـــژەکانی خۆیـــەتی لەکایـــەی دیبلۆمـــاتی ســـەردەمەکەیدا. بەبۆچـونی ئـەو دیبلۆماسـیەت وشـەیەکی ناسـکە،

بەڵام لەناوەڕۆكیدا دڕندایەتی جەنگەڵی تێدایە لەبواری نێو دەوڵەتێدا.

میری نوێ دەبێت بەردەوام وریاو چاوكراوە بێت لەئاست پلانو چاوچنۆكی دراوسێكانیدا. بامیر لەیەككاتدا شێرو ڕێویش بێت. گەر بەتەنها هەر شێر بێت، ئەوا تەڵەكان نابینێت. ئەو تەڵە بێ شومارانەی لەجەنگەڵی نێو دەوڵەتیدا هەن. هاوكات ئەگەر هەر ڕێویش بێت ئەوا بەرامبەر گورگەكان ئەو گورگانەی لەژماردن نایەن، هیچی پێناكرێت. ئەو وەك یەك پێویستی بەوەیە ڕێوی بێت تانەكەوێتە داوەوەو، شێریش بێت بۆ ئەوەی گورگەكان بتۆقێنێت(23).

لەكتێبی (دەمەتەقێ)دا "مەكیاڤیللی" ئەو ڕێوشوێنە قورسانە دەخاتەڕوو، كەبەهۆیانەوە كۆماری ڕۆما توانی ئیمپراتۆریەتی خۆی دروست بكاتو لەسەر حسابی هاوپەیمانو دوژمنەكانیشی سنورەكانی بەرفراوان بكات. ئەم پرۆسەیە لەدیدی پیاوی خاوەن مۆراڵدا چەپەڵو بێزراوە، بەڵام لەڕوانگەی "مەكیاڤیللی" یەوە ئاساییو پەسەندە، تەنانەت ئەو پێشی سەرسام بووە پێی وابووە لەم بوارەدا ڕۆمانیەكان داهێنانیان كردووەو بەهۆی بلیمەتی سیاسی خۆیانەوە زانیویانە، چ فۆرمێكی گونجاو بۆ سەركەوتن لەدەرەوەدا دەدۆزنەوە، ئەو فۆرمە گونجاوەش تێكەڵیەكی چون یەك بووە لەهێزو فێڵ بازی.

**هێز**: بەر لەهەموو شتێك دەبێت میر هێزی پێویستو تەواوەتی هەبێت، بەواتایەكی دی خاوەنی چەكو تفاقی چاك بێت، واتە لەشكرێكی باشی لەهاوڵاتیان هەبێت. لێرەوە "مەكیاڤیللی" بەپێشەنگی ئەوانە درایە قەڵەم كەبانگەشە بۆ دروستكردنی سوپای نەتەوەیی- نیشتمانی دەكەن.

مافی سەرەتاو كۆتایی لەسیاسەتی میر بەتایبەت میری نوێ، لەبەكارهێنانی هێزدایە، واتە بەرپاكردنی جەنگ. جەنگیش بەدامو دەزگاكانیو ئەو ڕێسایانەی ڕێكی دەخەن، دەبێت ببێتە خولیای سەرەكی میر، چونكە جەنگ كارو پیشەی ڕاستەقینەی هەموو فەرمانڕەوایەكەو ئەو میرەشی ڕقی لەهونەری شەڕ دەبێتەوە، مەرگو لەناوچوونی خۆی نزیك دەخاتەوە. جەنگ ڕوداوێكی ئاساییە لەیاسای ژیانی ناو جەنگەڵدا، دابەشبوونی جیهانیش بەسەر دەوڵەتی جیاجیادا ئەگەری هەڵایسانی جەنگی پێیە، وەك چۆن هەور هەواڵی هاتنی زریانو گەردەلولی پێیە.

دەوڵەتی كۆماری وەك دەوڵەتی میر وایەو ئەگەر ویستی ژیانو بەردەوامی هەبێت، پێویستە گرنگی بەهەمان مەسەلە بدات. واتە گرنگی بدات. بەجەنگو ئەو دەزگاو ڕێسایانەی تەدارەك بۆ جەنگ دەكەن، بەڵام جیاوازیان لەوەدایە كەدەوڵەتی كۆماری داوای خۆبەختكردنو دڵسۆزی نواند لەتەواوی میللەت دەكات، لەكاتێكدا دەوڵەتی میر چارەنووسی خۆی وابەستەی ژیریو لێهاتوی تاكەیەك كەس دەكات، ئەمەش بەرەو باسكردنی فرتو فێڵ پەلكێشمان دەكات.

**فرتو فێڵ**: بەكارهێنانی فرتو فێڵو لەخشتەبردن كارێكی قێزەونە لەژیانی تایبەتیدا، بەڵام لەشەڕدا شتێكی گرنگو ناوازەیە. سەركەوتن بەسەر دوژمندا بەفێڵو تەڵەكەی ڕێویانە شایستەی خەلاتكردنو ڕێز لێنانە، وەك چۆن سەركەوتن بەهێزو ئازایەتی شێر شایستەی ئەوەیە. لەڕۆژگاری ئاشتیشدا فێڵو تەڵكە ڕۆڵی گرنگی خۆیی لەدەست نادات.. پێویستە حكومەتەكان لەكاتی ئەنجامدانی ڕێكەوتنو جێبەجێكردنی ڕێكەوتننامەكاندا، سیاسەتی فرتوفێڵكردن بگرنە بەر. ئەم شتانە بۆ دەوڵەت پێداویستێكی ناخۆشو ناچارین، لەبەرئەوەی جوانتر وایە مرۆڤ خاوەنی قسەی خۆی بێتو ڕێزی بەڵێنەكانی بگرێت، بەڵام ئەوانە

بوونەتە مەسەلە گەلێك كەئیتر مرۆڤایەتی سەودایان لەگەڵدا ناكات.

كاڵفامیو گەمژەییە مرۆڤ بەڵێنێك بەرێتە سەر كەزیان بەبەرژەوەندیەكانی بگەیەنێت، بەتایبەت گەر ئەو هۆكارانە نەمابن كە ئەو بەڵێنەیان پێ دابێت. ئەم مۆجیارییە لەنەسكی هەژدەمی كتێبی (میر)دا هاتووەو بەم ناونیشانەیە: (میر دەبێت چۆن بەڵێنەكانی خۆی بەرێتە سەر)، لەوێدا دەڵێت: (مادامەكی ئەوانی دی خراپەكارنو ئەو بەڵێنانەیان نابەنە سەر كەبەتۆیان داوە، ئەوا تۆش ناچارنیت بەڵێنی خۆت بەریتە سەر لەگەڵیاندا)[24].

نمونەی زۆر هەیە ئاشكرای دەكەن كەئەو كارانەی دەزانن زۆر بەچاكی لاسایی رێوی بكەنەوە، سەركەوتوترن لەو كارانەی پشت بەوەفاو ئەمەكداری دەبەستن. ئەڵبەتە نابێت مەردوم هیچ شتێك دەربارەی ئەم مەسەلانە بزانن، لەبەر ئەوەی ئەمانە نهێنی دەوڵەتن. پێویستە دەوڵەتیش بزانێت چۆن چۆنی پەیماننامەو رێكەوتنەكانی بەرەنگی وەفاو دادپەروەریو مافو رێز دەرازێنێتەوە. واچاكە نیشانی بدات كەئەوەی دەست دریژی كارەو تەڵەكە بازو زاڵمو پێشێلكاری حەقو بەڵێنە، ئەوا دوژمنەكانمان، دوژمنەكانی دوێنێ ئەمرۆو داهاتوومان. بەمجۆرەش دەوڵەت دەتوانێت هاوسۆزی خەڵك لەدەرەوەو ناوەوەدا بۆ خۆی رابكێشێت.

## بایەخی كەسی یاسادانەر:

لەپای گەندەڵیو ناهەمواری باری وڵاتەكەیو لەژێر كاریگەری ئەفسانەی یاسا دانەرانی كۆنی وەك: "شیشرۆنو بۆلیبۆس"، "مەكیاڤیللی" گرنگیەكی زۆری دایە یاسادانەرو پێی وابوو سەروەری كۆمەڵگەیە، چونكە بەلای ئەوەوە دەوڵەتی سەركەوتوو بەهۆی تەنها پیاوێكەوە دروست دەبێت. هاوكات ئەو پێی وابوو یاساكان مۆراڵو فەزیلەت لەئەندامانی كۆمەڵگەدا دروست دەكەن، هەر میللەتێكیش دوچاری گەندەڵیو ئاشوب بووەوە، لەخۆڕا حاڵی چاك نابێت، بەڵكو پێویستی بەیاسادانەرێكی بەتوانا هەیە ئەو یاسایانەیان بەسەردا بەسەپێنێت كەفەزیلەتی مۆراڵیو مەدەنیان تێدا دروست دەكات. "مەكیاڤیللی" بۆ رێكخستنی كۆمەڵگە گرنگی بەلایەنی سیاسی نادات، بەڵكو بایەخی زۆر بەلایەنی ئەخلاقیو كۆمەڵایەتی دەدات. لێرەوە هەموو مافێك دەداتە فەرمانڕەوا تا بە بەكارهێنانی جۆرەها شێواز ئەو یاسایانە بسەپێنێت كەئەخلاقی چاك لەهاوڵاتیاندا دەچێنێت، مەبەست لەمەش ریشەكێش كردنی گەندەڵیو دامەزراندنی دەوڵەتی نمونەییە. لەم بارەیەوە دەڵێت: (یاسادانەر ئەو ئەندازیارە نییە كەتەنها دەوڵەت دروست دەكات، بەڵكو ئەندازیاری كۆمەڵگەشە بەهەموو بنەما مۆراڵیو ئایینیو ئابوریەكانیەوە)[25].

## چاكترین سستمی سیاسیو هەست و سۆزە نیشتمانیەكانی:

لە كتێبی (میر)دا "مەكیاڤیللی" وەك بانگەشەكەرێك بۆ سستمی پاشایەتی رەها دەردەكەوێت، بەڵام لەكتێبی (دەمەتەقێ)دا باس لەسستمی كۆماری دەكاتو وەك كەسێكی ئازادی خواز دیارە.. لە (میر)دا ستایشی فەرمانڕەوای رەهای تاكەكەس دەكات كەهیچ سنورێك بۆ دەسەڵاتی نییەو دەسكراوەشی كردووە لەوەی هەرچی ئامرازە بەكاری بهێنێت، تادەسەڵاتی لەدەست نەچێتو شوێن پێی خۆی قایمتر بكات. بەڵام لە (دەمەتەقێ)دا دەبینین وازی لەو بۆچونانە هێناوەو لەوێدا بەراورد دەكات لەنێوان سستمی كۆماریو سستمی پاشایەتیو لەم بەراوردكاریەشدا سستمی كۆماری میللی پێ چاترە، لەبەرئەوەی لەسەر ئازادی دادەمەزرێتو بێ ئازادیش دەوڵەت

ناتوانێت خۆی بەهێز بکات و بەرەو بەتوانا مادیەکانی خۆی بدات، هاوکات سستمی حوکمڕانی ڕەهای تاکەکەسی ڕەتدەکاتەوە کەئازادییەکان سنوردار دەکات و جگە لەبەرژەوەندیەکانی خۆشی خزمەت بەهیچ لایەکی تر ناکات.

لەبەراوردکردنی نێوان هەردوو سستمی کۆماری و پاشایەتیدا، "مەکیاڤیللی" پێی وایەکە:

1-سستمی کۆماری توانای سیاسی و گەشەکردنی زیاتری هەیە لەسیستمی پاشایەتی، کەخەسڵەتی سەرەکی بریتیە لەنەگۆڕان و چەق بەستن و دژایەتیکردنی هەموو شتێکی تازە.

2-سستمی کۆماری دەرفەت لەبەردەم تواناکاندا دەڕەخسێنێت و یەکسانیش دەستەبەر دەکات، بەڵام سستمی پاشایەتی بەپش بەستنی بەپرانسیپی (میراتی جێهێشتنی باوك بۆ كوڕ)، لەگەڵ دادپەروەری و یەکسانیدا کۆك نییەو هاوکات ڕێزی بەهرەو تواناکانیش ناگرێت.

3-سستمی کۆماری میللی زیاتر ڕێزی ڕێکەوتن و پەیماننامە دەوڵەتیەکان دەگرێت، بەپێچەوانەی سستمی پاشایەتیەوە کەڕێزی ئەو بەڵێننامانە ناگرێت، ئەگەر هاتوو پاشا زانی بەرژوەندەیەکانی ژیانی لێدەکەوێت، بەبێ گوێدانە ئەوەی کارێکی وا دەبێتە مایەی زیان گەیاندن بە بەرژەوەندیەکانی میللەتەکەی.

هەرچەندە "مەکیاڤیللی" سستمی کۆماری لەسستمی پاشایەتی پێ چاترە، بەڵام دەستبەرداری ئەو بۆچوونەی نەبوو کەدەبێت دژایەتی ئۆرستۆکراتیەت و خانەدانەکان بکرێت. چونکە ئەوانە مشەخۆری ناو کۆمەڵگەن و جگە لەزیادکردنی سامان و مەسرەفکردن لەخۆیاندا خەمێکی تریان نییە. ئەمانە بەتەمەڵی ژیان دەگوزەرێنن و پشت بەقازانج و دەسکەوتی ماڵ و سامانەکانیان دەبەستن، بەبێ پێشکەشکردنی هیچ خزمەتێکی بەکەڵك بۆ کۆمەڵگەکەیان. ئەمانە لەهەر جێگایەکدابن دوژمنی هەموو حوکمڕانیەکی مەدەنین، لەبەرئەوەی بەرژەوەندی ئەمان بەبەردەوامی دژ بەبەرژەوەندی چینی ناوەڕاستە، بۆیە پێویستە سستمی حوکمڕانی ئیتر پادشایەتی بێت یان کۆماری، سەرکوتیان بکات و لەکۆمەڵگەدا نەیان هێڵێت.

ڕاڕایی بیروبۆچوونە سیاسیەکانی "مەکیاڤیللی" سەبارەت بەسستمی حوکمڕانی، وایکرد نەتوانێت تیۆریایەکی گشتی داڕێژێت تاداکۆکی پێ لە بڕوابوونی خۆی بەحوکمی ڕەها بکات، بەپێچەوانەی ئەوەی کە "هۆبز" لەدواتردا کردی. "مەکیاڤیللی" لەنێوان قەناعەتی بەسستمێکی پادشای ڕەهاو پێداویستی بوونی ئەو سستمە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکەی لەیەکخستنەوەی ئیتاڵیا، لەگەڵ خۆشەویستی بۆ سستمی کۆماری دیموکراسی کە لەڕۆمای کۆندا لەئارەدابوو، تیامابوو. بۆئەوەی لەنێوان ئەم دوو بۆچوونەدا گونجانێك بکات و ئەو ناکۆکیە ئاشکرایەش لەنوسینەکانیدا نەهێڵێت، گەیشتە دەرەنجامێك کەئەو لەقۆناغی دروستبوونی دەوڵەتدا باوەڕی بەسستمی حوکمڕانی ڕەها هەیە، بەڵام کاتێك باروودۆخ ئارام بووەوە میللەت لەگەندەڵی وازی هێناو مۆراڵ و فەزیلەت کۆمەڵگەی گرتەوە، ئەو کاتە سستمی کۆماری دیموکراسی بەلاوە پەسەندە. لەبەرئەوە دەکرێت بڵێین "مەکیاڤیللی" دوو تیۆریای خستۆتەڕوو: تیۆریایەك دەربارەی دروستبونی دەوڵەت و تیۆریایەکی تر سەبارەت بەپارێزگاری لێکردنی، پێویستە لەدوو حاڵەتدا سستمی حوکمڕانی ڕەهامان قبوڵ بێت:

یەکەم/ لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێدا.

دووەم/ لەحاڵەتی چاکسازی کردن لەدەوڵەتێکی گەندەڵدا.

سەروەختێکیش باروودۆخ ئارام بووەوە، هاوڵاتیان مافی بەشداریکردنی حوکمڕانی کردنیان

دەبێت بۆ ئەوەی مانەوەی دەوڵەت بەردەوام بێت. لەم سەروبەندەشدا پێویستە حکومەت یاساکان دابڕێژێت و ڕێز لەو یاسایانەش بگرێت، وەك چۆن دەبێت ڕێز لە مافە سەرەکیەکانی تاکەکەسیش بگرێت، لەبەرئەوەی تەنها بەوە دەتوانێت مانەوەی دەوڵەت مسۆگەر بکات. بایەخدانی بەپارێزگاری کردن لەدەوڵەت، وای لە "مەکیاڤیللی" کرد بەتوندی دژایەتی هەر جۆرە بەکارهێنانێکی هێزی کرێگرتە بکات بۆ بەرگریکردن لەنیشتمان، چونکە ئەوانەی بەمەترسی دەزانی بۆ سەر ئارامی و ئاسایشی دەوڵەت و خەمی گەورەشیان وەرگرتنی زۆرترین موچەیەو بەردەوام ئامادەشن بۆ ئەوەی ئەم میر بە ئەو میر بگۆڕن، بۆ هیچ کەسێکیش دڵسۆز نین تەنها بۆ مادە نەبێت.

بەم پێیە ئەوانە لەدوژمن مەترسیدارترن بۆسەر میر. سوپای نیشتمانی فەرەنسای مەشقپێکراوی بە نمونەیەك دەزانی کەدەبوو چاوی لێ بکرێت، بۆئەم مەبەستەش داوای دەکرد سوپایەك لەهاولاتیان دروستبکرێت و مەشق بدرێن، لەبەرئەوەی پێداویستی یەکەم و سەرەکین بۆمانەوەو گەشەسەندنی دەوڵەتان. ئەمەش وادەکات پێشنیاری تەعمیمکردنی سستمی خزمەتی سەربازی بکات بەسەر سەرجەم هاولاتیاندا بەتایبەت (پیاوان لەنێوان تەمەنی حەڤدە ساڵ بۆ چل ساڵی). ئەم مەسەلەیە سوپا بەهێزدەکات و توانای ئەوەشی دەداتێ میر لەشۆڕش و ڕاپەڕینەکانی ناوخۆ بپارێزێت، هەروەها لەدژی مەرامی دوژمنکاری ولاتانی بیانیش داکۆکی لەولات بکات.

رقی زۆری "مەکیاڤیلی" لەچینی خانەدانەکان، ئەوانەی دەسەلاتداری هەرێمەکانی ئیتاڵیا بوون و لەگەڵ یەکتردا ناکۆکبون، ئەمەش ئیتاڵیای لاواز کردو بەپارچە پارچەیی هێشتیەوە. هاوکات هەستکردن بەبایەخ و گرنگی سوپایەکی نیشتمانی ڕێك و پێك کە دڵسۆزی نیشتمانەکەی بێت، دەیسەلمێنن ئەو چ هەستێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی هەبووە، بەو مەبەستەی ولاتەکەی لەورەوشی گەندەڵیە قوتار بکات کەئیتاڵیای بەسەر چەند هەرێمێکی ناکۆك و دژ بەیەکدا دابەشکردبوو، ئەمەش وایکردبوو ولاتانی بیانی چاوی تەمحکاری تێبڕن و بیر لەداگیرکردنی بکەنەوە.

"مەکیاڤیلی" بەهەستێکی نیشتمانی راستگۆوە باس لە ولاتەکەی دەکات و ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر نیشتمانەکەی لەسەرو هەموو شتێکی ترەوە دادەنێت، لەم بارەیەوە دەڵێت: (پێویستە مرۆڤ لەپێناو ولاتەکەیدا هەموو شتێك بکات و بۆ پاراستنی ژیان و ئازادی ولاتەکەی کۆلە هیچ شتێك نەکاتەوە.. ئەمەش ئەو ڕێگایەیە فەرەنسیەکان لەسەری دەڕۆن و بەقسەو کردارەکانیانەوە دیارە، بۆپاراستنی شکۆی پادشاکەیان و سەروەری ولاتەکەیان) [26].

## پەراوێزەکان

1-جۆرج سباین: تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث – ترجمة: د. راشد البراوي – دار المعارف بالأشتراك مع مؤسسة فرانكلين للطباعة و النشر، القاهرة – 1971، ص .473

2-جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسي من المدينة الدولة الى الدولة القومية – ص .232

*هەندێك پێیان وایە ساڵی 1521 تەواوی کردووە.

3-جان جاك شوفالييه: سەرچاوەی پێشوو، ص .232

4-maxey: political philosophies، p.p. 130:

وەرگیراوە لە: د. عبدالمعطي محمد: الفكر السياسي الغربي – دار الجامعات المصريه، الاسكندريه – 1975، ص .181

5-سەرچاوەی پێشوو، ص .181

6–د.عبدالمعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو، ص 181.

7–نيقولا ميكافللى: الامير – تعريب: خيرى حماد – منشورات دار الافاق الجديدة، بيروت – ط 11، 1981، ص 135.

8–د. ابراهيم دسوقي اباظة، د. عبدالعزيز الغنام: تأريخ الفكر السياسي – دار النجاح، بيروت –1973، ص 180.

9–جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسي من المدينة الدولة الى الدولة القومية – ص 239. هەروەها: ص 707، 708.

*10-maxey: political philosophies، p.p: 131-132.*

وەرگیراوە لە: د. علي عبدالمعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو، ص 180.

11–جان جاك شوفالييه: سەرچاوەی پێشوو، ص 238. هەروەها بڕوانە: د. مصطفى البارودي: لمحات من الفكر السياسي حول الفرد و الدولة – مطبعة الجامعة السورية، دمشق – ص 124.

*12-prelot، marcel: histoire des Idees politiq ues، 2eme edition، Dalloz، 1976، pp: 203-204.*

13–د. علي عبد المعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو – ص 180.

14–جان جاك شوفالييه: سەرچاوەی پێشوو، ص 242.

هەروەها بڕوانە:

–دەمەتەقێ، ص 519.

–جورج سباين: تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث – ص 477.

15–نيقولا ميكافللي: الأمير – تعريب: خيري حماد – دار الافاق الجديدة، بيروت – 1981، ص 8.

16–سەرچاوەی پێشوو – ص 144.

17–د. مصطفى البارودي: لمحات من الفكر السياسي حول الفرد و الدولة – مطبعة الجامعة السورية، دمشق – 1958، ص 135. هەروەها بڕوانە:

–جان جاك شوفالييە: سەرچاوەی پێشوو – ص 239.

18–الأمير – ص 334، 337. لە – جان جاك شوفالييە: سەرچاوەی پێشوو، ص 240 – وەرگیراوە.

19–جان جاك شوفالييە: سەرچاوەی پێشوو– ص 240.

20–نيقولا ميكافللى: الأمير – ص 141.

21–سەرچاوەی پێشوو، ص 142.

22–نيقولا ميكافللى: الأمير – ص ص 143، 144.

23–سەرچاوەی پێشوو، ص 149.

24–سەرچاوەی پێشوو، ص 148.

25–جورج سباين: تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث – ترجمة: د. راشد البراوي – دار المعارف بمصر، القاهرة – 1971، ص 482.

26–المطارحات– تعريب: خيري حماد– منشورات المكتب التجاري، بيروت – 1962، ط1 – ص ص 748، 749.

## سەرچاوە

د. موسى ابراهيم: معالم الفكر السياسي الحديث و المعاصر – مؤسسة عزالدين للطباعة و النشر، بيروت – الطبعة الاولى، 1994.

# قانوون و هێز

له عەرەبییەوە: ئاسۆ کەریم

له بانتیۆنی *Panthion* میزۆپۆتامیا، دوو خواوەند هەبوون، کە ڕێزو پیرۆزیی زێتریان لە بەرانبەردا دەنوێندرا: ئەو دووانەش ئانو *Anu* ی خواوەندی ئاسمان و ئینلیل *Enlil* ی خوداوەندی باهۆز بوون. گەردوون، بە دەوڵەتێکی کە خواوەندان فەرمانڕوایی بکەن، دەچوێندرا. لێ لە نێوان دەوری ئەم دوو خواوەندە سەرەکییەی ناو زنجیرەی خواوەندان، جیاوازییەکی یەکلاکەرەوە هەبوو. لە لایەکەوە کە خواوەندی ئاسمان فەرمانی دەدا، دەبوایە مل بۆ ئەو فەرمانە دابنەوێندرێ هەر لەبەر ئەوەی ئەو فەرمانە، فەرمانی خواوەندی هەرە مەزن بووە. ئا بەم شێوەیە بەرفەرمانبوون بووە پێویستیەکی بێ چارە و فەرمانێکی توندی وتووێژهەڵنەگر. لە سیستەمی گەردوونیدا، ئانو هێمای دەسەڵات بوو. تەنانەت لەسایەی ئەم بارەشدا، دەسەڵاتی خواوەندان —بە هەموو شەقڵە رەها بێ کۆت و مەرجەکانییەوە— هیچ گەرەنتییەکی نەبووە کە لەخۆوە مل بۆ ئەو فەرمانانەی لەسەرەوە دەهاتنە خوارەوە کە چ بکرێ. ئیدی لە سۆنگەی ئەمەوە بەناچاری دەبوایە دەقگەلێك بۆ سزادانی سەرپێچیکاران، جا خواوەند بوونایە یان بنیادەم، دابندرێ. ئا لێرەوە، هێزی باهۆز "ئینلیل"، هێزی بەزۆر، خواوەندی ناچارکردن، کە بڕیاری خواوەندانی جێبەجێ دەکرد و لە شەڕدا ڕێبەرایەتی دەکردن، پەیدابوو.

ئەگەر بە قوڵایی ڕۆبچین، زۆر شتی بنچینەیی لە ڕەوتارو ئامانجی مرۆیی لە ناو ئەفسانەی کەونارادا دەبینینەوە. هەردوو ئەفسانەی ئانو و ئینلیل، ئەو هەستە مرۆییە قوڵە سەبارەت بە پێویستبوونی نیزام دەردەبڕن. نیزامێکی لەمجۆرە — چ لەئاستی ئاسمانی و چ لە ئاستی دنیایی— پێویستیی بە دوو توخمی بنچینەیی و هاوبەند هەیە: دەسەلات و زۆرنواندن. چونکە بەبێ داننان بە دەسەڵاتێك کە قانوونگەل و بنەماکانی ئەو دەسەڵاتە، قەوارەی نیزام لە جیهاندا بڕیار دەدەن، شتێك بە ناوی کۆمەڵگەیەکی ڕێکوپێك بوونی نابێ. پاشان دەسەڵاتی حوکمی خودایی، دەشێ وا بکا گەردوون وەکو گشتێکی کۆمەڵایەتی کار بکا. بەڵام گەردوون بەبێ بوونی توخمی هێز کە ملدان بۆ فەرمانی خودایی دەستەبەر دەکا، هەرگیز ناگاتە دەوری دەوڵەت. ئا ئاوا دانیشتوانی وڵاتی میزۆپۆتامیای کەونارا ئەم دوو مەرجەی پێشەوەیان بە پێویست دانا بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی خۆیان کە لەسەر رووی پان و پۆڕی گەردوون ڕەنگیان

داوەتەوە، هەوڵیاندا بناخەیەکی گەردوونیش بۆ بەستنەوەی دەسەڵاتی شەرعی و هێز لەسەر ئەم خاکە لێبدەن.

راستییەکەی، ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ خواوەندان خۆیان، لە قۆناخە کەمتر ئاڵۆز و پاڵۆزەکانی بەرایی ئایینەکاندا، بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان پێویستیان بەبەکارهێنانی هێز هەبووە، دیاریدەیەکی باو بووە. کەس لە بروسکەکانی خوداوەندە "زفس" ((زیۆس))ی یۆنانی، هەروەکو خوێنەرانی شیعرەکانی هۆمیرۆس دێتەوە بیریان، قوتاری نەبووە — جا چ خواوەندێ بوایە لە خواوەندەکانی ئۆلمپ، یان بنیادەمێکی فانی — ئەگەر گاڵتەی بە فرمانەکانی ئەو بکردایە، یان بەم یان بەو شێوەیە رکی زیۆسی بکردبایەوە. وەلێ ئێمە ئەفسانە کۆنەکانی ولاتی نێوان دوو رووبارمان بۆیە هەڵبژارد، با ئەو ئەفسانانە باویش نەبن، تا جەخت لەسەر ئەم رووکارە لە رووکارەکانی فیکری مرۆیی بکەینەوە. چونکە ئەم ئەفسانانە بە شێوەیەکی دەگمەن هەردوو توخمی دەسەڵات و هێز خویا دەکەن کە بەبێ ئەو دووانە هیچ نیزامێك، چ خودایی بێ یان مرۆیی، لەسەر پێی خۆی ناوەستێ. لێرە بەدواوە لە چوارچێوەی تیوری قانوونی بە درێژتر لەم دوو چەمکە، دەدوێین.

## دەسەڵات:

بیرۆکەی قانوون، لە بیرۆکەی بەرفەرمانبوون هەراوترە. لێ توخمی بەرفەرمانبوون، توخمێکی یەکلاکەرەوەیە. دەبێ ئێمە ئەم جۆرە بەرفەرمانبوونە کە خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی پێوەندیی قانوونی، لە شتی تر جیا بکەینەوە. دیقەت بفەرموون لە کردەوەیەکی چەکدارانەی دەسگرتن بەسەر بانکێکدا، قوربانییان هەرچییان لێ داوا بکرێ بلەز فەرمانەکانی باندە چەردە چەکدارەکە جێبەجێ دەکەن، وەلێ ئەم گوێڕایەڵییە

هیچ پێوەندییەکی بە ملکەچکردنی رەعیەت بۆ ئاغایە دەرەبەگەکەی نییە ، یان بە ملکەچکردنی هاوولاتی بۆ فەرمانەکانی ئەفسەرێکی پۆلیس، یان بە ملکەچکردنی داواکار کە دادخوازییەکەی بە قازانجی ئەو تەواو نەبووە. ئەم بەراوردە، تەنیا بەراوردێکی رووت نییە لە نێوان حەزکردن و حەزنەکردن لە بەگوێکردن. چونکە جۆتکار و هاوولات و داواکار رەنگە هەر هەموویان لە ملکەچکردن بۆ دەسەلاتێکی باڵاتر لە خۆیان دوودڵ بن چ لە سات وکاتی خۆیدا و چ لە دۆخێکی گشتگیرتردا. هەروەکو چۆن کارمەندانی بانکی تایین، شتە گرانبەها و بەنرخەکان بە پەلاماردەران دەدەن.

بیرۆکەی دەسەلات، وا دەخوازێت کەسێکی دیاریکراو هەبێ کە مل بۆ کەسێکی دی کەچ بکا، بەبێ رەچاوکردنی ئەوەی کە داخوا ئەو کەسە، قانوون، یان فەرمانەکەی پێ پەسندە یان نا. هەڵبەت ئەو کەسەی کە دەبێ ملی بۆ دابنەوێندرێ، مەرج نییە تاکەکەسێك بێ هەروەکو لە پاشایەتی رەهادا وایە، بەڵکە ئەگەری ئەوەش هەیە کە سیستەمێکی کۆمەلایەتی بێ کە قەوارەیەکی بان سروشت، یان سازمانێکی مرۆیی بە کۆمەڵ بێ وەکو شاژن لە پەرلەمانی بەریتانیا، یان کۆنگرس لە ئەمریکا. لێرەدا تەنیا باسمان لەو کەسەیە کە دەبێ مل بۆ فەرمانەکانی دابنەوێندرێ.

کاتێ ئەو دۆخانەی هێنامانەوە، بەرچاومانگرتن، خویا دەبێ کە جۆتکار، ئاغاکەی بەو کەسە دەزانێ کە دەبێ ملی بۆ دابنەوێنێ. هەروا هاوولات، ئەفسەری پۆلیس بە کەسی خوازراو دەزانێ کە دەبێ گوێڕایەڵی بۆ بکات، هەمان شت سەبارەت بە داواکار و دادوەرەوە. لەم بارانەدا، دەبینین کاودانێکی تەمومژاوی دەوری هەر یەك لە ئاغا و ئەفسەر و دادوەرەکەی داوە، کە کاردانەوە، یان بەپیرەوەهاتن و دەنگدانەوەیەك لە

دەروونی دەستەی دووەم دەگورێنیٚ، هەستێکی وا باڵ بەسەر ئەو دەستەیەدا دەکێشیٚ کە دەستەی یەکەم لەو بالاٚتر و بەشکۆترن. هەر بەم سیفەتەشەوە، دەستەی یەکەم فەرمان دەدەن، دەستەی خوارتریش هەست بە پابەندبوون و ملدانەواندن دەکەن جا پێیان خۆش بێت یان نا. ئەم هەستە رەوایەی بە پاشکۆبوون، گرنگییەکی مەزنی لە قانووندا هەیە و پێویستیی بە روونکردنەوەی زێترە.

بۆ دەبیٚ کەسێك بەو جۆرە هەست بکا کە پابەندە بە داننان بە دەسەڵاتی یەکێکی تر و ئیدی بەناچاری فەرمانەکانی ئەو کەسە جێبەجیٚ بکا؟ بە شێوەیەکی تر، سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە داسەپاوە، یان گریمان داسەپاوە بەسەر لایەنی ملکەچکەردا لە کوێوەیە؟

وەلاٚمی پرەنسیپئامێزی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئەم پابەندبوونە، لە بنەڕەتدا، پابەندبوونێکی ئەدەبییە، بەو مانایەی کە کابرای گوێڕایەڵ بەکردەوە هەست بەوە دەکا، کە ئەو لە بەردەم ئەرکێکی ئەدەبیی ملدانەواندن دایە بۆ فەرمانەکانی ئاغا، یان پۆلیس، یان دادوەر بەپێی کاودانی بەرهەست. ئەم چەمکە ئەدەبی، یان مۆرالییە و پێوەندیی ئەو بە قانوونەوە، چەندین ئاریشە و سەختی تێدایە کە دەبیٚ دواتر پێیاندا بچینەوە. شایانی گوتنە لەمبارەوە پێوەندییەکی دیاریکراو لە نێوان بیرۆکەی دەسەلاٚتی شەرعی کە دەبیٚ بەهۆی رەوابوونیەوە ملی بۆ دابنەوێندریٚ و بیرۆکەی پابەندبوونی ئەدەبیدا هەیە. ئەم پێوەندییە، بنەماو رێسایەك دەسەپێنێت کە داوای خۆبەستنەوەی ئارەزوومەندانە بە حوکمی راست و دروستی رێساکە، دەخوازیٚ. هەردوو بیرۆکەی سەرەوە پابەندکارن بە هۆی ئەوەوە کە ئەرکی گوێڕایەڵییان بەبیٚ بەکارهێنانی هێز، گرتووەتە خۆ. ئا لێرەوە، هەست بەوە دەکریٚ کە ئەوە ئەرکێکی ئەدەبییە، گوێڕایەڵیی قانوون بکریٚ بەو مانایەی کە قانوون، نوێنەرایەتی دەسەلاٚتێکی شەرعی دەکات.

وەلیٚ مەترسیی گەورەش لە هەراوکردنی ئەم وتووێژەدا هەیە. لەوانەیە بڕوایەکی چەوت لەمە بکەویتەوە کە شەرعیەت و رەوشت دەشیٚ ببنە هاوشانی یەکتر. هەندیٚ لە کۆمەڵگاکان بەم دەرەنجامە گەیشتوون. ئا ئاوا مافی خوایی پاشایان مایەی ئەوە بووە کە پاشا بە مەعسووم لە هەڵەو چەوتی دابندریٚ. دواتر کە بە درێژی باسی پێوەندیی نیوان قانوون و رەوشت دەکەین، دەبینین هۆی بەهێز هەن بۆ وەلانانی ئەم بیرۆکەیە و داننان بەوە کە بواری هەر یەك لە دەسەلاٚتی شەرعی و دەسەلاٚتی ئەدەبی، وێڕای ئاوێتەبوونی توندوتۆڵی ئەو دووانە، دوو بواری لێکجودا و بەجیا هەڵکەوتوون. لەسەرینی ئەمەوە، ئەوەی لێرەدا پێی لەسەر دادەگرین ئەوەیە کە بیرۆکەی ئەو دەسەلاٚتەی دان بە رەوابوونی دانراوە، زۆر هێز و شنگی خۆی لە پێوەندیی بە پابەندبوونی ئەدەبییەوە وەردەگریٚ. ئا ئەمە رەوش و دۆخی شۆرشانە دژی دەسەلاٚتی ئارا، کاتیٚ کە شۆرشگێران هەوڵدەدەن کێشەی خۆیان پتەو بکەن و بەهەر هۆیەك بیٚ بیسەلمێنن کە دەسەلاٚتی ئارا ناڕەوایە و حوکمڕانان هیچ پاکانەیەکی قانوونی، یان مۆرالییان بەدەستەوە نییە بۆ بەرفەرمانبوون. ئەم وتووێژە بە تایبەتی لە هەردوو سەدەی شازدە و حەڤدە بڵاو بۆوە. ئەو دەمە حکوومەت وەکو دامەزراوێك کە بەپێی کۆنتراکتی کۆمەلاٚیەتی سازکرابیٚ، چاوی لە دەکرا. ئەگەر فەرمانڕەوا ئەم پەیمانەی نەگەیاندبایە جیٚ، هەروەکو جیمسی دووەم ، ئەوا رەعیەت پابەند نەدەبوون مل بۆ دەسەلاٚت کەچ بکەن.

## کاریزما Charisma

خاسترین شرۆڤە لەبارەی ئەو میتۆدانەی کە دەسەلاٚت بەسایەیانەوە لە کۆمەڵگەی مرۆییدا خۆی

دادەمەزرێنێ، ئەو شرۆڤەیەیە کە کۆمەڵناسی ئەڵمانی (ماکس ڤیبەر ***Max Weber*** 1920 مردووە) کردوویە. دەسەڵات، یان کۆنترۆڵی شەرعی، هەروەکو ڤیبەر وەسفی دەکا، یەکێ لەم سێ شێوەیەی خوارەوە دەگرێتە خۆ:

1- بەهرەی خودایی، 2- داب و نەریت، 3- قانوون.

وشەی بەهرە ((کاریزما)) وشەیەکی گریکییە و بەمانای ((ناز و نیعمەت)) دێت. مەبەستی ڤیبەر لەم وشەیە ئەو هەیبەت و شکۆ تایبەتییە تاکەکەسییەیە کە دەشێ مرۆ لە کۆمەڵگەیەکی تایبەتدا وەدەستی بێنێ. ئەم شکۆیە خەرمانەیەکی شەرعی بێ ئەملا و ئەولا بەدەوری هەموو رەوتار و کار و کردەکانی ئەو مرۆیە دروست دەکا، زۆر جاران ئەم بارە لە ئاکامی سەرکەوتنێکی سەربازی دروست دەبێ. ئەسکەندەری گەورە و ناپلیۆن نموونەگەلی لەم بابەتەن.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا نموونەگەلێکمان لە فەرمانڕەوایی کاریزمایی بەشێوەی دیکتاتۆر بینی لە بابەتی هیتلەر و مۆسۆلینی و ستالین کە هیچ بوار و دەرفەتێك بۆ گومان سەبارەت بە واقیعیبوونی ئەم شێوەیە لە شێوەکانی دەسەڵات ناهێڵێتەوە بەلەبەرچاوگرتنی ئەو شەقڵ و مۆرکەی لە سایەی سەردەمی تەکنەلۆجیای مۆدێرندا بەخۆیەوە دەگرێت. ئێمە هەر تەنیا وێنەیەکی راستگۆی ئەو کاریگەرییە موگناتیسییە نابینین کە هەندێ لە تاکەکەسان بەسەر شوێنکەوتوانی خۆیانەوەیان هەبووە، بەڵکە کاریگەریشیان بەسەر چەندین نەتەوە بە بتوونی هەبووە. مینا ئەو وێنە جوانەی پرۆفیسۆر (*تریفۆر ریبۆر* ***Trivor_Ripor*** )) لەبارەی دوا رۆژەکانی هیتلەر کێشاویە کە لە ژوورە قایمەکەی خۆیدا کەلەلا ببوو. لە گەڵ ئەوەشدا فەرمانگەلی شێتانەی ئەوتۆی دەردەکرد کە کەس زاتی ئەوەی نەبووە لە روویدا هەڵگەڕێتەوە.

## باڵادەستیی داب و نەریت:

دەشێ بەهرەی مرۆڤ کلیلێك بێت بۆ حاڵیبوون لە پرەنسیپی شەرعییەت. ئەو ژی لەبەر پێداگرتنێکی زۆر لەسەر ئەو هێزە دەروونیانەی ئەم چەمکە پێکدەهێنن. وەلێ خاڵی گرنگ ئەوەیە لە کاتێکدا رەنگە بەهرە، ئەو دەسەڵاتە بهێنێتە ئاراوە و بگورێنێ کە پاڵ بەسام و شکۆی کەسایەتیی پێشەوای تازە بدا، ئەمە سەرەڕای بوونی مەیل و خولیایەکی سروشتکرد بە ئاراستەی کوژاندنەوەی ژیلەمۆی ئەم سام و شکۆیە لە دوای مردنی پێشەوای تایین. ئەمە وا ناکەوێتەوە کە بەشێوەیەکی حەتمی ئەو بەهرەیە بە کەسایەتیی پێشەواکەوە بەندە، هەروەکو ڤیبەر ئاماژەی بۆ دەکا، ئەو دەسەڵاتە لە بنەچەکەدا سەرچاوەکەی کەسایەتیی سەرکردەکەیە، کە رەنگە بۆ وەچەی دوای ئەویش بگوازرێتەوە وەلێ بەشێوەیەکی کزتر. دەشێ تێبینی ئەم دیاریدەیە لە هەندێ پاشانشینی تازەشدا بکرێ، کە جێنشینەکانی سەرکردەی دامەزرێنەری ماڵباتی حوکمڕان، دەسەڵاتی شەرعیی خۆیان لە کەسی پێش خۆیانەوە وەردەگرن، وێڕای ئەوەی کە رەنگە هەندێ، یان گشت خەسڵەتەکانی پێشەوا دامەزرێنەرەکەیان تێدا نەبێ. دەشێ تێبینی هەمان شت لە کایەی تری نا- سیاسیشدا بکرێ. دامەزرێنەرانی ئایینەکان، سیفەتی بەهرەدارییان تێدا بووە. وشە و پەیڤەکانیان، کاریگەریی فەرمان و دەسەڵاتیان هەبووە و دوای مردنیشیان لەوانەیە پێڕەوانیان بشێن ئەم دەسەڵاتە بپارێزن و ئاقارەکەی فرەوانتر بکەن، تەنانەت ئەگەر بەهرەیەکی کەمیشیان لەچاو بەهرەی دامەزرێنەرەکە هەبێ کە هەژموونی بەسەر شوێنکەوتووانیەوە هەبووە، ئەگەر ئەم بارە بۆ ماوەیەك بەردەوام ببێ، ئەوا ئەم بەهرە رەسەنە لە چوارچێوەی دامەزراوەیەکدا خۆی دەبینێتەوە، واتە

لە چەشنێ لە دامەزراوەی هەمیشەیی قەرزارباری داب و نەریت و خو و خدە، خۆ دەنوێنێ.

نموونەیەکی ئاشکرای ئەم جۆرە " لە قاڵبدانی دامەزراوە"ییە، پاشایەتییە لە سیستەم یان کۆمەڵگەی فیۆدالیدا، چونکە هێشتا بەهرە بوونی هەبووە، بەڵام زۆر بە پاشا خۆی نەبەستراوەتەوە هەندەی بە سیستەمی پاشایەتییەوە بەندە، یان بە تاجەوە هەروەکو لە بەجێهێنانی دەستووریی بەریتانیدا دەگوترێ. چونکە فەرمانڕەواییکردن هەر تاکەکەسییە، بەو مانایەی کە پاشا تا رادەیەکی فرەوان دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردنی بە دەستەوەیە و بەشێوەیەکی رەواش پراکتیزەی دەکا، وەلێ مۆرکی دامەزراوەی پاشایەتی، کۆمەڵێ خو و خدەی نەریتخوازانەی گوراندووە کە بە پابەندکار بە ئەژمار دێ. ئا بەم شێوەیە سنوور بۆ ئازادیی رەوتاری ئەو کەسەی لەسەر تەختی پاشایەتی رونیشتووە، دادەنرێ. ئەم چەمکە بە باشترین شێوە لەو دەستەواژە نامێیەی ((برکتۆن *Bracton*)) خۆ دەنوێنێت کە گوتویەتی: دەبێ پاشا لە خوارەوەی خوا و قانوون بێت.

## باڵادەستیی شەرعی

ئەو جۆرە باڵادەستییەی کە ڤیبەر بە "داب و نەریت"ی ناو دەبا تێکەڵەیەکە لە توخمگەلی کەسایەتی و قانوونی و دەشێ وردە- وردە گەشە بکا و شێوەیەکی پەرەگرتووتر وەربگرێ کە ڤیبەر ناوی " باڵادەستیی شەرعیی" لێناوە. ئەم وشەیە، مرۆ خاپێنە، چونکە وای دادەنێت کە قانوون بە مانای وردی خۆی، لە دوا شێوەی دەسەڵاتدا هەیە، کەچی مەسەلەکە وانییە و ڤیبەر خۆیشی مەبەستی ئەوە نەبووە. تەنانەت لە سایەی فەرمانڕەوایی "کاریزما"ی رووتیشدا، لەبەر نەبوونی بنەماگەلێکی قانوونی هیچ هۆیەك نییە بۆ بەرەوا دانانیان، تەنانەت ئەگەر مانەوە و بوونی ئەو بنەمایانەش

پشت بە خواست و ویستی سەرکردەی کاریزمایی ببەستن. لەمبارەوە دەکرێ ئەوە بهێنینەوە یاد کە کۆکردنەوەی قانوونی رۆمانی لە لایەن جۆستنیان -ەوە کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر پەرەسەندنی قانوونی ئەورووپی مۆدێرندا هەبووە، ئەمە لەسایەی سیستەمێك بووە کە بڕوای بەو بنەما دەستوورییە هەبووە کە دەڵێ: خواست و ویستی ئیمپراتۆر بۆ خۆی قانوونە. هەروا سیستەمی کۆنباوی فەرمانڕەوایش بەبێ بنەماگەلێکی قانوونی نەبووە، با ئەو بنەماگەلە رووخسارێکی عورفی نەك یاسارێژییان پێوە دیار بووبێ. مەبەستی ڤیبەر لە پێداگرتن لەسەر بەکارهێنانی وشەی "قانوونی" بەتایبەتی لە شێوەی سێیەمی شێوەکانی کۆنترۆڵ، ئەوەیە کە لە سایەی ئەم سیستەمەدا، کۆنترۆڵی شەرعیی، چی دی تاکەکەسی نییە، واتە پێوەندیی بە تاکەکەس نەماوە و رووخساری دەسەڵات تا رادەیەکی گەورە، ئەگەر بە تەواویش نەبێت، رووخساری دامەزراوەیی وەرگرتووە و دامەزراوە جێگەی دەسەڵاتی تاکەکەسی گرتووەتەوە.

بۆ نموونە دەوڵەتی دیموکراتیی مۆدێرن، وازی لە دەسەڵاتی کاریزمایی بۆ بەرژەوەندی دامەزراوەی قانووندانان و بیرۆکراسیی و دادوەری کە بەبێ کەس کاری خۆی دەکا لەسایەی سیستەمێکی قانوونی کە رەوایی بەکارهێنانی هێزی پاوانکردووە.

لەم بارەدا، کۆنترۆڵی قانوونی، کاریزمای کەسایەتی دەخاتە لاوە، لێ هەر بڕوای بەرەوابوونی هەیە. چونکە بەبێ ئەم بڕوابوونە بێ ئەملاو ئەولایە، دەسەڵاتی قانوونی نا- کەسی و خودی لەکار دەوەستێ و بشێوی و بێ سەرو بەری جێگەی دەگرێتەوە.

شایانی گوتنە، ئەم بڕوابوونە بە شەرعییەت، کە بنەمای کاری دەوڵەتی مۆدێرنە، هەروەکو ئیمپراتۆریای شارلمان، بڕوابوونێکی لۆجیکی

نەبووە بەو مانایەی کە بشێ بە پێوەرگەلی لۆجیکی پاساو بدرێتەوە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە دەبێ لە زەین و بیری خۆماندا ئاگامان لەوە هەبێ کە بڕوابوون بە ڕەوایی کۆنترۆڵی قانوونی وتووێژێکی نەبڕاوەی لەخۆ گرتووە. قانوونگەل، هەروەکو پێمان گوتراوە، ئەگەر داڕێژران ڕەوا دەبن. داڕشتنی قانوونیش ئەو دەمە ڕەوا دەبێ ئەگەر دەست بەو بنەماگەلەوە گیرا کە ئەو کارڕاییانەی دەبێ پێڕەوییان لێ بکرێ ڕوونکەنەوە. پێمانوانییە پێویستمان بەوە هەبێ کە وەکو چۆن ڤیبەر پێیوابووە، ئێمەش پێمانوابێ کە دەیگوت: ئەم پیلەکە نەبڕاوەیە خۆی مەبەستدارە تا ئەو بڕوایە بە شەرعیەتێکی بەری لە هەر ئایدیالێکی تایبەت و بڕیارگەلێکی نرخئاسا، دروست بکەین. ئەو ڕاستییەی کە بە چاکی ددانی پێدا دەهێندرێ ئەوەیە: کە کۆمەڵگەی مرۆیی پشت بە بڕوای ئەقڵانی، یان نا ئەقڵانی دەبەستێ، وەلێ پێویستی بەوە هەیە کە ئەم بڕوایانە ڕوون و ئاشکرا و مەفهوم بن لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا. قانوونزانە هاوچەرخەکان زۆر گرنگیان بە دانان یان ڕوونکردنەوەی داڕشتەیەکی ڕەها هەبووە کە ببێتە بناخەیەکی پێویست، یان لۆجیکی بۆ کۆنترۆڵی قانوونی لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا، یان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. ئەم پرسە لە جێگەی لەبار و گونجاوی خۆیدا باس دەکەین. لێرەدا تەنیا ئەو قسەیە دەکەین کە دەسەڵات بە مانا فراوانەکەی، بەتایبەت بە مانا قانوونییەکەی، پشت بە بڕوابوونێکی بێ ئەم لاو ئەولا بە شەرعییبوونی خۆی دەبەستێ.

تا گومانمان بۆ ئەوە نەچێ کە شرۆڤەکاریی ڤیبەر ورد و پتەوە بە شێوەیەك کە بکرێ بەسەر دۆخی مێژوویی هەر کۆمەڵگەیەکی ئارای پراکتیزە بکەین، ئێمە دەمانەوێ دووپاتی بکەینەوە کە ڤیبەر خۆی گرنگی بە پەرەسەندنی مێژوویی نەداوە هەندەی گرنگی بە دانانی بناخەیەك داوە کە وەکو ناوی لێناوە "نموونەگەلی ئایدیالی" کە پەرەسەندنی تەواوی ئەگەرە ڕەگئاژۆکانی ناو هەندێ جۆرە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دەردەبڕن. ئەم نموونەگەلە ئایدیالی نین بە مانا ئاکارییەکەی، یان ئەفلاتوونییەکەی، بەڵکە سادەکردنەوەیەکە بنیادێکی شیکاری دەڕەخسێنێ کە دەکرێ لێتۆژینەوەی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەکەیدا ئاراستە بکرێ. شیکردنەوەکە لێرەدا نموونەییە *Typological* نەك گەشەکاری *Developmental*. چونکە کۆمەڵناسی لە ڕوانگەی ڤیبەرەوە تەنیا گرنگی بە ئاراستە گشتییەکان دەدا. بۆ نمونە، چۆنیەتی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی لە باری مێژووییەوە، بەرپرسیارێتیی لێتۆژەری مێژوویی نییە، بەڵکە بەرپرسیارەتی مێژوونووسە. ڤیبەر دان بەوە دادەنێ کە نموونەگەلە ئایدیالەکانی بەم شێوەیە لە مێژوودا ڕوو نادەن، بەڵکە هەمیشە تێکەڵن بە پێکهاتەی گۆڕاو لە ڕووی پلەی ئاڵۆزی و پێکهاتنیانەوە. با نموونەیەکی ئەمە وەربگرین، ئەلمانیای نازی تا ڕادەیەکی بەرچاو بە بیچم و چارەی کاریزمای کەسایەتییەوە بەندبوو، هەروا بە بیچم و چارەی بیرۆکراسیی مۆدێرنی پێوەندداریشەوە بە کۆنترۆڵی قانوونی. شیکردنەوەیەکی لەم بابەتە، بەشداری لە تێگەیشتنی ئەو لقە جیا- جیایانە دەکا کە قەوارەی قانوونی هەر کۆمەڵگەیەك پێکدەهێنن، هەروا سروشتی گشتیی ئەو دەسەڵاتەش کە بەشێوەیەکی حەتمی یەکێ لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی پێکدەهێنێ.

### سەرچاوە

ماهی فکره القانون – سلسله عالم المعرفه (27)

ترجمه سليم العويص

# دەنگانێك لە چەرخی بەردینەوە

ئامادەکردنی: گێرالد تراوفێتەر

لە ئەڵمانییەوە: نزار سابیر



نەخش و نیگارانی سەر بە چەرخی بەردین (نزیکەی پێش 19000 ساڵ) لە ئەشکەوتی لاسکوا

کەی یەکەمین مرۆڤ فێری قسەکردن بوو؟ بۆچیی ئەمە بۆ هیچ گیانەوەرێکی دیکە نەچووە سەر؟ چۆن دەتوانرێت ڕۆبۆتان بهێنرێنە زمان؟ لە گەڕان بە دوای سەرچاوەی زماندا، مێشك توێژەرەوان و پالیۆئەنترۆپۆلۆژەوانان[1] و جینناسان دۆزینەوانی سەرسوڕهێنەر ڕادەگەیەنن.

وشە زۆرن بۆ باسکردنی سیحرو تەلیسمی زمان. بەڵام کاتێك ئەستێرە –زمانەوانی ئەمەریکیی، ستیڤن پیکنەر، بیەوێت گوێگرەکانی خۆی بۆ ڕستەسازیی (*syntax*) و ماناسازیی (*semantik*) باش تامەزرۆ بکات، حەزدەکات پتر پەنا بۆ ژماران ببات.

بە گوێرەی پیکنەر، هەر ئەڵەمانێك لە ژیانی ڕۆژانەیدا تێکڕا نزیکەی 10000 وشەی سەرەکیی و 4000 فەرمان بەکاردەهێنێت، کە بە یارمەتیی ڕێزمان (*grammer*) دتوانێت بە دڵی خۆی پێکەوەیان بلکێنێت. لەوە دەتوانێت 6.4 ملیار ڕستەی جۆراوجۆر، بە درێژایی 5 وشە بۆ هەر ڕستەیەك، دروست بکات. پرۆفیسۆرەکەی پەیمانگەی تەکنۆلۆژیی ماسوشێت پتر ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێت: "ئەگەر وەهای دابنێین، بۆ بەرهەمهێنانی هەر یەکێك لەم ڕستانە پیاو پێویستی بە 5 چرکە هەیە، ئەوا دروستکردنی

هەموو ڕستەکان 1 ملیۆن ساڵ دەخایەنێت". بڕی ئەو زانیارییانەی کە لە ڕێی ئامرازی زمانەوە دەگواسترێتەوە تەواو بێسنوورە. مەگەر چۆنان شتێك هەبێت هێندەی ئەوە بۆ مرۆڤ خۆش بێت، ئەو شەپۆلە دەنگە ئاهەنگدارانە دروست بکات، کە لە سیستەمێکی ئەشکەوت ئاسای لقاولقی بەپێچو پەنای ژێر مێشکییەوە دروست دەبن. هەموو مرۆڤێك، هەتا پێ دەنێتە تەمەنی پێگەیشتووییەوە، 50 ملیۆن وشە بە دەمیدا هاتوون.

"زمان بڕیاردەرترین ئامرازی هۆشیارییە"، زمانتوێژەرەوەی خەڵکی لایپزیگ، ئەنگەلیکا فریدریك، دەبێژێت. هەمان کات گرنگترین ئامرازی زیرەکیشە. زمانەکە یەکەم شت مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ. وشان نەبوونایە، ئەو هەموو بیرۆکانە هەرگیز دروست نەدەبوون، چ جایێ لە مێشکی مرۆڤەوە بگەیشتنایە جیهان. زمان بوو بەو مووشەکە (سەرکەوتن- هەڵگر)ە لە ڕادەبەدەر خێرایەی، کە مرۆڤی کرد بە زاڵترین گیانەوەری سەر ئەم ئەستێرەیە. "لە داهێنانی تیروکەوانەوە هەتا وێستگە ئاسمانییە نێونەتەوەییەکان، هەمووی تەنیا 1200 ساڵ تێپەڕین"، پڕۆفیسۆری ئەنترۆپۆلۆژیی ئەمەریکیی زانکۆی ئیلینۆیس، ستەینلی ئەمبرۆز، دەڵێت.

شتێکی سەیر نییە، لە وەتەی هەیە ئەو پرسیارە مرۆڤی سەرسام کردووە، کە چۆن مرۆڤ هاتە زمان. لای ئینجیل وەڵامەکە ڕوونو دیارە: "لە پێشدا وشە بوو، وشەکەش لای خودا بوو، خوداش وشەکە بوو"، هەروەك لە ئینجیلی یوحەنادا هاتووە. بگرە جارێکیان خودا هەر "بە یەکجار زمان (گۆشتەکە) و قسە"ی بۆ یەکەم جارو هەتاهەتایی خستە دەمی ئادەمیزادەوە، وەك لە موسا دەگێڕرێتەوە. کە شێتێتیی گەورایەتیی مرۆڤی داگرتو کەوتە ئەوەی بورجەکە بۆ بابل دروست بکات، ئەوجا ئیدی خودا تووڕە بوو و بڕیاری دا، لە پڕ زمان لە هەموو میللەتان "تێك بدات".

لە سایەی گیانی ڕۆشنگەرێتیی (ڕێنیسانس)دا زانستە هێشتا نەوباوەکان کەوتنە خۆیان، بە شوێن هەڵگیرسێنەری بەهرەی زمانەکیی ئادەمیزاددا بگەڕێن. بەڵام لە ئاست بلیمەتیی ئەم توانایەدا هەرزوو ئەمانە خۆیان لە بەرانبەر (تیامان)ێکدا بینییەوە، کە زانای ئەڵەمانی، ڤیلهێلم هۆمبۆلدت، ساڵی 1820 بەرگی ئەم ووشانەی کردبووە بەر: "مرۆڤ تەنیا بەهۆی زمانەوە مرۆڤە. بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ زمان دابهێنێت، پێویستە پێشتر مرۆڤ بووبێت".

ئیدی لە بارەی سەرچاوەی زمانەوە یەك لەسەر یەك مەزەندەکاریی دەکرا هەتا ساڵی 1886 دەزگای خاوەن تەئسیری "*Societe de Linguestique de Paris*"، واتە کۆمەڵەی زمانەوانیی پاریس، لە ڕێی دەستنیشانکردنی ڕێساو ڕێککارییەوە ڕێی لە زمانتوێژەرەوان گرت، کە هەر لە خۆیانەوە لە بارەی سەرەتای زمانی مرۆڤەوە قسە بهۆننەوە. بەم شێوەیە دە ساڵانێکی دوورو درێژ زمانەوانان سەربەستانە خۆیان لە بابەتەکە بە دوور گرت. چونکە ماوەیەکی درێژ بوو، (بۆ بەڵگەدامان)ێکی ئاوڕوبەرانە باڵی کێشابوو. ئەو کاتەی مرۆڤئاسایەك بە لێوەکانی یەکەم وشەی دروستکرد، نە دەنگتۆمارکەر هەبوو نە کامێرا. بگرە هەتا بۆرە خانەی بە بەردبووش نین -کە ئەگەر هەشبوونایە هەر پەردەیان لەسەر نهێنییەکانی زمان هەڵنەدەماڵی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانستە سروشتییە مۆدێرنەکان بەم دواییانە هەتابێت دەستیان دەکەوێتە سەر هەندێك پارچەی وێنە مەتەڵینەکە، کە دەنگە یەکەمینەکانی ڕۆژگاری بەرد ڕوون دەکەنەوە:

-پالیۆئەنترۆپۆلۆژەوانان لە ئێسکە دۆزراوەکانی مرۆڤی پێشینان گەشەسەندنی کۆئەندامی قسەکردن پێکەوە دەنێنەوە.

-مێشك توێژەران لە سای تەکنیکە وێنەپیشاندەرەکانەوە کەوتوونەتە ئەوەی تێبگەن،

که چۆن زمان له جەنجاڵیی خانەکانی دەماردا دروست دەبێت.

-زانیارییەوانان (*Informatiker*) وەها له ڕۆبۆتان دەکەن، ئەو ڕۆبۆتانەی که توانای لێکگەیشتنیان نییە، زمانی خۆیان دروست بکەن.

-گەردیلەبایەلۆژەوانان (*Molekularbiologen*) له توێژینەوەی بنچینەی جینەکییانەی زماندا سەرکەوتنان ڕادەگەیەنن و ئەمساڵیش[2] بۆ یەکەم جار له خۆیان ڕابینی، تەمەنی توانای قسەکردن بۆ ئەوپەڕی 200000 ساڵ سنووردار بکەن.

بەڵام ڕێگەیەك که به تایبەتی زۆر هیوا بەخش بێت بۆ هەڵماڵینی نهێنییەکانی زمان ئەو ڕێگەیەیە، که منداڵانی گەشەکەری مرۆۋ پیشانمانی دەدەن. چونکە لەهەر یەکێکیاندا کرداری گەشەسەندنەکەی زمان به هەمان شێوە بەڕێوە دەچێتەوە، بەڵام به خێراییەکی دیکە.

سۆفیا، که تازە پێی ناوەتە هەفتەی هەشتەمی تەمەنییەوە، هێشتا یەك وشە قسەی نەکردووە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بلیمەتێکی بچکۆلەی زمانە. له کابینەیەکی دەنگلێدابڕاودا، که به کەلوپەلێکی پەلکەڕەنگینانە ڕازێنراوەتەوە،ئەم ساوایەی خەڵکی بەرلین له باوەشی باوکیدا ڕاکشاوە. به چاوانی نووقاوەوە تاقیکردنەوەیەکی بێ قسە دەکرێت.

ئەوەی وەها دەکات، بەهرەی زمانەکیی سۆفیا بتوانرێت به چاو ببینرێت، کۆمپیوتەرێکە. له ڕێی کلاوێکەوە، که له شێوەی کلاوی حەمامدایەو کۆمەڵێکی زۆر وایەری لێ هاتۆتە دەرێ، سۆفیا له ئامێرەکە بەستراوە. "بابا بااا"، له دەنگ زلکەر (یان بۆکسی دەنگ)ێکەوە دەنگ دەداتەوە، بەبێ ئەوەی سۆفیا چاو بکاتەوە. ئەوجا "باباااابا" و دیسانەوە "باباباااا". به درێژایی چەندان دەققە ئەم بڕگانە، بێمانا، خۆیان دووبارە دەکەنەوەو بەرگوێی سۆفیا دەکەون، وەکو ئەوەی ساواکە بخرێتە (خەوە موگناتیسە)وە. بۆ دەرەوە سۆفیا هیچ کاردانەوەیەك پیشان نادات، بەڵام لەناو سەریدا شتی سەیروسەمەرە ڕوودەدەن.

کۆمپیوتەرەکە تەوژمانێکی ئەلەکترۆنیی وەردەگرێت، که له کۆمپیوتەرەکەی یۆرگن ڤایسنبۆرندا له شێوەی شەپۆله خەتی نووکداردا دەردەکەون. "ئەمانە وێنەگرتنەوەی چالاکییەکانی مێشکی سۆفیان، کاتێك گوێی له (باباباااا)یەك دەبێت، ئەمانەش له بڕگەیەکەوە تا بڕگەیەکی دی خۆیان دەگۆڕن"، پرۆفیسۆرە زمانەوانییەکەی خەڵکی پۆتسدام ڕوونی دەکاتەوە.

هەرچەندە له یەکەم سەرنجدا دەکرێ ئەم تاقیکردنەوەیە زۆر بێمانا بێتە بەرچاو، بەڵام ئەگەر سۆفیا لەم ئیمتیحانەدا دەرنەچوایە، نەشیدەتوانی دوو ساڵی دیکە هیچ لەوە تێبگات که قەرەقۆزێك له شانۆی بووکەشووشاندا بۆ منداڵانی دەڵێت.

"زمان لای ساواکە له پێشدا وەکو تەهوژمێکی دەنگ خۆی دەخاتەڕوو، وەکو موزیکێك یان وەکو خوڕەی کانییەکی چیایی"، وەکو ڤایسنبێرگ پتر ڕوونی دەکاتەوە. هەنگاوی یەکەم بریتییە له شیکردنەوەی ئەم تەهوژمە دەنگە له پێشدا بۆ بڕگەبڕگەو دواییش بۆ وشە وشە.

هەر زمانێك قاڵبێکی ئاهەنگییانەی خۆی هەیە، که له ڕێی جۆری دانپیانانی بڕگەکانی وشەوە پەیدا دەبێت. گۆڕانی تەهوژمەکانی مێشك له نێوان بیستنی "با"یەکی دانپیانەنراوو "باااا"یەکی دانپیانراودا، ئەوە پیشانی ڤایسنبۆرگ دەدات، که سۆفیا دەرك به جیاوازیی ئاهەنگی هەردوو بڕگەکە دەکات. له ئەڵەمانییدا وشانی دووبڕگەیی دان دەنرێت به بڕگەی یەکەمیاندا -به پێچەوانەی فەرەنسییەوە، که بۆ نموونە ناوێکی وەکو (بێرنارد *Bernhardt*) دان به بڕگەی دووەمیدا دەنرێت.

"مرۆۋ زۆر لەوە زووتر فێری قسەکردن دەبێت که تا ئێستا ئێمە وەهامان دەزانی"، ڤایسنبۆرگ دەڵێت. "منداڵ هەر له سکی دایکیدا دەرك به

میلۆدیی زمان دەكات، كاتێك لە ڕێی سەراو (یان خۆراكاو)ەوە دەنگی دایكەكە دەدرێت بە گوێی لەدایكنەبووەكەدا".

بۆ هەر دانە هەنگاوێكی فێربوون، كە مێشكی سۆفیا بە ئەنجامی دەگەیەنێت، پەرەسەندنەكە لای پێشینانی مرۆڤ سەدان هەزار ساڵی ویستووە. (بەدوایەكداهاتن)ەكە دەبێت تەواو لێكچوو بووبێت، لەمەدا ڤایسنبۆرگ تەواو دڵنیایە.

"ئەو چۆنێتییەی سۆفیا بەش بە بەش زمانی دایكی وەردەگرێت، دووبارەكردنەوەی ئەو پرۆسەی پەرەسەندنەیە كە مرۆڤی كرد بە گیانەوەرێكی ئاخێوەر"، ڤایسنبۆرگ ڕوونی دەكاتەوە.

ئەم زمانەوانە سەنتەری ئەڵەمانیی بۆ لێكۆڵینەوەی پەرەسەندنی زمان بەڕێوە دەبات، كە لەسەر ئاستی جیهان یەكێكە لە سەنتەرە هەرە گەورەكانی تۆژینەوە لەسەر توانای زمان فێربوون. 250 شیرەخۆرەو ساوا ماوەی پتر لە ساڵێكە بە هەموو جۆرە ئامێرە دەمارناسییەكانەوە وایەربەند دەكرێن، بۆ ئەوەی "پەڵەیەكی سپی" لە ڕووبەری زانینماندا بە زانراوی نوێ پڕببێتەوە (وەكو ڤایسنبۆرگ دەریدەبڕێت). هەرچەندە بۆ تیۆرییەكی سەرتاسەریی سەبارەت بە پەیدابوونی زمان هێشتا زووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دۆزینەوە سەرەتاییەكان سەرنجڕاكێشن. لای ڤایسنبۆرگ ئەوە بۆ نموونە جێی سەرسوڕمانە، كە چەندە بە شێوەیەكی مەنتیقیی، زمان هەنگاو بە هەنگاو خۆی لە مێشكی منداڵاندا دادەمەزرێنێت. وەكو ئەو لەگەڵ تیپە سایكۆ —زمانەوانییەكەیدا توانی پیشانی بدات، هەر یەكەمین ئەو دەنگانەی منداڵ دەریان دەكات گەلێك زانیاریی لە بارەی زمانەوە لەخۆدەگرن.

لێرەدا توێژەرەوەكان هاتن هەتا هاوارو گارەگارەكانیشی سۆفیایان تۆماركرد. ئەوجا لێگەڕان كۆمپیوتەرەكە هێز (*volume*)ی دەنگەدەنگەكان بۆ یەك لەسەر دە، و مەودای پێچوونیان بۆ میللی چركان شی بكاتەوە.

"لێرەشدا دیسان توانیمان ڕیتم (ئیقاع)ێكی تایبەتی دەستنیشان بكەین، كە بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر لە زمانی دایكی دەچوو"، ڤایسنبۆرگ دەڵێت. كەواتە سۆفیا بە ئەڵەمانیی دەكوڕوزێتەوەو بەوەش پێشمەرجێكی گرنگ پڕدەكاتەوە، بۆئەوەی دواتر خۆی لە دنیای دەوروبەری بگەیەنێت.

دەبێ ئەوساش، پێش سەدان هەزار ساڵ، هەر بەم شێوە (ڕەگەز بە ڕەگەز)انەیە شتەكە دەستی پێكردبێت: لە قاووقڕی ئاژەڵانەوە پێشینانی مرۆڤ هەمیشە دەنگەدەنگی لێكجودایان پەرەپێداوە هەتا دواجار گەیشتوونەتە یەكەمین وشان كە میلۆدییەكانیان لێكچووبوون.

ڕێك چۆنیش سۆفیا لە ماوەی ساڵێكدا لەو پارچە دەنگانە وشانی وەكو "دایە" یان "تۆپ" پێكەوە دەلكێنێت، ئاوەهاش دەبێت مرۆڤی زوو ناوانی دیاریكراویان لە شتومەكی ناو سروشت نابێت. "خێرا بەسەر ئەوەشدا گەنجینە وشەی سۆفیا، هەر وەكو كانیی، دەتەقێت"، ڤایسنبۆرگ دەڵێت. لە تەمەنی 8 مانگیدا هەر منداڵێك نزیكەی 60 وشە تێدەگاتو هەتا دەشگاتە یەكەمین ڕۆژی باخچەی منداڵان ئیدی چەند هەزار زاراوەیەكی گل داوەتەوە.

هەروەكو باپیرانی بەر لە مێژوو، كە ڕەنگە پێش 50000 یان 100000 ساڵ ژیابن، سۆفیاش وای لێدێت بتوانێت وشەكان لە بەدوایەكدا هاتنێكی مانابەخشدا ڕیز بكات. دواجار وای لێدێت، زاڵبووانە ڕێزمان (*grammer*) فێر ببێت، ئەو ڕێزمانەی كە زنجیرەیەكە لە چەند سەد یاساو ڕێسایەك، كە لە سای بەكاربردنی ئەو گەنجینە وشە زلەی كە هەیە وەها دەكات بتوانرێت گەلێك ڕستەی جۆراوجۆر بێتەواوبوون پێكەوە بنرێن.

بەڵام چما بەهرەیەكی وەهای زمان هەر بە تەنیا بۆ (*homo sapiens*)[3] هەڵكەوت؟ چما شەمپانزییانو

ئاژەڵانی مەمکداری بەرز پەرەسەندووی دیکە هەرگیز نەکەوتنە قسە؟

هەرچۆنێك بێت، مەیموونانیش لەژێر مەرجانێکی تاقیگەییدا بەهرەیەکی بەراییانەی زمان پیشان دەدەن: بۆنۆبۆکانزی، کە لە سەنتەری توێژینەوەی زمانی سەر بە زانکۆی ویلایەتی جۆرجیا مەشقی پێکراوە، 250 وشە هێمای لە بەرە. ئەم شیردارە 21 ساڵەیە لەسەر کیبۆردێکی تایبەتییانەی کۆمپیوتەرێك وشەی وەکو (مۆز Banane) یان (بدە پێم gib mir) یان (باش gut) تایپ دەکات.

جگە لەمە، کۆتایی لە ساڵی پار بۆ دەرکەوتنێکی دوو توێژەری ئەم پەیمانگەیە بووە مایەی سەرنجکێشان: بە یاریدەی تۆمۆگرافێکی ناووکەکیی ناوچەیەکیان لە نیوەی چەپی مێشکی مرۆمەیموونانەدا دۆزییەوە، کە لێکچوونێکی بەرچاو پیشان دەدات لەگەڵ هەندێك بەشی ناوەندی زماندا لە مێشکی مرۆڤدا. هەردوو توێژەری ئەمەریکیی کلاودیۆ کانتالوپۆو ویلیام هۆپکینس شکیان بۆ ئەوە دەچێت کە "ئەم دەزگا زمانەوانییانە هەر زوو لای باپیرانی هاوبەشی مرۆڤو شەمپانزیی هەبووبن".

لەگەڵ ئەوەشدا شەمپانزییانو گۆریلایان پلە سەرەتاییەکانی زمان هەرگیز تێناپەڕێنن. دێرەك بیکەرتۆنی زمانەوان توانای قسەکردنی مەشقپێکراوی مەیموونان ناودەنێت "Protosprache" یان "فەریکەزمان". ئەوە شتێکی تەواو جیاوازە لەو شێوەیەی ئێمە بۆ زمان".

توێژەرەوان بۆیان دەرکەوتووە، کە ئەمەش هۆیانی ئەناتۆمی (لەشناسی)ی هەیە. ئەوەی بۆ یەکەم جار زمانی مرۆڤی کۆنی شل کرد ئەو گۆڕانە ڕادیکالانە بوون کە لە هەڵکەوتنی لەشیدا ڕویاندا.

بەم دواییانە توێژەرەوەی فەرەنسیی میشێل برونێت لە چاد کاسەسەری "هۆمینید (Hominide)"[4]ێکی 6 بۆ 7 ملیۆن ساڵ کۆنی دۆزییەوە. بنەچە درەختی هاوبەشی مرۆڤو شەمپانزیی دەبێت پێش ئەو دەمە لەبەریەك دابەشبووبێت. "ئەوەش لە هەمان کاتدا لادانو وچانێکی گرنگ بوو لەسەر ڕێی گەیشتن بە زمان"، هەروەکو زمانەوانی بیلیفێلدیی[5] پرۆفیسۆر پیتەر فینکە ڕوونی دەکاتەوە.

لەوە بەدواوە لەشهەڵکەوتنی پێشینانی مرۆڤ بە شێوەیەکی خۆیەکلاکەرەوانە کەوتە خۆگۆڕین، تا ئەوەی ئەناتۆمییانە کەوتە سەر بارێك، کە بتوانێت دەنگە ئاڵۆزەکانی زمان دروست بکات. یەکێك لەو پێشمەرجە لەشەکییانەی کە بۆ دەنگەزمانێکی ئاڵۆز پێویستە، ڕێکردن (یان ڕۆیشتن)ی ستوونییە، هەروەکو دەمار —دەروونناسی سەر بە زانکۆی میلانۆ ڕۆبێرت پرۆڤینە ئەوەندە نابێت بۆی دەرکەوتووە.

ئەگەر ڕێکردنی ستوونیی نەبووایە، هەروەکو پرۆڤینە دەڵێت، هەناسەدانێك لە تواناد نەدەبوو کە ڕێگە بە قسەکردنێکی ماقووڵانە بدات. لای چوارپێیانی وەکو سەگو پشیلە توێژەرەوەکە ئەوەی تێبینیی کردووە، کە لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا جارێك هەناسە هەڵدەمژن، بە پێچەوانەی مرۆڤەوە، کە دەتوانێت بێباکانە چەند هەنگاوێك بنێت پێش ئەوەی ناچار ببێت دیسانەوە هەوا بۆ ناو سییەکانی هەڵبمژێت. "ڕێکردنی ستوونیی، کە وای کرد بتوانرێت گۆڕان بەسەر هەناسەداندا بێت، ئەو ڕووداوە بوو کە بووە کلیل بۆ پەرەسەندنی زمان"، پرۆفینە ئەم تیۆرییە ڕوونکردنەوەکییەی خۆی ناوناوە "Walkie- talkie". پرۆفینە تێزەکەی خۆی لە ڕێگەی چاودێریکردنی شەمپانزییانەوە پشتئەستوور کرد. ئەو هات پێکەنینی مرۆڤی لەگەڵ هی شەمپانزییدا بەراورد کردو بۆی دەرکەوت، کە مرۆڤ بە یەك هەناسەکێشان دەتوانێت قاقایەکی درێژو پچڕپچڕ دەرپەڕێنێت، بەڵام شەمپانزیی، بە پێچەوانەی ئەوەوە، دەبێت

لەگەڵ دەرکردنی هەر دەنگە پێکەنینێکدا هەوا هەڵبمژێت.

لە ئێسکبەند (پەیکەری ئێسک)ی مرۆڤدا هێشتا جیاوازیی دیکەش دەناسرێنەوە: سەرقوڕگ (یان دەمی سەرەوەی قوڕگ) لای مرۆڤ بە شێوەیەکی ئاشکرا قووڵتر کەوتووە وەك لەلای مەیموون. بەمە جێگە دروست بووە بۆ بۆشاییەکی گەورەی مەڵاشوو، کە وەك لەشێکی دەنگدەرەوە مرۆڤ بتوانێت تێیدا دەنگەکانی زمان بە شێوەیەکی ورد هەڵبڕودابڕ پێبکاتو بگونجێنێت. پێدەچێت یەکەم نیشانەی ئەم دەزگادارییە تەکنیکییە بۆ زمان، وەکو توێژەرەوان بۆی دەچن، هەر بەر لە دەوروبەری 1.8 ملیۆن ساڵ خۆی پێکەوە نابێت. ئەو کاتە هۆمۆ ئێرەکتوس ***Homo erectus***[6] پێی نایە سەر شانۆی مێژووی ئەم زەوییە، کە ئەویش تواناییانێکی هۆشەکیی نوێی پێبوو: ئەو بوو کە یەکەمین جار تێغەبەردی وەکو ئامراز بەکارهێنا– هەرچییەك بێت، ئەمە نیشانەی ئەوەیە، کە توانیویێتی موجەڕەدانە بیربکاتەوە.. ئەو توانایەی کە بێ ئەو ناتوانرێت هیچ زمانێك بهێنرێتە بەرچاو. هەر بۆیە پالیۆئەنترۆپۆلژەوانان لێرەوە وەهای بۆ دەچن، کە باپیرە هەرە گەورەی مرۆڤ لەو کاتە بەدواوە دەستی بەوەکردبێت، وشان دروست بکات.

ئەم پرۆسە زمانەوانییە پێدەچێت لە پڕ خاوبووبێتەوە. کردەیی مێشکی هۆمینیدەکان (***Hominiden***) و بەوەشەوە بێگومان بەهرەی زمانەکییان دەبێت بۆ ماوەی سەدان هەزار ساڵ هەتا ڕادەیەك هەر بە بەرتەسکیی مابێتەوە. پتر لە یەك ملیۆن ساڵ دەبێت مرۆڤی هەرەکۆن هۆشکولانە هەر خەریکی بەردەکوتکێ بووبێت، هەروەکو بە پاشماوە کولتوورییەکاندا دەردەکەوێت.

ئەوجا، بەر لە نزیکەی 150000 ساڵ، هۆمۆ ساپێنسە مۆدێرنەکە دەرکەوت. بە خۆیو دەزگایەکی پوختەکراوەوە پێش پتر لە 50000 ساڵ لە ئەفریقاوە کەوتە بڵاوبوونەوە. لە ئێسكو لە دار ئامرازی وردو بە ئەرکی بۆ خۆی دروستکرد. بێجگە لەمە لەسەر دیواری ئەشکەوتان دیمەنانی ڕاوی نەخشاند، وەکو ئەوەی لە لاسکوای خوارووی فەرەنسادا هەیە. بۆ ئەمەش هونەرمەندانی چەرخی بەردینی کۆن دەبێت توانیبێتیان بە ڕەمز (سیمبوڵ) بیربکەنەوەو لە"کاتدراڵییەکانی چەرخی بەردین"دا، هەروەکو ئاوەهاش ئەشکەوتوتۆکەکانی ئەو سەردەمە لەناو توێژەرەواندا ناودەبرێن، خورت خزمەتی بیرگۆڕکێیان کردبێت.

ئایا ئەوە زمان بوو، کە لە سایەیەوە مرۆڤ ئەستێرەکانی بەزاند؟ گەلێك لە توێژەران شکیان بۆ ئەوە دەچێت، کە لە پێشدا ئەم توانا هۆشەکییە بووبێت، کە وەهای لە مرۆڤ کردبێت، بتوانێت ئامرازو چەکی ئاڵۆز دروست بکاتو هەر بەوانەش پێشپڕکێکەرانی وەکو نیاندەرتاڵەکان، بۆ نموونە، لە گۆڕەپانەکە بکاتە دەرێ. "ئێمە ئەوانمان هەر ڕێك بە قسە قڕکرد"، هەروەکو پزیشکی دەروونناسی نیوزلەندیی مایکڵ کۆربالیس باوەڕ دەکات.

بەڵام لەوانەشە ڕێك بە پێچەوانەوە بووبێت. ئەنترۆپۆلۆژەوانی ئەمەریکیی، ستانلیی ئەمبرۆس، باوەڕی وەهایە: لە پێشدا وەستاکاریی پەنجەکان هات، ئەوجا بەدوایدا وەستاکاریی زمان.

بە پێی تیۆرییە نوێیەکەی، کەلە بواری گۆڤاری "***Science***"دا بڵاوی کردەوە: ئەوە ڕێك سەلیقەی دەستڕەنگینیی کۆنەباپیرانی ئادەمیزاد بوو، کە "ڕێی بۆ پەرەسەندنی زمانی خۆش کرد".

بۆ ئەوەش، ئەمبرۆس دەرەنجامێکی توێژینەوەکانی مێشك وەك نیشانەیەکی گرنگ دەبینێت: ئەو ناوچەیەی لە مێشکدا زمان دەبات بەڕێوە، ڕێك دەکەوێتە تەنیشت مەڵبەندی ورد جوڵێنەری دەستەوە. دەبێت لەم مەڵبەندەوە بەشێکی دەزگا دەمارەکییەکەی زمان هەڵتۆقیبێت. بەهانەیەکی دیکەش: دروستکردنی ڕمو تەور تواناییانێکی زیرەکیی ئەوتۆی ویستووە کە تەواو

جیاواز بووە لە بەردەکوتکێی دەبەنگانەی کۆنەمرۆڤی زوو. وەستا دەسترەنگینەکانی بەر لە مێژوو، کە بەردەوام وێنەی ئامرازەکانیان بە تەواوبوویی لە سەردا هەبووە، دەبێت هەر لە پێشەوە هێنابیاننە بەرچاوو نەخشەیان بۆ کێشابن، پێش ئەوەی بکەونە دروستکردنیان. ئەم گونجانە ئەقڵییە، وەکو ئەمبرۆس دەڵێت، پێشمەرجی یەکلاکەرەوەیە بۆ پەرەسەندنی هەر زمانێکی ئاڵۆز.

مایکڵ کۆربالیسی خەڵکی (ئاوکلاند)یش، کە هەمان بابەتی توێژینەوەی گرتووە، هەر بۆ ئەوە دەچێت، کە پەنجە رەنگینیی پێشمەرجی بڕیاردەر بووە لە پەرەسەندنی زماندا –بەڵام لە ڕوانگەیەکی دیکەوە. تێزەکەی ئەم دەڵێت: لە پێشدا بەدەست قسە کرا.

"هەرچەندە، ئەگەر ئێتسا باپیرانی هۆمۆ ساپینس بخرانایە سەر تەلەفۆنێك، زەحمەت بوو بیانتوانییایە لەگەڵ یەکدیدا قسەبکەن، بەڵام بەرانبەر بەوە توانای ئەوەیان دەبوو، هەر لە خۆوە دەستو دەموچاو بجوڵێنن"، هەروەکو توێژەرەکە لە کتێبە تازەکەیدا (لە دەستەوە بۆ دەم– ئەسڵی زمانمان) دەنووسێت. "ئەوە توانیوێتی، بەلایەنی کەمەوە، وەك ڕێخۆشکەرێك خزمەتی پەرەسەندنی زمان بکات".

زوربەی توێژەرانی زمانی پێیان وایە، ئیحتیمالێکی کەم هەیە کە یەك هەڵگیرسێنەری بڕیاردەری تاكو تەنیا بووبێتە هۆی پەرەسەندنی ئەم چەنەبازییە. بەڵکو پتر بۆ ئەوە دەچن، کە گەلێك هەنگاوی بچوك بچوك ڕێیان بۆ زمانێکی، هەتا بێت، ئاڵۆزتر خۆش کردووە.

چۆن چۆنیی پەرەسەندنەکەی زمان دەکرێ بەڕێوە چووبێت، تاقیکردنەوەگەلێکی پسپۆڕانی کۆمپیوتەر پیشانی دەدەن. یەکێك لە پەرەپێدەرە هەڵکەوتووەکانی پرۆژەی "زیرەکیی دەستکرد *Kuenstlicher Intelligenz*" (کورتکراوەکەی: *KI*) لووك ستیلسە، کە بەڕێوەبەری تاقیگەی (*Sony*)ە بۆ زانستی کۆمپیوتەر لە پاریس. ئەم ستیلسە هەوڵ دەدات، ئەو پرۆسەیەی کە ملیۆنان ساڵی خایاندووە بە پۆلێك ڕۆبۆتی سووك چەکدار کراو دووبارە بکاتەوە.

"*Push red wa blue ko*"، ئەم قسە بەسەریەکدادراوانە لەو کۆمپیوتەرە دەستییەوە دەبیسترێن، کە تیایدا ڕۆبۆتەکانی زمان لەگەڵ یەکدا قسەی قۆڕی وەکو "*wabaku*" و (*wawosido*) دەکەن.

ستیلس هەموو ئەوانەی کردۆتە ناو ڕۆبۆتەکانییەوە، کە ئەمڕۆ سەر بە تازەترین داهێنراوەکانی ناو توێژەرانی بواری (*KI*)ن: دەنگدروستکەرێکی لە ڕاستیی چوو، یادگەیەك، پرۆگرامێك بۆ ناسینەوەی قاڵبان. بەڵام ئەقڵێك بۆ ڕستەسازیی یان گەنجینە وشەیەك یا سەرەزانینێك لە واتاسازیی، ستیلس پێیان نەداوە: دەبێ مەکینەکان خۆیان فێری قسەکردن ببن –بۆ سەرسامیی زمانەوانانیش، دەشبن.

ستیڵس دەرەنجامەکانی خۆی پێش چەند مانگێك لە کۆنفرانسی "پەرەسەندنی زمان *Evolution of language*"دا بڵاوکردەوە، کە لە زانکۆی دەستەبژێری *Harvard*ی ئەمەریکیی بەسترا. یەکێك لە ڕێکخەرانی کۆنفرانسەکە، کە ئەنترۆپۆلۆژەوانی لەندەنیی کریس نایت بوو، بە هەڵچوونو خرۆشانێکەوە قسەی لەسەر باسەکەی ستیلس کرد، کە بۆ خەڵکانی ئەکادیمیی ئاسایی نییە: "ئەمە هەر دەڵێت بۆمبێك بوو و تەقییەوە".

لە قسەکردنی دیجیتاڵانەی ئەم بوونەوەرە مەکینەییانەدا نەك هەر ووشانێك پەیدا بوون، کە ڕۆبۆتەکان هەموو پێکەوە بەکاریان دەهێنان، بگرە ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکە شێوەیەکی بەراییانەی لە ڕێزمان (*Grammer*)یش خولقاند.

لەسەرەتای تاقیکردنەوەکەدا ستیلس تەنیا کۆمەڵێك شتی پیشانی مەخلووقە ئوتوماتیکییەکانی دەدا. ئەوانیش دەبوو لە ڕێی

*Software*ی قاڵب ناسینەوەکەیانەوە پێناسی ئەو شتانە دیاریی بکەن. ئاوەها بەم شێوەیە ڕۆبۆتێك دەبووە قسەکەر و هەوڵی دەدا بۆ ئەوی دیکەی ڕوون بکاتەوە، کامە شت لەو کاتەدا دەبینێت.

بۆ ئەوەشی ئەم بیچمە دەستکردانە هان بدرێن کە بیر لەگەڵ یەکدیدا ئاڵوگۆڕ بکەن، هەموو جارێك بە گوێرەی توانا پاداشت دەکران، کاتێك لەسەر یەك زاراوەی هاوبەش ڕێك دەکەوتن. بەم شێوەیە هەتا دەهات گەنجینەو وشەیەکی هاوبەش گەورە دەبوو.

"زمان وەکو زیندەوەرێك وایە"، کە لە ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتییدا خۆی لە خۆیەوە ڕێك دەخات و وەکو ڤایرۆسە پەتایەك بڵاو دەبێتەوە. ستیلس ئەمەی لە تاقیکردنەوەکانی خۆیەوە دەرەنجام کردووە، کە بەم زووانە لە کتێبێکدا بڵاویان دەکاتەوە.

ئەزموونەکان لەگەڵ ئەم ڕۆبۆتە و وڕێنەکەرانەدا ئەوە پشتئەستوور دەکەن، کە زۆربەی زمانەوانان بە ئەکیدی دەزانن: زمان پەیدا نەدەبوو ئەگەر مرۆڤ گیانەوەرێکی بە تەنیا سووڕاوەی مۆن بووایە. زمان نەیدەتوانی پەرەبسێنێت ئەگەر پێکەوەبوونە کۆمەڵایەتییەکە نەبووایە، ئیدیی چ لە دەوروبەری ئاگرداندا بووبێت یان لە ڕاودا.

مرۆڤە کۆنە یەکەمینەکانیش خەڵکانێکی کۆڕ و کۆمەڵخواز بوون. بەڵام ئەوان ئەو *hardware*ەیان نەبوو کە پێویست بوو: توانای قسەکردن تەنیا ئەو کاتە توانی لەوە تێپەڕێت کە هەر تاك تاك ووشە بە دوای یەکدا ڕیز بکات، کە دەزگاکەی بیرکردنەوە قەبارەیەکی دیاریکراوی تێپەڕاند. بەم شێوەیە قەبارەی مێشك لای هۆمۆ ساپینس، بە بەراورد لەگەڵ هی بەر لە مرۆڤدا، نزیکەی سێ هێندە گەورە بوو.

تازە خەریکە توێژەرانی زمان وورده وورده لەوە تێدەگەن، کە پرۆسەی چاکردنی زمان لە مێشکی مرۆڤدا چەندە ئاڵۆزانە بەڕێوەدەچێت. جیاواز لەوەی جاران بۆی دەچوون، لە پێکهێنانی زماندا لەناو سەردا تۆرکێسترایەکی تەواوی ناوچەگەلێکی جوداجودای مێشك بەشدارە و تۆڕە دەمارینەکەش ئەوەندە نەرم و جێگۆڕە کە لای هەر مرۆڤێك دەکرێ جێگەیەکی جیاوازی گرتبێت.

لە گەڕان بە شوێن ئاسەوارانداا لە ژێر کڵاوەی کاسەسەردا ئەو خەڵکانە بە کەڵکی توێژەران دێن کە مێشکیان نەخۆشە، بە تایبەتیی ئیفلیجەکان. بۆ ئەوەی نەشتەرکاران بتوانن ڤێ لە دەستخۆدانەبووەکانی ئەمانە بە نەشتەرگەری (عەمەلیات)ی مێشك دوایی پێبهێنن، دەبێ پزیشکان لای هەر یەکە لەم نەخۆشانە ئەو ناوچانەی مێشك بدۆزنەوە و دەستنیشان بکەن کە بەرپرسی قسەکردنن. ئەم کارەش، کە زۆر بە ئەرکە، دیسانەوە بە قازانجی بواری توێژینەوەی زمان دەگەڕێت.

بەڵام شتێك هەیە پێدەچێت لای هەموو مرۆڤان هەر یەکێك بێت: شێوەیەك لە بابەتی "شیننووس"[7] لە سامانی بۆماوەییدا هەیە کە مشووری ئەوە دەخوات، لای ساوایان ئەو ناوچانەی مێشك نەشونما بکەن، کە بۆ زمان پێویستن.

جینناسان چاویان خستۆتە سەر دوو ناوچەی سەر *DNS*ی مرۆڤ. تیم کرۆ، کە لە ئۆکسفۆرد خوێندوویەتی، شکی بۆ ئەوە دەچێت، کە گۆڕانی جینێك لەسەر کرۆمۆسۆمی *Y* زمانی مرۆڤی هێنابێتە ئاراوە. "بەوپێیە، یەکەمین مرۆڤ کە توانی قسە بکات پیاو بوو"، وەکو ئەم پرۆفیسۆرەی نەخۆشییە دەروونییەکان، کە تیۆرییەکەی خۆی مانگی پێشوو لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە، جەختی لەسەر دەکاتەوە.

ئاسەوارێکی دیکە، کیمیابایەلۆژەوانانی بەریتانیا ساڵی پێشوو تێبینییان کرد: هەڵقەیەکی زۆر بچکۆلانە لەسەر کرۆمۆسۆمی 7. بۆ ئەم دۆزینەوەیە لە کۆئەندامی بۆماوە (یان میرات)دا، دەبێ سیمۆن فیشەر و ئەنتۆنی مۆناکۆ، کە سەر بە

زانكۆی ئۆكسفۆردن، سوپاسی خێزانێكی خوارووی لەندەن بكەن، كە لەبەر نەهێنگریی تەنیا بە خێزانی *KE* ناویان دەبەن.

مەگەر چۆنان كەسێك هەبێت لە *KE* ەكان تێبگات: دایە گەورەكە زمانێكی بێسەروبەر قسە دەكات و بە هەمان شێوە چواریش لە پێنج منداڵەكەی. هەروەها 10 لە 24 كچەزا و كوڕەزاكەی بەشێوەیەكی وەها قسە دەدەن بەیەكدا، كە هەتا خۆیان لە نێوان خۆیاندا ناتوانن بە ڕاستیی لێك تێبگەن.

لە پشكنینی بابەتە بۆماوەییەكانی ئەم خێزانە زمان شێواوەدا، مۆناكۆ و هاوكارەكەی بەسەر هەڵقەیەكی جینەكییدا كەوتن، كە بەرپرسی ئەو ناتەواوییەیە (ئەوەشیان ناونا "*FoxP2*"). پیكنەری زمانەوان ئەم دۆزینەوە نوێیە بە سەلمێنەری ڕاكەی خۆی دەزانێت، كە مرۆڤ جۆرێك لە غەریزە (*instinct*)ی زمانەكیی هەیە. ئەمە "بەڵگەیەكە بۆ بەهرەیەكی زمانەكیی پێوە لە دایكبووانەی مێشك".

بەڵام بە تەنیا جینی زمان ناتوانێت مەتەڵی زمان هەڵبهێنێت: چونكە *FoxP2* لای مشك و مرۆمەیموونانیش دەدۆزرێتەوە.

بۆیە جیناسە بەریتانییەكان هاوكارانی خۆیان، سڤانتە پێبێبۆ و وۆلفگانگ ئەنارد، یان خستنە لێكۆڵینەوە و داوایان لێیان كرد، بەراووردێك لە نێوان مرۆڤ و مشك و شەمپانزییدا بكەن. هەر بەڕاستییش، جین – توێژەرانی ئەنستوتیی *Max-Planck* بۆ ئەنترۆپۆلۆژیای پەرەسەندەكیی لەلایپتزیگ جیاوازیان لە نێوان پێكهاتەی پرۆتینی *FoxP2*ی مرۆڤ و هی ئاژەڵدا دۆزییەوە.

توێژەران ئێستا كەوتوونەتە بەردەم وێنە مەتەڵینەیەكی نوێ كە دەبێت پارچە پارچە پێكەوە بنرێتەوە. "چونكە هیچ دانە جینێكی تەنیا نییە بۆ زمان. بەڵكو كۆئەندامێكی جینەكیی هەیە كە مرۆڤ پێویستییەتی بۆ ئەوەی زمان بۆ خۆی پێكەوە بنێت"، پێبێبۆ لە درێژەی قسەكانیدا دەڵێت فیشەر بەوە دڵخۆشە، كە بەدۆزینەوەی *FoxP2* "ئیدیی دەرگا لەسەر پشتە، لە پەرەسەندنەكەی زمانە تێبگەین". لە كاتی كاركردنیدا لەگەڵ خێزانی *KE* دا ئەم توێژەرە بەریتانییە توانی زانیارییەكی دیكەش بەدەست بهێنێت. ئەویش ئەو پەیوەندییە توندەیە كە لە نێوان زمان و زیرەكییدا هەیە.

فیشەر: "ئەمانە هەر بە تەنیا قسە نادەن بەیەكدا، بەڵكو زەینیشیان ئەو ڕوونە نییە".

## پەراوێزەكانی وەرگێڕ

1-پێشگری *paleo* واتە زۆر كۆن. پالیۆئەنترۆپۆلۆژیا، كە بەشە بوارێكە لە ئەنترۆپۆلۆژیا، زانستی لێكۆڵینەوەی ئەسڵی مرۆڤ و پەرەسەندنییەتی لە ڕۆژگارانی بەر لە مێژوودا، زانستی لێكۆڵینەوەی ئێسك و پروسكی هۆمینیدەكان.

2-ئەم نووسار (ماددەی نووسراو، لەسەر شێوەی گوتار و كردار)ە لە *Der Spiegel*ی 21ی ئۆكتۆبەری 2002دا بلاو كراوەتەوە. هەر ئامارەیەك بۆ كات لە ناواخنی ئەم نووسارەدا دەبێت لە چاو ئەو ڕۆژەدا حساب بكرێت.

3-زاراوەیەكی لاتینییە، واتە "مرۆڤی ئەقڵدار"، دوا پلەی پەرەسەندنی مرۆڤ دیاریی دەكات.

4-گرووپێكە لە ئاژەڵانی مەمكدار، كە مرۆڤی ئەمڕۆ بە وەچەی ئەوان دەزانرێت. بە ڕێكردنە ستوونییەكەیان و پەرەسەندنە بەرزەكەی مێشكیان جودا دەكرێنەوە.

5-شارێكە لە ئەڵمانیا.

6-پلەیەكی پەرەسەندنی مرۆڤە بەر لە هۆمۆ ساپیینس.

7-"شیننووس" لەسەر شێوەی "ڕەشنووس". مەبەست لە كۆپیی ئەو كلێشە پەرە ئاوییەیە كە لەسەر كاغەزێكی شین خەتی سپیی سپیی دەردەكات.

# فـــايـــــــلـــــــى ژمـــــــاره

# میشێل فۆکۆ:

## فەیلەسوفی هۆڵی هەشتەم



1984/6/24

**بیست و یەک ساڵ پاش مەرگی (میشێل فۆکۆ)**

- میشێل فۆکۆ: دابڕانی بەردەوام!
- میشیل فۆکۆ..
- دەروازەی فۆکۆناسی
- بونیاد و مانا: میشێل فۆکۆ
- لە گریمانەی سەرکوتەوە بۆ دەسەڵاتی چاودێرکەر بەسەر ژیاندا
- فۆکۆ، بیریاری مۆدێرنە
- جوانناسی بوون لای فۆکۆ
- فۆکۆ و مۆدێرنە
- فۆکۆ و سیاسەت
- میشیل فۆکۆ، حەقیقەت و دەسەڵات
- لە کۆمەڵگەی سزاوە بۆ کۆمەڵگەی کۆنترۆڵ
- فۆکۆ لەیاد کە
- فۆکۆ: سیاسەت، ڕۆشنبیر، دەسەڵات
- نوسینە سەرەکییەکانی میشیل فۆکۆ
- چەمکی گوتار لە فەلسەفەی میشیل فۆکۆدا
- فۆکۆ و سنورەکانی دورترین ئەزمونی مرۆیی
- فەلسەفەی رۆشنگەری لە نێوان کانت و فۆکۆدا
- میشیل فۆکۆ و بەندیخانە
- فۆکۆ لەمڕۆدا

# میشێل فۆکۆ: دابڕانی بەردەوام!




میشێل فۆکۆ بە یەکێك لە گرنگترین فەیلەسووفەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێتو بەرهەمەکانی وەك سەرچاوەی بوارە تایبەتمەندەکان دەژمێرێن، لەوانە: "مێژووی شێتی لە سەردەمی کلاسیکیدا"- ساڵی 1961، "وشەکانو شتەکان"- ساڵی 1966، "ئارکیۆلۆژیای مەعریفە"- ساڵی 1969، "چاودێریکردنو سزادان"- ساڵی 1975و "ئاخاوتنو نووسینەکان" کە دەساڵ پاش مردنی بڵاوبۆتەوە. زۆربەی ئەو بەرهەمانەش وەرگێڕاونەتە سەر زمانەکانی جیهان، بەڵام هێشتا وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانە لای ئێمە بەدیناکرێت.

فۆکۆ تێکۆشەرو فەیلەسووف بوو، بانگەشەی بۆ دابڕان یاخود ئازادبوون لە وێناکردنە نوێکارییە مەزنەکان سەبارەت بە مێژوو و گوتارە مرۆڤکردەکان دەکرد، ئەوانەی پێیانوابوو ڕاستی (حەقیقەت) سازانی شتو ئەو بیرۆکەیەیە کە دەربارەی هەمانەو هەتا بیرۆکەکە لە ڕاستییەوە نزیك بێت، پلەی سازانی گوتارو واقیع زیاتردەبێت، چونکە فۆکۆ ئەم سازانە ڕەتدەکاتەوە، بەوپێیەی ناکرێت بابەت لە چوارچێوەکەی جیابکرێتەوەو ئەوە چوارچێوەکەیە وێناکردنمان بۆ بابەتێك دیاریدەکاتو وێناکردنەکەش گرێدراوی هەلومەرجی جیاوازو مێژووی تێکهەڵکێشی قۆناغو بەرژەوەندیو خواستەکانە.. کەواتە بابەتیبوون بوونی نییەو چاکتروایە کاتی لێکۆڵینەوەکردن دەربارەی دیاردەیەکی دیاریکراو، بەدوای ئەو گوتارانەدا بگەڕێین کە سەبارەت بە دیاردەکە داڕێژراونو تاوتوێکراون، نەك بەدوای چییەتی (ماهیەتی)و پێناسەی دیاردەکەدا وێڵبین. فۆکۆ ڕاستی ڕەت ناکاتەوە، بەڵکو بڕوای بە ڕێژەییبوونی ڕاستی هەیە، چونکە مەعریفە ئاوێنەی تاودانەوەی بابەت نییە. بەوپێیەش چەمکی ڕاستی، وەك سازان لەگەڵ بابەتدا، ڕەتدەکاتەوە. ئەمەش وایکرد دابڕان لەگەڵ ئەو ڕاستییە مەزنانەدا دروستبکات کە

ئایدیۆلۆژیا باڵادەستەکان دەریاندەبڕین، چونکە لەبری ئەو ڕاستییە گشتیانە، پێویستە بەدوای تایبەتمەندییەکاندا بگەڕێین، لەبەرئەوەی هیچ گوتارێکی کاملی کۆتاییهاتوو بوونی نییە، بەڵکو بەیەکداچوونێکی ئەزمونکارانە لەنێوان تاك‌و دەوروبەرەکەیدا هەیە. بۆ نموونە، فۆکۆ لە لێکۆڵینەوەکەی "مێژووی شێتی"دا تەقلیدیەتی سەبارەت بە بابەتەکە تێپەڕاندو گەڕان بەدوای پێناسەکردنی شێتیی، وەك مەسەلەیەکی نەگۆڕ، جێهێشت‌و ڕوویکردە فایلەکانی پۆلیس، کتێبە شاراوەکان، بەرهەمی جادوگەرەکان‌و شێوازی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان بۆ لێك جیاکردنەوەی ئەقڵ‌و شێتی‌و گۆڕانکارییەکانی گوتاری تا ئاستی ناکۆکبوون شیکردەوەو دواتر سەلماندی بابەتەکەو ئامڕازەکانی لێکۆڵینەوە دەربارەی بابەتەکە لە بۆتەی گەشەکردنی کۆمەڵگەکاندا بەرهەمهاتوون، بەو جۆرەش دابڕانی لەگەڵ بیرۆکەی بوونی شێتی، وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی‌و دەروونیی نەگۆڕ، دروستکرد.

لە شوێنێکی دیکەدا فۆکۆ ڕوونیکردۆتەوە، چەمکی مرۆڤ کە زۆرێك لە بیروڕاکان وەك پرنسیپێکی ناوەندی بۆ لێکدانەوەی شتەکان پشتیان پێ بەستوە، شتێکی جێگیر نییە، بەڵکو بەدرێژایی قۆناغە مێژووییەکان لە گۆڕاندا بوە. ئەمەش بەرەو دەربڕینە بەناوبانگەکەی "مردنی مرۆڤ"یان برد کە گفتوگۆیەکی زۆری خستەوە. بەشێوازێکی هاوشێوە، کە لێکۆڵەران بە بێوێنەیان ناوزەدکردوە، فۆکۆ لێکۆڵینەوەی دەربارەی دنیای زیندانەکان کردوەو لە ڕەوتی مێژووییاندا، هەر لەسەرهەڵدانیانەوە تاکو واتا نوێکانیان، شیکردنەتەوە. بەو جۆرەش ئەم دیاردەیە کەوتە ناو گۆڕەپانی گفتوگۆی فیکری‌و فەلسەفیەوەو هەژاندنێکی بەهێزی خستەوە کە گەیشتە ناو خودی دامەزراوی زیندان.

فۆکۆ لە ڕێگەی دابڕانەوە لەگەڵ ئەو ئایدیۆلۆژیا سەرتاپاگیرانەی لەسەر بناغەی دوانەیی (دوالیزم) دەستەبژێر- میللی، نێرایەتی- مێیایەتی‌و خود- بابەت، هەوڵیداوە مرۆڤ لەو چەمکە سەتاپاگیرو پێوانەییانە ڕزگاربکات‌و بیگەڕێنێتەوە بۆ تاکێتی خۆی، بۆیە دروشمی جوانکاری (ئیستاتیکای) بوونی وەك ئامانجێکی ئاکاری مرۆڤانە دەربڕی. لەناوەڕاستی حەفتاکانیشدا، کاتێك وێناکردنە بوونخواز، مارکسیست‌و بنەماخوازەکان زاڵبوون بەسەر دیمەنی ڕۆشنبیریدا، فەلسەفەکەی فۆکۆ وەك ئەڵتەرناتیڤی ئەو وێناکردنانە هاتەئاراوەو میکانیزمەکانی سەرکوتکردن‌و فەرامۆشکردنی هەڵوەشاندنەوە کە بناغەی دامەزراندنی نوێکاریی کۆمەڵگەی خۆرئاوایی بوون‌و ببوونە هۆی پەراوێزکردنی هەژاران‌و شێتەکان‌و کەمئەندامان، لەبەر ئەوەی "خەوشیی نوێکاری" بوون. بەوەش فۆکۆ جەغت لەسەر دابڕانێك لەگەڵ شێوازە مێژووییە تەقلیدییە باڵادەستەکان دەکاتەوەو چەندین چەمکی نوێ ڕووبەڕووی ئەو نوێکاری‌و ئەقلانیەتەی خۆرئاوا دەکاتەوە کە لەسەر بنچینەی توندوتیژی‌و دوورخستنەوەو دەسەلاتی فەرامۆشکردن دامەزرابوون. هەروەها فۆکۆ جەغتی لەسەر هاوکاتی یاخود یەکتربڕیی مەعریفەو دەسەلات بەواتا فراوانەکەی نەك تەنیا حکومیەکەی کردۆتەوە، چونکە فیکری مرۆڤانە لە ململانێ یاخود سازاندایە لەگەڵ ئەو دەسەلاتەداو ئەمەش چەندین بیروڕای نوێی لێدەکەوێتەوە.

# میشیل فۆكۆ

له ئینگلیزییه‌وه‌: ئاوات ئه‌حمه‌د



میشیل فۆكۆ (15ی ئۆكتۆبه‌ری 1926 – 26 مایسی 1984) فه‌یله‌سوفێكی فه‌ره‌نسییه‌، مێژوونوسی هزریشه‌. نوسینه‌كانی كاریگه‌رییه‌ زۆریان هه‌بووه‌ له‌سه‌ر چه‌ندان كایه‌ی جیاجیای وه‌ك ره‌خنه‌و تیوریی ئه‌ده‌بی، فه‌لسه‌فه‌ (به‌ تایبه‌تی فه‌لسه‌فه‌ی زانست له‌ جیهانی فرانكۆفۆنیدا[1])، تیوریی ره‌خنه‌یی، مێژوو، مێژووی زانست (به‌ تایبه‌تی پزیشكی زانستی)، پیداگۆگی ره‌خنه‌یی، هه‌روه‌ها سۆسیۆلۆژیای زانین، كه‌ هه‌موویان به‌سه‌ر یه‌كه‌وه‌ هه‌ژاندووه‌. فۆكۆ به‌ پۆستمۆدێرنیست[2]و پۆستبونیادگه‌را دانراوه‌، وه‌لێ هه‌ندێك كاره‌كانی سه‌ره‌تای، به‌ تایبه‌تی "ریزبه‌ندی شته‌كان، به‌ بونیادگه‌را[3] له‌قه‌ڵه‌مده‌ده‌ن، ئه‌و كاته‌ی خودی فۆكۆیان به‌ بونیادگه‌را داده‌نا. به‌ڵام ئه‌و زۆر به‌ وریایی مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌و نازناوه‌دا ده‌كرد، سه‌ره‌نجامیش به‌ ته‌واویی نكوڵی له‌وه‌ كرد كه‌ به‌سه‌ر كاری ئه‌ودا پیاده‌ ببێت، ده‌شێت زیاتر سه‌ر به‌ نه‌ریتی مۆدێرنیزم[4] بێت، لێره‌وه‌ ناتۆره‌ی پۆستمۆدێرنه‌ش تا راده‌یه‌ك گومانا‌وییه‌، گه‌رچی له‌ گه‌لێك له‌و شوێنانه‌دا كه‌ بۆی به‌كارهێنراون‌و دروستیشه‌.

### ژیانی فۆكۆ

له‌ ساڵی 1926 دا، له‌ پۆیاتێ[5]، فه‌ره‌نسا له‌ دایكبووه‌و ناونراوه‌ پۆڵ میشیل فۆكۆ، كوری خێزانێكی ناسراو بووه‌. پۆڵ فۆكۆی باوكی پزیشكێكی نه‌شته‌رگه‌ری نێودار بووه‌. دواتر فۆكۆ وشه‌ی پۆڵ له‌ ناوی خۆی فرێ ده‌دات، ره‌نگه‌ به‌هۆی ئه‌و په‌یوه‌ندییه‌ پر گێچه‌ڵه‌وه‌ بێت كه‌ به‌ باوكییه‌وه‌ هه‌یبوو. خوێندنی سه‌ره‌تایی تێكه‌ڵه‌یه‌ك بووه‌ له‌ زیره‌كی‌و مامناوه‌ندێتی، تا ئه‌و كاته‌ی په‌یوه‌ندیكرد به‌ كۆلێژی سان–ستانیسلاسه‌وه‌و

لەوێ زیرەکییەکەی گەشەی کرد. لەو ماوەیەشدا پۆیاتێ ناوچەیەکی بەرەنگاریی فەرەنسی بوو، دواتریش ئەڵمانیا داگیری کرد. دوای جەنگ فۆکۆ داوای وەرگیران لە پەیمانگای باڵای مامۆستایانی کرد، کە دەروازەی ژیانی ئەکادیمی بوو لە فەرەنسادا.

ژیانی تایبەتی فۆکۆ لە پەیمانگا نارەحەت بوو، هەستی بە سەر چەپاندنێکی زۆر دەکرد، تەنانەت هەوڵیشیدا خۆی بکوژێت. بردیان بۆ لای سایکۆلۆژیستێك، لەوێش کەوتە ژێر کاریگەریی سایکۆلۆژیاوە. بۆیە لەپاڵ بروانامەکەیدا لە فەلسەفەدا، بروانامەیەکیشی لە سایکۆلۆژیادا بەدەستهێنا، بەشداریشی کرد لە بەشی کلینیکی رشتە زانستییەکەدا، لەوێ راستەوخۆ چاوی کەوت بە بیریارانی وەك لۆدڤیگ بێنسوانگەرو دانیاڵ لاگاش.

فۆکۆش وەکو زۆربەی دەرچوانی پەیمانگا لە ماوەی نێوان ساڵانی 1950–1953 دا، پەیوەندی کرد بە پارتی کۆمۆنیستەوە، لە رێگای لویس ئاڵتۆسێری مامۆستاو سەرپەرشتیارییەوە بە پارتی کۆمۆنیست ناسێنرا. لە داخی ئەو شتانەی لە سایەی ستالیندا لە یەکێتی سۆڤێت روویاندەدا، وازی لە پارتەکە هێنا. فۆکۆ پێچەوانەی زۆرینەی ئەندامانی پارتەکە بووە، هەرگیز چالاکانە بەشداریی لە شانە سیاسییەکەیدا نەکردووە. لە ساڵی 1950 دا تاقیکردنەوەی ئەگریگاسیۆنی بری. ماوەیەکی کەم لە پەیمانگا وانەی وتەوەو پاشان لە زانکۆی لاڵ پۆستێکی وەرگرت و ساڵی 1953–1954 وانەی سایکۆلۆژیای وتەوە. لە ساڵی 1954 دا کتێبی (نەخۆشی ئەقڵی‌و سایکۆلۆژیا)ی بڵاوکردەوە، دواتر لێی پاشگەز بۆوە. ئیتر زۆری پێ نەچوو کە دەرکەوت فۆکۆ حەزی لە وانە وتنەوە نیە، بۆیە ماوەیەکی درێژ رووی کردە تاراوگەو لەگەڵ وەفدی کەلتوریی فەرەنسیدا گەیشتە زانکۆی ئۆپسالا لە سوێد (جۆرجی دوموزیل[6] ئەم پۆستەی بۆ ئامادە کرد، دواتریش بوو بە هاوڕێیەکی نزیکی فۆکۆ). لە ساڵی 1958 دا فۆکۆ بۆ ماوەیەکی کەم زانکۆی ئۆپسالای جێهێشت‌و لە وارشۆو زانکۆی هامبۆرگ پۆستێکی وەرگرت.

لە ساڵی 1960 دا گەڕایەوە بۆ فەرەنسا بۆ تەواوکردنی دکتۆراکەی‌و پاشان لە زانکۆی کلیرمۆنت فیران پۆستی ئوستادی فەلسەفەی وەرگرت. لەوێ دانیاڵ دیفێرتی بینی‌و بوو بە هاوەڵی ژیانی. لە ساڵی 1961 دا دوو تێزی پێشکەش کرد (نەریتی زانکۆکانی فەرەنسا وەهابوو کە دوو تێز پێشکەش بکرێت): تێزێکی سەرەکی: مێژووی دێوانەیی، تێزەکەی تریشان بریتی بوو لە شێتی‌و شارستانێتی کە تێیدا کۆمێنتێکی دەربارەی تێزەکەی کانت (ئەنترۆپۆلۆژیا لە دیدێکی پراگماتییانەوە، وەرگێرابوو. تێزەکانی پێشوازییەکی زۆریان لێکرا. ئیتر فۆکۆ بەردەوام بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی. لە ساڵی 1963 دا کتێبی (لەدایکبوونی کلینیك)ی بڵاوکردەوە. دیفێرت پۆستێکی سەربازیی لە تونس وەرگرت‌و فۆکۆش لە ساڵی 1965 دا پۆستێکی لە زانکۆی تونس وەرگرت، لە ساڵی 1966 دا کتێبی ریزبەندی شتەکانی بڵاو کردەوە، ئەم کتێبە سەرەڕای ئەوەی زۆر قورس‌و درێژیش بوو، سەرکەوتنێکی جەماوەریی زۆری بەدەستهێنا. ئەم سەردەمەش بونیادگەری لەوپەڕی برەویدا بوو، فۆکۆش لەگەڵ لێکۆڵیارانی وەکو جاك لاکان، کلۆد لیڤی شترۆس، رۆڵاند بارتدا پۆلێن کراو گرووپەکەش بەتازەترین شەپۆلی بیریاران لەقەڵەمدرا دژی بونگەرایی کە جان پۆڵ سارتەر رابەری بوو. ئێستا فۆکۆ بووە بە کەسێکی ئەنتی کۆمۆنیست، تەنانەت هەندێك بە راسترەو لەقەڵەمیان دەدا، لە هەمانکاتیشدا بە بونیادگەراش نێوزەد دەکرا. لە ماوەی راپەرینی خوێندکاراندا هێشتا لە تونس بوو، بەڵام کەوتبووە ژێر کاریگەریی راپەرینێکی زووتری خوێندکارە لۆکاڵەکانەوە کە هەر لە هەمان ساڵدا روویدابوو. لە

یایزی 1968 دا گەرایەوە بۆ فەرەنسا، پاشان لە ساڵی 1969 کتێبی ئارکیۆلۆژیای زانینی بڵاو کردەوە، کە وەڵامی ئەو رەخنانە بوو کە لێی گیرابوون.

فۆکۆ دوای روداوەکانی ساڵی 1968 گەڕابۆوە بۆ فەرەنسا، حکومەت زانکۆیەکی ئەزمونی کردەوە بەناوی ڤانسانەوە، لە دیسەمبەری هەمان ساڵدا، فۆکۆ بوو بە یەکەمین بەرپرسی بەشی فەلسەفە لەوێ. ئەویش ئەکادیمیکارە لاوە تا رادەیەك چەپرەوەکانی لەوێ دامەزراند، کە ئەوەندە رادیکاڵ بوون وەزارەتی پەروەردەی فەرەنسی ناچار بوو پاشەکشە بکات لە پاڵپشتیکردنی ئەو بەشە. فۆکۆش خۆی بە شێوەیەکی بەرچاو بەشداریی کرد لە هەڵمەتی خوێندکاراندا بۆ داگیرکردنی بیناکانی زانکۆو شەری دژی پۆلیسدا.

سەرکێشییەکەی فۆکۆ لە ڤانساین کورتخایەن بوو، چونکە لە ساڵی 1970 دا هەڵبژێردرا بە پرۆفیسۆری مێژووی سیستمەکانی هزر لە باڵاترین دامەزراوەی ئەکادیمی لە فەرەنسا، کۆلێج دوفرانس. لێرە بەدواوە سەرقاڵییە سیاسییەکانی بەرینبوونەوە، دیفێرت پەیوەندیکردبوو بە ماویستە چەپرەوەکانەوە، بەڵام پەیوەندی فۆکۆ پێیانەوە زۆر سست بوو. فۆکۆ یاریدەی دامەزراندنی دەزگای زانیارییەکانی بەندیخانەیدا بۆ ئەوەی بوار بدات بەندییەکان دەنگ بدەن بو کەسانەی هەڵی دەبژێرن. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی مۆرکێکی سیاسی بدات بە کاری فۆکۆ لە کتێبی (چاودێری و سزا)دا کە دەربارەی سیستمی بەندیخانە بوو.

لە کۆتایی هەفتاکاندا هەڵسوراوە سیاسییەکان لەناو فەرەنسادا دامرکانەوە، چونکە زۆربەی ماوییەکان، ئەگەر نەڵێین هەموویان نائومێد بوون، هەندێکیشیان هەڵگەرانەوەو ئایدیۆلۆژیای خۆیانیان گۆری‌و بوون بەوانەی پێیان وترا فەیلەسوفە نوێیەکان، کە زۆرجار دەیانوت کاریگەری فۆکۆیان زۆر لەسەرە، فۆکۆ خۆی زۆر لەمە دڵنیاو خۆشحاڵ نەبوو.

فۆکۆ سەردانی ئەمریکای دەکردو کاتێکی زیاتری لەوێ بەسەر دەبرد، بە تایبەتی لە *UC* بێرکلی‌و سونی بوفالۆ. لە سان فرانسیسکۆ تێکەڵاوی کەلتوری هاوسێکسانی[7] بوو ئەمەش خستیە بەر مەترسی تووشبوونی نەخۆشی ئایدز کە لەو سەردەمەدا هێشتا ناسراو نەبوو. لە ساڵی 1984 دا لە پاریس‌و بەهۆی نەخۆشی ئایدزەوە مرد.

### کاری فۆکۆ

کارە سەرەکییەکانی فۆکۆ زۆر نائاشنا بوون‌و کەم لە هزری باوەوە نزیك بوون. ئاشناترین چەمك کە ئەو بایەخی پێدابێت، چەمکی دەسەڵات بوو، لەگەڵ پەیوەندییەکانیدا بە زانینەوە (سۆسیۆلۆژیای زانست) هەروەها چۆن لە رەوتێکی مێژوویدا گوزارشت لە خۆی دەکات. ئەو مێژوو دەکات بە زنجیرەیەك ئەپستیمەوە[8]، کە وەکو ئامادەکاریی رێکخراوی دەسەڵات لەناو کەلتوردا پێناسە دەکرێن. فۆکۆ دەسەڵات لە مانا پوختە فیزیکی یان توانا سەربازییەکەیدا بەکارناهێنێت، گەرچی ئەمانەش رەگەزی پێکهێنەری دەسەڵاتن. بەلای فۆکۆوە دەسەڵات لە شێوازەکانی ریزبەندی کۆمەڵایەتیشدا هەیە. فۆکۆ پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی زانینیش سەرچاوەیەکی دەسەڵاتە، چونکە بوار دەدات بەوەی هەیەتی دەستڕۆیشتووانە دەربارەی ئەوە بدوێت کە خەڵك چۆنن، بۆچی ئاوان – لای فۆکۆ دەسەڵات شێوەیەکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو کۆمەڵێك میتۆدی جیاجیایەو لە رێگای دەزگا کۆمەڵایەتییەکانەوە خۆیان دەسەپێنن و لە فۆرمی راستییەکدا دەردەکەون.

بۆیە، بۆ نمونە، کە فۆکۆ دەروانێتە مێژووی بەندیخانە، بەگشتی سەیری ئەو شێوازانە ناکات کە لێیانەوە پاسەوانەکان دەسەڵاتی فیزیکییان پێدراوە – ئەو رێگایەی لێوەی بەندیخانە دیزاین کراوە بۆ ئەوەی ئایدیایەکی دیاریکراو بدات بە بەندکراوەکان دەربارەی ئەوەی ئەوان کێن، هەروەها واشیان

لێکرێت بە شێوەیەکی تایبەتی ڕەفتار بکەن. هەروەها سەرنجیش دەدات لە ئایدیای "تاوانبار" و گۆڕانی سروشتی تاوانباریی لەگەڵ کاتدا، ئەم گۆڕانە بریتیە لە دینامۆی دەسەڵات.

بەلای فۆکۆوە، ڕاستی (ئەوەی وەکو ڕاستی ڕەفتار دەکات یاخود لە ڕەوشێکی مێژووییدا، وەکو ڕاستی وەرگیراوە) بەهۆی هەلسورانی دەسەڵاتەوە بەرهەمهێنراوە، بابەتی مرۆییش بە سادەیی بریتیە لە وەگەڕخستن و هەڵسورانی جەستەکان لە لایەنی دەسەڵاتەوە.

بەلای فۆکۆوە، دەتوانرێت کێبڕکێی ئەو دەسەڵاتەی لە توێی سیستمەکانی هەقیقەتەوە لێی کۆڵدراوەتەوە، لە توێی فۆرمە ناشایستەکانی گوتار، زانین، مێژوو... هتدەوە، بکرێت. لە توێی ئیمتیاز بەخشینەوە بە جەستە لەسەرووی هزری یەتییەوە، هەروەها لەتوێی خود-ئەفراندنی هونەرییانەوە.

کتێبەکانی فۆکۆ بە زانیارییە مێژووییەکان ئاخنراون، بە تایبەتی "ساتە بچووکەکان" کە بەکەڵکی ئەوە دێن خزمەتی بیرۆکە تیورییەکانی بکەن وەك نمونەی بیرهێنراوە. وەلێ ڕەخنەکانی فۆکۆ، زۆرجار ڕایانگەیاندووە کە لە مێژووی خۆیدا زۆرجار وریا نەبووە، هەروەها زۆرجاریش شتەکانی بەخرایی وێناکردووە، یان بە سادەیی خراپ ڕیزی کردوون.

### شێتی و شارستانێتی

شێتی و شارستانێتی کورتکراوەی چاپە فەرەنسییەکەیە *Folie et deraison* کە لە ساڵی 1961 دا چاپکراوە. ئەوە یەکەمین کتێبی سەرەکی فۆکۆ بوو، لەو ماوەیەدا نوسراوە کە لە سوێد وانەی دەووتەوە. ئەو کتێبە دەروانێتە ئەو شێوازەی کە لە مێژوودا ئایدیای شێتی پەرەیسەندووە.

لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەستپێکردووەو سەرنجدەدات کە چۆن گەروگولەکان لە کۆمەڵگا دوورخراونەتەوەو چاودێرییان کراوە. لەوێوە لە توێی ئایدیای کەشتی گێلاندا لە سەدەی یازدەهەمەوە بەناو مێژوودا دەگەڕێت و دەگاتە سەر قازانجی لەناکاوی زیندانیکردن لە سەدەی حەڤدەهەمی فەرەنسەدا. پاشان سەیری ئەو ڕێگایە دەکات کە لێوەی مامەڵە لەگەڵ شێتیدا کراوە وەك نەخۆشییەکی باو لە نێوانی ژناندا، کە بەهۆی ڕەحمیانەوە گیرۆدە بوون و جەستەشیان پێوەی تووشبووە. سەرەنجام شێتی بوو بە نەخۆشی ڕۆح، دواجاریش لای فرۆید بوو بە نەخۆشییەکی ئەقڵی.

فۆکۆ بایەخێکی زۆریش دەدات بە پیاوانی شێت، لەگەڵ ئەو ڕێگایەی لێوەی پیاوی شێت لە بەشێکی پەسەندی ڕیزبەندیی کۆمەڵگاوە دەگوێزێتەوە بۆ ئەوەی ببێت بە کەسێکی بێزراوی دوورخراوەی چاودێریکراو. هەروەها لەو شێوازەش ورد بۆوە کە تێیدا خەڵکی هەوڵیانداوە شێوازێك مامەڵەی کەسێك بکەن کە تێکدەچێت، بەشێوەیەکی تایبەتی لە حاڵەتەکەی فیلیپ پینالڵ و ساموێل توکەدا. دەڵێت ئەو چارەسەرەی لە لایەنی ئەم پیاوانەوە پێشکەشکراوە، لە ڕاستیدا دڵڕەقانەو دزێو بووە. بۆچوونەکەی توکە ئەوەبوو کە چارەسەری شێت بە سزادان بکرێت، تا ئەوکاتەی فێردەبێت ئاکارییانە بجوڵێتەوە، وای لێدێت هاوشێوەی خەڵکی تەندروست دەجوڵێتەوە. بەهەمانشێوە، چارەسەرەکەی پینالیش بۆ شێت بریتی بوو لە چارەسەرکردن بە شۆك و ئازاردان، کە تەنانەت ڕووتکردنەوەو پێداکردنی دووشی تەزیو و بەکارهێنانی کراسی ئاسنینیش دەگرێتەوە. لە تێڕوانینی فۆکۆدا، ئەم مامەڵەکردنە ڕێك بریتیە لە دووبارەکردنەوەیەکی دڵڕەقانەی ئازاردان تا ئەوکاتەی ئازاردراوەکە دەچێتە ژێر بار.

### لەدایکبوونی کلینیك

دووهەمین کتێبی سەرەکی فۆکۆ، لەدایکبوونی کلینیکە: ئارکیۆلۆژیایەك بۆ گۆشەنیگای پزیشکی (*Naissance de la clinique: une archeologie du regard medical*) بە فەرەنسی، لە ساڵی 1963 دا

چاپکراوەو لە ساڵی 1973 دا وەرگێردراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی. ئیتر لە نێوانی شێتیو شارستانێتیو لەدایکبوونی کلینیکدا، مەسەلەی پسیۆریی پزیشکیو بەشێوەیەکی تایبەتی دەزگای کلینیکی پزیشکی یان نەخۆشخانە تاوتوێ دەکرێت.

### ریزبەندی شتەکان

ریزبەندی شتەکان: ئاریکۆلۆژیایەك بۆ زانستە مرۆییەکان، بریتیە لە ناونیشانە ئینگلیزییەکەی کتێبە فەرەنسییەکە (*Les Mots et les choses: un archeologie des sciences humaines*) کە لە ساڵی 1966 دا چاپکراوە، ئەم کتێبە فۆکۆی کرد بە کەسێکی دیارو بەرچاو لە رۆشنبیریی فەرەنسیدا. جان پۆڵ سارتەر هێرشی کردە سەری و بە "دواهەمین سەنگەری بۆرژاوزییەت" لەقەڵەمیدا. تێزی سەرەکی لەم کتێبەدا بریتی بوو لە پیشاندانی ئەوەی چۆن لە هەموو ماوەیەکدا چەند مەرجێکی دیاریکراو رەوشەکانی راستی دیاری دەکەن کە بریتیە لە داخزانێکی گەورە لە ئەپستیمێکەوە بۆ یەکێکی تر.

### ئارکیۆلۆژیای زانین

لە ساڵی 1969دا چاپکراوە، ئەم کتێبە بریتیە لە گەشتی سەرەکی فۆکۆ بەناو میتۆلۆژیادا. ئەم کتێبەی نوسی بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو پێشوازییە بداتەوە کە لە (*Les Mots et les choses*) کرا. بەشێوەیەکی بەرچاویش لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی شیکاریی ئەنگلۆ-ئەمریکیدا بوو، بەشێوەیەکی تایبەتی تیوریی یاسای ئاخاوتن.

### دیسپلین و سزا

دیسپلین و سزا: لەدایکبوونی بەندیخانە لە ساڵی 1977دا وەرگێردراوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی، ناونیشانە فەرەنسییەکەی (*Surveillir et punir: naissance de la prison*) و لە ساڵی 1975دا چاپکراوە. لێرەدا دەروانێتە ئەو شێوازەی تێیدا کۆنترۆڵ لە توێی ئەو دڵرەقییەوە ئاشکرا دەبێت کە لە سەردەمە مۆدێرنەکاندا بەکارهاتووە (بۆ نمونە لەسێدارەدان و ئەشکەنجەدانی ئاشکرا) کە بەشێوەیەکی گشتی رێگایان خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی کۆنترۆڵکردنی سایکۆلۆژییانە. فۆکۆ کۆمەڵگای مۆدێرن بەراورد دەکات بە هێڵکارییەکەی جێرمی بێنتام کە بۆ زیندان دیزاین کرابوو، کە تێیدا چەند پاسەوانێکی کەمی نهێنیو نەبینراو دەتوانن پاسەوانی ژمارەیەکی زۆری زیندانییان بکەن، خۆی بەم شێوازە دەڵێت "پاسەوانی نمونەیی". فۆکۆ تێبینی ئەوەش دەکات کە لە کاتی لەدایکبوونی سیستمی زیندانەوە، زیندان وەك تاکە چارەسەری مەسەلەی رەفتاری تاوانکارانە دانراوە.

خاڵێك لەم کتێبەدا زۆر سەرنج رادەکێشێت، سیستمی سزادان لە تاوانکارییدا (نەسرۆیی) وەکو پەیوەندییەکی دووسەرە مامەڵەی لەگەڵکراوە — هەردوکیان پێشگریمانەی یەکترین. سیستمی مەرگ خۆی چینی تاوانکاران دەخوڵقێنێت.

### مێژووی سێکسایەتی

سێ بەرگ لە کتێبی مێژووی سێکسایەتی بەر لە مردنی فۆکۆ لە ساڵی 1984 دا، چاپکران. بەرگی یەکەمیان گرنگترین سەرچاوەیە: پێشەکی (*Histoire de la sexualite، 1: la volonte de savoir*) کە لە ساڵی 1976دا چاپکراوەو لە ساڵی 1977دا کراوە بە ئینگلیزی، بەشێوەیەکی بەرایی نیگا دەگرێتە دواهەمین دوو سەدە، کە تێیاندا وەزیفەی سێکسایەتی وەك رژێمێکی دەسەڵات وایەو پەیوەندی هەیە بە دەرکەوتنی بایۆدەسەڵاتی دووبەرگەکەی دییەوە، بەکارهێنانی چێژ (*l'usage des plaisirs*) و بایەخدان بە خود (*le souci de soi*) کە بایەخدەدەن بە رۆڵی سێکس لە رۆژگاری دێرینی یۆنان و رۆماندا. ئەم دوو بەرگە هەردوکیان لە ساڵی 1984 دا چاپکران، ساڵی مردنی فۆکۆ، بەرگی دووهەمیشیان لە ساڵی 1985 دا کرا بە ئینگلیزی،





سێهەمیش لە 1986 دا. لە کاتی مردنی فۆکۆدا بەرگێکی چوارەم کە بایەخدەدات بە سەردەمی مەسیحی، کەم تا زۆر تەواو ببوو، وەلیٚ فۆکۆ باسی لە هیچ نوسینێکی وەها نەکردووە، بۆیە ئەم بەرگە بووەتە مایەی مشتومڕێکی زۆر.

**وانەکان**

لە ساڵی 1970 وە هەتا ڕۆژی مردنەکەی، ساڵانە چەند وانەیەکی وتۆتەوە. هەفتانە لە کۆلیج دو فرانس سیمینارێکی هەبوو، ئەمەش مەرجی دامەزرانی بوو وەکو پرۆفیسۆرێك لەویٚ. هەموو ئەم نامانە بە ریکۆردەر تۆمار کراون، هەروەها ڕەشنوس‌و دەسخەتەکانیشی ماون. ئەمەش وای کرد بتوانرێت لە ساڵی 2001 دا وەکو کتێبێك بە فەرەنسی چاپ بکرێت‌و پاشان وەریشبگێردرێتە سەر زمانی ئینگلیزی. لە زمانی ئینگلیزیدا، تا ئێستا دوو کۆمەڵە وانەی فۆکۆ کەوتونەتە بەرچاو: پێویستە داکۆکی لە کۆمەڵگا بکرێت، لەگەڵ نائاسایی. هەروەها کۆمەڵەی وانەکانیشی لە بێرکلی لەژێر ناونیشانی ئاخاوتنی نەترسانە بڵاوکراوەتەوە.

**پەراوێزەکانی وەرگێڕ**

1-**جیهانی فرانکۆفۆنی** *Franco phonic world* بە کۆمەڵەی ئەو وڵات‌و هەرێم‌و ناوچانە دەوترێت کە دانیشتوانەکەی بە زمانی فەرەنسی دەدوێن، بە تایبەتی ئەوانەی فەرەنسی زمانی زگماکیانە.

2-**پۆستمۆدێرنیزم** *postmodernism* مانای فەرهەنگی وشەکە پاش مۆدێرنیزم دەگەیەنێت. دراوەتە پاڵی ئەو لێکۆڵینەوەو تێزانەی لە کایەکانی هونەر، بیناسازیی، ئەدەب، هزردا ئەنجامدراون، وەك کاردانەوەیەك بەرامبەری مۆدێرنیزم. لێرەدا گەڕانەوەیەك هەیە بۆ توخم‌و تەکنیکە کلاسیکییەکان یان سوننەتییەکان لە تۆژینەوەو هزراندن‌و ئەنجامداندا. هەروەها پۆستمۆدێرنە، جولانەوەیەکی هزرییە دژ بەو دڵنیاییەی مۆدێرنە دامەزراوە کە زۆر گەشبینە لە پێشکەوتنی زانستی‌و تەکنیکی مرۆڤایەتی‌و پێیوایە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بەرەوپێشدەچێت.

3-**بونیادگەرایی** *structuralism* جولانەوەیەکی ڕەخنەیی ئەوروپاییە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا. لەسەر بناغەی تیورییە زمانەوانییەکانی فەردیناند دی سۆسێر، کە دەیووت زمان بریتیە لە سیستمێکی خۆبەخۆی نیشانەکان، هەروەها تیورییە کەلتورییەکانی کلۆد لیڤی شتراوس کە دەیووت کەلتوریش وەکو زمان دەشێت وەکو سیستمێکی نیشانەکان ببینرێت، هەروەها دەشتوانرێت بە زاراوەکانی پەیوەندییە بونیادییەکانی نێوانی توخمەکانی شیبکرێتەوە. بونیادگەرایی ئەدەبیی وەها دەیڕوانییە تێکستە ئەدەبییەکان کە سیستمێکی ئاڵۆسکاوی نیشانەکان بنکە بەشێوەیەکی نیمچە زانستییانەی وەکو ڕێزمان ڕوون دەکرێنەوە (ڕێساکان و کۆدەکان، یان سیستمەکانی ڕێکخستن) کە فۆرمەکە بەڕێوە دەبەن و ناواخنی ئەدەبەکە پێکدەهێنن. میشیل فۆکۆ، ڕۆمان یاکۆپسن، هەروەها ڕۆلان بارت لە بونیادگەرا دەرکەوتووەکانن. ئەو بوارانەی لێکۆڵینەوە کە پێشەکییەکانی بونیادگەراییان هەڵگرتۆتەوەو پەرەیان پێداون، بریتین لە سیمیۆتیکس (زانستی ئاماژە)، زانستی حیکایەت (گێڕانەوە).

4-**مۆدێرنیزم** *Modernism* بریتیە لەهەوڵێك کە لەلایەنی گرووپێك لێکۆڵەر لە تیۆلۆجیاو فەلسەفەدا، بۆ سەرلەنویٚ پێناساندنەوەی پێڕەوی مەسیحیی بەبیری زانستییانەی سەدەی نۆزدە. گەرچی هەموو هەوڵەکان بەسەریەکەوە لەیەك دانە سیستم و یەك بواردا کۆناکرێنەوە، بەڵام لەساڵی 1907دا، لە لایەنی پاپا پیۆسی دەیەمەوە، ئەم ناوەی لێنرا. دواجار مۆدرێنیزم هەموو بوارەکانی تری بیرکردنەوەو ئەدەب و هونەرو بیناسازیی و نیگارکێشان و سیاسەت و ... هتدیشی گرتەوەومانای نوێکردنەوەو بەهاوچەرخکردنی وەرگرت.

5-**پۆیاتیٚ** *Poitiers* (شاری دێرینی لیمۆنۆم) شارێکە لەخۆراوای ناوەڕاستی فەرەنسە، سەنتەری ناوچەی

ڤینه. پۆیاتێ ناوچەیەکی ئاڵوگۆڕی بازرگانییەو سەنتەرێکی پیشەسازیشە، کە ئامێری میکانیکی و یەدەکی مێتاڵیی و کیمیاوییات و ئامێری کارەبایی بەرهەم دەهێنێت. زانکۆیەکی تێدایە هەر بەناوی شارەکەوە ناونراوەو لەساڵی 1432دا لەلایەنی چارلسی حەوتەمەوە دروست کراوە. لەسەدەی شازدەیەمداو لەکاتی جەنگە ئاینییەکاندا، ئەم شارە لەلایەنی کاسۆلیکەکانەوە،بەتەواویی وێرانکراوە، چونکە سەنتەرێکی پرۆتستانتی بووە. لەساڵی 1999دا ژمارەی دانیشتوانەکەی 83448 کەس بووە.

6–**دومۆزیل، جۆرج** ***Dumézil, Georges (1898-1986)*** فەیلەسوف و مێژوونوسێکی فەرەنسییە، بە زۆریی بەهۆی کارەکانییەوە لە کایەی میتۆلۆژیای هیندۆ ئۆرۆپییدا ناسراوە. لە پاریس لەدایکبووە، لە چەند شارێکی فەرەنسا خوێندوویەتی و پاشان پەیوەندی کردووە بە پەیمانگای مامۆستایانەوە. دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان، لە ساڵی 1919 دا گەڕاوەتەوە بۆ پەیمانگاو ئەگریگاسیۆنی وەرگرتووە. لە ساڵی 1921 ەوە دەستیکردووە بە وانەوتنەوە لە زانکۆی وارشۆ. لە ساڵی 1933 دا گەڕاوەتەوە بۆ فەرەنساو کراوە بە بەرپرسی لێکۆڵینەوەکانی پەیمانگای باڵا. لە ساڵی 1949 دا هەڵبژێردراوە بۆ کۆلیج دۆفرانس و لەوێ تا ساڵی 1968مێژووی هیندۆئۆرۆپییەکانی وتۆتەوە. لە ساڵی 1978دا کراوە بە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا. لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەسەر بنەمای بەراوردکردنی بونیادییانەی ئایینە هیندۆئۆرۆپییەکان، وەك هیندستان، یۆنان، جەرمانەکان، دامەزراندووە. سەرەنجام گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو ئایینانە هەموویان رەگیان چۆتە ناو ئایدیۆلۆژیایەکی باوەوە کە چەندان سروت، ئەفسانە، ئۆرگانی کۆمەڵایەتی بەڕێوەی دەبەن. لە تێڕوانینی ئەودا چالاکییەکانی ئایین لەناو کۆمەڵگادا دەکرێت بە سێ بەشەوەو هەر بەشەی وەزیفەی خۆی هەیە: رۆحی، سەربازیی، بەرهەمگوزاریی. ئەم تیورییە گەلێك لایەنی میتۆلۆژیای هیندۆئۆرۆپیی روونکردەوە. لە کتێبە نێودارەکانی: لە ئەفسانەوە بۆ فیکشن (نادروستی)–1973، ئەفسانەو داستان 1968–1973.

7–**هاوسێکسانی** ***Homosexuality*** بریتیە لەئارەزووی سێکسیی بەرامبەری ئەندامانی هەمان رەگەزەکەی خۆت. هۆمۆسێکسی پێچەوانەی هیترۆسێکسییە *heterosexuality*، کەئەمیان بریتیە لەئارەزووی سێکسیی بەرامبەری رەگەزەکەی تر. بەڵام ئەوانەی کە ئارەزووی هەردوو رەگەزەکە دەکەن لەیەك کاتدا پێیان دەوترێت جووتسێکسی *bisexuals* ، ئەم زاراوەیە جیاوازیی زۆرە لەگەڵ زاراوەی نێرەمووکدا، کە بۆ کەسێك بەکاردێت خاوەنی هەردوو ئەندامی سێکسیی نێریش و مێش بێت. هۆمۆسێکسی ئافرەت پێی دەوترێت پانێنکەر یان لیزبی *lesbians*. لەم ساڵانەی دواییدا، لەمیدیادا، زاراوەی گەی *gay* بۆ هەردوو هۆمۆسێکسی نێریش و مێش بەکار دەهێنرێت.

8–**ئەپستیم** *episteme* لە تێڕوانینی فۆکۆدا، ئەم زاراوەیە هەڵوێستێکی سۆسیۆ- رۆشنبیرییە لە لایەنی کۆمەڵگاوە لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئەپستیم کایەیەکە تێیدا هەموو پێشینە تیورییەکان دیاری دەکرێن، ئەمەش وەکو مەرجێك بۆ شێمانەی زانین و پرەنسیپەکانی ئاڕاستەکردن. بەمجۆرە ئەپستیم دەبێت بە رێکخستێکی زنجیرەیی کە هەموو بونیادە سیمیاییە قوڵەکان لەوێدا کۆدەبنەوە.

## سەرچاوە

*Wikipedia، the free encyclopedia.*

# دەروازەی فۆكۆناسی

## میتا-خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی (مەعریفە و دەسەڵات: دۆڵۆز)*

شاهۆ سەعید



**یەكەم: فۆكۆی ئەرشیفناس (ئاركۆلۆجیای مەعریفە)**

ئەو ئەرشیفناسە نوێیە كێیە كە ماوەیەكە لە شاردا سەرگەرمی هەڵكۆڵینە بەناو دۆكیۆمێنت و مەعریفەی چەندین سەدەی مرۆڤایەتیدا؟ داخۆ خۆی بە ئیرادەی خۆی ئەو كارە دەكا، یان لەلایەن دەزگایەكی تایبەتەوە ڕاسپێردراوە؟!

ئەمە گەوهەری پرسیارەكەیە، كە كەسانێكی بەدگومانی بەدگومانتر كردووە. هەندێكیان وەك فەرمانبەری دەزگایەكی تەكنۆكراتی بونیادگەری لێیدەڕوانن. هەندێكی تر پێیان وایە پیاوێكە هیتلەر ئاسا گاڵتەی بە (مافەكانی مرۆڤ) دێ و مانیفێستی (مەرگی مرۆڤ)ی زۆر بێباكانە ڕاگەیاندووە. كەسانێكیش وەك نوسەرێك لێی دەڕوانن كە گەمە لە نێو زماندا دەكا و توانای بەرهەمهێنانی دەقێكی ڕوون و ئاشكرای نییە و قسەی هیچ فەیلەسوفێكی گەورە بە هێند وەرناگرێ.

بەڵام لە بەرامبەر ئەم بەدبینییەدا. خەڵكانێكیش بە وردی و، بێ هیچ حوكمێكی پێشوەخت، لە كارە سەیرەكانی ئەو ئەرشیفناسە نوێیە ورددەبنەوە، كە لە كاری هیچ ئەرشیفناسێكی پێش خۆی ناچێ. ئەو مێژوونوسەی كە خاوەنی فەلسەفەیەكی نوێیە بەرامبەر مەعریفە و گوتاری مەعریفی، بێباك لە هەر قسە و تۆمەتێك، بە متمانەیەكی ئێجگار گەورەوە، درێژە بە هەڵكۆڵینەكانی خۆی دەدا. وەك ئەوەی لە ئایندەوە گەڕابێتەوە و توانای نەبێ بە زمانی ئاسایی ئێمە قسە بكا. بۆیە ئەم خەڵكانە لە (میشیل فۆكۆ)دا

وێنەی سپێدەیەکی نوێی چاخێکی فەلسەفی – مەعریفی نوێ بەدیدەکەن.

بۆ ئەوەی لە هەڵکۆڵینەکانی فۆکۆ تێبگەین، دەبێ سەرەتا لەو میتۆدە بگەین کە (مێژوو) و دۆکیۆمێنتەکانی مێژووی پێدەخوێنێتەوە. ئەڵبەتە گرنگترینیشیان (دەقەکان)ن. بەڵام داخۆ ئەو میتۆدە نوێیە چییە بۆ خوێندنەوەی مێژوو؟

کاتێ فۆکۆ مێژوو دەخوێنێتەوە، دوو شت جێ بایەخی ئەو نین، کە پێشتر و تا ئێستاش – بە گوێرەی میتۆدی ڕەخنەیی و شێوازی لێکۆڵینەوە لە زانستە مرۆییەکاندا – دوو سەرچاوەی سەرەکی تێگەیشتن و دەسکەوتنی حەقیقەتن. ئەو دوو شتەش کە فۆکۆ بە سەریاندا بازدەدا:

1–دۆز (القضية *proposition*): کە ڕەگەزێکە بۆ پشتڕاستکردنی حەقیقەت. لە لۆجیکدا: ئەو قسەیەیە کە قابلی سەلماندن یان ڕەتکردنەوەیە. سروشتی دۆز ستونییە، دۆزەکان لە پاڵ یەکدا کۆمەڵێك ستوونی هاوجۆر یان ناجۆر، یەکتەواوکەر یان دژ بە یەك پێکدێنن. بەڵام لە رووی مێژووییەوە پلەبەندی لە نێوانیاندا هەیە (لە کۆنەوە بۆ نوێ). بۆ نمونە دەوترێ (مرۆڤ بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە: ئەرستۆ) ئەمە دۆزێکە لە پاڵ دۆزێکی تردا کە دەڵێ (من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم: دیکارت). ئەم دوو دۆزە هەر چەندە لە ڕووی لوجیکییەوە تەواون، بەڵام لە هەناویاندا یەکتری ڕەتدەکەنەوە. یەکەمیان بوونی فیسیۆلۆجی مرۆڤ دەکاتە مەرجی پێشوەختی بیرکردنەوە، هەرچی دووەمیانە بیرکردنەوە دەکاتە مەرجی پێشوەختی بوون. مەعریفەی مرۆیی لێوانلێوە لە دۆز، هەندێکیان رووکەش و هەندێکیان قووڵ، هەندێکیان سانا و هەندێکیان لێکدراون.. بەڵام ئەو رووبەرە فراوانەی کە دۆزەکان لە دۆکیۆمێنتە مێژوییەکاندا داگیریاندەکەن، جێبایەخی ئەوتۆی فۆکۆ نین.

2–ڕستە: ئەگەر سروشتی دۆزەکان ستوونی بێ، ئەوا سروشتی ڕستەکان ئاسۆییە. هەموو ڕستەیەك کە ئێمە دەیدرکێنین تەواوکەری ڕستەیەکی پێشوتر و زەمینەخۆشکەری ڕستەیەکی دواترە. بۆ ئەوەی ڕستەکانمان بگەن، دەبێ پەیوەندییەکی هێڵی (خطي) لە نێوانیاندا هەبێ و بچنە گەمەیەکی دیالیکتیکییەوە لەگەڵ یەکتردا، وەك ئەوەی هەر رستەیەك وەڵامی ڕستەیەکی پێشوتر بێ. بۆ نمونە ڕستەی (مرۆڤ بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە) وەڵامی ڕستەیەکی پێشوترە کە دەڵێ (مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاژەڵییە). ڕستەی (من هەم) وەڵامی ڕستەیەکە دەڵێ (من بیر دەکەمەوە). بەڵام فۆکۆ جگە لەوەی گرنگی بە سروشتی لۆجیکی دۆزەکان نادا، گرنگی بە سروشتی سێنتاکسی ڕستەکانیش نادا.

ئەی داخۆ ئەو ڕووبەرە چیە کە فۆکۆ لە هەڵکۆڵینە مەعریفیەکانیدا تیشکی دەخاتە سەر؟!

لە ڕاستیدا ئەو ڕووبەرە (گوتار)ە، کە نە لە دۆزەکان پێکدێ و نە لە ڕستەکان، بەڵکو لە (گوزارشت)ەکان پێکدێ. فۆکۆ پێی وایە لە هەر شوێنێکی مەعریفەی مرۆییەوە هەڵکۆڵین دەستپێبکەین، دۆزەکان و ڕستەکان هەڵدەقوڵێن، بەڵام ئەوەی کە زۆر ناوازە و دەگمەنە (گوزارشتەکان)ن چونکە ئێمە بە ئاسانی دەستکاری دۆزەکان دەکەین و بە جیاوازی توێژەرەکان ئەنجامگیری جیاوازمان چنگدەکەوێ. هەروەها دەکرێ لە ڕستەکاندا ئەو مانایانە دەستخەین کە نەوتراون، چونکە لە هەناوی هەموو ڕستەیەکی وتراودا ڕستەیەکی نەوتراو هەیە. کەواتە دۆزەکان و ڕستەکان لە زاوزێی بەردەوامدان، ئەوەی لە رابردوودا بەرهەمهاتووە ئێستا بەرگی نوێ دەپۆشێ، لە سیاقی خۆی دەترازێ و دەچێتە سیاقە بێ شومارە فەردی و دەستەجەمعییەکانەوە. بۆیە ناتوانین هیچ (گوتار)ێکی ڕوونمان دەستکەوێ




گەربێتو تەنها بەناو دۆزو ڕستەکاندا بگەڕێین. بەڵام سروشتی (گوزارشت) جیاوازە لە سروشتی دۆز و ڕستەکان، گوزارشتەکان ڕووبەرێك نین بۆ زاووزێی مانا، بەڵکو ڕەگەز پێکهێنەرەکانی گوتارن، کە قۆناغێکی مەعریفی لە قۆناغی مەعریفی تر جیادەکەنەوە. گەڕانیش بە دوایاندا سانا نییە، چونکە ناوازە و دەگمەنن. گوزارشتەکان لە هەناویاندا دۆزی لۆجیکی هەڵناگرن کە قابلی سەلماندن یان ڕەتکردنەوە بن، هەروەها ڕستەی نەوتراو ناشارنەوە کە قابلی ڕاڤەکردنی نوێ بن. بەڵکۆ گوزارشتەکان تەنها گوزارشتن و راستگۆترین کانگای بەرهەمهێنانی گوتارن. هەندێ جار گوزارشتەکان کۆپی یەکترن و یەکدی دووبارە دەکەنەوە، کە ئەوەش بەڵگەی بەردەوامبوونی گوتارێکی دیاریکراوە، هەندێ جاریش دابڕان لە نێوان سروشتی گوزارشتەکاندا بەدیدەکەین، کە ئەوەش بەڵگەی دابڕانە لە گوتاردا.

گوزارشتەکان هەندێك جار تاکەکەسی و هەندێ جار دەستەجەمعین، هەندێ جار بەرهەمی مرۆڤەکان و هەندێ جار بەرهەمی دامودەزگاکانن.. هەموویان پێکەوە ئەو پنتانە پێکدێنن کە لە فەزایەکی هاوجۆردا گوتار پێکدێنن. بەڵام پێویستە سێ بازنە لێکدیّ جیابکەینەوە کە لە گوزارشت ئالاون:

بازنەی یەکەم: (فەزایەکی پێکەوەلکاو) کە تیایدا گوزارشتەکان سروشتێکی هاوجۆریان هەیە، ناکرێ وەك (دۆزەکان) بیانبەینەوە سەر پرنسیپی سەرەتایی. هەروەها ناکرێ وەك (ڕستەکان) بیانبەینەوە سەر سیاق. بەڵکو دەکرێ سەرنجی ئەو گۆڕانە بدەین. کە بەسەر جووڵەی گوزارشتەکاندا دێ نەك بەسەر شوناسی گوزارشتەکان. بۆ نموونە کاتێ مرۆڤ لە چەند کایەیەکی جیاوازدا کاردەکا، گۆڕان بەسەر سروشتی گوزارشتەکاندا نایەت، بەڵکو گۆڕان بەسەر ئاستەکانی ئیشکردنیاندا دێت.

مرۆڤ هەوڵنادا چوونیەکی لە نێوان چالاکیەکاندا بدۆزێتەوە، بەڵکو هەوڵدەدا چوونیەکی لە نێوان ئەو سیستمە پێشوەختانەدا بدۆزێتەوە کە پەنایان بۆ دەبا. فۆکۆ نموونەی گەنجێکی ڕەشپێستی ئەمریکی دێنێتەوە، کە هەندێ جار بە سیستمی زمانی ئینگلیزی گشتی قسە دەکا و هەندێ جاریش بەلەکنەو سیستمی تایبەتی ڕەشپێستەکان قسە دەکا. گەنجەکە لەو دوو پرۆسەیەدا، کە دەشێ ئارەزوومەندانەبێ یان ناچاری بێ، بە دوای هاوجۆری لە نێوان دۆز و ڕستەکاندا ناگەڕێ بەڵکو بە دوای هاوسیستمیدا دەگەڕێ کە لە شێوازی گوزارشتەوە سەرچاوە دەگرێ. واتە گوزارشت سەرچاوەی سەرەکی هەر سیستمێك یان هەر گوتارێك پێکدێنێ، کە ئەو سیستمەش لای خۆیەوە ڕستە و دۆزی تایبەت بە خۆی بەرهەمدێنێ. نموونەیەکی تر (کە هی دۆلۆزە): کرافت ئیبینگ کتێبێکی بە زمانی ئەڵمانی دەربارەی سایکۆلۆجیای لادانە سێکسیەکان (الانحرافات الجنسیە) نوسیوە، کاتێ باس دێتە سەر ئەو بابەتانەی کە مایەی شەرم یان بێزلێکردنەوەن، کرافت سیستمی گوزارشتی خۆی دەگۆڕێ و زیاتر زاراوەی لاتینی بەکاردێنێ. ڕەنگە زمانناسێك یان ڕەخنەگرێك ئەم دیاردەیە بەوە تەفسیر بکا کە سیستمی سانسۆر و شەرم لە هەر کۆمەڵگایەکدا ئەوە دەخوازێ کە ئەو وشەی بازاڕیانە لە نوسیندا بەکارنەیەن، ئەم تەفسیرە لە ڕووی یاسای زمان و شێوازی دەربڕینەوە ڕاستە. بەڵام لە رووی یاسای گوزارشت و گوتاری مەعریفییەوە ڕاست نییە، چونکە کرافت تەنها لە شێوازێکی دەربڕینەوە ناگوێزێتەوە بۆ شێوازێکی دەربڕینی تر، بەڵکو لە گوتارێکی مەعریفییەوە دەگوێزێتەوە بۆ گوتارێکی مەعریفی تر، کە تیایدا ماناکانی شەرم و سانسۆر و جوانی و سێکس و.. هتد، جیاوازن.

بازنەی دووەم: (فەزایەکی هاوسیێ) لەم فەزایەدا مەرج نییە گوزارشتەکان پەیوەندییان پێکەوە هەبێ، بەڵکو پەیوەندییان بە ئاستەکانی خود، بابەت و چەمکەکانەوە هەیە. ئەم پەیوەندیانەش دەرفەت دەرەخسێنن بۆ سەرلەنوێ جیاکردنەوەی گوزارشت لە دۆز و ڕستە. ئەڵبەتە هەر ڕستەیەو بەرهەمی خودێکی دیاریکراوەو، هەر دۆزێکیش ئەنجامگیریی خودێکی بیرکەرەوەیە. گوزارشتەکان هەرچەندە لە ڕواڵەتدا خودین، بەڵام لە فەزای گشتیدا بەرهەمی گوتارن. بکەری گوتاریش بکەرێکی نادیارە. بۆ نموونە هەرچەندە کەسێك دێت و دەڵێ: (بە دیدی من..)، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو فرێزە لەناو گوتارێکدا بەکاردێت کە قسەکەر، یان بکەر، تیایدا پاسڤ و نادیارە، یان ملکەچی سیستمی گشتی گوتارە. واتە ئەوەی کە ئامادەیە دیدی گشتی گوتارە نەك دیدی تاکەکەس. گوزارشت سەربەخۆیە نەك سەر بە کەسی گوزارشتکار، کەسی گوزارشتکار پنتێك پێکدێنێ لەناو تۆڕێکی گوزارشتئامێزا، کە سەرەڕای پێگەو شوێن و سیاقی جیاوازی بکەرە گوزارشتکارەکان هەموویان بە گوێرەی سیستمێکی دیاریکراوی بەرهەمهێنانی گوتار و گوزارشت کاردەکەن. لێرەدا سەرلەنوێ پێویستە ئەوە دووپات بکرێتەوە کە مەرج نییە گوزارشتەکان سەر بە هەمان ڕستەو هەمان دۆز بن، چونکە ئەو ڕستانەی پزیشکێك، فەرمانبەرێك، پیاوێکی ئاینی یان مامۆستایەك بەکاریدێنێ جیاوازە لەو ڕستانەی سەربازێك یان بازرگانێك یان نەخوێندەوارێك بەکاریدێنێ، هەروەها دۆزەکان (قضایا)ی ئەو کەسانە لە یەکتر جیاوازن.. بەڵام گوزارشتەکان سەر بە گوتارێکی دیاریکراوو سیستمێکی دیاریکراوی مەعریفین. بۆیە ئەوەی لای فۆکۆ گرنگە خودی گوزارشتەکەیە نەك کەس و دەزگا گوزارشتکارەکان. لێرەدا دۆلۆز قسەیەکی سارتەر بە نموونە وەردەگرێ کە دەڵێ ئەو وێنە و زانیارییە خەیاڵیانەی کە لە خەونەکاندا دەیانبینین و وەریاندەگرین سەر بە جیهانێکی ناواقعی نین، بەڵکو سەر بە جیهانی تایبەتی خۆیانن کە جیاوازە لە جیهانی بێداری.. بەم پێیە جیهانی گوزارشتەکان کە ژێدەری بەرهەمهێنانی گوتارن لای فۆکۆ، جیهانێکی تەواو جیاوازە لەو جیهانەی کە پێشتر فەیلەسوف و مرۆڤناسەکان بەرهەمیانهێناوە.. جیهانێکی خەیاڵی نییە بەڵکو بەرهەمی ئەو گوزارشتانەیە کە لە ژێر زەبری رستەو دۆزەکاندا خنکاون و ئارکۆلۆجیست و هەڵکۆڵەرەکانیش هیچ لایەکیان لێنەکردۆتەوە، هیچ میتۆدێکی نوێیان بەکارنەهێناوە بۆ بەقسەهێنانیان.

لە هەر رستەو دۆزێکدا سێ جۆر ئاماژە ئامادەییان هەیە: (ئاماژەکانی خود، ئاماژەکانی بابەت، ئاماژەکانی وێنا). بەڵام لە گوزارشتدا ئەم ئاماژانە ئامادەییان نیە چونکە قابلی لێکجیاکردنەوە نین. هەموو ئاماژەیەك لەیەك کاتدا خود و ئاماژە و وێناکردنیشە. ڕەنگە ئاماژە رواڵەتیەکانی ڕستەو دۆز گۆڕانیان بەسەر بێت، بەڵام گوزارشت وەك ئاماژەیەکی گەوهەریی لە گوتارێکی دیاریکراودا وەك خۆی دەمێنێتەوە. بە مانایەکی تر: گۆڕان لە ڕستەو دۆزدا گۆڕانی کاتی و ڕواڵەتین، بەڵام گۆڕان لە گوزارشتدا یان ڕوونادا، یان کە ڕوویدا ریشەییە و دابڕانێك لە گوتاردا دەخاتەوە.

بازنەی سێهەم: (فەزایەکی تەواوکار) واتە فەزای ئەو پێکهاتانەی کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نایەنەگۆ، وەك دامودەزگاکانی دەوڵەت، ڕووداوە سیاسیەکان و پرۆسە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان، بەڵام بەرهەمهێنی ئەو گوزارشتانەن کە دوا بازنەی سیستمی بەرهەمهێنانی گوتار پێکدێنن.

گوزارشتە دەنگدارەکان گوزارشتی بێدەنگ بەرهەم دێنن، بۆ نمونە فرێزگەلێکی وەك (دەستور، پەیماننامە، گرێبەست و تۆمارکردن) ئەو گوزارشتە





دەنگدارانەن کە دەزگاگەلێکی وەك دادگا و دەوڵەت و فەرمانگەکان بەرهەمدێنن. بەڵام دامودەزگاکانیش ئەو ئاستە بێدەنگانەی گوزارشتن کە (بەها) و هەیبەت دەبەخشن بەو فرێزە پەتی و ئەبستراکتانەو لە رستە و دۆزی ئاسایی جیایان دەکەنەوە. دەمودەزگاکان مرۆڤەکان جڵەو دەکەن تاببنە بەرهەمهێنی ئەو گوزارشتانەی کە بە گوێرەی سیستمێکی پێشوەختی گوتار بەرهەمهاتوون. بۆ نموونە وێنەی پزیشك لەناو خەستەخانەدا، وێنەی ئەکادیمییەك لەناو دەزگای زانکۆدا، یان دادوەرێك لەناو دادگادا وێنەی کەسێك نییە گوتار بەرهەمبێنی بەڵکو بەرجەستەکەری گوتارێکی سیاسی –مەعریفی– کۆمەڵایەتییە کە رۆڵی دابەشکردووە بەسەر هەموو بکەرەکاندا، جیهانی خەستەخانە لە جیهانی دەرەوەی خەستەخانە و جیهانی ناو دادگا لە جیهانی ناو بازاڕ جیادەکاتەوە.. کەسانێك سانسۆر و کەسانێك سانسۆرکراون، کەسانێك تۆمار دەکەن و کەسانێك تۆمار دەکرێن.. بەڵام هەموو بکەرەکان پێکەوە، ئەوانەی دەرەوە و ناوەوە، گوزارشت لە گوتارێك دەکەن کە ڕۆژانە و سات لە دوای سات دووبارە دەبێتەوە.

کەواتە خەسڵەتێکی تری گوزارشت لە دیدی فۆکۆدا دووبارە بوونەوەیە، بەڵام دووبارە بوونەوەیەك کە لە گەوهەردا (سەقامگیریی) لە خۆگرتووە نەك پێچەوانەکەی. لە پرۆسەی دووبارە بوونەوەدا فۆرمەکان دەگۆڕێن، ڕستەکان چەندین بەرگی جیاواز دەپۆشن، دۆزەکان دەکەونە ململانێ.. بەڵام گوزارشت وەك خۆی دەمێنێتەوە. بۆ نمونە: (مێژووی سروشتی) لە سەدەی هەژدەدا بە شێوازێك باس لە تیورەی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی دەکا کە جیاوازە لە تیورەی پەرەسەندنی سروشتی لای زیندەوەر ناسەکان، تێزەکانی سیمسۆن جیاوازە لە تێزەکانی داروین، بەڵام ئەوەی کە جیاواز نییە و دووبارە دەبێتەوە فرێزەکانی وەك: پێشکەوتن، پەرەسەندنی جۆرەکان و گەشەی سیاسی و بایۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و.. هتدە. نمونەیەکی تر: بەر لە سەدەی هەژدە. مرۆڤەکان لە رووی بایۆلۆجییەوە لەیەکدی جیادەکرانەوە، مرۆڤی تەندروست لە مرۆڤی نەخۆش جیادەکرایەوە، یان مرۆڤی ئاسایی لە مرۆڤی دڕندە، مرۆڤی پاك لە مرۆڤی گول جیادەکرایەوە. بەڵام لە دوای سەدەی هەژدەوە مرۆڤەکان لە رووی توانای ئەقڵییەوە لە یەکدی جیاکرانەوە، ئاقڵەکان لە شێتەکان جیادەکرانەوە تەنانەت داوادەکرا تاوانبارەکان (کە دەکرا ژێر بن) لەگەڵ شێتەکان (کە دەکرا بێتاوان بن) پێکەوە زیندانی نەکرێن. بەڵام ئەم دابڕانە کە سەدەی هەژدە لە پێش خۆی جیادەکاتەوە، مەرج نییە زادەی گۆڕان بێ لە ئەنگێزە ئەخلاقیەکاندا، بەڵکو زادەی دابڕانە لە گوتاردا: کە یەکەمیان هێڵێکی جیاکەرەوە دەکێشێ لە نێوان پیرۆزی/ پیسی یان مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی یەزدانی و مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی نەفرەت لێکراو. دووەمیشیان هێڵێکی جیاکەرەوە دەکێشێ لە نێوان ئاقڵی/ شێتی یان مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی بیرکەرەوە و مرۆڤ وەك بوونەوەرێك کە توانای بیرکردنەوەی لە دەستداوە. بە گوێرەی دیدی جیاکاری یەکەم ئەگەر مرۆڤێك پیرۆزی لە دەستدابێ، ئەوا شوێنی ئەو دەرەوەی مرۆڤستانە، دەرەوەی شار و ئاوەدانیەکان. بەڵام بە گوێرەی دیدی جیاکاری دووەم ئەگەر مرۆڤێك توانای بیرکردنەوەی لەدەستدابێ، ئەوا شوێنی ئەو دەرەوەی هوشیارییە لە ئاست بووندا، چوونکە بە گوێرەی تێزەکەی دیکارت بیرکردنەوە مەرجی پێشوەختی بوونە.

دووبارە بوونەوەی گوزارشتێك لە رستەو دۆزە جیاوازەکاندا، هێز و سەرچاوەی مانەوە دەبەخشێ بەو گوزارشتە. کاتێك تۆ ڕستەیەك دەدرکێنی، یان





– هەروەك دۆلۆز دەڵێ – كاتێ تۆ چەكوشی سەری پەنجەكانت دەكێشی بە دوگمەی پیتەكانی سەر ئامێری چاپكردنی بەردەمتدا.. ئەوەی ئامادەیە هێزی گوزارشتە، هێزی مەعریفەیەكی تێكەڵ بە تواناكانی دەسەلأت، پەیوەندیی نێوان دوگمەی پیتێك و دوگمەی پیتێكی تر پەیوەندی نێوان پنتەكانی دەسەلأتە، گواستنەوەی جوڵەی پەنجە لە دوگمەیەكەوە بۆ دوگمەیەكی تر ڕێكخستنی پەیوەندیی نێوان چەقەكانی دەسەلأتە. ئەو گۆڕانكاریانەی بەسەر ڕستەو دۆزەكاندا دێن لە فۆرم و شێوازی جیاوازدا، بەرجەستەكەری جێگیریی گوزارشتن، چونكە جێگیربوونی هەرشتێك دەلالەت لە (زۆریی) ئەو شتە دەكا. ڕیمان ***Riemann*** وەك زانایەكی ئەندازەناس تێزێكی تایبەتی سەبارەت بە (زۆریی) لە فیزیا و ماتماتیكدا پێشكەشكرد. پاشان هۆسرڵ ***Husserl*** بەهایەكی فەلسەفی بەو چەمكە بەخشی. بەلأم بیرگسۆن ***Bergson*** وردتر باس لە (زۆریی) دەكا و دەڵێ ئەوەی كە زۆرە ئەوەیە كە جێگیرەو لە (كات)دا رووبەر داگیردەكا، واتە مەرج نییە زۆری تەنها پەیوەندیی بە دووبارە بوونەوەوە هەبێ لە (شوێن)دا. لێرەوە هەرچەندە ڕستە و دۆزەكان لە زۆرترین شوێندا زاووزێدەكەن و دووبارە دەبنەوە، بەلأم دووبارە بوونەوەكانیان ڕەسەن نین چونكە بە جیاوازی قسەكەرەكان و دەزگاكان و سیاقەكان گۆڕانیان بەسەردادێ، هەرچی گوزارشتە هەرچەندە ڕاستەوخۆ نییە، بەلأم جێگیرەو بۆ ماوەیەكی زەمەنیی درێژ بە جێگیریی دەمێنێتەوە. واتە دەشێ چەندین ڕستەو دۆز (كەمایەتی) پێكبێنن كاتێ توانای ئەوەیان نیە وەك كۆمەڵێك هاوسێ یەكدی دووبارە بكەنەوە، لە بەرامبەردا دەشێ یەك گوزارشت (زۆر) بێ كاتێ بۆ ماوەیەكی درێژو لە رووبەرێكی فراواندا دووبارە دەبێتەوە. رستەكان خاوەنیان هەن، بەلأم ڕەسەن نین.. لە بەرامبەردا گوزارشتەكان بێ خاوەنن، بەلأم رەسەنن و بەرهەمی تۆڕێكی جێگیریی بەرهەمهێنانی گوتارن.

فۆكۆ ڕەخنە لە ئاركۆجیست و مێژوونوسەكان دەگرێ بەوەی تەنها كار لە ڕستەكان و لە دۆزەكاندا دەكەن. واتە ئەوان كار لەناو ئەو گوزارشتانەدا ناكەن كە لە دەقەكاندا دووبارە دەبنەوە، بەڵكو بە دوای وێنە مەعقولەكاندا دەگەڕێن و گەر لە پشت دۆزێكی دیاریكراوەوە وێنەیەك نەدۆزنەوە كە شایەنی شیكردنەوە بێت یان ئەگەر هێماگەلێك نەدۆزنەوە بۆ بەرجەستەكردنی ئەنجامگیریەكانیان ئەوا فرێز و گوزارشتەكانی ئەو دۆزە پشتگوێ دەخەن و تەنها لەسەر دۆزە دیارەكان دەوەستن، كە ئەوەش لە توانای هەموو توێژەرێكدایە. هەندێ جار بە پێچەوانەوە تەنها لەسەر مانای ڕستەكان دەوەستن و لە ڕستەكانی پێشتر و پاشتر دەكۆڵنەوە تا مانای زیاتر ببەخشن بە ڕستەگەلێك كە توانای وەرگرتنی ئەو هەموو مانایانەی نییە. واتە هەندێكیان نوقمی وێناكردن و هەندێكیان نوقمی ڕاڤەكردن دەبن. بەلأم ئاركۆلۆجیای فۆكۆ بریتیە لە پرۆسەیەكی وردی گەڕان بەشوێن ئەو جومگە سەرەكیانەی گوتاردا كە لە ڕستەكان و لە دۆزەكاندا هێندە بە ئاسانی چنگ ناكەون، فۆكۆ لەم پرۆسەیەدا ژێدەر (مەرجەع)ی نییە، چونكە بوونی ژێدەر واتە تەسلیمبوون بەو گوتارەی كە پێویستە ببێتە بابەتی خوێندنەوە نەك میتۆدی خوێندنەوە، گەڕانەوە بۆ مەرجەع واتە درێژەدان بە جێگیریی تێگەیشتنێكی پێشوەخت و درێژەدان بە مەرجەعیەتی دەسەلأت لە رستەو دۆز و هەڵكۆڵینی نوێدا.

هەر بۆیە (ئیوالْد ***F. Ewald***) پێیوایە هەموو دەق و نوسینەكانی فۆكۆ بریتین لە "گوتارگەلێك بێ ژێدەر – بێ مەرجەع"، چونكە ئەو كار لە دەقەكاندا ناكا بەڵكو كار لە وەزیفەی دەقەكاندا دەكا، بە مانایەكی تر فۆكۆ میتۆدێك بەرهەمدێنێ بە

مەبەستی خوێندنەوەی مەعریفە نا، بەڵکو بە مەبەستی خوێندنەوەی شێوازی خوێندنەوەی مەعریفە لەلایەن کەسانێکەوە کە بەشێوەیەکی ترانسندنتاڵ گوتاریان خوێندۆتەوە، بەڵام خۆیان لە ڕاستیدا بەشێك بوون لەو گوتارە، ئەمەش ئەو گەمەیەیە کە دەسەڵات دەیکا بۆ بەرەنگار بوونەوەی (بەرگری). بۆ نمونە فۆکۆ لەناو دۆکیومێنتەکانی تایبەت بە (خەستەخانە، بەندیخانە، شێتخانە، قوتابخانە، یاساکانی تەمبێکردن و فێرکردن و..هتد) بەناو ڕستەو دۆزەکاندا ناگەڕێ، بەڵکو تەنها لەسەر وەزیفەی ئەو دەزگایانە دەوەستێ و دەیانبەستێتەوە بە گوزارشتیی گشتی گوتارەوە.

بەڵام گرفتی گوزارشت لەوەدایە، کە دابەشناکرێ و تاك تاك ناناسرێ، بەڵکو وەك یەکەیەکی هەمەکی لە گوتاردا بەرجەستە دەبێ. توێژەر دەتوانێ لەسەر ڕستەو دۆزەکان یەك بەیەك بوەستێ، بەڵام ناتوانێ ئەو کارە لەگەڵ گوزارشتدا بکا. گوزارشت ئەو پێکهاتانەی گوتارە، کە یان دەرناکەون و لە تاریکیدا دەمێننەوە، یان هەموویان پێکەوە ئاشکرا دەبن و لە ڕووناکیدا دەدرەوشێنەوە. ئەمەش پێویستی بە نەفەسدرێژی و هەڵکۆڵین هەیە لە جۆرێکی تر، پێویستی بە کار کردن هەیە لە پەراوێزەکان و لەو شوێنانەدا کە دوورن لە غەڵبەغەڵب و جەنجاڵی ڕستەو دۆزەکان. بۆ نمونە تیشکخستنە سەر (کورسی ئیعتراف) و بەستنەوەی وێنەی ئەو کورسییە بە شێوازی گوزارشتی زمانەوانی و پاشان بەستنەوەی (لە وێنەی تەونێکی جاڵجاڵۆکیدا) بە سیستمی سانسۆری سێکس و یاساکانی قوتابخانەو کورسی قوتابی و کورسی نەخۆش و یاساکانی زیندان و شێتخانەکان.. بەشێکی دانەبڕاوە لە هەڵکۆڵینەکانی فۆکۆ، کە هەموویان لە جوغزی پرۆسەیەکی ئارکۆلۆجی بەرفراواندا، بەدەر لە هەر ژێدەرێکی پێشوەخت بۆ لێکۆڵینەوە، لەکەکانیان بەیەکدەگا و پێکەوە دادەگیرسێن.

بەڵام گەر پێکهاتەکانی گوتار لە تەونێکی جاڵجاڵۆکی هێندە ئاڵۆز و یەکانگیردا خۆیان بپارێزن، ئیدی مرۆڤ چۆن توانای کەشفکردن و خوێندنەوەی ئەو پێکهاتانەی هەیە، لە کاتێکدا خودی خۆی و هەموو ئەو بابەت و ڕستەو دۆزانەی بەرهەمی دێنێ بەشێکی دانەبڕاون لەو پێکهاتانە؟ ئەم پرسیارە زادەی خولیایەکە، خولیای تێکشکاندنی ئەو زنجیرەی کە هەموو سەرەداوەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. بەڵام ئاستەمە مرۆڤ لە دەربازبوون تێبگا و دەروازەیەك بۆ هەڵاتن بدۆزێتەوە گەر نەزانێ لە چ دەرگایەکەوە داخڵ بووە. ئەمە کاری فۆکۆیە، تێگەیشتن لە سروشتی دروستبوونی گوتار، نەك پێکەشکردنی گوتارێکی ئەڵتەرناتیڤ. فۆکۆ ئەوەش دەڵێ کە لە چرکەیەك لە چرکەکانداو لە شوێنێك لە شوێنەکاندا ئەڵقەکانی ئەو زنجیرەی کە هەموو گوزارشتەکانی گوتاری پێکەوە بەستووە لێکدەترازێ و لە فەزایەکی نوێدا پەرش و بڵاو دەبێت، ئەوەش چرکەسات و شوێنساتی لەدایکبوونی دابڕانە، دابڕانی مەعریفی لە گوتاردا. هەر بۆیە گەر ئەرکی مێژوونوس دۆزینەوەی پەیوەندی سەبەبی بێ لە نێوان قۆناغەکاندا، ئەوا ئەرکی ئەبستمۆلۆجست دۆزینەوەی دابڕانە لە نێوان سروشتی گوتارەکاندا. هەر ئەمەشە هۆکاری ئەو مشتومڕە نەزۆکانەی مێژونوسان تێیدەکەون، ئەوان بە دوای (هۆکار و هۆئەنجام — العله و المعلول) دا دەگەڕێن و دووچاری پەشۆکان و دۆشدامان دەبن کاتێ توانای تەفسیرکردنی دیاردەکانیان نامێنێ و چەندین وەڵامی جیاواز و دژبەیەك پێشکەشدەکەن سەبارەت بە تاقە پرسیارێك، لە بابەتی ئەو پرسیارەی کە دەڵێ بۆچی سەرمایەداری لە شوێنێکی دیاریکراوو کاتێکی دیاریکراودا دەرکەوت؟ لە کاتێکدا

مەرجەکانی ئەو دەرکەوتنە لە چەندین شوێن و کاتی تردا لە ئارادابوون؟! هۆکاری ئەو دەستەوسانییە دەگەڕێتەوە بۆ گەڕانی بێ پسانی مێژونوسان بە شوێن هۆکار و هۆئەنجامدا لەناو ڕستەو دۆزەکاندا، لەبری گەڕان بەدوای وێنەکانی دابڕان لەناو گوزارشتەکاندا. گوتار لە شێوەی قۆناغی نوێدا، کتوپڕ خۆبەخۆ، لەدایك نابێ. بەڵکو ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی هەر گوتارێك لەناو داروپەردوو، پاشماوەو کەرەستەی کۆنی ئەو گوزارشتانەدا ئامادەییان هەیە کە بەسەرچوون. گوتاری نوێ کەرەستەی نوێ بەکارناهێنێ، بەڵکو نەخشەی نوێ و سیستمی نوێ دەخاتە گەڕ بۆ سەرلەنوێ پێکەوەلکانی کەرەستە کۆنەکان. بەڵام پەنجەخستنە سەر دابڕان لە گوتاردا، ئاشکراکردنی گوتار و جیاکردنەوەی لە گوتارێکی تر.. پرۆسەیەکی ماتماتیکی – لۆجیکی نییە، واتە ناتوانین بڵێین گوتاری نوێ و گوتاری کۆن، لە ڕووی پەیوەندیی ئاسۆیی و پلەبەندیی زەمەنییەوە. هەروەها ناتوانین بڵێین گوتاری باڵاو گوتاری نزم، یان گوتاری پێشکەوتوو گوتاری دواکەوتوو.. لە ڕووی پەیوەندیی ستونی و پلەبەندیی لۆجیکییەوە. بەڵکو گوتارەکان لە جیهانێکدا کاردەکەن کە شتەکان لەسەر ئاستی ئاسۆیی و ستوونی ڕێکناخرێن، بەڵکو لەسەر ئاستی پەخشبوونەوەیان بەنێو پنتە بڵاوەکانی فەزای گشتیدا دەستنیشان دەکرێن.

**دووەم: فۆکۆی نەخشەساز ( پاسەوانی و سزا )**

میشێل فۆکۆ نەخشەیەکی نوێ بۆ دەسەڵات دەکێشێ، کە جیاوازە لەو نەخشەیەی لە فیکر و مێژوی سیاسیدا کێشراوە. دەسەڵات لە دیدی ئەودا (هەرەمیی) نیە وەك ئەوەی تیورسازە دەسەڵاتگەرەکان و ڕەخنەگرەکانیان وێنایدەکەن.. هەروەها بەشێك نییە لە (سەرخان) وەك ئەوەی تیورسازە مارکسیەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە. بەڵکو دەسەڵات بریتییە لە چەند پنتێك، کە لە شێوەی چەند دەزگایەکی تەکنیکی و دیسپلینکاردا بە هەموو ئەو کەرتانەدا بڵاوبۆتەوە کە تاکەکان و گروپەکان، بەبوونی فیزیایی و بوونی ڕەمزییانەوە، ئامادەن لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە لە پەیوەندییەکی یەکتەواوکەردان (خێزان، قوتابخانە، سەبازگە، کارگە، بەندیخانە و.. هتد). واتە گرنگترین خەسڵەتی "دەسەڵات" بریتییە لە ئامادەبوون لە کایەیەی خۆیدا، بەڵام لە هەر شوێنێکیش کایەیەك لە کایەیەکان هەبوو دەسەڵاتیش هەیە. بۆیە دەسەڵات شێوازێکی هەرەمی یان مەرکەزی یان گشتگیریی نییە، بەڵکو شێوازێکی (هاوسێگەر)ی هەیە لە نێوان ئەو کەرتانەدا کە نە ئاسۆیی و نە ستوونین بەڵکو بەناو فەزای گشتیدا بێ هیچ نەخشەیەکی ئەندازەیی پەخشبوونەتەوە.

ئەو فریزەی کە دەڵێ "دەسەڵات پێگەی تایبەت بەخۆی هەیە"، لە سەردەمی ئێستادا دوو مانا لەخۆ دەگرێ: یەکەمیان بەستنەوەی دەسەڵاتە بە شوێنەوە، چونکە مەرج نییە دەسەڵات لە هەموو شوێنێك – بە شێوەیەکی ڕەها – ئامادەیی هەبێ، دووەمیان دەرکردنی دەسەڵاتە لە شوێن، چونکە سروشتێکی پەخش و بڵاوی هەیە و لە شوێنێکی دیاریکراودا گەمارۆنادرێ. هەرچەندە دەسەڵات پەنا دەبا بۆ تەکنیکی دیسپلین و بۆ ئەو مەبەستە چەندین دەزگای تایبەت دروستدەکا، بەڵام ئەو دەزگایانە سەربەخۆییەکی ئەوتۆیان هەیە کە ناکرێ تەنها بە شێوەیەکی ئەندازەیی و هەرەمی بیانبەستنەوە بە سەروو خۆیان و ژێر خۆیانەوە، بەڵکو ئەو دەزگایانە کۆمەڵێك جومگەن کە لەیەك کاتدا پێکەوە لکاو و لێکترازاویشن. بۆ نمونە دەزگای پۆلیس وەك دەزگایەکی دیسپلین ڕوخسارێکی دیاری دەوڵەتە، بەڵام لەبەرئەوەی

جومگەیەکی دەسەڵاتە خاوەنی سەربەخۆییەکی ئەوتۆیە کە لە دەزگای دادوەری و کایەی سیاسی باڵاو دەزگای یاسادانان و.. هتد. جیاوازە. نموونەیەکی تر: لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێ کە دەزگای بەندیخانە لە ژێر کۆنترۆڵی دەزگای دەوڵەتدایە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو دوو دەزگایە هەردووکیان دوو پنتی دەسەڵاتن، بە جۆرێك هەندێ جار دەسەڵاتی دەزگای بەندیخانەی سنوری دەسەڵاتی دەزگای دەوڵەت دەبەزێنی[1]. بەهەمان ئەو ئەندازەیەی دەوڵەت یاسای دیسپلینکاری هەیە لە فەزای گشتیدا، بەندیخانەش یاساکانی خۆی هەیە لە فەزای تایبەتی خۆیدا. بە کورتی فۆکۆ تەماشای پێگەی دەزگا دەکا نەك وەزیفەی دەزگا، ئەو دەزگایانەی کە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی وابەستەن، سەربەخۆن.. بەهەمان ئەو ئەندازەیەی سەرچاوەکانیان دەچێتەوە سەر دەسەڵات، دەسەڵاتیش سەرچاوەکانی دەچێتەوە سەر ئەوان. دۆلۆز لێرەدا ئەم چەمکە نوێیەی فۆکۆ بۆ پێگەی دەزگا دەشوبهێنێ بە تێگەیشتنی نوێی هەردوو زانستی فیزیا و ماتماتیك بۆ (شوێن)، کە هیچ شوێنێك چەقی شوێنێکی تر نییە، بەڵکو هەموو شوێنێك دەچێتەوە سەر شوێنێکی تر، هەموو شوێنێکیش شوێنێکی تری دێتەوە سەر.

فۆکۆ باس لە چەند شێوازێکی پشکنین و سزا و دیسپلین دەکا لە چاخە کۆنەکاندا، کە مایەی پێکەنینن و خوێنەر سەراسیمە دەکەن سەبارەت بەو هونەرە جۆراوجۆرانەی کە دەسەڵات دایهێناون بۆ سزا و چاودێری. وەك گوتارە ناشرینەکان کاتێ بەسەر سزادراوەکاندا خوێندراونەتەوە بەر لە جێبەجێکردنی سزا، ئەو ئامێرانەی کە لە مێردمناڵان بەستراون تا دەسپەڕ نەکەن، شێوازی بەندکردنی کەسە گەورەکان، ئامێرەکانی داخکردن و قرتاندنی ئەندامەکانی لەش و.. هتد. بەڵام هەمیشە دەسەڵات پەنا دەبا بۆ هونەر و سازکردنی مەراسیم، تا شێوازەکانی سزادان و چاودێریکردن و دیسپلین لە ڕووداوی ڕەمەکییەوە بکا بە ڕووداوی سیستماتیك، تا هەموو جومگەکانی دەسەڵات، هەموو کەس و گروپەکان، دەزگای سیاسی و دەزگاکانی یاسادانان، دادگا، بەندیخانە، جەللادەکان و قەشەکان و سزادراوەکان، تەختی شانۆی سزادان و جەماوەری تەماشاکەری سزاکە.. بەشداری لە جێبەجێکردن و دەرهێنانی ئەو هونەرەدا بکەن. بۆ ئەوەی دەسەڵات پێگەی خۆی سەقامگیرتر بکا، پێویستە هەمیشە پەنابەرێ بۆ ئاڵۆزکردن و زۆرکردن و جۆراوجۆرکردنی هونەرەکانی بەڕێوەبردن و دیسپلین و پەرشکردنەوەی پنتەکانی دەسەڵات بەناو بەرفراوانترین فەزادا. لێرەوە دەکرێ شێوازە سەرەتاییەکانی دەسەڵات، بۆ نموونە دەسەڵاتی هەمەجی و خێڵەکی، بە نموونە وەربگرین کە دەسەڵاتێکی ساکارە و سزا تیایدا زۆر ڕاستەوخۆیە، پەنا نابا بۆ هونەر و مەراسیمەکانی سزا، هەر بۆیە دەسەڵات توانای خۆپەخشکردن، خۆجێگیرکردن، خۆ دووبارە کردنەوەی زۆر نییە. بەڵام ئەو دەسەڵاتانەی کە پەرەیانداوە بە هونەر و مەراسیمی سزادان توانایەکی زیاتری خۆپەخشکردن و خۆ دووبارە کردنەوەیان هەیە. تا کۆمەڵگاکان پتر بەرەو مۆدێرنەکردنی دەزگاکانیان بچن، شێوازەکانی سزا سیستماکتر بەڵام ناڕاستەوخۆتر دەبێ، بۆیە هەرچەندە ئێمە لێرەوە گاڵتەمان بە دەزگا و شێوازەکان و هونەر و مەراسیمە سەیروسەمەرەکانی ئەشکەنجەدان و سزادان و چاودێریکردنی سەردەمانی زوو دێت، بەڵام ئەو دەزگا و هونەرو مەراسیمانە لە سەردەمی خۆیاندا هەیبەت و ڕێز و بەردەوامبوونی دەسەڵاتیان پاراستووە. ئێمەش – لەسەردەمی ئێستاماندا – تەنراوین بە چەندین دەزگا و مەراسیم و هونەری بیروکراتی دەسەڵات، کە مرۆڤ نازانێ





گاڵتەیان پێبکا، چونکە خۆی پنتێك و بەشێکە لەو دەزگا و مەراسیمانە. واتە ئەگەر مۆدێلی کۆنی دەسەڵات بابەتێکی خوێندنەوە بێت بۆ خودێکی خوێنەر، ئەوا لە مۆدێلی نوێدا دەسەڵات بابەت و خودە لە یەك کاتدا.

لە فیکری کۆندا دەسەڵات گەوهەر و دەرکەوت (جوهر/ عرض)ی هەبوو. (دەسەڵاتدارەکان) گەوهەری دەسەڵات بوون کە وێنەی دەسەڵات کۆپی وێنەی ئەوان بوو، هەرچی (بێدەسەڵاتەکان) بوو دەرکەوتەکان (اعراض)ی دەسەڵات بوون، کە بە جیاوازی دەسەڵاتداران و مەزاجی دەسەڵاتداران وێنە کاتییەکانی ئەوانیش گۆڕانیان بەسەر دەهات. بەڵام لە فیکری فۆکۆدا دەسەڵات گەوهەری نییە، بەڵکو رەفتارسازە.. هەروەها دەرکەوتی نییە بەڵکو پەیوەندیسازە. ئەو پەیوەندییانەی دەسەڵات دەیسازێنێ بەشێکن لە خودی پێکهاتەی دەسەڵات. دەسەڵات ڕێکخەری جووڵەیە لە دەسەڵاتدارانەوە بۆ بێدەسەڵاتان، هەروەها لە بێدەسەڵاتانەوە بۆ دەسەڵاتداران. فۆکۆ نمونەی ستەمی پادشا کۆنەکان بە نموونە دێنێتەوە، کە تەنها ستەمێك نەبوو لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بەڵکو جێبەجێکردنی داوایەك بووە کە لە خوارەوە پێشکەشیانکراوە، لەلایەن رەعیەت و خەڵکی قەڵمڕەوە جیاوازەکانەوە، بۆ سزادانی خەڵکە سەرکێش و ئاژاوەگێڕەکان، واتە هەیبەت و دەسەڵاتی پادشا گەوهەرێکی تایبەتی نەبوو بەڵکو بەشێك بوو لە وردە هەیبەت و وردە دەسەڵاتی رەعیەت.

هەروەها دەسەڵات بەشێك نییە لە (سەرخان)ی کۆمەڵگا، رێکخەری پەیوەندییە ئابورییەکان و پارێزەری موڵکایەتی تایبەت نییە — وەك چەپەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە — چونکە دەسەڵات سەر بە چینێکی دیاریکراو نییە و بەرژەوەندی چینێکی دیاریکراو ناپارێزێ. بەڵکو دەسەڵات رێکخەری پەیوەندیی نێوان چینەکانە، رێکخەری پەیوەندیی نێوان کایەی ئابووری و کایەی سیاسی و ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگایە. دەسەڵات تەنها چەکی دەستی ئەو کەسانە نییە کە زۆرترین موڵکیان هەیە، بەڵکو جووڵەی دەسەڵات لەوە ستراتیجیترە کە کار لە شوێنێکی دیاریکراوو لە موڵکدارییەکی سنورداردا بکا، هەیبەتی دەسەڵات بەند نییە بە رووبەری ئەو شوێنانەی کە لەسەر زەوی تەملیکی دەکا، بەڵکو بەندە بەو کارو تەگبیر و کەرەستەو تەکنیکانەوە، کە لە ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان هێزە جیاوازەکاندا، پەیڕەویدەکا. وەنەبێ ئەم تێزە نوێیە بڕوای بە ململانێی نێوان چینە ئابووریەکان نەبێ، بەڵام تابلۆیەکی نوێ دەکێشێ بۆ ئەو ململانێیە کە مەرج نییە دەوڵەمەندەکان تەنها دەوڵەمەند و هەژارەکان تەنها هەژاربن، خاوەن کارەکان تەنها چەوسێنەر و کرێکارەکان تەنها چەوساوەبن.. بەڵکو سەرباری دۆخی ئابوورییان، بە وەزیفەی جیاواز و لە کایەی جیاوازدا، بکەرە جیاوازەکانی پاراستنی هاوکێشەکانی دەسەڵاتن. فۆکۆ تەماشای تابلۆی ململانێکان دەکا وەك ئەوەی تەماشای دیمەنێکی سروشتی بکا کە هەموو پێکهاتەکانی رۆڵ و وەزیفەی خۆیانی هەیە، چ ئەو کاتەی دەچنە دۆخی هارمۆنی پێکەوە گونجان، چ ئەو کاتەی دەچنە دۆخی کۆنتراست ململانێ.

دەسەڵات بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، کاریگەریی خۆی پێڕەو ناکا. بەڵکو لە ڕێگای کەرەستە ناڕاستەوخۆو. جیاوازەکانەوە ئەو کارە دەکا. بۆ نموونە کڵێسا و قوتابخانە و خەستەخانە.. ئەو دەزگایانەن کە بە مەبەستی چارەسەرکردنی جەستەیی و رۆحی و ئەقڵی مرۆڤ دامەزراون، بەڵام ئەو زمانە جیاوازانەی لەو دەزگایانەدا کاردەکەن دەچنەوە خزمەتی ستراتیجیەتی دەسەڵات. سیستمێکی چەپاندن و سانسۆر بۆ دروستکردنی شەرم لەناو زماندا لە ئارادایە، کڵێساو خەستەخانە ئەو دوو دەزگایەن کە تیایاندا خواپەرست و

نەخۆش بە ئارەزووی خۆیان و دوور لەو سانسۆرە قسە دەکەن و زمان ئەزموونەکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو دوو دەزگایە دوو پنتی دەسەڵاتن کە تیایاندا قسەکردن بەرهەمی ئازادی قسەکردن نییە، بەڵکو بەرهەمی ئیعتراف نەخۆش و خواپەرستە بەکەم و کورتی و گوناهەکانیان. واتە لە کۆمەڵگای سزادا هەڵاتن لە سزاش جۆرێکە لە ملکەچکردن بۆ سیستم و دەسەڵات.

فۆکۆ دێتە سەر باسی شەرعیەتی دەسەڵات، کە سەرچاوەکەی یاسایە. بەڵام لە ڕاستیدا یاسا دیوە گوزارشتامێزەکەی جەنگە، چونکە هەر یاسایەك کۆتاییهێنانە بە ململانێ ناڕەوەکانی جەنگ، بەڵام کۆتاییهێنان نییە بە خودی ناڕەوایەتی. یاسا ئەو گوزارشتەیە کە ئارەزووە ناڕەواکان پێکەوە دەگونجێنێ و کۆیاندەکاتەوە. بۆ ئەوەی یاسا وەك گوزارشتکارێك لە ڕەوایەتی درێژە بە خۆی بدا، پێویستی بە دژەکەی خۆی هەیە کە ناڕەوایەتییە. کاتێ یاسای بازرگانی دەخوێنینەوە، دەبینین چەندین بەندی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێ بۆ خۆدزینەوە لە چەند یاسایەکی تر. یاسا هەندێ جار ڕێگەدەدا بە فەرمانڕەواکان تەماح و ئارەزووە ناڕەواکانی خۆیان تێر بکەن، لە بەرامبەردا وەك پارسەنگێك ڕێگە دەدا بە مەحکومەکان بڕێك لە ئارەزووە ناڕەواکانیان جێبەجێ بکەن تا ناڕەوایەتی بەسەر هەمووان دابەشبکاو هاوسەنگی لە نێوان هێزە ناشەرعییەکاندا رابگرێ. ئیدی (جەنگ) لە رەفتارێکی نا شەرعی فیزیکییەوە دەبێتە رەفتارێکی ناشەرعی رەمزی کە (یاسا)یە. هەر بۆیە فۆکۆ پێدادەگرێ لەسەر ئەوەی (یاسا) گوزارشتێك نییە لە ئاشی، بە هەمان شێوە گوزارشتێك نییە لە جەنگێك کە کۆتایی پێهاتووە و لایەنێك بردوویەتیەوە، بەڵکو گوزارشتە لە جەنگێك کە هێشتا کۆتایی پێنەهاتووە چونکە کەس نەیبردۆتەوە. یاسا لە باشترین حاڵەتدا

(ئاگربەست)ێکەوە و پشووە لە نێوان دوو جەنگدا. یاسا ئاشتکردنەوەی شەڕکەرەکان نییە هێندەی ئاشتکردنەوەی خواستە ناشەرعیەکانە پێکەوە.

لە کتێبی (ئارکۆلۆجیای مەعریفە)دا فۆکۆ لەسەر چەمکی "گوزارشت" دەوەستێ کە پێکهێنەری گوتارە. بەڵام لە کتێبی "پاسەوانی و سزا"دا لەسەر چەمکی "نێوەند" دەوەستێ کە پێکهاتەیەکی ناگوتارییە. بەڵام پەیوەندیی نێوان نێوەند و گوتار پەیوەندییەکی یەکتەواوکەرە. چونکە (نێوەند) رووبەرە مادییەکەی دەسەڵاتە و (گوتاریش) گوزارشتە زمانەوانیەکەیەتی، بۆ نموونە پەیوەندیی نێوان دەزگای بەندیخانە و یاساکانی سزا بەرجەستەکەری پەیوەندیی نێوان نێوەند و گوتارەکانی دەسەڵاتە. دەسەڵات بەندیخانەی داهێناوە نەك تەنها وەك دەزگایەك بۆ دوورخستنەوە و تەمبێکردنی تاوانبار، بەڵکو بە مەبەستی دروستکردنی وێنەی شوێنێك کە بەندکراوی تێدا سزا دەدرێ. واتە داهێنانی بەندیخانە وەرچەرخانە لە دەسەڵاتێکەوە کە سزای فەوری دەردەکا - کە دەسبەجێ پاکتاوی جەستەیی سزادراو دەکا - بۆ دەسەڵاتێك کە سزا دەبەستێتەوە بە نێوەندێکەوە لە شوێنێکدا. داهێنانی یاسا جۆراوجۆرەکان سەبارەت بە تاوان و سزا وەرچەرخانە بەرەو داهێنانی گوتار. یاساکان گوزارشتدەکەن لە دەسەڵات بەڵام بەندیخانەکان وێنەی دەسەڵات بەرجەستەدەکەن. دادوەرەکان، تاوانباران ڕەوانەی بەندیخانەکان دەکەن، بەندیخانەکانیش کار بۆ دادوەرەکان دەدۆزنەوە. بەندیخانە تەنها دەزگایەك نییە بۆ چاودێریکردن لە کۆمەڵگاوە بۆ سزادراوەکان، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە دەزگایەکە بۆ چاودێری لە سزادراوەکانەوە بۆ کۆمەڵگا. تەنها پاسەوانەکان چاودێری بەندکراوەکان ناکەن، بەڵکو بەندکراوەکان خۆشیان بەشێکن لە دەزگای چاودێری لە ژوورە

نوتەکەکانەوە بۆ ژوورە ڕووناکەکان. بەندکراوەکان وێنەی ئەو سزادراوانەن کە ئامادەیی بەردەوامیان لە زەینیەتی کەسە ئازادەکاندا هەیە و هەمیشە ئەو وێنانەی دەسەڵات دووبارە دەکەنەوە کە نێوەندەکان و گوتارەکان داگیر دەکەن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ: ئایا دەکرێ ڕۆژێ لە ڕۆژان مرۆڤ دەسبەرداری بەندیخانە ببێ؟! ئەڵبەتە لە سایەی دەسەڵاتێکی ئیجرائیدا کە دەزگای بەندیخانەی کردبێتە بەشێکی تەواوکاری دەزگاکانی قوتابخانەو سەربازگە و کارگە.. مرۆڤ ناتوانێ بیر لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەزگایە بکاتەوە، بەڵکو تەنها دەتوانێ خۆی لێبپارێزێ. فۆکۆ باس لە سێ شێوازی پەرەسەندنی بەندیخانە دەکا:

چرکەی یەکەم: بەندیخانە لە پەراوێزی دەزگاکانی دەسەڵاتدا، کە لە وێنەی مەنفایەکدا بوو بۆ دوورخستنەوەی کەسە تاوانبار و نەخۆش و گەڕو گولەکان، جیاکردنەوەی پیس لە پاك و تاوانبار لە بێگوناه. دەسەڵات لەم قۆناغەدا توانای پەخشبوونەوەی بە هەموو ئاستەکاندا نەبوو، تەنها لەو شوێنانەدا ئامادەبوو کە وەك هێزی تەمێکردن کاری لەسەر جەستەی سزادراو دەکرد.

چرکەی دووەم: بەندیخانە لەناو دەزگاکانی دەسەڵاتدا، وەك نێوەندێك بۆ بەرجەستەکردنی گوتار، کە زۆر جار خۆی لە یاساکانی سزاداندا دەبینیەوە. واتە بەندیخانە بووە دەزگایەك لە پاڵ دەزگاکانی قوتابخانە و سەربازگە و کارگە و دادگا و.. هتد. بووە خاوەنی یاساگەلێك کە کەمتر نەبوون لە یاسای دەزگاکانی دیکە. لەم چرکەیەدا بەندیخانە بە ڕوونی هاتە ناو نەخشەی دەسەڵاتەوە، بەڵام وەك دەزگایەك لە دەزگاکانی کۆمەڵگا نا، بەڵکو وەك دەزگایەك کەپەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە نوخبەیەکی دەسەڵاتدارەوە هەبوو.

چرکەی سێیەم: چاکسازی لە بەندیخانەکاندا، لێرەوە بەندیخانە دەبێتە بەشێك لە کایەی کۆمەڵایەتی. بەندیخانەش وەك هەر دەزگایەکی ئاسایی تر دەبێتە بابەتێك بۆ توێژینەوە و مشتومڕ. ئیدی کۆمەڵگا خۆی دەبێتە داهێنەری دەزگای مۆدێرنی بەندیخانە و خۆی دەبێتە چاودێریکەری ئەو دەزگایە. بەمەش نەخشەی دەسەڵات خولێکی گرنگی خۆی تەواو دەکاو کەرەستەکانی دیسپلینکاری دەداتەوە دەست کەسە دیسپلینکراوەکان. واتە هەر هاوڵاتیەك، بەجۆرێك لە جۆرەکان، ڕۆڵی پاسەوانی بەندیخانە دەبینێ و دەزگای بەندیخانەش بە جۆرێك دێتە هەناوی کۆمەڵگاوە کە لە هەموو شوێنێك ئامادەیی هەیە. واتە لە دیمەنی یەکەمدا بەندیخانە لە دەرەوەی شارەکان بوو، لە دیمەنی دووەمدا هاتە ناو شارەکان، بەڵام لە دیمەنی سێیەمدا هاتە ناو هەموو ماڵێك. چونکە چیتر شوێنی سزا تەنها بەندیخانەکان نییە، بەڵکو لە هەموو ئەو شوێنانە ئامادەیە کە ئاستەنگ دەچێتە بەردەم چنینی نەخشەی دەسەڵات. ئیدی کاری (پۆلیس) —بۆ نمونە— تەنها پاسەوانیکردنی شوێنێکی دیاریکراو نییە کە ناوی (بەندیخانە)یە، بەڵکو پاسەوانیکردنی شەقام و کۆڵان و شوێنە گشتییەکانە، دیسپلینکردنی جووڵە و خێرایی، چاودێریکردنی ڕووبەرە کراوەکان و.. هتد.

پەیوەندی نێوان هێزە جیاوازەکان و دەسەڵات، پەیوەندییەکی مایکرۆفیزیکی و ستراتیجییە، پەیوەندییەکی پەخش و بڵاوە و لە هەموو پنتێکەوە دەچنەوە سەر یەکتری. فۆکۆ نەخشەی ئەو پەیوەندیانە بەشێوەیەکی ئەبستراکت دەکێشێ و دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە گوتار وەك گوزارشتێك لە دەسەڵات زادەی فەلسەفەیەکی ترانسندنتاڵی پێشوەخت نییە هەروەك چۆن زادەی سەرخانێکی ئایدیۆلۆجی نییە. پەیوەندی نێوان



دەسەڵات و مەعریفە پەیوەندیەکی یەکتەواوکەرە، چونکە مەعریفە هەوڵێکە بۆ تەرجەمەکردنی (وێنە) بۆ (گوزارشت).. دەسەڵاتیش، لای خۆیەوە پێویستی بە مەعریفەیە بەمەبەستی دابەشبوون بەسەر کایە جیاوازەکان و تەرجەمەکردنی گوزارشت بۆ کردەوە. "هیچ پەیوەندییەك لەپەیوەندییەکانی دەسەڵات ئامادەییان نییە، گەر کایەیەك لەکایەکانی مەعریفە لە (قۆناغی) دروست بووندا نەبێ. هەر وەك چۆن هیچ مەعریفەیەك بوونی نییە گەر ئەو مەعریفەیە لەسەر بنەمای پەیوەندییەکانی دەسەڵات، گریمانەکانی خۆی دانەمەزرێنێ..". هەڵەو لووتبەرزییە، گەر وابزانین مەعریفە لەدەرەوەی پەیوەندیی هێزەکان دروست دەبێ.. چونکە هەر حەقیقەتێك کە بەرهەمدێ دەچێتەوە سەر لکێك لە لکەکانی دەسەڵات. مەعریفە جووڵەیە لەبینراوەوە بۆ وتراو، هەروەك چۆن دەسەڵات جووڵەیە لەوتراوەوە بۆ بینراو. ئاشکراترین نمونەش بۆ ئەم پەیوەندییە لە پەیوەندیی نێوان دەزگای بەندیخانەو دەزگای یاساداناندا دەردەکەوێ، کە یەکێکیان وێنەی سزادراو بەرهەمدێنێ و ئەوی تریان یاسای سزادان.

فۆکۆ نەخشەیەك دەکێشێ کەخۆی لەخۆیدا کۆکردنەوەی چەند نەخشەیەکی فەرعییە. هەموو نەخشەیەك دەچێتەوە سەر نەخشەیەکی تر، هەندێ پنتی ناو نەخشەکان پەیوەندیدارن و هەندێکی تریان بێ پەیوەندین و دەسپێکی نەخشەیەکی نوێی نێوان پەیوەندییەکانی دەسەڵاتن. بۆ ئەوەی نەخشەکان روونتر بخوێنینەوە پێویستمان بە جیاکردنەوە سروشتی ململانێکان هەیە لەهەر قۆناغێکی دیاریکراودا. سەرباری جیاوازی سروشتی ململانێکان هێڵێك بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، هێزێك توخمەکانی لێکترازان لەنەخشەکانی پەیوەندیی جیادەکاتەوە، وەك ئەوەی لەمەیدانی شەڕێکدابین. هەر بۆیە فۆکۆ بەدیمەنی جەنگ کۆتایی بەکتێبی "پاسەوانی و سزا" دێنێ. بەڵام لەکتێبی "ئیرادەی مەعریفە"دا گرنگی بە "پنتەکانی بەرگری" دەدا. نوسین لای فۆکۆ سێ ئەرکی هاوکاتی هەیە: نوسین وەك ململانێ و بەرگری. نوسین وەك بووناوبوون (صيرورة *becaming*). نوسین وەك جۆرێك لە نەخشەسازی، بۆیە "من نەخشەسازم..."، ئەو قسەیەی فۆکۆ لەدیدارێکدا وتی.

### سێیەم: ئەوەی دەبینرێ و ئەوەی گوزارشتی لێدەکرێ "مەعریفە"

هەموو گوتارێك دەچێتەوە سەر گوزارشتێك، بەڵام دەشێ پەیوەندیی گوتارئامێز لەنێوان گوتارو ناگوتاریشدا هەبێ. بەمەبەستی خوێندنەوەی ئەو پەیوەندییانە فۆکۆ پەنادەبا بۆ پێکهاتە مێژووییەکان، واتە بنیاتەکان، ئەو چینانەی کە لەسەریەك کەڵەکە بوون و لەشت و وشە، دیدو وتە، شتە بینراو و شتە وتراوەکان.. پێکدێن. بەڵام توێژەر پێویستی بەمیتۆدێکی ئەپستمۆلۆجی هەیە نەك میتۆدێکی فینۆمینۆلۆجی، توێژەر تەنها لەشتە بینراوەکان ناکۆڵێتەوە بەڵکو شتە وتراوەکانیش دەپشکنێ و لەپشت هەموو دیاردەیەکەوە گوتارێك و لەدوو توێی هەر گوتارێکیشدا ئەو پنتانە دەست نیشان دەکا کەپێکهاتەی گشتی دیاردەو بنیاتی دیاردەکان دەچنەوە سەریان.

داهێنانی شوێنێکی تایبەت بە (شێتەکان)، هاوزەمان بوو لەگەڵ داهێنانی چەند گوزارشتێکی بنەڕەتی سەبارەت بە چەمکی شێتی و شوناسی شێت لەزانستی پزیشکیدا. واتە نەدەکرا گوزارشت لە (شێتی) بکرێ، گەر (شێت) لە (ناشێت) جیانەکرێتەوەو تیشك نەخرێتە سەر شوێنگەی شێتەکان. لەنێوان هەردوو کتێبی "پاسەوانی و سزا" و "مێژووی شێتی"دا، فۆکۆ دوو کتێبی تر ئامادە دەکا کە یەکێکیان بەناونیشانی "ریمۆن




روسیل" و ئەوی تریان "لەدایکبوونی کلینکی پزیشکی"یە. لەیەکەمیاندا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن کاری روسیل دابەشدەبێ بەسەر دوو ئاستدا: یەکەم، داهێنانی شێوازی نوێی بینین بەگوێرەی شێوازی نوێی ئامێری بڕەر، دووەم: بەرهەمهێنانی گوزارشتی نوێ بەگوێرەی شێوازی نوێی ڕەفتارە دەگمەن‌و سەیرەکان. بەڵام لەکتێبی دووەمدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن دوابەدوای لەدایکبوونی کلینکی پزیشکی‌و توێکاریی جەستەی نەخۆش بنیاتی "شتە بینراو و شتە گوزارشت لێکراوەکان" دابەشبوونی جۆراو جۆریان بەخۆوە بینیوە. فۆکۆ لەژێر ناونیشانی سەرەکی ئەو کتێبەدا ناونیشانێکی فەرعی نوسیووە کە بریتییە لە "ئارکۆلۆجیای بینین"، چونکە هەموو شتێکی بینراو گوزارشتی تایبەت بەخۆی هەیە، هەروەك چۆن گوزارشتەکان پێویستیان بەخۆنمایشکردن هەیە لەشوێندا. بەڵام ئەوەش لەیادناکا کە شوێنەکانی بینین هەمان ریتم‌و بەردەوامیی گوزارشتیان نییە، بەڵکو لەفۆرمی جیاوازدا بەرجەستە دەبن، کە پێویستە لەهەر کارێکی هەڵکۆڵیندا بەوردی کاریان لەسەر بکرێ. چونکە بنیاتەکان بابەتی مەعریفە نین، بەڵکو خودی مەعریفەن، لەهەر شوێنێك بنیات ئامادەیی هەبوو مەعریفەش هەیە، هەر گۆڕانکارییەکیش لەوێنەی بنیاتدا گۆڕانکارییە لەئاستەکانی مەعریفەدا. هەموو ئەو دیدو بۆچوونانەی سەبارەت بە پرسە ڕەمزییەکان بەرهەمدێن، وەك تیورسازیی ئەخلاقی، تیورسازیی ئیستاتیکی و سیاسی‌و.. هتد، دەروازە جیاوازەکانی بنیاتن. مەعریفە تەنها زانیارییەکی دیاریکراو نییە بەڵکو هەڵبژاردنی دەروازەیەکە لەدەروازەکان کە بەندە بەئەزموون‌و بەهاو خەیاڵ‌و بیرکردنەوەی گشتی خەڵکەوە. لێرەدا فۆکۆ دیدێکی پۆزەتیڤیست‌و پراگماتی پێشکەشدەکاو خۆی لەتەڵەزگەی دوالیزمەکان دەرباز دەکا، وەك: پەیوەندیی نێوان زانست‌و ئەدەب، خەیاڵی و زانستی، مەعریفەو ژیان‌و.. هتد. چونکە ئەم دوالیزمانە دەرگا جیاوازەکانی بنیاتی مێژوویین کە مەعریفە داخڵیان دەبێ‌و وێنە جیاوازەکانیان دەپۆشێ.

گوتار شێوەیەك لەئاماژە نییە کە بەدوای واتاکانیدا بگەڕێین، بەڵکو هەموو گەڕانێك بەدوای ماناکانی گوتاردا جۆرێکە لە ونکردنی گوتار. پێکهاتەی گوتار زیاتر لە پێکهاتەی (موزیك) دەچێ نەك پێکهاتەی (دەقی نوسراو)، هەر ڕستەیەکی موزیکی هەموو پێکهاتەکانی تر لەخۆیدا چڕدەکاتەوە. گوزارشت پارچە موزیکەکەیە، کە لەبچوکترین یەکەو لەگەورەترینیشیاندا ئامادەیی هەیە. دەق دابەشدەکرێ بەسەر وشەو دۆزو ڕستەو مانا، ئاماژەو واتا، دال‌و مەدلول‌و..هتد، بەڵام لەگەڵ موزیکدا ئەو کارە ناکرێ، موزیك یان هەموو ئەو شتانەیە پێکەوە یان هیچیان نییە.

گوزارشت پێکهێنەرێکی سەرەکی گوتارە، بەڵام هەیشە لەدوو توێی ڕستەو دۆزەکاندا وندەبێ. ستراتیجیەتی دەسەڵات بەرجەستەکردنی گوزارشتە بەڵام لەڕێگای تەکنیکی ڕستەو دۆزەکانەوە. بۆ نموونە گوزارشتکردنی گوتار لەسێکس تەنها لەچەپاندنی ڕاستەوخۆی زماندا دەرناکەوێ، بەڵکو هەندێ جار لەپنتەکانی بەرگریداو لەڕێگای والآکردنی زمانەوە ئەو کارە مەیسەر دەبێ(2). لەسەردەمی ڤیکتۆریدا، لەناو ڕستەو وشەکانی زماندا، سێکس پاکتاودەکراو ڕووبەری ئامادەبوونی بەرتەسکدەکرایەوە، بۆ ئەوەی گوزارشت لەسێکس نەکرێ دەبوو ڕستەو فرێزەکان لەو وشانە پاکبکرێنەوە کەئاماژەبوون بۆ سێکس، ئەو وهمە سەبارەت بەچەپاندنی سێکس لەئارادا بوو تا فرۆید هات. ئەڵبەتە فرۆید تەواوی ئەو وێناکردنەی هەڵگێڕایەوە سەبارەت بەحەرامکردن لەڕێگەی حەرامکردنی قسەکردن سەبارەت بەشتە




حەرامکراوەکان، چونکە هەندێ کات بێدەنگی‌و کوشتنی قسە بەرزترین هاواری گوزارشتکردنە لە بوون‌و ئامادەیی شتی بێدەنگکراو. لەکاتێکی وادا سێکس ئامادەیە بەڵام بەناوی خۆیەوە نا، بەڵکو بەناوی ئەو کەس‌و شت‌و نێوەندانەوە کە حەرامی دەکەن. لەسەردەمی کۆن‌و ئێستاشدا گوتار کار لەسەر دیسپلین‌و چاودێریکردن‌و چەپاندن دەکا، بەڵام بەشێواز هونەری جیاواز [3] ئەو چاکسازییەی لەچاخی نوێدا بەسەر باری شێتدا هات گۆڕانێك بوو لەشێوازی چاودێریدا، واتە هەڵگرتنی سزا نەبوو بەڵکو بەخشینی دەمامکێکی نوێ بوو بەسزا. لەسەردەمی نوێدا کۆت‌و بەندی دەست‌و پێی شێتەکان شکێنرا، بەڵام خرانە شوێنێکی تایبەتەوە، بوونە بابەتی بەردەوامی تیشکخستنەسەرو قسە لەسەرکردن، واتە لەدەرەوەی گوتارەوە بوون بە بەشێك لەگوتاری مرۆڤی نوێ (هیومانیزم). هەڵوەشاندنەوەی سزای لەسێدارەدان دەچێتەوە هەمان خانە، گۆڕان بەسەر هونەری چاودێرکردندا هات، دەسەڵاتی کلاسیکی توانای سەپاندنی حوکمی مەرگی هەبوو بەسەر رەعیەتدا، بەڵام دەسەڵاتی نوێ توانای کۆنترۆڵکردنی ژیانی هاووڵاتی هەیە لەدایکبوونەوە تا مردن، مۆدێلی یەکەم خاوەنی دواقسە بوو سەبارەت بەمەرگی مرۆڤ بەڵام مۆدێلی دووەم خاوەنی دواقسەیە سەبارەت بەچۆنیەتی ژیانی مرۆڤ [4].

(بینین) رەگەزێکی گرنگ‌و پێکهێنەرێکی گرنگی گوتارە، کە لەڕستەو دۆزەکاندا پەیدا نابن. بایەخنەدان بەو رەگەزە هۆکارێکی سەرەکی بەدحاڵیبوونی توێژەرەکانە کاتێ توانای ناسینی ئەو شتانەیان نییە کەرۆژی لەرۆژان بەڵگەنەویست بوون‌و هەموو کەس ناسیونی. بەڵام بایەخدانی فۆکۆ بەرەگەزی بینین، وەك بایەخدانی فینومینۆلۆجیستەکان نییە، کە تەنها لەسەر شتەکان وەك دیاردەی پەتی دەوەستن، بەڵکو دیاردە دەبەستێتەوە بەمەعریفەوە، واتە فینۆمینۆلۆجیا دەبەستێتەوە بەئەپستمۆلۆجیاوە.

شێوازەکانی بینین بەندن بەشێوازەکانی بیستنەوە، ئەو شوێنانەی کە لەسەر زەوی تیشکیان دەخرێتە سەر وابەستەی ئەو وشەو فرێزو چەمکانەن کە لەناو زماندا تیشکیان دەخرێتەسەر. لەچاخی کلاسیکدا شێت‌و ئاوارەو بێ کارو بێحاڵ‌و ماڵەکان دەخزێنرانە ناو یەك شوێنەوە، واتە سنورێکی جیاکەرەوە نەبوو لەنێوان شێتخانەو بەندیخانەدا. ئەڵبەتە لەدیاردەیەکی لەمجۆرە تێناگەین گەر نەیبەستینەوە بەسیستمی گوزارشتەوە لەناو گوتاردا، ئەو سیستمەی کەتیشکی زیاتری خستەسەر مرۆڤەکان‌و پلەبەندی مرۆڤەکان، تیشکی دەخستە سەر رەعیەت نەك تەنها بۆ بینینی رەعیەت لەسەرەوە بۆ خوارە بەڵکو بۆ بینینی پێچەوانەش. شوێنگەی پادشا، وەك شێوازێکی تایبەت لەبیناسازیی تەلارو قەڵاو جۆری پەنجەرەو شورفەو.. هتد. شوێنگەیەك بوو بۆ تیشکخستنەسەر دەرەوەی کۆشك، بەپێچەوانەشەوە بۆ تیشکخستنە سەر ناوەوەی کۆشك.. پادشا بەو ئەندازەیەی دەیبینی دەشبینرا، لەڕێگەی هەموو ئەو شوێنانەوە کە هێمای بوونی ئەو بوون. بەهەمان شێوە شوێنگەی پاسەوان‌و کارمەندی چاودێریکەری بەندیخانە بەجۆرێك دروست دەکرا، کە لەیەك کاتدا، یەك پاسەوان هەموو بەندکراوەکان ببینێ‌و هەموو بەندکراوەکانیش ئەو ببینن.

کەواتە تەنها زمان کەرەستەیەك نییە بۆ رۆشنکردنەوەی هزرو گوتار، بەڵکو شێوازەکانی بینینیش بەشێك لەو کارە دەکەن. هەروەها تیشك (رادەی تیشك لەکۆشکی پادشایەتی‌و رادەی تیشك لە زیندانەکاندا بۆ نموونە) تەنها کەرەستەیەك نییە بۆ رۆشنکردنەوەی نێوەندێکی مادی، بەڵکو هۆکارێکیشە بۆ بەرجەستەکردنی گوزارشت‌و گوتار. لێرەوە فۆکۆ لەگەڵ (نیوتن)دا یەکنایەتەوە




کاتێ باس ڕەهەندیی ماتریاڵی تیشك دەکا کەتوانای دابەشبوونی نییە، بەڵکو زیاتر لە (گۆتە)وە نزیکە کاتێ هەستی بینین دەبەستێتەوە بەهەستەکانی ترەوە. فۆکۆ وەك هایدگەرو میرلۆپۆنتی بەدیدێکی فینۆمینۆلۆجی باس لەتیشكو بایەخی تیشك ناکا لەشوێندا، بەڵکو باس لەبایەخی دەکا لەمێژوودا، واتە بنیاتە مێژووییەکان شاردراوەن، تا ئەو کاتەی گوزارشت وەك ڕەگەزێکی زمان دەگاتەوە بەبینین وەك ڕەگەزێکی پەخشبوونەوەی تیشك لەشوێندا. چونکە تیشك تەنها شوێنی شتە بینراوەکان ڕووناکاتەوە بەڵکو سروشتی شتە گوزارشت لێکراوەکانیش ڕۆشندەکاتەوە.

ئارکۆلۆجیای فۆکۆ گەڕان نییە بەدوای مێژوویەکدا کە لەئەقڵو ڕووداودا ئامادەیی هەیە، سۆراخی ئەو فەلسەفانە ناکا کە لەماوەیەکی دیاریکراودا بەهەمهاتوون، هەروەك چۆن شوێنپێی ڕووداوە مێژووییەکانو هۆکاری ئەو ڕووداوانە هەڵناگرێ. تەنها لەسەر ئەو چرکانە دەوەستێ کە بینینو گوزارشت دەگەنە یەك، چونکە ئەو بەیەکگەیشتنە گرنگترین چرکەی بەرجەستە بوونی گوتارە شاردراوەکانە. شتە بینراوەکان فۆرمی خۆیان هەیە هەر وەك چۆن شتە گوزارشت لێکراوەکان فۆرمی تایبەت بەخۆیان هەیە، لەبەرامبەردا ناوەڕۆك ئەدگاری خۆی هەیە هەر وەك چۆن فۆرم ئەدگای خۆی هەیە. هیچ کامیان لەپێش هیچ کامیانو هیچ کامیان بەرگ یان ناوکی ئەوی تریان نییە، هیچ کامیان هۆکار (علە)و هیچ کامیان هۆئەنجام (معلول) نین. سازدانی ئەو جیاکارییە وەهمە، یان لەوێنەی خەونێکی مەعریفیدایە کەفیکر خوازیارە بیهێنێتەدی، وەك ئەو وەهمەی زانستی پزیشکی کلینکی دووپاتی دەکردەوە کاتێ دەیووت: "ئەوەی گوزارشتی لێدەکرێ ئەوەیە کە هەیە"، بەڵام لەڕاستیدا تەنها گوزارشت لەو شتە دەکرێ کە دروستدەکرێو ئامادەکرێ، نەك ئەوەی دروستکراو ئامادەکراوە.

هەمیشە شتێك هەیە کە ناوترێو گوزارشتی لێ ناکرێ، بەڵام مرۆۋ بێ پەروا لەهەوڵی ئەوەدایە کەلێنی نێوان وتراوو بینراو، دەقو وێنە، پڕبکاتەوە. بۆ نموونە: داخۆ چ پەیوەندییەك لەنێوان (پایپ)ێکی ڕاستیو وێنە پایپێكو ڕستەی "ئەمە پایپە"دا هەیە، لەڕاستیدا پەیوەندیی نێوان قسە نەك هەر بینین نییە بەڵکو پێچەوانەکەیەتی، بەئەندازەیەك مانای ڕاستەقینەی ئەو ڕستەیە ئەوەیە کە "ئەمە پایپ نییە" بەڵکو هێمایەکی زمانەوانی نەبینراوە بۆ شتێکی بەرجەستەی بینراو. هەموو شتەکان پێکەوە "شتە ڕاستەقینەکەو وێنەی شتە ڕاستەقینەکەو ئەو وشانەی گوزارشتی لێدەکەن هەموویان پێکەوە" مانایەك دروست دەکەن، کە لەهەناویدا هەڵگری کەلێنێکە لەنێوان ئەوەی کە هەیەو ئەوەی کە دەبینرێو ئەوەی گوزارشتی لێدەکرێ. (بلانشۆ) بیرۆکەیەکی لەمجۆرەی پێشکەشکرد کاتێ وتی: "قسەکردن بینین نییە"، ئەم ڕستەیە لەتەواوی نوسینەکانی ئەودا ئەمادەیە کەپێی وایە هەمیشە "دەق هەوڵدەدا وێنە بێت بەڵام هەرگیز وێنە نییە". بەڵام بلانشۆ تا ئەوێ دەڕواو لەوێدا دەوەستێ کە "قسەکردن بینین نییە" بێ ئەوەی ئەوەمان پێ بڵێ کە "بینینیش قسەکردن نییە". هۆکاری ئەم ڕاوەستانەی بلانشۆ دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری (دیکارت) لەسەر ئەو، چونکە دیکارت بیرکردنەوەو گوزارشتکردن لەبیرکردنەوە دەکاتە بنەمای وێناکردنو کەشفکردنی حەقیقەت. بەڵام فۆکۆ دیکارتی نییە، بەڵکو لەم خاڵەدا زیاتر کانتییە کاتێ باس لەپەیوەندییو ناپەیوەندیی دەکا وەك دوو ڕەگەزی یەك تەواوکەر، چونکە هەمیشە پەیوەندیی نێوان وتراوو بینراو دیوی دووەمی ناپەیوەندیی نێوان ئەو دوو ڕەگەزەیە.

یاساکانی تاوان و سزا هەمیشە خۆیان وەك کۆمەڵێك گوزارشتی دابڕو لەوێنەکانی بەندیخانەو ئامێرەکانی سزادان نمایشدەکەن. وەك کۆمەڵێك ئایدیا کە زادەی کەسە بیرکەرەوە ترانسندنتاڵەکانن. یاساناسەکان دەیانەوێ بڵێن کاری ئێمە یاسا دەرکردن‌و یاسا جێبەجێکردنە.. کە کارێکە لەدوو توێی کاغەزو دۆسیەکاندایە، بەڵام کاری پاسەوانەکان تەمبێکردن و سزادانی راستەوخۆیە.. واتە هەوڵدەدەن وتراو لەبینراو، گوزارشت لەنێوەندیی مادیی جیابکەنەوە. بەڵام هەروەك چۆن هەموو پەیوەندییەك لەسەر بنەمای ناپەیوەندیی دروست دەبێ، هەموو ناپەیوەندییەکیش لەسەر بنەمای پەیوەندیی دروستدەبێ. لێرەوە یاساناسەکان تەنها دەق بەرهەم ناهێنن بەڵکو شوێنیش وەك نێوەندێکی مادیی بەرهەمدێنن، ئەوان پێویستیان بەشوێنێکە کە گوزارشتەکانیان بینراو بێ نەك تەنها وتراو بێت.. لەبەرامبەردا پاسەوان‌و جەللادەکان پێویستمان بەدەق‌و گوزارشتە تا وێنەکان، ئەرك‌و رەفتارەکانیان، گوزارشت لێکراو بێ نەك تەنها بینراو.

واتە فۆکۆ فەیلەسووفێکی ئایدیالیست نییە کە "ووتن" وەك بەرهەمی بیرکردنەوە بکاتە بنەمای "بینین" و کەشفکردنی بوون. هەروەها فەیلەسووفێکی ماتریالیستیش نییە کە "بینین" وەك بەریەککەوتنێکی واقعی مادیی نێوان مرۆڤ و جیهان بکاتە بنەمای بیرکردنەوەو (وتن). بەڵکو فەیلەسوفێکە لەناو گوتاردا کاردەکا، پێی وایە هیچ کام لەبینین‌و وتن مەرجی پێشوەختی یەکتر نین، بەڵکو مەرجی هاوکات‌و هاوزەمان (محایث)ی یەکترین.. لەهەر شوێنێك بینین هەبوو وتن ئامادەیە، پێچەوانەکەشی راستە، چونکە هەموو گوزارشتێك گوزارشتکردنە لەبینینێك. لێرەوە، کارکردن لەگوتاردا کارکردنە لەو دوو رەگەزەدا بێ جیاکردنەوەیان لەیەکتری. لێرەدا پێویستە ئەوە روونبکەینەوە، کە فۆکۆ کار لەئەنترۆپۆلۆجیاو سایکۆلۆجیاو ئەو کایانەی مرۆڤ ناسیدا ناکا کەبەشوێن مێژووی دروستبوونی هۆشیاریدا دەگەڕێن، یان لە پەیوەندیی نێوان ئەنگێزە مادی‌و دەروونی‌و پەرچە ئەنگێزەکان دەکۆڵنەوە، هەروەها ناچێتە گەمەی پەیوەندیی نێوان هۆکارو هۆ ئەنجام (العلة و المعلول).. بەڵکو کاری ئەو بەپێچەوانەوە دوورکەوتنەوەیە لەمجۆرە جیاکاریانە کەدەبنە هۆی ونکردنی پنت‌و رەگەزە پێکهێنەرەکانی گوتار. گوتار زۆرجار لەڕێی ئەو گەمانەوە، کە لەناو ڕستەو دۆزەکاندا دووبارە دەبنەوە، خۆی وندەکا.

پەیوەندیی نێوان (وتراو) و (بینراو) پەیوەندییەکی راستەقینە نییە، بەڵکو پەیوەندییەکە رەوایەتی خۆی لەناپەیوەندییەوە وەردەگرێ. بەڵام ئەوە کێشەی فۆکۆ نییە، چونکە ئەو بەدوای حەقیقەتدا ناگەڕێ-وەك حەقیقەتێکی رەها- بەڵکو بەدوای حەقیقەتی گوتاردا دەگەڕێ. ئەمەش جۆرێکە لەئایرۆنی (مفارقە)، چونکە بەشێکی زۆری فەیلەسووفان بەدوای حەقیقەتی رەهادا گەڕاون لەکاتێکدا زۆر بێئاگاو دووربوون لەحەقیقەتی ئەو گوتارەی "کەخۆیان لەناویاندا کاریانکردووە"، بەڵام فۆکۆ-بەپێچەوانەوەی ئەوانەوە- لەکاتێکدا هەرگیز توخنی حەقیقەتی رەها ناکەوێ لەهەموویان نزیکترە لەحەقیقەتی گوتارەوە، ئەمەش وا لە فۆکۆ دەکا کە ئەپستمۆلۆجیست بێ بەئیمتیاز، چونکە ئەو بیر لەشتێکی دیاریکراو ناکاتەوە، تیورزە بۆ بابەتێکی دیاریکراو ناکا، بەڵکو بابەتی سەرەکی بیرکردنەوەو هەڵکۆڵینەکانی ئەو بریتییە لەو تایپانەی بیرکردنەوە کە گوتار بەرهەمی هێناون. کێشەی ئەویش هەرگیز لەگەڵ فەیلەسوفێکی دیاریکراودا نییە، بەڵکو هەمیشە لەگەڵ گوتاردایە.

بەمەبەستی روونکردنەوەی ئەم دیدەی فۆکۆ سەبارەت بەپەیوەندیی نێوان وتراوو بینراو، دۆلۆز

نموونەی سینەمای هاوچەرخ دێنێتەوە کە گرنگی بەو پەیوەندییەو بەگەڕخستنی ئەو پەیوەندییە دەدا لەپێناو بەرجەستە کردنی گوتاری فیلمدا. هەروەها نمونەی چەند فیلمێك دێنێتەوە کە ڕەگەزی وتراو لەرەگەزی بینراو جیاکراوەتەوە، وەك لە فیلمەکانی ستڕۆب ***straub***، سیبیربێرگ ***syberberg*** و مارگریت دۆراس ***marguerite duras*** تێبینی دەکرێ. دەنگەکان لەو فیلمانەدا چیرۆکێك دەگێڕنەوە لەدەرەوەی شوێن، هەرچی ڕەگەزە بینراوەکانە شوێنێك نمایشدەکەن کە مەیدانی هیچ چیرۆکێك نییە. لەو دۆخی ناپەیوەندییەدا ئەوەی ئامادەیە تەنها بۆشاییە وەك هێمایەك بۆ غیابی دەسەلات، یان وەك ئاماژەیەك بۆ بوونی بنیاتێك کە توانای خۆنمایشکردنو پڕکردنەوەی درزو کەلێنەکانی نێوان (بینراو) و (وتراو)ی نییە. بەلأم پەیوەندیی نێوان ئەو دوو ئاستەو سەلماندنی لەلایەن مرۆڤەوە، بەکەنالێکی تایبەتدا تێدەپەڕێ، کەکاتی خۆی (کانت) ناوی نابوو ئەنگێزە ئەخلاقییەکانی دەروون. بەلأم فۆکۆ بەوشەی "نامۆ" گوزارشتی لێدەکا.

لەبەشێکی تری نوسینەکانی فۆکۆدا، ئاستی سێیەم دەردەکەوێ کەرۆڵی پردی پەیوەندیی دەبینێ لەنێوان (وتراو) و (بینراو)دا، چونکە سەرەڕای رۆڵی گرنگ و هاوبەشی وتراو و بینراو لەدروستکردنی گوتاردا، هەمیشە لەبەردەم ئەو مەترسییەدان کە بەبۆشاییدا تێبپەڕن، بەتایبەتی کاتێ دەردەکەوێ کە پەیوەندیی راستەقینەی ئەو دوانە لەسەر بنەمای ململانێو هەندێ جار شەڕو پێکدادانی ترسناك.. دروستبووە. وتراو و بینراوەکان بۆ ئەوەی لەدۆخی ناپەیوەندیی دەربازبن، تەنها پەنا بۆ بەرجەستەکردنی خۆیان نابەن لەدوو توێی گوتاردا، چونکە رەنگە گوتاریش وەك وێنەیەکی نەوتراوو وەك دەنگێکی بێ شوێن، یان وەك فۆرمێکی بێ واتاو واتایەك کە گوزارشتی لێناکرێ بمێنێتەوە گەر پەنانەبا بۆ رەهەندی سێیەم. ئەو رەهەندەی سەر بەهیچ کام لەو دوو رەگەزە نییە، بەلأم هەمیشە وەك دوو کۆڵەکەی سەرەکی، وەك دوو مەرجی پێش وەختی خۆی لێیاندەڕوانی. رەهەندی سێیەم پێکهێنەری ستراتیجە دوور خایەنەکانی پەیوەندییە لەنێوان رەگەزە بەشەڕهاتووەکاندا، رەهەندی سێیەم ئامادەیی بەردەوامی هەیە لەناو بنیاتەکاندا، بێ ئەوەی خۆی بەشێك بێ لەو بنیاتانە جێی خۆیەتی بپرسین: ئەم تەوەرە نوێیەو ئەم رەهەندی سێیەمە چییە؟!

## چوار: ستراتیجی میتا-بنیات (دەسەلأت)

دەسەلأت چییە؟ فۆکۆ وەلأمێکی زۆر سانای ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵی دەسەلأت بریتیە لە پەیوەندیی نێوان هێزەکان، لە هەر شوێنێکیش ئەو پەیوەندییە هەبوو دەسەلأت ئامادەیە. فۆکۆ چەمکی دەسەلأت لە چەمکی دەوڵەت جیادەکاتەوە، بەوەی دەسەلأت وەك دەوڵەت خاوەنی فۆرمێکی دیاریکراو نییە، هەروەها چەمکی دەسەلأت لە چەمکی مەعریفە جیادەکاتەوە بەوەی وەك مەعریفە پەیوەندیی لە نێوان دوو فۆرمی دیاریکراودا ناسازێنێ. هێز، هەر هێزێك، چەندە خاوەن توانا بێ، خاوەن سەربەخۆیی تەواوی خۆی نییە.. بەڵکو هەمیشە پێویستی بە پەیوەندییە لەگەڵ هێزەکانی تردا. بەلأم فۆکۆ هێز و توندوتیژیی نابەستێتەوە یەکدییەوە، چونکە مەرج نییە هێز هەمیشە توندوتیژی بەکاربێنی، بەڵکو هەمیشە بەدوای هێزی بەرامبەردا دەگەڕێ، واتە هێز خۆی (خود) و (بابەتیشە)، هێزە کردارە بەلأم کردارە لەناو کردارێکی تردا کە خودی هێزە.

دەسەلأت خاوەنی وتەزاگەلێکە وەك: هاندان، خرۆشان و فراوانکردن و پەرەپێدان، بەلأم لە هەمان کاتدا خاوەنی وتەزاگەلێکی تری وەك خامۆشکردن



و ئاڵۆزکردن و خاوکردنەوە و بەرتەسکردنەوەیە. لە کتێبی "پاسەوانی و سزا"دا، لیستێك بە وتەزای لەمجۆرە و بەو بەهایانە هاتووە کە پەیوەندیی نێوان هێزەکانی لە سەدەی هەژدەیەمدا لەسەر دامەزرابوو، ئەو بەهایانە بەسەر سێ ئاستی سەرەکیدا دابەشبووبوون:

ئاستی یەکەم: دابەشکردن لە شوێندا (وەك سانسۆر، پۆلێنکردن، لێکجیاکردنەوە و دەستبەسەراگرتن..)

ئاستی دووەم: ڕێکخستنی کات (وەك دابەشکردنی کات بۆ سات و تاقە جیاوازەکانی کار و کارکردن بە پرۆگرام و ئامازەکانی تایبەت بە کات).

ئاستی سێیەم: پێکەوە گرێدان لە کات و شوێندا (کە لە ئاکامی شێوازی کارکردنی هێزە بەرهەمهێنەکان و تێکڕژانی کاری هێزە جیاوازەکان دەردەکەوێ).

لێرەوە، فۆکۆ شێوازەی کاری دەسەڵات بە جۆرێك شیدەکاتەوە کە قابلی ساناکردنەوەو تاکشوناسی نییە، بۆیە بەستنەوەی دەسەڵات بە چەند سروشتێکی دیاریکراوەوە کارێکی هەڵەیە. بۆ نموونە مەرج نییە دەسەڵات هەمیشە خاوەن زەبروزەنگ بێ. دەبێ لە کۆی پەیوەندییەکاندا بەدوای بنیاتی دەسەڵاتدا بگەڕێین، بەڵام بنیاتێك کە هێشتا بەرجەستە نەبووە و لە دۆخی خۆ بنیاتنانی بەردەوامدایە. دەسەڵات نوێنەرایەتی جووڵەیەك ناکات لە چینێکەوە بۆ چینێك، لە گروپێکەوە بۆ گروپێك.. بەڵکو هەموو چین و نوخبە و گروپەکان، هەموو دەسەڵاتدار و بێدەسەڵاتەکان.. پێکەوە دەبڕێ.

ڕەنگە ئەو پرسیارەی کە دەڵێ (دەسەڵات چییە؟) پرسیارێکی بێهودە بێ. وا باشترە لەبری پرسیارکردن دەربارەی شوناسی دەسەڵات، بە دوای شێوازی کارکردنی دەسەڵاتدا بگەڕێین، کە لە ڕێگەوە خۆی پراکتیزە و نمایشدەکات. هەمیشە وا دەردەکەوێ کە دەسەڵات هێزێکی هەرەمییە بۆ جڵەو کردن و کارلێکردن، بەڵام دەسەڵات بەو ئەندازەیەی کارلێکەرە کارلێکراویشە. فۆکۆ لەسەر ئەم خاڵە دەوەستێ و جیاوازیدەکا لە نێوان: فیزیای کار و فیزیای ماتریاڵدا. یەکەمیان پەیوەندیدارە بە کارو کردەوەکانی دەسەڵات و پەیوەندیی نێوان هێزەکان. لە فیزیای کاردا ناتوانین باس لە ئەدگار و سروشتی دەسەڵات بکەین چونکە ئەو ئەدگار و سروشتە بە جۆرێکی بێشومار دابەش و لەتلەت دەبێ کە کۆکردنەوەی لە تاقە ئەدگارێکدا کارێکی زەحمەتە. بەڵام لە فیزیای ماتریاڵدا قسە تەنها لە بکەرەکان دەکرێ بە جۆرێکی دابڕاو لەو تۆڕە پەیوەندییەی کە بە یەکتریانەوە دەبەستێتەوە، لێرەشدا هەر دەستنیشانکردنێکی ئەدگاری دەسەڵات کارێکی سەختە. بۆیە زۆرجار بە مەبەستی (ون — نەبوون) لە تۆڕی پەیوەندییەکان و لەناو کەرەستە ئەبستراکت و دابڕاوەکاندا، زۆر جار دەسەڵات پەنادەبا بۆ "خۆ ئاشکراکردنی ناوەکی "لە ڕێگای داسەپاندنی ڕەفتارێکی دیاریکراوەوە بەسەر گروپێکی دیاریکراودا، بە مەرجێ ئەو گروپە گروپێکی گەورە نەبێ و لە شوێنێکی دیاریکراودا جێگەیان ببێتەوە وەك (بەندکراوەکان، نەخۆشەکان، قوتابییەکان، شێتەکان، کرێکاران و سەربازان.. هتد)، بەڵام ئەم گروپانەش ئەو کەرەستە خاوانە پێکدێنن کە پێویستیان بە شێوازی کار و ئامانجی کاری تایبەت هەیە وەك (پەروەردە، چارەسەر، سزا و بەرهەمهێنان و.. هتد).

سەرەڕای سروشتی جیاوازی هەریەك لە دەسەڵات و مەعریفە، بەڵام لە چەندین خاڵدا دەرژێنە یەکتر و ئاوێتەی یەکدی دەبن. دەسەڵات لە کۆی ئەو پەیوەندیانەدا بەرجەستە دەبێ کە لە نێوان هێزە جیاوازەکاندا هەیە، بەڵام مەعریفە




زادەی پەیوەندیی نێوان بابەتەکانە. دەسەڵات کار لەو رووبەرانەدا دەکا کە هێشتا لە بنیاتە دیاریکراوەکاندا دەرنەکەوتوون، بەڵام مەعریفە پەنجە دەخاتە سەر پێکهاتە و سروشتی بنیاتەکان. هەر بۆیە دەکرێ بڵێین دەستنیشانکردنی ماهیەتی مەعریفە، لە رێگای بنیاتی مەعریفیییەوە ئاسانترە لە دەستنیشانکردنی شوناسی دەسەڵات کە خاوەن سترەکتورێکی میتابنیاتییە و بە پنتە جیاوازەکاندا پەخشدەبێتەوە. چونکە دەسەڵات لە چەقێکی مەرکەزییەوە سەرچاوە ناگرێ بەڵکو بەرجەستەکاری جووڵەی بەردەوامە لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێك، واتە هیچ شوێنێك خاڵی دەستپێك و هیچ شوێنێك خاڵی کۆتایی جووڵەکانی دەسەڵات نییە، بەڵکو لە شێوەی تۆڕێکی پەیوەندیی بەردەوامدایە کە پەلوپۆی بۆ هەموو لایەك، لە هەموو شوێن و کاتێکدا، هاویشتووە. بەستنەوەی دەسەڵات بە شوێنێکی تایبەت، یان چرکەساتێکی دیاریکراوەوە، کارێکی زەحمەت و قورسە، چونکە دەسەڵات خۆی ستراتیجێکە لە دەرەوەی ستراکتورە مێژوویی و جوگرافیەکان، ستراتیجێکی گومشوناسە، هەمیشە خۆی لە هەوڵەکانی نمایشکردن و گوزارشتلێکردن دەرباز دەکا.

هەرچەندە هەمیشە فۆکۆ پێدادەگرێ لەسەر بوونی کردار، لە هەموو شوێن و لە هەموو کاتێکدا، بەڵام ئەو کردار و رەفتارانەی پەیوەندیدارن بە دەسەڵاتەوە قابلی کورتکردنەوە یان ناساندن نین بەو شێوەیەی کە لە مەعریفەی باودا پێناسە دەکرێن و دیاریدەکرێن. لە کتێبی "پاسەوانی و سزا"دا بەوردی باس لە پەیوەندییە ستراتیجییەکانی دەسەڵات دەکرێ و بە بەراورد لەگەڵ کتێبی "ئارکۆلۆجیای مەعریفە"دا ئەدگارە سەرەکی و جومگە پەنهان و تێکرژاوەکانی هەریەك لە دەسەڵات و مەعریفە تیشکیان دەخرێتە سەر. لە دیدی فۆکۆدا زانستە مرۆیییەکان بەشێکن لە پەیوەندیەکانی دەسەڵات، بەشێکن لە ستراتیجیەتی بەرهەمهێنانی مەعریفە کە لە دەروازەکانی خۆبینینەوە دێنە ژوورێ، پەیوەندیی نێوان زانستە مرۆییەکان (وەك مەعریفەیەکی گوزارشتکار لە دۆخی رەمزیی مرۆڤ) لەگەڵ پنتەکانی دەسەڵاتدا (کە زۆر جار لە رێگای شوێنەکان و ئاستە فیزیکییەکانەوە خۆی نمایشدەکا) پەیوەندیی یەکتەواوکەر و تێکرژاون. بۆ نموونە لە نێوان بەندیخانە وەك دیمەنێکی بینراوی دەسەڵات و یاسا و کۆمەڵناسی وەك دوو لقی زانستە مرۆییەکان پەیوەندیی هەیە، هەروەها شێوازی مامەڵەکردن و رەفتاری کارگێرانی بەندیخانە لەگەڵ بەندکراواندا دەچێتەوە سەر سایکۆلۆجیا. ئەڵبەتە مەرج نیە ئەو پەیوەندییانە هەمیشە تەبابن، بەڵکو هەندێ جار لە دۆخی ململانێ و کێشمەکێشدان، بە تایبەتی لە کاتی بەراوردکردنی تیورە پەتیەکانی ئەو زانستانە لەگەڵ رەفتارە بینراو و بەرجەستەکاندا. تەنانەت هەندێ جار ئەو زانستانە دەچنە دۆخی شەڕی مەعریفیەوە لەگەڵ نێوەندەکانی دەسەڵاتدا، بەڵام سەرەنجام سەرچاوەکانیان دەگەڕێنەوە سەر یەکدی و ئاکامی بەرهەم و کردەوەکانیان دەبێتە ئەنگێزەی جووڵە و بەردەوامبوون لە هەردوو کایەکەدا. چونکە مەعریفە، بە هەموو لقەکانیەوە، بەرهەمی هوشیارانەی خودە. هیچ خودێکیش لە دەرەوەی نەخشە جۆراوجۆرەکانی دەسەڵات بوونی نییە. لێرەوە فۆکۆ جەختدەکاتەوە لەسەر رۆڵی هاوبەشی دەسەڵات — مەعریفە لە پێکەوە گرێدانی بینراو لەگەڵ وتراودا، یان شوێنەکان لەگەڵ گوزارشتەکاندا، رۆڵێك کە تەنها لەسەر بنەمای هاوپەیمانی نێوان دەسەڵات و مەعریفە دانەمەزراوە، بەڵکو زۆر جار لەسەر بناغەی جیاوازی و ململانێی نێوانیان دامەزراوە. "لە نێوان تەکنیکەکانی مەعریفە و ستراتیجەکانی دەسەڵاتدا، هیچ شتێکی دەرەکی (هیچ ناپەیوەندییەك)

ئامادەیی نییە"، تەنانەت لەو شوێنانەشدا کە هەریەك لەو دوانە بەشێوەیەکی بەسەربەخۆ و دوور لە یەکدی کاردەکەن و لەو شوێنانەشدا کە جیاوازی قووڵ دەکەوێتە نێوانیانەوە.

پەیوەندیەکانی دەسەڵات لەسەر دوالیزمی لێکجیاکردنەوەو پێکەوە گرێدان دامەزراوە، لەسەر بنەمای بەرجەستەکردنی رۆڵی جیاوازی خودەکان لەلایەك و نەخشەسازیی نێوان هێزی گشتی و هاوتوخمی نێوان خودەکان و پێکەوە ڕێکخستنیان لەلایەکی ترەوە دامەزراوە. بەڵام گرنگە ئەوە بڵێین کە پێکەولکان پرۆسەیەکی خێرا و گشتگیر نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی بەشبەش و جیاوازە کە سەرەنجام پنتە فەرعیەکان دەبەستێتەوە بە تۆڕی گشتی پەیوەندیەکانی دەسەڵاتەوە. پرۆسەکانی پێکەوەلکان لە دەزگا جۆربەجۆرەکاندا پێڕەو دەکرێ، وەك: دەزگای دەوڵەت، دەزگای خێزان، دەزگای ئاین و دەزگاکانی بەرهەمهێنان و هونەر و ئەخلاق و... هتد، بەڵام ئەم دەزگایانە خاوەن بناغە و ماهیەتی دیاریکراو نین، بەڵکو تەنها خاوەنی کردەوە و رەفتارن و بوون و شوناسیان بەندە بە کاروکردەوەکانیانەوە. شوناسی دەسەڵات لە وێنەی دەوڵەتدا بەرجەستە نابێ، بەڵکو خودی دەوڵەت و پرۆسەی "بە دەوڵەتکردن" چالاکیەکە لە چالاکیەکانی دەسەڵات. هەندێ جار سروشتی دەسەڵات دەبەسترێتەوە بە سروشت و شێوازەکانی چاودێری و کۆنترۆڵکردنەوە لە دەزگا جۆراوجۆرەکان و رەفتارە جۆراو جۆرەکان، بۆ نمونە لە هەندێ نمونەی مێژوییدا دەسەڵات فۆرمێکی هەرەمی مەرکەزیی وەردەگرێ، بەڵام بە مانای ئەوە نا کە دەسەڵات دەبێتە خاوەن چەقێکی بزوێنەر و هەموو پەیوەندییەکان دەچنەوە سەر ئەو، بەڵکو مانای ئەوەیە کە دەسەڵات بە دۆخی "بە دەوڵەتکردن"ی سیستمی پەروەردەیی و دادوەریی و ئابووری و خێزانی و سێکسیدا تێدەپەڕێ، لە شوێنێکی دیاریکراو و لە دۆخێکی دیاریکراودا.

لەنێو پەیوەندییە "مایکرۆ فیزیکیەکان"ی دەسەڵاتدا، هەندێ ناوکی سەرەکی دەردەکەون وەك: دەسەڵاتی سەرۆك یان یاسا لە دەوڵەتدا، دەسەڵاتی باوك لە خێزاندا، دەسەڵاتی پارە و دراوەکان بازاڕدا، دەسەڵاتی یەزدان لە ئایندا و دەسەڵاتی فریوە سێکسیەکان لە دەزگای بەرهەمهێنانی سێکسدا. لە بازنەی ئەم دەزگایانەی دەسەڵاتدا هەموو بکەر و بابەتەکان سروشتی ئاسایی خۆیان لە دەستدەدەن و سروشتێکی نوێ وەردەگرن. بۆ نمونە لە کتێبی "ئیرادەی مەعریفە"دا فۆکۆ لەسەر سێکس ڕادەوەستێ وەك بابەتێك کە لە هەموو رەگەزە سروشتیەکانی خۆی بەتاڵکراوەتەوە و لە چالاکیەکیەوە کە پەیوەندیی بە جەستەی مرۆڤەوە هەیە بووە بە چالاکیەك لەناو زمان و کولتور گوتاردا. هەمیشە لە پشت ئەو بابەتە سێکسسیانەی کە قسەیان لێدەکرێ یان تیوریزەیان بۆ دەکرێ، چ لە ڕێی چەپاندنەوە بێ یان لە ڕێی ئازادکردنەوە بێ، ڕووبەرێك دەمێنێتەوە کە گوزارشتی لێناکرێ و رووناکیشی ناخرێتە سەر تا نەبینرێ، واتە هەمیشە ناوچەیەکی نامۆ دەمێنێتەوە کە نەبابەتی بینی دەسەڵاتە و نە بابەتی گوزارشتلێکردنی مەعریفەشە. ئیدی هێندەی سێکس وەك بابەتێك قسەی لەسەر دەکرێ و نمایشدەکرێ، هێندە وەك چالاکیەکی جەستەیی پراکتیزە ناکرێ.. ئەمەش ئامادەبوونی دەسەڵات و گوتاری مەعریفییە، چ لەو کاتانەدا کە سێکس ڕووبەڕووی چەپاندن دەبێتەوە، چ لەو کاتانەدا کە قسە لە ئازادکردن و رەهەندە ئیستاتیکیەکانی دەکرێ، چونکە لە هەردوو دۆخدا هەوڵێك هەیە بۆ بە دەزگاییکردن و بە بابەتیکردنی سێکس و تێکەڵکردنی لەگەڵ کۆی ئەو دەزگا و بابەتانەدا، کە

شوێنی بەرجەستەبوونی دەسەڵات و فەزای گوزارشتەکانی مەعریفەن.

کاتێ فۆکۆ باس لە کاریگەریی هاوبەشی نێوان دەسەڵات و مەعریفە دەکا، ئاماژە دەکا بۆ وابەستەیی پەیوەندییەکانی هەردوو کایەکە بەیەکترەوە، بێئەوەی یەکێکیان لە پێشتر بێ، چ لە رووی کاتەوە چ لە رووی بایەخەوە. بۆ نموونە مەعریفە ناتوانێ چەند توخمێك لە گوتارێکدا پێکەوە بگونجێنێ گەر پەیوەندییەکانی دەسەڵات لە ئارادا نەبێ. رەنگە یەکێك بێت و باس لە "رەسەنایەتی" نوسین و بیرکردنەوە بکا لە دەرەوەی ئەنگێزەکانی دەسەڵات، یان بە پێچەوانە باس لە کاریگەریی دەسەڵات بکا لە دەرەوەی گوزارشتەکانی مەعریفە. بەلام لە راستیدا رەسەنایەتی تەنها پەیوەندیی بە گوزارشت یان بینینەوە هەیە. دەشێ شتێك وەك (وتن) لە دەرەوەی (بینین) رەسەن بێ، یان بە پێچەوانەوە وەك (بینین) لە دەرەوەی (وتن) رەسەن بێ. بەلام لە حاڵەتێکی ئاوهادا ئێمە ناتوانین باس لە رەسەنایەتی بکەین بەو جۆرەی کە لە زمانی باودا بەکاردێ، چونکە "رەسەن" تەنها ئەو کاتە دەردەکەوێ کە بینین و بیستن، واتە گوزارشتەکانی مەعریفە و نێوەندەکانی دەسەڵات بەیەکدی دەگەن. هەموو ئەفراندن و رەسەنایەتیەکیش لە دەرەوەی ئەو هاوکێشەیە، جۆرێکە لە کارکردن لەناو سەدیمدا، یان ئەفراندن لە بۆشاییدا.

کەناڵەکانی پەیوەندیی نێوان مەعریفە و دەسەڵات، کەناڵی دیار و دامودەزگایی نین. بەڵکو کەناڵی هەمەجۆر و فرەن و لە هەر پنتێکەوە تۆ دەست پێبکەی بوونیان هەیە. بە ئەندازەیەك جیاکردنەوەی ئەو دوانە لە یەکتر و گەران بە دوای دوو بنیات و دوو جۆر وەزیفەی جیاوازدا مرۆڤ دەباتەوە نێو ئەو مشتومرەی کە هەمیشە دەربارەی پەیوەندیی نێوان دوالیزمەکان کراوە. ئەقڵی مرۆیی پەنای بردووە بۆ داتاشینی دوالیزمەکان تا خۆی لە وێڵگای شتە زۆر و بێسنورەکان بپارێزێ. سەرەرای ئاڵۆزیی تێزی فەیلەسوفە گەورەکان، بەلام هەمیشە مەیلێك هەیە بۆ ساناکردنەوە لای قوڵترین و سەختترین فەیلەسوف. لێرەدا دۆلۆز نمونەی سێ جۆر فەیلەسوف دێنێتەوە:

نمونەی یەکەم: نمونەی ئەو فەیلەسوفەی کە مەعریفەی دابەشکردووە بەسەر دوو چرکەدا (وەك لای دیکارت دەبینرێ: بیرکردنەوەی خود و کەشفکردنی بابەت)، یان مەعریفەی پێشین و مەعریفەی دوایین (وەك لای کانت دەبینرێ: مەعریفە لە بازنەی ئەقڵی پەتی و مەعریفەی هەڵێنجراو لە جیهانی بابەتەکان).

نمونەی دووەم: نمونەی ئەو فەیلەسوفەی کە فرەیی رەتدەکاتەوە و هەموو دوا لیزمەکان دەباتەوە سەر یەك و یەکتایی (یەکبوونی ئەنتۆلۆجی)، وەك لای سپینۆزاو بێرگسۆن بەدیدەکرێ.

نمونەی سێیەم: نمونەی فۆکۆ کە لە بازنەی دوالیزم و یەکتاییدا کارناکا، بەڵکو لە فەزای فرەییەکدا کاردەکا کە تیایدا، هەمیشە ژمارە دیاریکراوەکان دەگەرێنێتەوە بۆ بێشوماریی، گوتارە ساناکان دەگەرێنێتەوە بۆ گوتارە لێکدراو و فرەئەدگارەکان، تاك گوتاریش دەباتەوە سەر فرەگوتاریی، یان گوتاری هەمەکی.

لێرەوە، قسە کردن لە دوا لیزمی حاکم و مەحکوم، یان کۆنترۆڵکەر و کۆنترۆڵکراو، کارلێکەر و کارلێکراو.. دەچێتە خانەی ساناکردنەوەی هاوکێشە ئاڵۆز و بێشومارەکانی دەسەڵات. بەلام هەر یەکێك لەو دوالیزمانە – بە گوێرەی میتۆدی فۆکۆ – هەڵگری چەندین پەیوەندیی جۆراوجۆرن کە لە رووی مەعریفییەوە ناکرێ گوزارشتیان لێبکرێ، تەنها لەو شوێنانەدا نەبێ کە دەسەڵات وەك گشتێکی فرە ئامادەیە و لە بنیاتێکی بینراو و بیستراوی دیاریکراودا گەمارۆنادرێ. راستە





پەیوەندیەکانی دەسەلأت بەدەر نین لە بنیاتی شوێن و بنیاتی کات، بەلأم هیچ کام لەو دوو بنیاتە هەڵگری سروشت و شوناسی دەسەلأت نین. بە مانایەکی تر دەسەلأت لەناو بنیاتەکاندا ئامادەیی هەیە، بەلأم ئەو بنیاتانە کاریگەرییەکیان نییە لەسەر شێوازی کاری دەسەلأت، واتە شوناسی دەسەلأت بەدەرە لە شوناسی ئەو بنیاتانەی دەسەلأت لە خۆدەگرن. بۆ نموونە هەرچەندە جیاوازیی زۆر هەیە لە نێوان مۆدێلی دەسەلأتی مۆدێرن، دەسەلأتی دەرەبەگایەتی، دەسەلأتی گریکی و دەسەلأتی رۆمانی و هتد.. بەلأم دەسەلأت هەمیشە میکانیزمی تایبەتی خۆی پێڕەودەکا بێ ئەوەی لە ژێر ئیرادەی دەسەلأتێکی دیاریکراودا بێ. بە مانایەکی تر دەسەلأت هەرچەندە سەرەتایی بێت یان لە شوێنێکی بەرتەسکدا بێت، قابلی کورتکردنەوە و ساناکردنەوە نییە.

ئەگەر دەسەلأت سانا بکرێتەوە، ئیدی توانای بەردەوامبوون و بووناوبوون (صیرورة) لە دەستدەدا. بەلأم بەو پێیەی ئەو توانایە لە دەست نادا واتە سانا نییە. دەسەلأت چەندە سەرەتایی و چەندە دەسەلأتگەر بێ، خۆبەخۆ "پنتەکانی بەرگری" بەرهەمدێنێ، هەروەك چۆن ناوچەکانیی تەبابوون بەرهەمدێنێ. پەیوەندیەکانی دەسەلأت لەسەر بنەمای جووڵە و گەڕان بەدوای پنتەکانی تەبابوون و پنتەکانی بەرگریدا دامەزراوە. بۆ نمونە فۆکۆ باس لە مۆدێلی دەسەلأتی مێگەلی دەکا، نەك وەك دەسەلأتێکی ساکار بەڵکو وەك دەسەلأتێك کە لەسەر بنەمای پەیوەندیی نێوان کار لەناو کرداردا دامەزراوە. کاری کەسی جڵەوکەر لەناو کرداری مێگەلی جڵەوکراودا. بەمانایەوکی تر، دەکرێ بڵێین دەسەلأتی مێگەلی زادەی کردارە جۆراوجۆرەکانی خودە لەناو کردارە جۆراوجۆرەکانی گشتدا بە گوێرەی شوێن و کاتە جیاوازەکان، کە ئەڵبەتە بە ئەندازەیەك بێشومار و فرەن کە قابلی دەستنیشانکردن و ساکارکردنەوە نین.

بەلأم مەبەستی فۆکۆ تەنها ئاڵۆزکردن و فرەکردنی بێشوماری پەیوەندیەکانی دەسەلأت نییە، بەڵکو دەیەوێ ئێمە لە دەسەلأت بگەین لە ڕێگای ستراتیجە بەردەوامەکانیەوە نەك لە ڕێگەی ئەو گریمانانەوە کە بە شێوەیەکی دابڕاو و میکانیکی تەماشای سروشتی کاری دەسەلأت دەکا. یان دەسەلأت تەنها دەبەستێتەوە بە ئیرادەی مرۆڤەوە.

بەر لە سێ سەدە، کەسانێکی ساویلکە لە تێزەکەی "سپینۆزا" تێنەدەگەیشتن، کاتێ ووتی: من کار بۆ ئازادی مرۆڤ دەکەم هەرچەندە بڕوام بە ئازادیی مرۆڤ نییە و بڕوام بە تایبەتمەندێتی مرۆڤ نیە. ئەمڕۆش کەسانێکی ساویلکە لە تێزەکەی فۆکۆ ناگەن کاتێ مانیفێستی "مەرگی مرۆڤ" ڕادەگەیەنێ. ساویلکەکان هەمیشە لە ژێر پەردەی بەرگریکردن لە ویژدانێکی مرۆیی گشتی و نەمر بە گژ هەموو فیکرێکی نوێ و هەموو ئەو تێزانەدا دەچنەوە کە لە داهاتوودا دەبنە تێزگەلی زۆرئاسایی و بەڵگەنەویست. کەسانێك هەن بەناوی بەرگریکردن لە (مافەکانی مرۆڤ)ەوە نایانەوێ لە تێزەکەی فۆکۆ بگەن، یان بە پاساوی گەڕانەوەی بەهای گەردوونی و هەمیشەیی بۆ مرۆڤ دژایەتی هەموو تێزێکی رەخنەیی دەکەن کە ڕووبەڕووی مرۆڤی مۆدێرن دەکرێتەوە. بەلأم فۆکۆ بڕوای بە هیچ بەهایەکی گشتی و نەمر نییە کە دەبەخشرێ بە مرۆڤ، چونکە ئەو بەهایانە بەرهەمی دەسەلأت و گوتاری مەعریفی باون. لە پشت هەموو بەهایەکی گەردوونی و گشتگیرەوە گەمە تایبەتەکان و بلأوبوونەوەیان بە بنیاتە مێژووییەکاندا ئامادەیە. ئەو نەمریی و گشتگیرییەش کە بەخشراوە بە مرۆڤ جۆرێکە لە گەمەکردن لە بنیاتێکی مێژوویی دیاریکراودا.

ئەو بایەخەی دەبەخشرێ بە مرۆڤی هاوچەرخ و ئەو پێداگرتنە بەردەوامەی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ لە ئارادایە، پێگەیەکی سەنترالی ئەوتۆی بەخشیوە بە مرۆڤ کە خودی (ژیان) چۆتە پەراوێزی مرۆ ڤ و مافەکانی مرۆڤەوە. خەریکە مرۆڤ لە بوونەوەرێکی خاوەن ژیانەوە دەبێتە مرۆڤێکی خاوەن ماف، خودی ژیانیش خەریکە دەبێتە جۆرە مافێکی پەتی. بەتایبەتی ئێستا لە بواری یاساییدا زۆر باس لە مافی ژیان و مافی تەندروستی و مافی دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیان و.. هتد، دەکرێ. پێداگرتن لەسەر مافەکانی مرۆڤ و هەوڵدان بۆ بەگەردونیکردنی ئەو مافانە دەچنەوە نێو هەمان پرۆسە، پرۆسەی گشتگیرکردنی وێنەی مرۆڤ. بەڵام سەربارەی خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مرۆڤەکان لەوەی کە دەبێ خاوەنی مافەکان بن بە یەکسانی، دەبێ خاوەنی ژیانی جیاواز و ژیانی فەردی جیاوازیش بن، ئەمەش ئەو پرۆسەیە کە گوتاری مرۆڤی هاوچەرخ پشگوێی خستووە و لە یادیکردووە. مرۆڤی کۆن خاوەنی مافەکانی خۆی نەبوو بە مافی ژیانیشەوە. هەرچی مرۆڤی هاوچەرخە، هەرچەندە خاوەنی مافە تایبەتەکانی خۆیەتی، بەڵام ژیان وەک رووبەرێك کە لەو مافانە گەورەترن و لە چوارچێوەی بەندەکانی ئەو مافانەدا جێیان نابێتەوە پەراوێز خراوە.

لەم سەروبەندەدا رۆڵی رۆشنبیر چییە؟. لە سەدەی هەژدەوە رۆشنبیری خۆرئاوایی رۆڵێکی گەردوونی بەخشیوە بە خۆی و لە هەوڵی گشتاندنی بەهای مرۆڤ و مافەکانی مرۆڤدایە. ئەم رۆڵەی رۆشنبیر لای (زۆلا) و (رۆلان) ئامادەیی هەبوو، تا جەنگی جیهانی دووەم درێژ دەبێتەوە و لای (سارتەر)یش درێژەی هەیە. رۆشنبیر وەك پارێزەر، یان وەك یاساناس، بەرگری لە چەمکی ماف و مافەکانی مرۆڤ کردووە. لە کاتێکدا ئەو بەرگریکردنە کاری ئەو نییە بەڵکو کاری ئەو بریتییە لە بەرگریکردن لە ژیان کە لەو مافانە فراوانتر و لەو مافانە بەربلاوترن. بە مانایەکی تر، گەر رۆشنبیری کۆن بە زمانی ماف دوابێ، ئەوا رۆشنبیری نوێ بە زمانی ژیان دەدوێ.

لە جوانترین بەشی کتێبی "ئیرادەی مەعریفە"دا، فۆکۆ باس لە نمونەی دەسەڵاتێك دەکا کە سیاسەتی ژیان، نەك سیاسەتی ماف، پێڕەودەکا. کار بۆ جێبەجێکردنی یاسا مەدەنییەکان ناکا، بەڵکو کار بۆ چەسپاندنی یاسا کۆمەڵایەتییەکان دەکا. دەسەڵاتێك لەسەر مافی مرۆڤەکان بە دابڕاوی لە مافی کۆمەڵگا دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر بناغەی مافەکانی کۆمەڵگە دامەزراوە لە دۆخی ئاوێزانبوون و شوناسگۆڕینەوەی بەردەوامدا. ڕەنگە لە سەردەمی ئێستادا سەرەتاکانی دروستبوونی ئەو دەسەڵاتە بەدیبکەین. هەڵوەشاندنەوەی سزای (لە سێدارەدان) لە وڵاتانێکی زۆری جیهاندا، لەقبوونی رۆڵی سەنترالی مرۆڤە لە دەوڵەت و کۆمەڵگادا. چیتر مرۆڤ ئەو بوونەوەرە پیرۆزە نییە کە ئەفرێنەری شارستانیەتە و چیتر ئەو بوونەوەرە نەفرەتلێکراوەش نییە کە وێرانکەری ئەو شارستانیەتە بێ. ئێستا (ژیان) وەك بابەتێکی زیندووی فرە رەهەند و فرە ئەدگار، وەك بابەتێك کە قابلی کورتکردنەوەی یاسایی نیە لە چەند مافێکدا، وەك پرسێکی مەعریفی کە قابلی پێناسەکردن نییە، وەك فەزایەك کە قابلی دەستنیشانکردن و گەمارۆدان نییە لەناو شوێنێکی دیاریکراودا.. رۆژ بە ڕۆژ لە فراوانبووندایە و پرسێکە و هەموو پنتەکان و هەموو تۆڕەکانی پەیوەندیی تەنیوە. بۆیە ئێستا ستراتیجی (دەسەڵات) بە ئاقاری بەبابەتکردنی ژیاندا تێدەپەڕێ، بە هەمان شێوە (بەرگری) پشتئەستوورە بە ژیان وەك بابەتێکی سیاسی. ئێستا –هەروەك نیچە دەڵێ– رووناکی دەخرێتە سەر هێزەکانی ژیان، کە دەوڵەمەندتر و




جۆراوجۆرترن. ئێستا مرۆڤ بۆتە ئەو بوونەوەرە بەتەمەنەی کە پشتی پێنابەسترێ لە ستراتیجەکانی دەسەڵات و گوزارشتەکانی مەعریفەدا. ژیان بۆتە (مرۆڤی باڵا) یان ئەو سوپەرمانەی کە نیچە باس لە هاتنی دەکا. ئازادکردنی ژیان بە مانای کوشتنی مرۆڤ نایەت، چونکە ژیان لەو مرۆڤە رزگاردەکرێ کە ژیانی لەناو خۆیدا بەندکردووە.

لێرەوە ئازادکردنی ژیان واتە ئازادکردنی مرۆڤ لەو کۆت و بەندەی کە ژیانی لەناو خۆیدا پێبەستۆتەوە. ژیان شوێنێك نییە بۆ پێرەوکردنی ماف، بەڵکو خودی ژیان مافێکە دەبێ بەرگری لێبکرێ. هەر بۆیە ئێستا کۆنزەرڤاتیڤترین دەسەڵات بەرگری لە ماڤی ژیان دەکا و دژایەتی لەباربردنی منداڵ و هونەرەکانی مناڵنەبوون دەکەن. ژیان چالاکیەکە قابلی پێناسەکردن و ساناکردنەوە نییە، ژیان کۆی ئەو چالاکیانەیە کە بەرەنگاریی مەرگ دەبێتەوە. هەربۆیە فۆکۆ وەك نیچە بە دوای نەمریی مرۆڤدا ناگەڕێ وەك بوونەوەرێکی بایۆلۆجی، بەڵکو بە دوای ئەو چالاکیە زیندوانەی ناوناخی مرۆڤدا دەگەڕێ کە ژیان، نەك مرۆڤ، بە زیندوویی دەهێڵنەوە.

## پێنجەم: کرۆکی بیرکردنەوە (خودبوون)

بینیمان دەسەڵات چ جۆرە ماشێنێکی زەبەلاح و ترسناکە، بەجۆرێك خود لە ئاستیدا یان هیچ نییە یان کۆیلەی نێو پەیوەندییە جۆراوجۆرەکانی دەسەڵاتە. بۆیە فۆکۆ لە شوێنێکدا نائومێدانە ڕەخنە لە خۆی دەگرێ و دەڵێ ئێمەش "بێدەسەڵاتین و ناتوانین جارێکی دی هێڵەکە ببەزێنین، ناتوانین بیپەڕینەوە بۆ ئەو بەر.. ئێمەش لایەنی دەسەڵات دەگرین، لایەنگری قسەکانی دەسەڵاتین یان ئەو قسانەی کە ناچارماندەکا بیاندرکێنین". بەڵام خودی فۆکۆ لە شوێنێکی تردا وەڵامی خۆی دەداتەوە، بە نەغمەیەك کە جۆرێك لە ئومێدی تێدایە، دەڵێ: "گرنگترین پنتی پەیوەندیدار بە ژیانەوە بریتیە لەو پنتانەی کە وزەی ژیانی تێدا چڕ دەبێتەوە، لەو شوێنانەدا ژیان بەردەسەڵات دەکەوێ و دەچێتە ململانێوە لەگەڵیدا، هەوڵدەدا هەموو وزەی خۆی بەکاربێنێ و خۆی لە تۆری دەسەڵات دەرباز بکا". فۆکۆ یادماندەخاتەوە کە هۆکاری بڵاوبوونەوەی چەقە جۆراوجۆرەکانی دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ بوونی پنتە سەرەتاییەکانی بەرگی. چونکە لە بنەڕەتدا دەسەڵات پەنا بۆ قۆرخکردنی ژیان نابا گەر هەستنەکا شتێك لە ژیاندا هەیە بەرەنگاری دەسەڵات دەبێتەوە.

پاش شکستی بزاوتی چاکسازی زیندانەکان لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، فۆکۆ هەستی بەخەمێکی قووڵکرد. هەستی کرد دەسەڵاتیش ئەو توانایەی هەیە کە هەقیقەت بەرهەمبێنێ و هەمیشە لە ئاست پنتەکانی بەرگریدا خۆی نوێژەندەکاتەوە. ئەگەر دەسەڵات خۆی بەرهەمهێنی هەقیقەت بێ، ئیدی چۆن وێنای "دەسەڵاتی هەقیقەت" بکەین؟، واتە چۆن هەقیقەت خۆی ببێتە دەسەڵات و تەنها بەرهەمی دەسەڵات نەبێ؟ ئەگەرنا ئەوا ئەو ژیانەی کە ئومێدەکەین ببێتە بەرهەمهێنی پنتەکانی بەرگری لە بەرامبەر دەسەڵات، دەبێتە جووڵەیەکی بێهودە، جۆرێك لە پەلەقاژە لەناو بۆشایی ڕەنگەکان و فۆرمەکانی مەرگی لەسەرخۆ. لە بری ئەوەی مەرگ قەدەرێك بێ لە ژیاندا، ژیان دەبێتە قەدەرێك لەناو مەرگدا. لێرەدا فۆکۆ پەنا دەبا بۆ شیکردنەوەی تێزەکانی (بیچا *bichat*) دەربارەی چەمکی مەرگ. لە دیدی (بیچا)دا مەرگ چەمکێکی سەربەخۆ و دابڕاو نییە لە ژیان، مەرگ بەشێکە لە ژیان و درێژبوونەوەی ژیان. مەررگ تەنها یەك چرکەسات نییە کە بکەوێتە پشتی ژیانەوە. مەرگ بەر لە ژیان و دوای ژیان و لەناو ژیانیشدا ئامادەیی هەیە. وەك چۆن وردە ژیان



هەیە، وردە مەرگیش هەیە کە بەناو پنتەکانی یەکتردا بڵاودەبنەوە. ژیان ئەو کاتە دەردەکەوێ کە دەچێتە کێشمەکێشەوە لەگەڵ دەسەڵاتدا، ژیان جۆرێکە لە بەرەنگاربوونەوەی قەدەری مەرگ.

لە ململانێی نێوان ژیان و مەرگ، دەسەڵات و بەرگری، ڕاستی دەسەڵات و دەسەڵاتی ڕاستیدا.. ململانێیەکی تر دێتە ئارا، کە بریتییە لە ململانێی خود لەگەڵ بابەتدا، یان ناخی مرۆڤ لەگەڵ دەرەوەی مرۆڤدا. لێرەدا فۆکۆ بیرۆکەیەکی تر دێنێتە گۆڕێ کە بیرۆکەی "دۆنادۆن"ە، واتە لە دەستدانی شوناس و خەسڵەتی تایبەتی شتەکان و تێکەڵبوونیان لەگەڵ یەکتردا، بەجۆرێك هیچ شتێك وەك خۆی نامێنێ. بەڵام ئەم بیرۆکەیە باس لەو هێزە ناکا کە خود دەسڕێتەوە، بەڵکو ئیرادەی خود بەرجەستە دەکا کاتێ دەیەوێ هەموو شتەکانی دەرەوە بەو جۆرە ڕێکبخاتەوە کە خود دەیخوازێ. لە تەرجەمەکردنی بیرۆکەی دۆنادۆندا مەرج نییە هەمیشە خود خودێکی دەسەڵاتگەر بێ، بەڵکو زۆر جار خودێکە بەدوای هاووێنەکانی خۆیدا دەگەڕێ لە دەرەوە. (من)ێکە بە دوای منەکانی تردا دەگەڕێ لە دەرەوە، یان بە دوای (ئەوان)دا دەگەڕێ کە بوونیان تەواوکەری بوونی منە. لێرەوە دۆنادۆن لە نێوان ئیرادەی خود و ئیرادەی ئەودا، لە نێوان هێزی ناوەوە و هێزی دەرەوەدا ڕوودەدا. بەمجۆرە فۆکۆ باس لە (زاینی خود) دەکا، بەڵام خودێك لە دەرەوەی تۆڕی پەیوەندیەکانی دەسەڵات و گوتارەکانی مەعریفە نا، بەڵکو خودێك هەمان ستراتیج پیڕەو دەکا و هەوڵدەدا تۆڕێکی پەیوەندیی نوێ بەرهەم بێنێ لەناو تۆڕێکی پەیوەندیی پێشوتردا. یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکی و گرنگەکانی ئەم خودەش بریتییە لە گێرنەخواردن لە تاکدا، لە ڕێگای جووڵەوە لە ناوەوە بۆ دەرەوە و وەرگرتنی هەموو جووڵەیەکی نوێش لە دەرەوە بۆ ناوەوە.

(خود) لای فۆکۆ، لە وێنەی (خود)ی فەیلەسوفە بوونگەر و فینۆمینۆلۆجیستەکاندا نییە. خود لای ئەو خاوەن پێگەیەکی سەنتراڵ نییە. تەنانەت لەو شوێنانەشدا کە خود لە پیوەندییەکی پەتی و دابڕاودایە لەگەڵ خودی خۆیدا، ئەوی بەرامبەر ئامادەیە. تەنانەت لەو کاتانەدا کە خود لە هەوڵی ڕێکخستنی خۆی و جڵەوکردنی خۆیدایە، لەناو تۆڕی پەیوەندییە دەرەکیەکان و بە گوێرەی ستراتیجی دەسەڵات و دەزگا سیاسی و خێزانیەکان و دەزگا و گوتارە جۆر بەجۆرەکانی دەرەوە کاردەکا. مرۆڤ ئەو کاتەی سەرگەرمی جڵەو کردنی خۆیەتی، ئەوی تر جڵەو دەکا. چونکە مرۆڤ ناتوانی ئەوی تر جڵەوبکا ئەگەر پێشوەخت خۆی جڵەو نەکا. واتە یەکەم جووڵەی دەسەڵات لەناوەوە بۆ دەرەوە لە جوڵەی دەسەڵاتەوە دەستپێدەکا لە دەرەوە بۆ ناوەوە. بەڵام زۆر جار مرۆڤ واتێدەگا خۆی خاوەنی جووڵەیە و لەناو تۆڕێکی بەرفراوان و بێشوماری جووڵەدا نییە. لێرەدا فۆکۆ نمونەی دەسەڵات دێنێتەوە لای یۆنانیەکان کە لە رواڵەتدا وا دەردەکەوت یۆنانیە ئازادەکان بکەری ئازادن، بەڵام لە راستیدا بکەری جڵەوکراوبوون، چونکە بیرۆکەی (خۆجڵەوکردن و خۆدامرکاندنەوە و خۆبەستنەوە) هەمیشە مەرجی پێشوەختی جڵەوکردنی بەرامبەر بووە، بە تایبەتی کۆیلەکانی ئەو سەردەمە. بە مانایەکی تر پێڕەوکردنی دەسەڵات لەلایەن یۆنانیە ئازادەکانەوە بەسەر کۆیلەکاندا، پێویستی بە خۆجڵەوکردن هەبوو لەلایەن کەسە ئازادەکانەوە کە لە رواڵەتدا وادەردەکەوێ هەڵبژاردنێکی ئازادانەیە، بەڵام لە راستیدا هەڵبژاردنێکی جەبرییە لە ناو سیستەمێکی دەسەڵاتی دیاریکراوو گوتارێکی مەعریفی دیاریکراودا.

لە کتێبی "بەکارهێنانی چێژ"دا، فۆکۆ باس لە ڕەهەندێکی تری خود دەکا، کە هەندێ جار ملکەچی پەیوەندیەکانی دەسەڵاتە و هەندێ

جاریش لە دەرەوەی تۆڕی ئەو پەیوەندیانە کاردەکا. ئەویش ڕەهەندی پەنابردنە بۆ چێژە بایۆلۆجیەکان، بە تایبەتی چێژی سێکسی. فۆکۆ هەڵکۆڵینێکی مەعریفی ئەنجامدەدا کە لە گریکەوە تا سەردەمی مەسیحیەت و تا سەردەمی ئێستامان دەگرێتەوە. باس لەو چرکەساتانە دەکا کە خود توانیویەتی خۆی لە تەونی جاڵجاڵۆکی دەسەڵات دەرباز بکا و لە دەرەوەی گوتاری مەعریفی پراکتیزەی خود بکا. لە نێوان ئەم کتێبە و کتێبی "ئیرادەی مەعریفە"دا دابڕانێك هەیە، نەك لەسەر ئاستی میتۆد، بەڵکو لەسەر ئاستی بابات. چونکە لە کتێبی "ئیرادەی مەعریفە"دا باس لە چالاکی و وەزیفەی مرۆڤ دەکا لەناو پەیوەندیەکانی دەسەڵات و گوزارشتەکانی مەعریفەدا. بەڵام لە کتێبی "بەکارهێنانی چێژ"دا باس لە ڕەهەندێکی تری مرۆڤ دەکا، کە تا دوا ئەندازە. چەپێنراو و خەفەکراوە تەنانەت لە کراوەترین کۆمەڵگاشدا، ئەویش ڕەهەندی چێژ و سێکسە. ئەڵبەتە فۆکۆ باس لە چێژ و سێکس وەك دوو وەزیفەی بایۆلۆجی یان وەك دوو ئەزموونی ئیرۆتیکی و ئیستاتیکی ناکا. بەڵکو وەك رووبەرێك باسیان دەکا کە لە چەند چرکەساتێکی مێژوییدا، بەدەر لە گوتاری گشتی و بنیاتی گشتی و جووڵە مێژوییەکانی تر بنیاتی تایبەت بە خۆی پێکهێناوە، کە شایەنی لەسەر وەستان و لێکۆڵینەوەیە. واتە فۆکۆ پێشنیازدەکا مێژوویەکی نوێ بۆ سێکس بنوسینەوە کە مەرج نیە تەریب بێ لەگەڵ مێژووی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی باودا. چونکە هەمیشە سێکس لە فەزایەکدا کاریکردووە کە فەزای گشتی نەبووە، هەربۆیە لە هەندێ چرکەساتی تایبەتدا سێکس بووەتە چالاکیەك کە لە دەرەوەی پەیوەندییەکانی دەسەڵات و گوتاری گشتی بەگەڕخراوە. تەنانەت لە هەندێ چرکەی مێژوویدا چالاکی سێکسی و چالاکی خواردن، کە هەردووکیان دوو چالاکی بایۆلۆجین، لە یەکتر دابڕاون و بەدوو مێژووی جیاوازدا تێپەڕیون. چونکە ئەگەر کولتوری باو توانیبێتی (خواردن) لە چالاکییەکی تایبەت بە خودەوە بکاتە چالاکیەکی کۆمەڵایەتی، ئەوا سێکس زۆر جار رووبەرێکی بۆ خودگەری هێشتۆتەوە. بەتایبەتی لای یۆنانیەکان سێکس هەمیشە جووڵەیەك نەبووە لە خودەوە بۆ ئەوی تر، بەڵکو زۆر جار جووڵەیەك بووە لە خودەوە بۆ خود. سێکس وەك رووبەرێك بۆ پەیوەندیسازی لەگەڵ (خود)دا، هەندێ جار دەچێتە ناو ستراتیجی گشتی دەسەڵات. بەڵام هەندێ جار بە پێچەوانەی ویستی دەسەڵاتەوە دەبێتە پێکهێنەری پنتەکانی بەرگری بەڕووی دەسەڵاتدا. پەیوەندیی خود بە خودەوە، بە چوار چرکەدا تێپەڕیوە، کە دەکرێ بە چرکەکانی (خودزایینی) ناوبرێن، کە بریتین لە: ناسینی جەستە، ناسینی هێز، ناسینی حەقیقەت و ناسینی ئەویتر. ئەم چوار چرکەیە پێکەوە هۆکاری مادی و هۆکاری رەمزیی لە دایکبوونی خود (خودزایینی) بوون، هەرچەندە بە چەندین ریتمی جیاوازدا تێپەڕیون، کە هەندێ جار تەبا و هەندێ جار ناتەبا بوون لەگەڵ سیستمی گشتیدا، بەڵام رۆڵی گرنگیان هەبووە لە بەرهەمهێنانی ئەو چالاکیە سەربەخۆ و تایبەتانەی کە لە پشت یاسا و بنەما گشتیەکانی مەعریفە و دەسەڵاتەوە ئامادەبوون.

لە کتێبی "بەکارهێنانی چێژ"دا فۆکۆ (خود) کەشف ناکا بەڵکو مانا جیاوازەکانی خود کەشفدەکا لەسەردەمە جیاوازەکاندا، واتە ئەگەری خۆ دروستکردنەوەی خود پێشنیاز دەکا لە دەرەوەی دەسەڵات و مەعریفە. چونکە ئەگەر مەعریفەخوازی و دەسەڵاتخوازی دوو رەفتاری مرۆیی بن ئەوە چێژخوازی، واتە گەڕان بە دوای چێژدا، دەکەوێتە ئەودیو ئەنگێزەکانی مەعریفە و دەسەڵاتەوە. لێرەدا فۆکۆ باس لە بایەخی یادەوەری دەکا، کە ئەو شوێنەیە مرۆڤ تیایدا خودی خۆی

دەناسێ. مۆڤ هەمیشە لە ڕێگەی یادەوەرییەوە هوشیاری زیاتر پەیدا دەکا بەرامبەر خودی خۆی لەناو (کات)دا، هەروەك چۆن هوشیاری بەرامبەر شتەکان پەیدا دەکا لەناو (شوێن)دا. بەڵام زۆرجار مرۆڤ لە ژێر کاریگەری پەیوەندیەکانی دەسەڵات و گوتارەکانی مەعریفەدا هوشیاری خۆی بەرامبەر کات لە دەستدەداو تەنها سەرقاڵی مامەڵەکردن دەبێ لەناو شوێندا. بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بناسێتەوە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ناسینی کات. ئەڵبەتە کات تەنها (ئێستا) نییە، بەڵکو بە پلەی یەکەم یادەوەرییە. بە مانایەکی تر ئەگەر ناسینی شتەکانی دەرەوە پێویستی بە ناسینی شوێن هەبێ لە چرکەی ئێستادا، ئەوا ناسینی خود هەمیشە پێویستی بە بەستنەوەی ئێستا بەڕابردووەوە هەیە، واتە بەگەڕ خستنی یادەوەری لە پێناو (خودزاینی)دا. لەم ڕووەوە میتۆدی فیکری فۆکۆ جیاوازە لە میتۆدی مێژونوس و ئارکۆلۆجیستە تەقلیدییەکان کاتێ دەیانەوێ بابەت بناسن بەدەر لە خود و بەدەر لە یادەوەری خود لە ئێستادا. هەروەها جیاواز لە هی دیاردەناس و بوونگەرەکان کە دەیانەوێ بابەت لەناو بازنەی مەبەستگەریی فینۆمینۆلۆجی خود –دا بناسن.

لەناو هەر (خود)ێکدا دوو جووڵە هەیە، جووڵەیەك بۆ ناسینی دەرەوە و جووڵەیەك بۆ ناسینی ناوەوە. جووڵەیەك بۆ کەشفکردنی ئەویتر و جووڵەیەك بۆ کەشفکردنی خود. هەموو خودێك شارێکی بچوکە، هەموو شارێکیش خودێکی گەورەیە. هەروەك چۆن شارپارێزی لەهەر شارێکدا جووڵەیەکە بۆ ناوەوە کە هاوزەمانە لەگەڵ کرانەوە بە ڕووی شارەکانی تردا، کە ئەویش مەرجی مانەوە و درێژەدانە بە ژیانی شار. بەهەمان شێوە خودپارێزی و ئەویترناسی دوو خەسڵەتی سەرەکی هەر مرۆڤێکن. لە کاتێکدا فۆکۆ هەوڵیداوە ئەرشیفناسێك بێ لە وێنەی گۆگۆل ***googol*** و نەخشەسازێك بێ لە تایپی چیخۆف ***tchehov***، لێرەدا هەوڵدەدا ئاسەوارناس و شوێنناسێك بێ لە بابەتی بیەلی ***Biely*** کە لە یەکێك لە نوسینەکانیدا شێوە لوولەك و پێچاوپێچەکانی ناو دەماغی مرۆڤ دەشوبهێنێ بە کوچە و کۆڵانەکانی شار. لە هەردوو حاڵەتدا ئاماژەیەك بەدیدەکەین بۆ ناوەوە و ئاماژەیەك بەدیدەکەین بۆ دەرەوە، کۆڵانێك دەمانباتە دەرەوەی خود و کۆڵانێك دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ناوەوە. لێرەوە دەکرێ لە فەلسەفەی فۆکۆدا چوار ناوچەی سەرەکی لەیەکدی جیابکەینەوە:

1–هێڵی دەرەوە: ئەو هێڵەی کە خود دەبەستێتەوە بە بابەتەوە، مرۆڤ دەبستێتەوە بە شتەکانەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هێڵی شەڕێکی ڕاستەقینەیە. چونکە لەو هەرێمەدا دەسەڵات بە هەموو گەمەکانیەوە و بەرگری بە هەموو پنتەکانیەوە ئامادەیە.

2–بنیاتەکان: لێرەدا شەڕ و ململانێ وەك خۆیان ئامادە نین، بەڵکو وەك جۆرێك لە وێنە. بنیاتەکان بەشداری لە ململانێدا ناکەن، بەڵکو تۆماریدەکەن و هەمیشە لەناویاندا باکگراوندی مێژو ئامادەیە، بەڵام مێژوو وەك خۆی ئامادە نییە.

3–ناوچە ستراتیجەکان: ئەگەر شوێنی بنیاتەکان سەرزەمین بێ ئەو شوێنی ستراتیجەکان لە ئاسمان یان لە دەریاکاندایە، هەمیشە لە نێوان سروشتی جێگیری بنیاتەکان و سروشتی ناجێگیر و نادیاری ستراتیجەکاندا گێژەڵووکەیەکی بەهێز هەڵیکردووە.

4–ناوچەی خود (چەقی گێژەڵوکە): ئەو شوێنەیە کە چاوگی هەموو جەنجاڵی و جووڵەیەکە، بەڵام خۆی ناوچەیەکی ئارام و بێدەنگە. ئەڵبەتە ئێمە دڵنیاین لەوەی ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی خاڵی نییە چونکە خۆمانی تێدا نیشتەجێین. کاتێ گێژەڵوکە هەڵدەکا ئارام ترین شوێن چەقی



گێژەڵووکەکەیە، چونکە لەوێدا ئاراستەی (با)یەکان دەگەن بەیەك و خامۆشدەبن. لەو شوێنەدا خود لە دایکدەبێ کەسەر بە ناوچەی هەڵکردنی ململانێکان و کوژانەوەی ململانێکان نییە. لەوێدا هەموو ململانێکان دەکوژێنەوە و خامۆشدەبن بەلاّم شتێك هەڵدێ و لە دایکدەبێ کە (خود)ە. ئەوێ ناوچەی (خودزاینی)یە.

## دەربارەی مەرگی مرۆڤ و لەدایکبوونی مرۆڤی بالاّ

مانیفێستی مەرگی مرۆڤ لای فۆکۆ وەك هەندێ کەس بەهەڵە لێی تێگەیشتوون، مانیفێستی مەرگی ژیان و کاڵبوونەوە و لەناوچوونی پنتەکانی بەرگری نییە لە ژیاندا. مەرگی مرۆڤ مەرگی تایپێکی تایبەتی مرۆڤە کە تەمەنی چەند سەد ساڵێکە، ئەو مرۆڤەی کە خۆی کردۆتە سەرچاوەی هێزگەلێك لە بابەتی: بیرکردنەوە، فەنتازیا، یادەوەری، وێناکردن و ئیرادە. بەلاّم لە دیدی فۆکۆدا ئەم هێزانە لە مرۆڤدا هێزی ڕەسەن نین، بەڵکو زادەی پەیوەندیی بەردەوامن لەگەڵ هێزەکانی دەرەوەدا. هەر بۆیە مرۆڤ وەك ئاژەڵ خاوەنی ماهیەتێکی جێگیر نییە، بەڵکو مرۆڤ خاوەنی ئەو وێنانەیە کە بۆ خۆی دروستی کردوون. بە مانایەکی تر گەر ئاژەڵ بوونێکی جێگیری لەناو شوێندا هەبێ، ئەوا بوونی مرۆڤ بەندە بە وێناکردنەکانیەوە لەناو کاتدا. ماهیەتی مرۆڤ بە گوێرەی سەردەمەکان گۆڕانی بەسەردا دێت، لە سەردەمی مۆدێرنیشدا مرۆڤ خۆی کەشف نەکردووە، بەڵکو وێنەیەکی تایبەت بە خۆی دروستکردووە، کە وێنەیەکی کاتییەو وەك هەموو وێنەکانی پێشوی، وردە.. وردە.. کاڵدەبنەوە و کۆتاییان دێت.

لەسەردەمی کلاسیکیدا مرۆڤ هەمیشە بیری لە نەمری و ناکۆتایی دەکردەوە، بیری لە دوا پلەکانی بالاّبوون و کەماڵ دەکردەوە. خولیای گەیشتن بە ناکۆتا ئەنگێزەی گەورەبوونی فەنتازیا و خەونی دۆزینەوەی شوێنە دوورەکان لە گەردونێکی بێکۆتادا، خەونی کەشفکردنی کاتە دوورەکان لە ئەزەل و ئەبەددا هەمیشە مرۆڤی لە قەبارەی خۆی دەردەکرد. واتە حەقیقەتی بێکۆتا لە دەرەوەی مرۆڤ بوو، مرۆڤ بوونەوەرێکی بچوك و بێ نرخ بوو بەرامبەر گەردوونێکی گەورە و زەمەنێکی بێکۆتا و بێسەرەتا. گەورەیی لە دەرەوەی مرۆڤ، لە نهێنییەکی گەورەدا، لە یەزداندا بەرجەستە دەبوو.

بەلاّم لە سەدەی حەڤدە بەدواوە، مرۆڤ ڕەهەندێکی دیکەی ناکۆتای کەشفکرد. ناکۆتا لە بچوکیدا ناکۆتا لە کورتی و بچوکی چرکەساتەکاندا. ئیدی بچوکیش بووە بەهایەك و بووە نهێنیەك لە بەرامبەر گەورەییدا. ناکۆتا لە بچوکیدا بووە رکابەری ناکۆتا لە گەورەییدا، باسکاڵ و سپینۆزا و لیبنتز و فەیلەسووفەکانی ئەو دەمە، بیریارە ئەقلاّنی و ئەزموونگەرەکان بە گشتی، لە بایەخی گشتەوە گەڕانەوە بۆ بایەخی تایبەت. لە توانا ناکۆتاکانی گەردوونەوە گەڕانەوە بۆ توانا ناکۆتاکانی مرۆڤ.

ئیدی ناکۆتا، لە ئاسمانەوە دابەزییە سەر زەوی. گەشەی بایۆلۆجی مرۆڤ لە ئاژەڵەوە بۆ بوونەوەرێکی بیرکەرەوە گەشەیەکی ناکۆتایە. گەشەی سەرمایە لە سیستمی ئابووری فیوداڵییەوە کە بەندە بە شوێنەوە بۆ سیستمی ئابوری سەرمایەداری کە لە هیچ شوێن و سنورێکدا گیرناخوا گەشەیەکی ناکۆتای ئابوورییە. گەشەی زمان لە ئامرازێکی پەیوەندیی جێگیرەوە بۆ ئامرازێکی بیرکردنەوە و چەمکسازی ڕەها لە بوارە جیاوازەکانی مەعریفەدا گەشەیەکی ناکۆتای ئامرازی کەشفکردنی هەقیقەتە. واتە مرۆڤ لە بوونەوەرێکی تاساوەوە بەرامبەر گەردونێکی بێکۆتا بووە خاوەنی بەرهەمهێنانی ناکۆتا و ڕەهایەتی. ئەو دۆخەی (نیچە) ناوی نا (مەرگی یەزدان) و فۆکۆ ناوی نا (لەدایکبوونی مرۆڤ). کودەتای مرۆڤ دژی یەزدان تەنها لە پێناو





گرتنەدەستی دەسەڵاتدا نەبوو، بەڵکو لە پێناو قۆرخکردنی حەقیقەتیشدا بوو. ئیدی دابڕانێکی گەورە کەوتە نێوان دوو قۆناغەوە، گۆڕانێکی گەورەش بەسەر فۆرمی دەسەڵات و فۆرمی مەعریفەدا هات. لەو دەمەوە سێ لقی مەعریفی هاوتەریب لەگەڵ بەرجەستەبوونی دەسەڵاتی مرۆییدا کار بۆ گەڕاندنەوەی چەمکی (ناکۆتا) دەکەن لە گەردوونەوە بۆ ناو مرۆڤ: بایۆلۆجیا، زانستی ئابووری و زمانناسی.

نیچە دژی ئەو مرۆڤە بوو کە کودەتای دژی یەزدان بەرپا کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بانگەوازی بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی یەزدان نەکرد، بەڵکو ستایشی مرۆڤی باڵای کرد، ئەو بوونەوەرەی کە هێشتا نەهاتووە. کاتێ فۆکۆ-ش ووتی: پێویست ناکا بۆ مەرگی مرۆڤ بگرین و ئەسەف بخۆین، مەبەستی بوو ئاسۆکانی بینینمان بەر فراوان بکەین لە پێناو کەشفکردنی ئەو وزە شاراوانەی کە لە کرۆکی ژیاندا هەن.

داخۆ ئەو بوونەوەررە نوێیە کێیە کە دژی کۆتایی هاتنی سەردەمی یەزدان و دوای بڕانەوەی سەردەمی مرۆڤ لەدایك دەبێ؟ ئەڵبەتە دەبێ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا وریا بین. چونکە ئەگەر بە متمانەیەکی زۆرەوە پێشبینیەکانی خۆمان بکەین بە قسە، ئەوا وەك ئەوەیە فیلم کارتۆن بسازێنین. مرۆڤی باڵا لای فۆکۆ، بوونەوەرێکی بایۆلۆجی جیاواز نییە، بەڵام لەوە گەورەترە کە لە وێنای مرۆڤی سەردەمی ئێستا جێگای ببێتەوە. ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو بوونەوەرە نوێیە لە دایکدەبێ، کە نەیەزدانە و نە مرۆڤ، بەڵام ئومێد دەکەین لەو دوانە دڵرەقتر نەبێ.

## پەراوێزەکان

*جیل دولوز، المعرفة و السلطة - مدخل لقراءة فوكو. ت: سالم يفوت. (بيروت/ الدار البيضاء: المركز الثقافي العربي) ط 1، 1987.

1-بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیدەی فۆکۆ سەبارەت بە دەزگای بەندیخانە وەك پنتێك لە پنتەکانی دەسەڵات، کە لە تەونێکی جاڵجاڵۆکەیی ئاڵۆزدا، کە لە یەك کاتدا وابەستەی پنتەکانی تر و خاوەنی سەربەخۆیی خۆشیەتی. دەکرێ دەزگای بەندیخانەی عێراق بە نموونە وەربگرین لە دوو سەردەمی جیاوازدا، بەر لە روخانی رژێمی سەدام حسێن و دوای روخانی ئەو رژێمە. لە سەردەمی یەکەمدا بەندیخانە ئەو دەزگا ترسناکەی دەسەڵات بوو کە نەیارانی رژێمی سەدامی سزادەدا، لە سەردەمی دووەمدا بەندیخانە هەمان ئەو دەزگا ترسناکەیە، بەڵام ئەمجارە سەدام حسین و لایەنگرەکانی سزادەدا. واتە ئەوەی گۆڕانی بەسەرهاتووە وێنەی بەندکراوەکانە نەك وێنەی بەندیخانە (وێنەی سەدام حسێن بە زەلیلی کە گۆرەویەکانی خۆی دەشوا، وێنەی عەلی حەسەن مەجید بەسەری سپی و گۆچانێکەوە.. وێنەی بەندکراوەکانی دوێنێ و قوربانییەکانی ئەو دوو بەندکراوەی ئەمڕۆمان یاددەخەنەوە). واتە سەرەڕای جەبەرووت و دەسەڵاتی تۆتالیتاری سەدام لە سەردەمی یەکەمدا و جەبەرووت و دەسەڵاتی میلیتاری ئەمریکا لە سەردەمی دووەمدا، سەرەڕای گۆڕانکاریی لە وێنەی بەندکراوەکاندا.. بەڵام هیچ کام لەو دوو دەسەڵاتە نەیانتوانی دەزگای بەندیخانە هەڵگرن. ڕەنگە سەدام حسین توانیبێتی بەمەرسومێکی جمهوریی بەندکراوێك کە حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا سەپێنرابێ ئازاد بکا، یان بە پێچەوانەوە هاوڵاتییەکی بێتاوان بکا بە خائین و لە سێدارەی بدا، بەڵام هەرگیز نەیتوانیوە بە مەرسومێك دەزگای بەندیخانە دابخا. لە بەرامبەردا، ڕەنگە لە سەردەمی دووەمدا دەسەڵاتی مەدەنی ئەمریکا لە عێراق چەند بڕیارێکی گرنگی دەرکردبێ سەبارەت بە هەڵپەساردنی حوکمی لە سێدارەدان و باشکردنی رەوشی مافەکانی مرۆڤ لەناو زیندانەکاندا، بەڵام نەیتوانیوە و ناتوانێ بە بڕیارێك دەزگای بەندیخانە هەڵوەشێنێتەوە.

چونكە ئەوەی گۆڕانی بەسەرهاتووە شێوازەكانی سزایە نەك خودی سزا، لە یەكەمیاندا سزا هەمەجییە و لەسەر جەستەی بەندكراو كاردەكا، بەڵام لە دووەمیاندا سزا بیرۆكراتییە و لەسەر سایكۆلۆجیای بەندكراو كاردەكا. هەربۆیە ئێستا وێنە جیاوازەكانی سەدام حسێن لە زیندان و لەبەردەم دادوەردا (بە قژ و ریشێكی بژەوە، لەبەردەم پزیشكێكی دەسكێش لە دەستدا كە دەموددانی دەپشكنیٚ و ئەسپیٚ لە قژی دەبژنیٚ، لە دۆخێكی هیستریدا لە بەردەم دادوەرێكدا، كا داوای لێدەكا بە ئەدەب بیٚ و ریٚز لە هەیبەتی دادگا بگریٚ و ...هتد) زیاتر لە وێنەی شێتێك دەچیٚ، نەك لە وێنەی تاوانبارێك – ئەمەش ئەو گۆڕانەیە كە بەسەر شێوازی سزادا دێت، لە سزای جەستەییەوە بۆ سزای سایكۆلۆجی، كە فۆكۆ لە هەردوو كتێبی (پاساوانی و سزا) و (مێژوویی شێتی) بە وردی كاری لەسەر دەكا. لە سەردەمی یەكەمی عێراقدا سزادراوەكان دڕندەو خائین بوون بۆیە دەبوو سزاكەشیان دڕندانەبیٚ، بەڵام لە سەردەمی دووەمدا بەندكراوەكان ناشارستانی و دەروونەخۆشن بۆیە دەبیٚ سزاكەیان سایكۆلۆجی بیٚ. لەسەردەمی یەكەمدا (دەسەڵات و بەرگری) لە سەر دوا لیزمی پاك/ ناپاك (مقدس/ مدنس)، نیشتمانی/ خائن، ئیلاهی/ شەیتانی.. كاریدەكرد. بەڵام لە سەردەمی دووەمدا لەسەر دوالیزمی ئاقڵ/ شێت، یاساپارێز/ یاساشكێن، شارستانی/ ناشارستانی، هاوڵاتی/ تاوانبار.. كاردەكا. بۆیە لەبەر رۆشنایی تێزەكەی فۆكۆ هەروەك چۆن ناكریٚ وێنەی دەسەڵات، لەسەردەمی یەكەمدا، لە خودی سەدام حسێندا چڕ بكرێتەوە، ناشكریٚ لە سەردەمی دووەمدا لە دەسەڵاتی سیاسی ئەمریكادا چڕ بكرێتەوە. چونكە لە هەردوو سەردەمدا ئەوەی ئامادەیە دەسەڵات و دەزگاكانی دەسەڵاتە، وەك بەندیخانەو دادگا و دەزگاكانی دیسپلین و ...هتد. بەڵام ئەوەی گۆڕانی بەسەرهاتووە شێوازەكانی دیسپلین و شێوازەكانی پەلكێشانی دەسەڵاتە بۆ پنتە جیاوازەكان لەناو كایە جیاوازەكاندا.

2–گوتار، وەك بەرجەستەكاری كۆمەڵێك گوزارشت، وەك یاسایەك بۆ جڵەوكردنی شتە وتراو و شتە بینراوەكان. لە هەموو ڕەفتارێكدا ئامادەیی هەیە، ڕەفتارەكە قسە بیٚ یان كردەوە، ڕەهەندێكی فیزیایی هەبیٚ یان سایكۆلۆجی، تاكەكەسی بێت یا دەستەجەمعی، مەعریفی بیٚ یان سیاسی و ..هتد. تەنانەت گوتار لەو شوێنانەشدا ئامادەیی هەیە كە (بەرگری) بەرهەمێنیٚ و هەوڵی خۆ هەڵوەشاندنەوە دەدا. سیستمی زمانەوانی وەك گوزارشتكارێك لە گوتار، رووبەرێكە بۆ لێكۆڵینەوەو دەستنیشانكردنی ئەو پەیوەندییە جۆراو جۆرانەی كە پنتەكانی گوتار پێكەوە دەبەستێتەوە. بۆنمونە: كاتیٚ من بە زمانی كوردی و بە شێوازێكی رادیكاڵانە بەرگری لە ئازادی سێكسی دەكەم، پیٚ بزانم یان نا، پنتێكم لەو پنتانەی دەسەڵات و گوزارشتكارێكم لە گوزارشتەكانی ئەو گوتارەی كار بۆ چەپاندن و حەرامكردنی ئازادی سێكسی دەكا. چونكە من لەگەڵ بەكارهێنانی فرێزەكانی تایبەت بە سێكس، دەسبەجیٚ سیستمی زمانەوانی خۆم دەگۆڕم و لە ڕێگەی دەزگایەكی چاودێرییەوە هەموو وشە كوردییەكانی تایبەت بە سێكس لە قسەكانم دەردێنم، واتە هەرچەندە چەپاندن وەك دۆزێك رەخنە دەكریٚ و وەك ڕستە و فرێز لە زماندا فڕێدەدریٚ، بەڵام وەك گوتار ئامادەیی خۆی دەپارێزیٚ و لە پشتی دۆز و ڕستەكانەوە گوزارشت لە خۆی دەكا. ئەمەش ئەو جیاوازییەیە كە فۆكۆ لە نێوان (دۆز و گوتار) و (ڕستە و گوزارشت)دا دەیدۆزێتەوە. ڕەنگە كەسێك بێت لە من رادیكاڵانەتر باس لە ئازادی سێكسی بكا و وشە كوردیەكان وەك خۆی بەكار بێنیٚ وەك (پەڕین، زاوزیٚ، كەڵدان، لاقەكردن و ...هتد)، بەڵام لەم كاتەشدا گوتار هەر باڵادەستی خۆی هەیە، چونكە ئەگەر فرێز و وشەكان زۆر میللی بن، ئەوا گوتار ئەو توایەی هەیە كە قسەكان لە قسەی یاخییەوە بكا بە قسەی بازاڕی، نەغمەی رادیكاڵی بگۆڕیٚ بە نەغمەی بەرەڵایی، ئەنگێزەی شارستانی بگۆڕیٚ بۆ ئەنگێزەی حەیوانی و ..هتد. ئەگەر وشەگەلێكی لە بابەتی (زاوزیٚ،

کەڵدان، جوتبوون و ...هتد)یش بەکاربهێنرێ، ئەوا گوتار توانای ئەوەی هەیە کە ڕەهەندێکی زانستی – پزیشکی – بایولۆجی پەتی ببەخشێ بە وشەکان و بەتاڵیان بکاتەوە لەهەر رەهەندێکی ئیستاتیکی – ئیرۆتیکی، واتە (ئازادی سێکسی) لە وزەیەکی پەیوەندیدار بە ڕۆح و جەستەی مرۆڤەوە دەکا بە بابەتێك بۆ لێدوان و بیرۆکەیەکی ئەبستراکت و پەیوەندیدار بە نوخبەیەکی دیاریکراوەو دوور لە فەزای گشتی. ئەڵبەتە تا کۆمەڵگا ساکارتر بێ، کەرەستەکانی گوزارشتکردن لە گوتار راستەوخۆترن، بۆ نموونە لە کۆمەڵگەی کوردیدا تا ڕابردوویەکی نزیك نوکتەی سێکسی لە فەزای گشتیدا حەرام بوو، تەنها لە مەجلیسی مەلاکاندا نەبێ کە نوکتەکانیان تا دوا سنور ئیباحی بوون، لە کاتێکدا مەلاکان چالاکترین بکەری ئەو دەزگایانە بوون کە کاریان لەسەر چەپاندن و حەرامکردن و فراوانکردنی ڕووبەرەکانی شەرم لە زماندا کردووە، بە ئەندازەیەك زۆر فرێز و وشە هەن لە زمانی کوردیدا مانای سێکسییان پێدەبەخشرێ لە کاتێکدا هیچ پەیوەندییەکیان بە سێکسەوە نییە. جگە لە مەجلیسی نوکتەی مەلاکان، لەوانە ئاینیەکانیشدا سێکس بابەتێکی سەرەکی فیقهو ئەحوال شەخسی و زانستە ئاینییەکان بووە، کە بەوردی و بە درێژی لە قوتابخانە ئاینییەکاندا تاووتوێکراوە و خوێندراوە. واتە دیواری حوجرە و مزگەوت ئەو سنوورە بووە کە فەزای گشتی لە فەزای نوخبە جیاکردۆتەوە، سێکسی (وەك بابەتێکی پیس) لە سێکس (وەك بابەتێکی زانستی) جیا کردۆتەوە، سێکسی لە ئەنگێزەی نەفرەت و فەسادەوە کردووە بە ئەنگێزەی پێکەنین و قسەی نەستەق. بەڵام لە هەردوو فەزاکەدا گوتاری چەپاندن ئامادەیە و گوزارشت لە خۆی دەکا، لە فەزای گشتیدا سێکس بابەتێکی قێزەونە کە ڕستە و دۆزەکانی لێ پاکدەکرێتەوە.. لە بەرامبەردا لە فەزای نوخبەدا سێکس رستەو دۆزەکان داگیردەکا بەڵام لە هەموو مانایەکی ئیرۆتیکی و کۆمەڵایەتی بەتاڵدەکرێتەوە. هەر بۆیە فۆکۆ ئامۆژگاریمان دەکا کە لەناو رستە و دۆزدا بەشوێن گوتاردا نەگەڕێین، چونکە زۆرجار رستە و دۆزەکان پۆشاکی خۆحەشاردان و خۆونکردنی گوتارن، بەڵکو شوێنی راستەقینەی گوتار پنتەکانی دەسەڵاتە کە بە هەموو فەزا گشتی و تایبەتەکاندا، بە هەموو کایە سیاسی و ئابووری و مەعریفی و ئاینییەکاندا، بە هەموو چالاکیە فیزیایی و رەمزیەکاندا، بە هەموو شتە بینراو و شتە گوزارشتلێکراوەکاندا بڵاوبۆتەوە. فۆکۆ لە شوێنێکدا دەڵێ: (ئێمە کاتێ پشتەوەی پەردە نابینین، ناچارین باس لە پەردەکە بکەین)، مێژونوس و ئارکۆلۆجیستە تەقلیدیەکانیش بە شوێن ڕستەو دۆزەکاندا دەگەڕێن، لە کاتێکدا رستە و دۆزەکان ئەو پەردانەن کە لە گوتار ئاڵاون و گوتاریان ونکردووە. هەروەك چۆن زۆرجار ئەو قسانەی کە لە (ئاگایی)یەوە سەرچاوە دەگرن تەواو پێچەوانەو دژی ئەو ئاماژانەن کە نائاگایی دەیاننێرێ، بە هەمان شێوە ئەو حەقیقەتانەی لە ناو رستە و دۆزی ئەرشیف و بەڵگەنامە و دەقەکاندا هەن، زۆر جار پێچەوانەی حەقیقەتی گوتارن. بۆیە ڕەنگە بتوانین بڵێین گوتار نائاگایی مێژووە. زانستی مێژوی تەقلیدی ئیش لە ئاگایی مێژودا دەکا، بەڵام هەڵکۆڵینەکانی فۆکۆ ئیشکردنە لە نائاگایی مێژودا.

3–پێداگرتنی فۆکۆ لەسەر بەردەوامی چاودێری و چەپاندن لە هەموو سەردەمەکاندا بەسەردەمی ئێستاشەوە، تێزێکی پێچەوانەی هیربەرت مارکۆز–مان بیردەخاتەوە سەبارەت بە لاوازبوونی شێوازەکانی چەپاندن، بەتایبەتی چەپاندنی سێکسی، لەسەردەمی مۆدێرندا، چونکە شارستانیەتی مۆدێرن تەنها کار لە سەر چەپاندن و داپڵۆسن ناکا بۆ بنیاتنانی دەزگاکانی خۆی، بەڵکو هەندێ جار شانبەشانی بنیاتنان کار لەسەر جوانکردنی سێکس و بەها بەخشینەوە بە ئیرۆتیکای جەستەیی دەکا. بەڵام ئەم دیدە لەگەڵ دیدی فۆکۆدا یەکنایەتەوە سەبارەت بە چاودێرێ و ئامادەیی و بەردەوامی دەزگاکانی چەپاندن، چونکە چەپاندن لە هەموو سەردەمێکدا بەردەوامە بەڵام بە شێواز و

مەراسیمی جیاواز. لە سەردەمی کلاسیکیدا چەپاندن هێزێکە لە دەرەوە، لەلایەن دەزگا ئاینی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانەوە، ئاراستەی جەستەی مرۆڤ کراوە. بەڵام لەسەردەمی نوێدا چەپاندن هەڵبژاردنێکی خودییە و مرۆڤ بە ئیختیاری خۆی، خۆی دەچەپێنێ لە پێناو هەندێ ئیمتیازی رەمزیدا، کە مەرج نیە تەنها ئاینی بێ بەڵکو دەشێ ئیستاتیکی یان فیکری، یان سیاسی، یان کۆمەڵایەتی یان زانستی بن.. بەڵام چەپاندن هەروەك خۆی ماوە. لەسەردەمی کۆندا ئیغرایەك هەبوو دەخرایە بەردەمی کەسی چەپێنراو کە زۆر جار ئیغرای ئاسمانی بوو، پاداشتێکی بەهەشتی بوو لە پای دامرکاندنەوەی جەستە. بەڵام لەسەردەمی ئێستادا ئەو ئیغراو پاداشتانەی دەخرێنە بەردەستی کەسی چەپێنراو هەموویان زەمینین، بە تایبەتی لە جیهانی سەرمایەداریدا کە مرۆڤ خۆی بە ئارەزووی خۆی سەعاتەکانی کارکردن و بەرهەمهێنان و قازانجکردن زیاددەکا، لە پێناو بردنەوەی زیاتری فریو و پاداشتە دنیاییەکان، بەڵام ئەڵبەتە لەسەر حسابی چەپاندنی سێکسی. لە هەردوو مۆدێلەکەدا هێزێك هەیە بۆ ناشرینکردنی سێکس. یەکەمیان: لە رێگای کەرەستەو دەزگاکانی شاردنەوە و بەنهێنیکردن و دروستکردنی لەمپەری فیزیاییەوە، سێکس ناشرین و ترسناك دەکا، بەڵام دووەمیان بە پێچەوانەوە لە رێگای کەرەستەو دەزگا مۆدێرنەکانی ئاشکراکردن و پەردە لەسەر هەڵماڵینەوە، لە رێگای نەهێشتنی لەمپەرەکانەوە کە تا دوا سنور رێگە بە کردارە سەیرەکانی ئیباحیەت دەدا.. سێکس ناشرین و قێزەوندەکا. سیستمی چاودێری و چەپاندن لە سەردەمی کلاسیکیدا، پەنای دەبرد بۆ قەدەغەکردنی راستەوخۆی رەفتارەکان، بەڵام لە سەردەمی مۆدێرندا بە پێچەوانە کار لەسەر بەرەلاکردنی رەفتارەکان دەکا، دواجار سیستمی چاودێری لە سیستمێکی فیزیایی دەرەکییەوە دەبێتە سیستمێکی سایکۆلۆجی.. ناوەکی. ئەڵبەتە لێرەدا

قسە لەسەر باشی و خراپی یەکێك لەو دوو سیستمە نییە، بەڵکو قسە لەسەر خودی سیستمە کە لە هەردوو مۆدێلدا ئامادەیی هەیە، بەڵام بە شێواز و هونەری جیاوازەوە.

4-مەرگ و لەدایکبوون، ئەو دوو رووبەرەن، کە دەسەڵات لەسەردەمانی کۆن و نوێدا کاریان لەسەر دەکا. دەسەڵاتی کۆن خاوەنی شێوازەکانی مەرگ بوو، لە هەر ئان و ساتێکدا توانای بڕیاردانی هەبوو لەسەر سەپاندنی سزای مەرگ و شێوازی جێبەجێکردنی سزای مەرگ بەسەر رەعیەتدا. بەڵام دەسەڵاتی مۆدێرن، بەتایبەتی دوای کاکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی سزای ئیعدام، وردە وردە ماق بڕیاردانی مەرگی هاوڵاتیان لە دەستدەدا، بەڵام تواناکانی لە کۆنترۆڵکردنی ژیاندا بەرفراوانتر دەبێ، بە ئەندازەیەك توانای هەیە بە گوێرەی پێداویستیە جیاوازەکانی گوتاری گشتی ژیان ببەخشێ، یان نەیبەخشێ. هونەرەکانی رێگرتن لە منداڵبوون و لەباربردن و کولتووری خێزانی بچووك و هاوسەرگیریی دەرەنگ وەخت، کە باری ژیانی مۆدێرن لە باری ژیانی کلاسیکی جیادەکاتەوە.. رەنگدانەوەی گوتارێکی سیاسی و مەعریفی و کۆمەڵایەتی و ئابووری باڵا دەستە کە تیایدا بە شێوازی ناڕاستەوخۆ دەستدەخرێتە ژیان و بڕیاردان لەسەر ژیان و ژمارەی ئەو کەسانەی بۆیان هەیە بژین. ئەمەش دەمانباتەوە سەر هەمان خاڵی پێشو سەبارەت بە شێوازی کۆنترۆڵکردن و چاودێری لەسەر سێکس و لەسەر زاوزێ.. لەسەردەمی کۆندا شێوازەکانی کۆنترۆڵ و چاودێری ڕاستەوخۆ و جەستەیی بوون لە دەسەڵاتەوە بۆ رەعیەت، بەڵام لەسەردەمی نوێدا شێوازەکان ناراستەوخۆ و سایکۆلۆجی و ئیختیارین، لەسەردەمی کۆندا دەسەڵات توانای هەبوو بڕیاریدا لەسەر (مەرگ)، بەڵام لەسەردەمی نوێدا توانای هەیە بڕیاربدا لەسەر (لەدایکبوون). یەکەمیان دوگمەکانی ئەوسەری ژیانی بەدەستە، بەڵام دووەمیان دوگمەکانی ئەمسەری ژیان.

# بونیاد و مانا : میشیل فۆکۆ

## بەهەشتی ڕاستەقینە بەهەشتی ونبووە

مارسیل بروست

**بابك ئەحمەدی**

**لە فارسییەوە: ڕێبوار سیوەیلی**



سەبارەت بە میشێل فۆکۆ (1926–1984) بە گاڵتەوە گوتویانە، ئەو هێندە ئازا بوو کە مرۆڤ و زانستی لە مەیدانی زانستە مرۆڤایەتییەکان وەدەرنا. کاتێ لە ساڵی 1980دا ڕۆژنامەی لۆمۆند هەستا بە سازدانی گفتوگۆ لەگەڵ فەیلەسوفە ناودارەکاندا و گوڵبژێری لەو گفتوگۆیانەی لە دووتویێی بەرگێکدا بە چاپ گەیاند[1]. فۆکۆ وەك تاقە "فەیلەسوفی نەناسراو" مایەوە، هەرچەندە دەکرا بە ئاسانی لە دەقی گفتوگۆیەکدا ئەندێشەی وی بناسرێتەوە. لەوە پێشتر فۆکۆ چەندین جار لە بارەی سیاسەت، ئەدەبیات و زانستە مرۆڤایەتیەکانەوە گفتوگۆی لەگەڵ بڵاوکراوە جۆربەجۆرەکاندا کردبوو، بەڵام هەرگیز ملی نەدابوو لەمەڕ فەلسەفەوە بدوێ. ئەو لایوابوو دەبێ فەیلەسوف هەردەم سیمای خۆی لە پشتی دەمامکەوە بشارێتەوە.

بواری کارەکانی فۆکۆ بێ سنوور بوون لە توێژینەوەی سەرهەڵدانی چەمکی "زانستی مرۆڤایەتی"یەوە دەستیپێکرد، کارەکەی ناونا "دێرینە ناسی زانست" و ئەمەش بووە ناوی یەکێ لە گرنگترین کتێبەکانی کە لە ساڵی 1969دا بڵاوکردەوە[2] هەر زوو لە ناوەڕاستی دەیەی 1950دا گەیشتە ئەو ئەنجامەی "مرۆڤ" لەناو زانستە مرۆڤایەتیەکان و مێژوودا دیاردەیەك یان چەمکێکی تازەیە، لە سەدەی ڕێنیسانسەوە هێمای بۆ کراوە، بەڵام لە "سەدەی مەزن"دا واتە سەدەی هەڤدەهەمدا بۆتە "بیرۆکەی زاڵ". ئەم خاڵەی چەند ساڵێ لەوە دوا لە کتێبی وشەکان و شتەکان

1966دا شیکردەوە[3]، ئەو کتێبەی لە بارەی "دێرینە ناسی زانستە مرۆڤایەتیەکان"ەوەیە. بەهۆی ئەم دۆزینەوەیەوە خاڵێکی دیکەشی لێ ئاشکرا بوو: لەگەڵ سەرهەڵدانی مرۆڤ لە شانۆی زانست، شێوازێکی نوێ و (چەمکێکی تازە)ی دەسەلاّتداریێتی سەریهەڵداوە، بۆیە هەوڵیدا ڕەگ و ڕیشەی دامەزراوەکانی دەسەلاّتداریێتی بناسێتەوە. پرسیاری کرد: ئەو دەسەلاّتەی بەسەر شێتەکانەوە هەمانە لە کوێوە هاتووە؟ مێژووی شێتبوونی نووسی (1961، چاپی دووەم 1972)[4] کە شیکردنەوەی ئەو چەمکە نوێیانەیە لە شێت بوون و "شێتخانە" وە پەیدابوون و ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەڤدەهەم. دووبارە پرسی: ئەو دەسەلاّتەی بەسەر نەخۆشەکانەوە هەمانە لە کوێوە هاتووە؟ لەدایکبوونی دەرمانخانەی نووسی 1963[5]، کە بریتیە لە دێرینەناسی پەیوەندی نێوان چەمکە زاڵەکانی هاوچەرخ سەبارەت بە نەخۆش، پزیشکی، سەلامەتی و نەخۆشخانە واتە دۆزینەوەی ڕەچەڵەك و گۆڕانکاریەکانی چەمکی "جیهانبینی پزیشکایەتی". پاشان پرسیاری کرد: ئەو دەسەلاّتەی بەسەر بەندییەکانەوە هەمانە لە کوێوە هاتووە؟

کتێبی کۆنترۆڵ و سزای نووسی (1975)[6] بۆ ئاشکراکردنی دێرینە ناسی پەیوەندی نێوان بەندیخانە، بەندئازار و بەندیی، واتە تێگەشتنی هاوچەرخانەمان لە بەندیخانە. دواجار پرسی پەیوەندی دەسەلاّت و مەسەلەی سێکسییەکان کامانەن؟ و مێژووی سێکسی نووسی کە سێ بەرگی لێ بلاّوبۆتەوە[7]. لە سەرجەمی ئەم بەرهەمانەدا فۆکۆ خۆی وەك چاوێ بە کۆی میکرۆسکۆپێ زانیوە تا "لە دەسەلاّت وردبێتەوە". لە بەرگی یەکەمی مێژووی سێکسدا فۆکۆ جەخدی کردووە کە گرنگی توێژینەوە لە بارەی کێشەکانی ژیانی سێکسییەوە لە دایکبوونی ئەو ڕاستییەیە کە خودی فەلسەفی/ زانستی بیری خۆرئاوا لەم "مێژوو"ەدا، خۆی وەك بابەت (ئۆبژە)ی توێژینەوە بینیوە. هەر بۆیەشە بەلایەوە تێگەیشتن لە پێکهاتەی پەیوەندییە شێوە دەسەلاّتمەندییەکان و سەرجەمی بناغەی پرسیاری دەسەلاّت ئاسانتر بووە. فۆکۆ کاری خۆی بە (بەراورد لەگەڵ کاری نیتشەدا) ناونا تەبارناسی (جینالۆژیا)ی ڕەوشت و جارێکیش وتی حەز دەکات سەرجەمی بەرهەمەکانی بەو ناونیشانە ناوبنرێن. کاری وی دەکرێ لەیەك وتەدا بەمجۆرە کورت بکرێتەوە: دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان زانست و دەسەلاّت، لە نێوان بیر و زەبردا. تێڕوانینی ئەو بۆ ڕابردوو، عەوداڵی ناسینی ڕەگ و ڕیشەی ئەو پەیوەندیەن جگە لەمە هیچ ئامانجێکی دیکەی لەبەردەم خۆیدا قووت نەکردەوە، کەواتە ئەو مێژوونووس نەبوو هەر خۆشی بە خۆی گوت "فەیلەسوفی بێ ناو" ئەو کەسەی "دەیەوێ بەرەو دەزگایەکی فەلسەفی بڕوات، بەلاّم توانای نییە"، وە لێرەوە هەر لە سوفستاییەکان دەچێ، ئەو کەسانەی بە پێچەوانەی ڕەوتی فەلسەفی سەردەمی خۆیانەوە هەنگاویان نا، بەدناو بوون، بەلاّم لە ئاست ڕاستییدا بە ئەمەکداریمانەوە، هەر بۆیەشە ئەو گوتەیەی ژیل دۆلۆز تەنانەت یەك تۆز زیادەڕۆیی نییە کە دەڵێ فۆکۆ یەکێ بوو لە مەزنترین فەیلەسوفەکانی ئەم سەدەیە[8].

یەکێك لە گرنگترین ئەو چەمکانەی فۆکۆ کاری پێکردن، چەمکی "گوتار" بوو سۆسێر گوتاری بە "کارکردی ڕەوانبێژی زمان" دەزانی، دوای ئەویش زامنەوانان راستەوخۆ گوتاریان بە "ڕستە" دەزانی. بەلاّم لە نیشانەناسی نوێدا گوتار بریتییە لە "شوێن گۆڕکێی ڕستەکان بەیەکتر" یان بە دەربڕینێکی تر بریتییە لە "ڕۆحی وەدەنگهاتووی زمان". پەیوەندی نێوان ناوەرۆکی مانایی بە گشتی و گوتار و نووسراوە، هەر لەبەر ئەمەش باسی "گوتاری

سیاسی" یاخود "گوتاری ڕیوایی" دەکرێت، سەرچاوەی باسی فۆکۆ لەمەڕ گوتارەوە خاڵێکی دیکەیە. گوتار نووسەر یان قسەکەر ناچار بە بەکارهێنانی شێوەیەکی دەربڕین (بەیانی) یاخود شێوازێکی (اسلوب) نووسین دەکات، لەبەرئەوەی کە لایەنێکی گوتار پابەندی "دەسەڵاتی زمان"ە. جۆرێکە لە پراکتیزەکردنی فەرهەنگیی کە زۆر زەبراوی خۆی دەنوێنێ فۆکۆ، لەبەرئەمە، هەر شێوە دەربڕینێکی چەمکەکانی ژیانی فەرهەنگی ناونا "گوتار" و هەر بەم هۆیەشەوە لایەنی "دەسەڵاتمەندیانە"ی گوتاری بەرجەستەکرد. لەلایەکی دیکەوە هەر گوتارێ دەربڕینی شێوەیەك لە چێژە کە لە خواست و ئارەزووەوە هاتبێ. گۆشەیەکە کە وەکو لایەنی دەسەڵاتمەندی گوتار، شاراوەیە[9]. بۆیە فۆکۆ لەم ڕووەوە گەڕایەوە بۆ جینالۆژیای وشەی ***Discdurs*** (گوتار): ***dis*** لە ڕەگەزی هیندۆئەوروپاییە و مانای (نەرێتی) پێکدەهێنێ، ***kcrs*** بە واتای ڕەوت و ڕێگا. فۆکۆ دەڵێ دەتوانرێ لە هەموو گوتارێکدا تێکەڵێك لە ڕەوت و بێڕەوت، ئەرێتی و نەرێتی بدۆزرێتەوە. هەر دەقاودەق بەم مانایەیە کە فۆکۆ لە کتێبی تەبارناسی زانستدا (حفريات المعرفە) کارەکەی خۆی ناونا "گوتارێ لە بارەی گوتارەوە". گوتاری ئەدەبی دۆزینەوەی ئەو دیالێکتیکی قبوڵ و ڕەفزەیە. شێواز و جۆری دەربڕینی هەر نووسەرێ ڕەنگدانەوەی شوێنی ئەوە لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەی گوتاردا.

دەلالەتی مانایی هەر گوزارەیەك لە نووسراوی هەر کەسێدا، شوێنی ناهاوسەنگی نووسین لە گوتاردا پیشان دەدات، ئەو نووسەرەی ئاگاداری ئەم بارە بێت، دیارە ئاگاداری ئەو خاڵەیە کە سنووری دەلالەتی مانایش لەلایەن دیالێکتیکی دەسەڵات/ چێژەوە دەستنیشان دەکرێ.

فۆکۆ دەپرسێ: "چۆن خۆمان لە ئاسۆیەکی مێژوویی دیکەدا ببینینەوە؟"، "چۆن زانستی هاوچەرخ بخەینە لاوە و زانستی ڕۆژانی ڕابردوو بکەینە پارسەنگی ناسینەوەی ڕووداوەکانی؟"، "ئایا لە بنەماوە ئەم کارە کارێکی کردەیە؟" و ئەگەر نا بۆچی؟، ئەم پرسیارەی دوایی فۆکۆی لە بەڵگەنامە و نووسراوە کۆنەکاندا نقووم کرد، و لەم نێوەندەشدا دەقە ئەدەبیەکان گرنگییان بە خۆیانەوە بینی. فۆکۆ بەو جۆرە ڕووبەڕووی گوتاری ئەدەبی بۆوە کە ئێمە ڕووبەڕووی گوتاری حقوقی دەبینەوە. بە تێکەڵییەك لە دودڵی و حەز، ترس و چێژەوە. هەریەکێ لە بەندەکانی یاسای سزا مافێکمان پێدەبەخشێ و لێ دەستێنێتەوە، بە وردبوونەوەمان لە یاساکانی سزادانی لەمەوپێش پرسیار دەکەین: چ مافێکیان لەمن زیاتر یا کەمتر هەبووە؟ ئەوان لە چی دەترسان و لە هەمان کاتیشا چێژیان لێوەردەگرت؟ مەبەستم ئیما بۆڤاری، ئانا کارنین ژولین سورل و هیت کلیفە.

لە بەرهەمەکانی فۆکۆدا هەردەم کەسایەتیە "خەیاڵی"یەکان دێن بەدەنگیەوە: برازاکەی ڕامۆ و ڕیمون روسیل، کەسی سێهەم مرۆڤێکی واقیعی بوو، بەڵام دوای دۆزینەوەی "یاری زمانی" بووە خەیاڵی و فۆکۆ کتێبێکی لە بارەوە نووسی ئەو کەسایەتییە سەرسوڕهێنەرەی کە دیدرۆش کتێبێکی لە بارەوە نووسی بوو. (وە هەر کاتێ شتێ لە بارەی کەسێکەوە دەنووسین، ئەو کەسە "خەیاڵی" دەکەین) واتە برازاکەی ڕامۆ، لە مێژووی شێتیدا شوێنێکی گرنگی هەیە: "ئاخر ئەو دواهەمین کەسە شێتێتی و ناعەقڵانیەتی لە خۆیدا ئاوێتە کردووە و جیاوازی ئەم دوانەش بە هۆی ئەوەوە دەناسرێتەوە"[10]. لە کاتێکدا برازاکەی ڕامۆ لە کتێبی (دیاردەگەرایی ڕۆح)ی هیگڵدا بەکەڵکی ناساندنی "لە خود نامۆ بوون" هاتبوو[11]. لە کتێبەکەی فۆکۆدا نیشانەی لەدایکبوونی "ناعەقڵانیەتی نوێ"یە. پاڵەوانێکی دیکەی ئەم "ناعەقڵانیەتی نوێ"یە بریتییە لە




(مانش)ی جەنگاوەر. فۆکۆ چەندین جار دۆنکیشۆتی بە "یەکەمین بەرهەمی مۆدێرن "ناوبردووە، چونکە "لێکچوون و ناتەبایی لە هەموو چرکەیەکی ئەم بەرهەمەدا ئامادەن." و بەیەکبوونی "شیعر و شێتێتی" پیشان دەدا[12] شێتێتی برازاکەی ڕامۆ، وەکو شێتێتی دۆنکیشۆت لایەنی دەروونی واقیعیەتمان پیشان دەدەن. ئەوان "گوتاری شێتێتی" یان دامەزراند و درەنگانێ ئەم گوتارە لە بەرهەمی (مارکی دوساد) هۆڵدرین، نرڤاڵ، نیتشە، تراکل و ئاتۆنین ئارتۆدا بەردەوامی وەرگرت کاتێ فۆکۆ باس لە "زانستی مرۆڤایەتی"، "تەبارناسی ڕەوشت" و "دێرینە ناسی زانست" دەکات، هاوکات لەگەڵ تێگەیشتن (مان) لە لایەنە مێژووییەکانی کار، زمان و غەریزە، شتێکی دیکەش ئاشکرا دەبێت: جۆرێ لە ئاشوب و بەرەڵایی[13]. فۆکۆ بە گاڵتەوە ناونیشانی وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی کتێبی (وشەکان و شتەکان)ی ناونا ئارامی (نظم) شتەکان[14]. لە ڕاستیدا بە سەودای هەمان ئارامییەوە بوو کە لە سەدەی هەڤدەهەمدا چەمکی مرۆڤیان دروستکرد. ڕێك بە هۆی دۆزینەوەی ئەو بێ ئارامییەشەوە بوو کە فۆکۆ خۆی بە "بونیادگەر" نەدەزانی، چونکە بڕوای بە هەبوونی دوا بونیاد نەبوو: بونیادگەریی بە بڕوابوون بە جیهانێکی داخراو دەزانی کە لەگەڵ شێوازی دێرینە ناسیێ خۆیدا هەڵیان نەدەکرد[15] هەمان بڕوابوون بە ناتەبایی و ئاشوب لە بەرهەمی کەسانێکدا کە پێشتر ناوم هێناوە، واتە لە دامەزرێنەرانی "گوتاری شێتی"شدا ئامادەیە. سادە، هۆڵدرین و ئەوانی دی بەدوور لە یەکتری شتێکیان دۆزیەوە کە نیتشە بە کامڵترین شێوە دەریبڕیوە، ئەم شتە سەرسوڕهێنەرترین واقیعیەتی سەدەی نۆدەیەمە: عەقڵ نا، بەڵکو جۆرێ "زانستی نەزانراو" (هەروەك "بێداری" خەواڵویەك) ئەو بەشەی دیکەی "من" ئازاد دەکات، فۆکۆ دەریخست کە ئەم شێتانە دەرکیان بە شتێ کردووە کە زانستە مرۆڤایەتییەکان تەنیا نیشانەیەکی هەمان شتیان بۆ قۆناغی دوا پلەکانی کامڵبوونی خۆیان، وەك ئامانجێ، لەبەرچاوگرتووە.. هەر لەبەر ئەمەشە کە فۆکۆ بەرهەمی ئەوانەی بە "بڕبڕەی مەعنەوی دەربڕینی ئاشووبی ئاگایی" ناساند و، لە وتارێکدا بە ناونیشانی "سەرەتایەك لەبارەی سەرپێچی"یەوە[16] کە لە بارەی جۆرج باتایەوەیە، نووسی کە زمانی ساد، فلوبیر و نیتشە، چیدی بەو مانا سادە باوە بریتیی نیە لە دەربڕینی ببڕێك و بە لە دەستدانی بونیادی مانا ناسی زمان، هەر گوزارەیەك دەبێتە ئاشکراکەری مەرگ و شێتی (لەیەك کاتدا). ئیدی ئەو یەقینە دیکارتیە لە کارکەوتووە و "مەتەڵ" و "نەسازەکانی زمان" جێگەیان گرتۆتەوە، زمانی ڕەوانبێژانە و زانستانەی سەدەی نۆزدەهەم، لە ژێر تیشکی ڕۆحی گوتاری گومانکارانەی ساد و هۆڵدرین، فلۆبیر و نیتشەدا کاڵ و سەرەنجام سپی بۆتەوە و بە دابڕبوونێکی تەواو لەو نەریت و زمانە گوتارێکی نوێ سەری هەڵداوە.

فۆکۆ لە کتێبی (وشەکان و شتەکاندا) مێژووی ڕووبەڕووبوونەوەی ئادەمیزادی لەگەڵ زماندا کرد بە سێ پلەی جیاوازەوە: لە پێش عەقڵانیەتدا وایان دەزانی وشەکان شتەکان خۆیانن، واتە بڕوایان بە جادووی وشەکان هەبوو، بە لایانەوە مەدلول نەك ئامادەیی شتێ لە زەیندا، بەڵکو خودی ئەو شتە بوو، تەنانەت هێماشیان بو "دۆخی تێڕامان" نەدەکرد. لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا ویستیان بەهۆی تەبایی شتەکانەوە لە تەبایی وشەکان تێبگەن، ئەم دووانەش ئیدی تاقە شتێ نەبوون، بەڵام لە جۆری دوا بونیاددا دەبوونە هاوبەشی یەکدی. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا "شتەکان ئیدی یەکسەرە کەوتونەتە دەرەوەی بازنەی ناساندن و ڕەوانبێژی و دەلالەتەوە"[16]. مرۆڤ بۆتە پاشبەندی

جۆرێ لە "یاری زمانی" کە سەر لە یاساکانی دەرناکات و لێرەش بەدواوە هیچ جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان شتەکان و وشەکاندا (لە نێوان پەیڤ و ماناشدا) ئاشکرا ناکرێت. بە گوتەی فۆکۆ چیدی ئەدەب و زمان بەهای ئەبستمۆلۆژییان نییە. بە زمانێکی ئاشناتر بە ئێمە، هەر جۆرە کارکردێکی پەیام لەگەڵ کارکردە چاوگەییەکەیدا لەناوچووە و تەنێ کارکردە ئەدەبییەکەی ماوەتەوە، بەم پێیە دەشێ بگوترێ سروشتی دەلالی زمان شوێنی خۆی بۆ "دەلالەتی ناوەکی" چۆڵکردووە. فۆکۆ لە وتارێکدا "زمان تا بێبڕانەوە"[18] قسەیەکی هۆمەری هێناوەتەوە کە گوتبووی: "خوداکان ئادەمیزاد دووچاری بەڵا دەکەن بۆ ئەوەی بتوانن لە بارەیەوە بدوێن". هەروەك ئەوەی زمان ئامانج بێت و سەختییەکان و مەرگیش، کەرەستە، هۆڵدرین بە یادی ئەو خەیاڵیانەی هێنایەوە کە دەیانویست یۆنانی دێرین زیندووبکەنەوە، خوداکانی یۆنان مردوون، کەواتە زمان بەکاری هیچ شتێ نایەت بێجگە لە "خودی خۆم" هەروەکو چۆن زمانی مارکی دوسادی بەندیی نێو باستیل بەکاری هیچ کەسێ نەدەهات جگە لە خۆی نەبێت[19].فۆکۆ لە گۆشەیەکی دیکەشەوە کێشەکە دەخاتە ڕوو، ئەو گۆشەیەی کە دەشێ ناوبنرێ "بێدەنگی"، نموونەی لە "پەراوخانەی بابل"ی بورخیس هێنایەوە کە تیایدا هەموو وشەکان، ڕستەکان، و تەنانەت پێکهاتەی "بێ مانای" دەنگەکان، واتە هەر گۆشەیەکی مومکین زمان یەکسەرە ناسراوە و ئیدی شتێ بۆ گوتن یان ئاشکرا کردن یاخود دەلالەت نەماوەتەوە[20]. بەر لە فۆکۆ، مۆریس بلانشۆ باسی "نەمانی ئەدەبیات"ی کردبوو نموونەی لە ڕۆژگارانی دێرین و ئەو سەر زەوییانە هێنایەوە کە شاعیر و نووسەریان نەبووە، وە پێشبینی ئەوەی کرد کە "بێدەنگی لێمانەوە نزیکە. فەرهەنگی نووسراوەیی و کتێب لەناودەچن، پاشانیش.."[21].

خاڵی بنەرەتیێ لەمەڕ زمانی شیعرییەوە ئەمەی: "چۆن زمان دەتوانێ گوتارێکی یەکسان و تاقانە بداتە شیعر و شێتێتی؟ کام کارکردە زمانەوانییە بە شێوەیەکی هاوکاتی، هەم وەك مانایەك دەناسرێ و هەم دەلالەتێکە قابیلی لێوردبوونەوەیە؟"[22] ئەم پرسیارە کە لە وتارێکدا سەبارەت بە هۆڵدرین خراوەتەڕوو، پانتاییەکی فراوانتری لە پانتایی شیعری هۆڵدرین هەیە، بەڵام فۆکۆ خۆی وەڵامێکی ئەم پرسیارەی لا نییە. لەو قسانەیدا لە "کۆلێژ دوفرانس" کە بە ناونیشانی سیستەمی گوتارەوە بڵاوکراوەتەوە[23] باس لە هەبوونی بونێکی مەرموزی نێو دەروونمان دەکات، گاهێ دێتە قسە و ملکەچی خۆیمان دەکات. ئەگەر ئاوابێت، پرسیارەکەی فۆکۆ لە مەڕ "ئەو کارکردە زمانەوانییە"ش چ وەڵامێکی نیە: بەڵام ڕێگەمان بۆ پاك دەکاتەوە تا وێنەیەکی تازەمان لەسەر شوێنی هونەرمەند و شاعیر بێتە دەست. ئەورووپای مەسیحی لە ڕێنیسانس بەملاوە بەهۆی پێناسەکردنی ژیانی هونەرمەندەوە دەهات پاڵەوانێکی لەو هونەرمەندە دروست دەکرد، ئەو ژیاننامانەی (ڤاساری) لەمەڕ هونەرمەندانی ڕێنیسانسەوە نووسیونی[24]، بەمجۆرە پێشکەشیان دەکات: هەر لە منداڵییەوە نبوغیان تێدابووە، ئەوەش نەك لە شێوەی ئاشکرابوونێکی دەروونناسانەدا، بەڵکو وەك گەوهەرێ کە لە پێشەوە تیایاندا بە ئەمانەت دانراوە. وێنای ڕێنیسانس لە هونەرمەند/ پاڵەوان ڕەگێکی یۆنانی کۆنی هەیە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەم وێنایە گۆڕا، یەکەمجار ڕۆمانتیکەکان شێتیان لە جیاتی نبوغ بەرجەستە کرد. ئەم بیرەش سنوورێکی باریك لە نێوان نبوغ و شێتیدا قایل بوو پاشان سەمبولیستەکان شیعر و شێتییان وەك یەك تەماشا کرد. بەڵام ئەمڕۆ ئەم خاڵە هەر لە بنەماوە گۆڕاوە و ئیدی نەبوونی دەلالەت و نەدۆزینەوەی چاووگ بە

خەسڵەتێکی "سروشتی" کاری هونەری دادەنرێت، فۆکۆ لە وشەکان و شتەکاندا دەنووسێ: وشەی ئەدەب وشەیەکی تازەیە، هەروەك چۆن لە رۆشنبیریی ئێمەدا گۆشەگیری زمانێکی تایبەت کە بوونێکی "ئەدەبی" هەبێ، شتێکی تازەیە، ئا لێرەوە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە زمان، کە لەوەوەو پێش ڕێگەی دەدا بیر بەهرەی لێوەربگرێ، توبخاڵی خۆی لە جێگەیەکی دیدا پتەوکرد، بە شێوەیەکی سەربەخۆ، هەروەکو پەنابردنەوەیەك بە کردەی ڕەسەنی نووسین.. لێرەدا ئەدەب بە جۆرێکی روو لە زیادی لە قەڵەمڕەوی گوتاری یۆتۆپی جیابۆوە و خۆی لە ئیلتیزامێکی یەکپارچەدا شاردەوە، لە هەر شێوە بەهایەك کە لە دوو سەدەی پێشودا، بواری بە گشتیبوونی (ئەدەبی) ئاسان دەکرد (سەلیقە، چێژ، باری سروشتی، راستی)، دابڕاو لە دەروونی خۆیدا هەموو ئەو شتانەی ئەفراند کە ڕێگری سەراپا بوون بۆی (شتی سەربەگۆبەند، دزێو و نامومکین)[25]

واتە ئەدەب بە جۆرێك وەرچەرخا و کاریگەریی لە سنووری شۆڕشی ژمارەیەك نووسەر و شاعیر تێپەڕی، چونکە چەمکی "ئاشکراکردنی زمان"ی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

خاڵێکی گرنگ کە لە بواری ئەم "دووبارە ئاشکراکردنی زمان"ەدا دێتە پێشەوە، بریتیە لە پەیوەندیە دەروونییەکانی دەقی ئەدەبی بە دەقەکانی ترەوە. فۆکۆ لە بارەی "پەیوەندی نێوان دەقەکان" (نقاص) کەمتری نووسیوە. هەڵبەتە لە بەرهەمەکانیدا وەرووخستنێکی تیۆری "پەیوەندیە دەروونییەکانی گوتار" بەدی دەکرێ کە دەشێت بۆ شیکردنەوەی مەبەستەکەمان بەکار بێت، بەڵام ئەگەر بمانەوێ بەشێوەیەکی تایبەتیتر و ئاشکراتر سەبارەت بە "پەیوەندی نێوان دەقەکان" لە بیری فۆکۆدا، ئاگاداربیبینەوە، ئەوە تەنیا وتارێکی بەکەڵکمان دێت، ئەو وتارەی بە نێونیشانی "کتێبخانەی خەیاڵی" ساڵی 1967 لە بارەی داستانی وەسوەسەی قەدیس ئەنتوانی فلۆبێرەوە نووسیویەتی[26] فۆکۆ سەرەتا ڕوونکردنەوەیەکی وردی لە بارەی ڕووداوی سێ جار نووسینی ئەو داستانە لە ساڵانی 1849، 1856 و 1872دا خستەڕوو و هەوڵیدا ئەوە ئاشکرا بکات کە بۆچی نووسینی ئەم دەقە بەلای فلۆبێرەوە ئاسان نەبووە. پاشان لێکدانەوەیەکی لەسەر ڕەگ و ڕیشە و سەرچاوەکانی ئەو داستانە خستەڕوو، نووسی دۆزینەوەی تەباری دۆنکیشۆت لە ئەفسانەکانی قارەماناندا یاخود تەباری (روستین)ی مارکی دوساد لە رۆمانە "یاساغەکانی" سەردەمی هەژدەهەمدا کارێکی سادەیە، بەڵام وەسوەسەی قەدیس ئەنتوان دەچێتە خانەی کام جۆری ئەدەبی (ژانر)ەوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە فۆکۆ کتێبخانەیەکی خەیاڵی دروستکرد: مالارمێ، جۆیس، روسیل، کافکا، پاوەند و بورخیس لە نووسەرانی ئەم کتێبخانەیەن داستانەکەی فلۆبێر شوێنی لە جۆرێکی ئەدەبیدا نییە بەڵکو سەر بە کتێبخانەیەکە، هەرچەندە "تەنیا لەگەڵ کتێبی پیرۆزدا بەراورد دەکرێ"[27]، وتارەکەی فۆکۆش وەکو داستانەکەی فلوبێر، مەسەلەی پەیوەندی دەقەکان بە گرنگ دەبینێ، بەڵام هیچ وەڵامێکی بۆ نادۆزرێتەوە ئەو دەقەی کە هەروەك کۆمەڵێ پارچەی بچووکی نائاشنان، (ئەو پارچانەی بەبێ هیچ پەیوەندییەکی لۆژیکی پێکەوە نووساون) هەمان پەیوەندی لەگەڵ دەقەکانی دیکەدا دروست دەکات کە کتێبێ لە کتێبخانەیەکدا لەگەڵ کتێبەکانی دی دروستی دەکات. فۆکۆ دەنووسێ وەسوەسەی قەدیس ئەنتوان تەنیا کتێبێ نییە کە فلوبێر ماوەیەکی زۆر نیازی نووسینی لە سەردابوو، بەڵکو خەونی کتێبەکانی ترە، ئەو خەونەی کتێبەکانی دی دەیبینن. تەنانەت بە شێوەیەکی کاملتر، دەتوانرێ

بگوترێ "بەرهەمەکانی فلوبیر خەونی کتێبەکانی ترن"[28].

گرنگترین کاری فۆکۆ لە بواری "تیوری ئەدەبدا" کتێبێکە لە بارەی ریمۆن رۆسیل (1933–1807) وە نووسیویە[29]. شێوازی نووسینی رۆسیل سەرسورهێنەر بوو. ئەو دەهات دوو ڕستەی لە جێگەی یەکتری بەکاردەهێنا کە لە ڕووی دەنگەوە یەکسان بوون و لە ڕووی ماناناسییەوە جیاوازبوون، ئەم شێوازە لەلایەکەوە پشت ئەستوور بوو بە مانا جیاوازەکانی وشەیەك، و لە لایەکی تریشەوە بە ئیمکانی لەت لەتکردنی وشە دەبێ بە چەند بەشێکەوە کە هەر کام لەو بەشانە مانایەکی جیاواز دەدەن بە دەستەوە لە هەنگاوی دواتردا ئەم بەشانە لەگەڵ تووخمی وشەیەکی تردا دەبونە پێکهاتەی ڕستەیەك. هەموو ئەمەش دەبێتە هۆی تێکشکاندن و وێرانکردنی مانا. خودی رۆسێل ئەم شێوازەی بە "مەجاز" ناودەبرد و دەینووسی کە شێوەی داڕشتنەکەی دەقاودەق "شاعیرانەیە". چیرۆکەکانی ڕەگەزی ریوایەتیان تێدانەبوو، یاخود بە دەربڕینێکی چاکتر، بەشێوەیەکی ناباو ریوایی بوون، لێرەوە سەرەتا سوریالیستەکان، پاشانیش نووسەرانی "ڕۆمانی نوێ" (بەتایبەتیش میشیل بوتور) ستایشیان دەکرد فۆکۆ لە کتێبەکەی خۆیدا زیاتر جەغدی کردە سەر "یاری کردن بە زمان" و "لایەنی نەخوێنراوە"ی کارەکانی ڕۆسیل بۆ نموونە ڕۆسیل لە ڕۆمانی لوکوس سولوس (1914)دا باسی مەکینەیەك دەکا "بەو مەبەستە درروستکراوە تا جیهانێك بخولقێنێ، یەکسەر لە دایکبووی خودیی مەکینەیی زمانە" و کۆڵەکەی ئەم داستانەش "یاریە بە زمان". لە یەکەمین پەرەگرافدا، لەبەر هەمەمانایی ڕستەکان، داستانێ دەخولقێنرێ کە لە ڕواڵەتدا لەدایکبووی مەکینەیەکە: شازادەیەك گیرۆدەی کیژێ دەبێ کە بەددان گرتویەتی فۆکۆ ڕوونیکردەوە، لەلایەکەوە، دەقەکە لە درێژی رستە بێ ماناکانیدا "شێوەیەکی پێچەوانە و جودانەکراوە"ی دروستکردووە و، لەولای تریشەوە ئیمکانی بەدەستهێنانی ژمارەیەکی بێ سنوور پێکهاتەی جیاوازی خستۆتەڕوو. ئەو پێکهاتانەی کە لە ئەنجامی "خستنە پاڵیەکی دەنگەکانەوە، نەك پەیوەندی ماناییانەوە" دێنە دەست و لە ئەنجامیدا ئیمکانی سەر سورهێنەری زمان هەستی پێدەکرێ[30]. فۆکۆ پیشانیدا بەهۆی "شێواز"ی ڕۆسێلەوە، وەلاٚمدانەوەی خەیاڵپەروەرانەی زمان (چونکە زمان سەربەستانە "وەك سیستەمێکی جیاکارەیی یاری دەکات") ئیمکانی سەرهەڵدانی چەندین مانای بێ شومار دەهێنێتە ئاراوە و ماناکان دەگۆڕێ بە نیشانەکانی: "ئەو داهێنانە زمانەی تەنیا خۆی دێتە گۆ، ئیمکان و مەودایەکی بەرفراوان دەخاتە بەردەم زمانی ئەدەبی کە ڕەنگە بشێت پێی بگوترێ (مەودایەکی) زمانەوانی، بەو مەرجەی وێنەیەکی پێچەوانەی (بەکارهێنانێکی خەیاڵ، سەرمەستانە و ئەفسانەیی فەزای زمانەوانی) نەبێت[31].

فۆکۆ باسی ڕابردووی بەکارهێنانی مەجازی کرد لە سەدەی هەژدەهەمدا (بەتایبەتی لەبەرهەمەکانی ڕێزمان نووسێکی کەم تا زۆر نەناسراودا بە ناوی دومارشە) و گرنگی کاری رۆسێلی لە "شێوازی پێچەوانەیی" ئەودا بینی: "گێڕانەوەی وشەکان بۆ ئەو شوێنەی جووڵەی خۆیان لێوە دەستپێکردبوو ئەمەیە مانای شێوازی رۆسێل". و دیسانەوە "(ئامانجی رۆسێل) دووبارە سازاندنەوەی جیهانی دەرەوە بوو لە ڕێگای بەکارهێنانی کەفوکوڵی زمانەوە، شاردنەوەی بۆشایی (فەزای) پێشبینی نەکراوو، ئاشکراکردنی هەموو ئەو شتانەی تا ئێستا نەوتراون"[32].

فۆکۆ جەغدی لەسەر ئەوە کرد کە رۆسێل بە دووی دۆزینەوەی جیهانێکی نوێدا عەودالْ نەبوو، (ئەو جیهانەی دی کە لە ئەفسانە زانستییەکاندا

سەرهەڵدەدەن). دەیویست جیهانی نوێی زمان بدۆزێتەوە: ئەو فەزایەی لە "وشە هێشتا نەوتراوەکان" دروست دەبێت. بەمجۆرە فۆکۆ مانایەکی تازەی بۆ "ئەدەبی سەرسوڕهێنەر" هاتە دەست لە وتاری "کتێبخانەی خەیاڵی"دا نووسی: "نابێ خەیاڵ لە دژی واقیع بێ تا لە واقیع تێپەڕێنێ، هێندە بەسە تێکەڵ بە نیشانەکان ببێت، لە کتێبێکەوە بۆ یەکێکی تر"[33] واتە بچێتە نێوان دوو دەقەوە، لە مەودای دەق و تێڕاماندا، هەر بۆیەشە لە کتێبخانەکەی فۆکۆدا، مەودای کتێبەکان گرنگە نەك خودی کتێبەکان، ئەم کتێبخانەیە تەنیا هەر فەزای ئەدەبیی پیشان نادات، بەڵکو فەزایەکیشە خەیاڵی[34]. رۆسیل، کە وەك خۆی دەیگوت "هەموو دنیای دیتبوو" هەر لە چین و هیندستانەوە تا دوورگەکانی باشوور، لە ئوسترالیاوە تا ئەفریقا و "بست بە بستی ئەوروپا"، نووسیبوی "ئەوی ڕاستی بێت ئەو هەموو گەڕۆکیەی من تۆزقاڵێ یارمەتی نەدام بۆ نووسینی کتێبەکانم.. بەلای منەوە خەیاڵپەروەری هەموو شتێکە"[35]. فۆکۆ لە کتێبی (ڕۆمەن ڕۆسێل)دا زیاتر گرنگی بە "یاری بە زمان"ی ڕۆسیلدا بەڵام کاری رۆسێل لەمەڕ زمانەوە جودانیە لە شوێنگەی بیری فەلسەفی لە بیری ئەودا. رۆسێل بڕوای بەوە نەبوو کە "من" خودێکە "گرنگی" بەوی دیکە دەدات. بە پێچەوانەوە "من" تەنیا دەتوانێ بابەتێك (ئۆبژە) بێت بەخۆی، بێ توانایی و تێکشکانی "من" لە دەربڕینیشدا هەر لێرەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ. ئا لێرەوە رۆسێل نەهات مانا لێکبداتەوە (تاویل)، بەڵکو نیشانەکانی لێکدایەوە "چۆن دەنووسم؟" بە پێی شیکردنەوەی فۆکۆ بووە پرسیارێ لەجۆری "چۆن دەنووسن؟" ئەمەش یەکێك لە بابەتە بنەڕەتییەکانی کتێبی (وشەکان و شتەکان)ە حوکمێ بۆ سەلماندنی "مردنی بابەتی فەلسەفی".

بە گومانی فۆکۆ، ئەگەر ئەمڕۆ نووسین لە سەردەمی رۆشنگەری جودا بوبێتەوە، کە هەروایشە ئەوا پێویستە رێك و ڕاست وەك گەڕانەوەیەك بۆ خود تەماشای بکرێ، کەواتە مەبەستی نووسەر وەلاوەخرێ، و دەق خۆی دەبێتە بنەمای کارەکە. فۆکۆ لە وتاری "نووسەر چییە؟"[36] (نەك کێیە؟) دا لە زمانی سامویل بیکیتەوە دەنووسێ: یەکێ قسان دەکا، چ گرنگی لەوەدایە کێ قسان دەکا"[37] پاڵەوانە هەرزەکارەکانی تراژیدیای یۆنانی باوەشیان بۆ مەرگ دەکردەوە، چونکە بڕوایان بە نەمری هەبوو لە (هەزار و یەك شەو)دا شەهرزادی حیکایەتخوان چۆك بە مەرگ دادەدات. بەڵام نووسەری نوێ نەبڕوای بە نەمری هەیە و نە بە بەردەوامبوونیش لە گێڕانەوەی داستاندا بۆی دەلوێ لە مەرگ ڕاکا: "ئێستا نووسین لە قۆناغی کوشتندایە، لە پێش هەموو شتێکدا کوشتنی نووسەر. فلۆبێر، پروست و کافکا لە نیشانە دەرکەوتووەکانی ئەم گۆڕانەن (لە نووسین)دا" و "چیدی ئەرکی ڕەخنە دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان نووسەر و بەرهەمدا نییە، شیکردنەوەی بیروڕا و ئەزموونەکانی نووسینیش نیە کە لە بەرهەمەکەدا ڕەنگیان داوەتەوە. دەبێ ئێستا رەخنە تەنیا خۆی بە بونیادی بەرهەمی هونەرییەوە خەریك بکات، واتە بە شێوە میعمارییەکەیەوە کە بە هۆی ناسینی پەیوەندی پارچەکانیەوە دەناسرێتەوە[38].

لەمەوپێش، لە کاتی باسکردنی فۆرمالیستەکانی رووسدا بینیمان بەلای ئەوانەوە بۆ شیکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی ناشێت هەلومەرجی مێژوویی، کۆمەڵایەتی و دەروونی لە دایکبوونی بەرهەمی هونەری سەرەتاکەیەکی مەعریفی بێت و لە لێکدانەوە و توێژینەوەی ئەم بەرهەمانەدا دەبێ پێش هەموو شتێ لە پەیوەندییە دەروونییەکانی توخمی پێکهاتەی شێوەکانیان سەرنج بدرێ. ئەم حوکمە لە قوتابخانەی ناسراو بە "ڕەخنەی

نوێ"شدا پەسەندکراوە کە چەندین دەیە قوتابخانەیەکی بالادەستی ڕەخنەی ئەدەبی ولاتانی ئەنگلۆسەکسیۆن بوو بەرلەمانیش ت.س. ئەلیۆن ساڵی 1920 لە وتارێکدا "سونەت و حەزی تایبەت" نووسیبوی: "ئەو کاریگەری و ئەزموونانەی لەبەرچاوی مرۆڤدا بە گرنگی خۆیان دەنوێنن، ڕۆڵێکیان لە شیعرەکانیدا نییە، و ئەوانەشیان کە لە شیعرەکانیدا گرنگییەکیان هەبێ، لەوانەیە بەلای خۆیەوە گرنگ نەبن"(39). لەبەرهەمەکانی فۆکۆدا بەڵگەی ڕەسەنی تیۆری بۆ سەلماندنی ئەم حوکمە ئامادەیە. ئەو لە کۆتایی وشەکان و شتەکاندا نووسی: "مرۆڤ داهێنراوێکە و دێرینە ناسی زانست ئەوە پیشان دەدات کە داهێنراوێکی تازەیە و بە زوویش لەناودەچێ"(40). چەمکی نووسەریش (وەك خودی فەلسەفی) کە لە سەدەکانی دواییدا لە خۆرئاوادا گرنگی پێدەدرێ. لە ناودەچێ، فۆکۆ باسی زمانی بیرکەرەوە دەکات و لوی شتراوسیش باسی ئەو خاڵە دەکا کە گرنگ نیە تاکەکان چۆن بیر لە میتۆلۆژییەکان دەکەنەوە: خاڵی گرنگ ئەوەیە چۆن میتۆلۆژییەکان لە تاکەکاندا بیردەکەنەوە، بەبێ ئەوەی تاکەکان لەم سەودایە بە ئاگابن"(41). مەبەستی نووسەر گرنگ نییە، ئەم مەبەستە هەر وەك زۆربەی ڕوداوە عەینییەکانی ژیان، یاخود وەك ئەو تیۆرە جوان ناسیانەی کە بەلای نووسەرەوە، بونیادی کارەکانیان پێکهێناوە، بێ نرخن. خاڵی بەهادار بەرهەمەکە خۆیەتی و ئەو پەیوەندییە دەرونیانەی لە نێوان تووخمی پێکهاتەکانیدان کە نووسەر ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە پێکهاتنیاندا نەبینیوە.

ڕۆلان بارت لە وتارە بەناوبانگەکەیدا "مەرگی نووسەر" جەغدی کردووە کە جیهان کلیلێ نییە بۆ ناسینەوەی ڕۆمانی گەڕان بە شوێن زەمانەی لە دەستچووی مارسیل بروستدا، بەڵکو ڕۆمانەکە کلیلێکە بۆ ناسینی جیهان لە جیاتی ئەوەی بارۆن مۆنتسیکۆ بە نموونەی شارلۆسی نێو ڕۆمانەکە بزانین، دەبێ شارلۆس وەك نموونەی بارۆن بناسین. مالارمێ ڕاستی دەگوت "زمان قسان دەکا نەك نووسەر.. نووسین گەیشتە بە پنتێ کە زمان بێتە گۆ نەك من"(42). لە دوای مالارمێ، پۆل ڤالێری جەغدی کردە سەر لایەنی زمانەوانیانەی کاری نووسەر. پروستیش بە چاوپۆشین لە هەموو ئەو شیکردنەوە دەروونیانەی بۆ کارەکەی دەکرێت. نە ڕاوی بەو کەسە دەزانێ کە دەیبینێ و هەست دەکا و، تەنانەت نە ئەو کەسەش کە دەنوسێ، بەڵکو بەو کەسەی دەزانێ کە دەیەوێ بنووسێ. پیاوێکە بە ڕاستی نازانین کێیە و تەمەنی چەندە، تەنیا دەیەوێ بنووسێ و ناتوانێ داستانێ ریوایەت بکا، ڕۆمان لەو شوێنەدا تەواو دەبێ کە ئەم پیاوە توانای نووسین بەدەستدەهێنێ. بۆ نووسینی تازە، بروست مەلحەمەیەکی خوڵقاند" واتە "لە جیاتی ئەوەی کارە باوەکە دووبارە بکاتەوە ژیانی خۆی لە ڕۆمانەکەیدا بنووسێتەوە، لە ژیانی خۆی بەرهەمێکی دروستکرد کە نموونە سەرەکییەکەی ئەو (ژیانە)، ڕۆمانەکەیەتی "بارت جەختی لەوە کرد کە ئەگەر بێتو بۆ دۆزینەوەی "پێشینەی مێژووی تازەگەری – مۆدێرینزم" بەرەو پێش بڕۆین، سوریالیستەکانیش دەبینین کە بە هۆی شێوازی "نووسینی میکانیکی"یەوە، ئەگەر نووسەریشیان ڕەت نەکردبێتەوە ئەوا تا ئاستی زمانێ کە وریێنان دەکا، دایان بەزاندووە. ئەوان نووسەریان لەگەڵ "دەستێ کە ئەو شتانە دەنووسێ هۆش لێیان بێ خەبەرە" بەراورد دەکرد و سەرئەنجام دوای قبووڵ کردنی ئەو حوکمەی کە، دەبێ ئەزموونی چەند کەسانی لەیەك کاتدا و بەیارمەتی هەموویان بنووسرێت، هەستان بە کوشتنی نووسەر، نووسەر بەر لە بەرهەم بیردەکاتەوە، ڕەنجی بۆ دەکێشێ، لە پێناویدا دەژی، بەڵام بەرهەم لە دوای نووسەر خوڵق دەبێ و تیۆری نوێی ئەدەبیش ڕاستەوڕاست

لەبەرهەمەوە دەست پێدەكات. هیچ بەرهەمێكی هونەری تاك مانا نییە كە بە هۆیەوە پەیامی (نووسەر – یەزدان) بگاتە خوێنەر، بەڵكو (بەرهەمی هونەریی واقیعیەتێكی فرەمەودایە و خاوەنی چەندین مانا كە هیچ كامێ لەم مانایانە لە حوكمی دوامانای رەسەندا نین. كۆمەڵێ لە "نووسراوەكان" بەرهەمێ دروست دەكەن و دەشێ "نووسراوی رەسەن" لەو نێوانەدا بدۆزێتەوە یاخود بناسرێتەوە. گریمانی ئەوەی لە رێگەی نووسەرەوە دەق بناسینەوە، بە واتای سنووردانانە بۆ دەق. كارێكی ئاواش، دیارە باسەكە سانادەكا، هێندە بەسە نووسەر بناسین و لەبارەیەوە زانیاری كۆبكەینەوە ئەو كارە وێنەیەكی (زۆربەی جار تەماوی) لەسەر نووسەر دەدات بە دەستەوە، بەلاٚم هیچ پەیوەندییەكی بە بەرهەمەكەوە نییە. بارت دەڵێ: "لەدایكبوونی خوێنەر بایی مردنی نووسەرە"[43].

ژان پۆل سارتەر سەبارەت بە شیعر، سەربەخۆیی زمان لە مانای پەسەندكرد و لە كتێبی ئەدەبیات چییە؟دا شاعیری وەك كەسێ ناساند كە لە زمان "سوود وەردەگرێ" و "وشە بەخودی شتەكان خۆیان دەزانی، نەك نیشانەكانیان"[44]. تۆدۆرۆڤ دەنووسێ ئە جیاوازییەی مانا و دەلالەت كە سارتەر سەبارەت بە زمانی شیعر خستوێتیەڕوو، دەچێتەوە سەر ئەو جیاوازییەی رۆمانتیكەكانی ئەڵمان: موریتس، نۆڤالیس و ئاگۆست ڤیلهیلم شلیگل لە نێوان پەیكەر و نیشانەدا دەیانكرد[45] هەرچۆنێ بێ سارتەر هیچ ناكۆكییەكی لەگەڵ تیۆری شیعریی بونیادگەرەكاندا نەبوو، بەلاٚم ئەو حوكمانەی سەبارەت بە شیعر بە راستی دەزانین، سەبارەت بە پەخشان بەلایەوە پەسەند نەبوون ئەو نوسەر (پەخشان نووس)ی بە پرسیاری هەڵبژاردنی وشەكان وەك نیشانە و بەرپرسی دروستكردنی مانا دەزانی، هەمان خاڵیش بنەمای "تیۆری ئەدەبیاتی بەرپرس (ملتزم) ئەوی پێكدەهێنا: "نووسەری بەرپرس دەزانێ وشە، كردارەو ئاشكراكردنیش بریتییە لە گۆڕان"[46].

بەلای سارتەرەوە هونەر و ئەدەبی بەرپرس بەمانای هونەر و ئەدەبێكە ئاگاداری ناسنامەی خۆی بێت و بە پێچەوانەوەی ڕای باویشەوە مەرج نیە مانای ئیلتیزام و بەرپرس بۆ ئامانجێكی سیاسی (یاخود بەرنامەی سیاسی پارتێكی تایبەت) بێت[47]. لە رەخنە ئەدەبییەكانی سارتەر خۆیشیدا، نووسەر چەندین جار گرنگتر لە بەرهەمەكەی تەماشای كراوە. با لە چوار بەرهەمی وی كە سەبارەت بە چوار ئەدیب نووسیونی، وردبینەوە: بۆدلێر (1947)، جێنیەی قەدیس، ئەكتەر یان شەهید (1956)، وشەكان (لە ساڵی 1954دا تەواوبووە، ساڵی 1963 بلاٚوكراوەتەوە) و ساویلكەی خێزان (لە سێ بەرگدا 1971–1972) بابەتی ئەم چوار كتێبە چوار كەسایەتی ئەدەبین نەك بەرهەمەكانیان، ئەوانیش بریتین لە: شارڵ بودلێر، جان جینیە، سارتەر خۆی و كوستاو فلوبیر.

دوا رستەی كتێبەكەی سارتەر لە بارەی بۆدلێرەوە ئەوە دەردەخات تاكە كەسێ، واتە شارڵ بودلێر بەلای نووسەرەوە ڕێ پاككەرەوە و هۆكاری ناسینی مرۆڤایەتییەكی گشتی "بارودۆخە ئەبستراكتەكانی ئەزموون.. ئەو راستیەیان بۆ (بۆدلێر) پیشاندا كە هەڵبژاردنی ئازادانەی مرۆڤ بۆ پێكەوەنانی خودێتی، بەشێوەیەكی رەها هەر ئەوەیە كە ئێمە ناومان ناوە چارەنووس"[48]. باسی كتێبی جێنیەی قەدیس بریتییە لە: "كۆمەڵێ زانیاری ئێمە سەبارەت بە سەرجەمی وجودیەتی كەسایەتییەك"[49]. لەگەڵ بۆدلێردا مرۆڤی گشتی دەناسین و لەگەڵ جینیەشدا مرۆڤی تایبەت. ئەدەبیش واتە بەرهەمەكانیان. بۆ ناسینی مرۆڤ بەكاردێن، سارتەر كتێبی جینیەی قەدیسی (بە پێی حوكمی خۆی) بۆ "وەدیارخستنی سنوورەكانی

شیکردنەوەی دەروونی و مارکسیانە" نووسی تا "هەڵبژاردنی نووسەری لە بونیادی خودێتی" ئەودا، لە لامان ئاشکرا بێت: و "بتوانین تا سنوری بۆ لوان مێژووی (جۆری لە) ئازادی لە جوزئیاتەکانیدا شیبکەینەوە"[50]. لە راستیدا، لە نێو ئەم بەرهەمانەدا هەمان پرسیار بنەرەتیەکەی فەلسەفەی سارتەر، سەرهەڵدەداتەوە: پەیوەندی نێوان ئازادی و جەبر چییە؟ و ئەم خاڵەش لە کتێبی (وشەکان)دا بەشێوەیەکی پتەوتر دێتە بەرچاو. لەم کتێبەدا. بە سەرەتاکانی ژیانی سارتەر ئاشنا دەبین بۆ ئەوەی کلیلی بێت بۆ تێگەیشتن لە بیرە فەلسەفیەکەی. بەڵام پرسیارە سەرەکیەکە هەروا بێ وەڵام دەمێنێتەوە، بۆچی بۆ تێگەیشتن لە بەرهەمی نووسەرێ دەبێ ژیاننامەی ئەو نووسەرە بنووسین؟ ئەویش ئەگەر لێرەدا مەبەستمان ناسینی بەرهەمەکان بێت، چونکە بە ئاشکرا دیارە ئامانجی سارتەر لە وەرووخستنی ژیاننامەی نووسەرەکان، وەڵامدانەوەی پرسیارە فەلسەفیەکانە. هەرچۆنێ بێ چەقی گرنگپێدانی سارتەر ژیانی نووسەر بوو نەک بەرهەمەکانی. لە رستەکانی سەرەتای (ساویلکەی خێزاندا) ئەمە دەخوێنینەوە: "بابەتی ئەم کتێبە ئەمەیە: دەتوانین چ شتێ، ئەورۆکە، لە بارەی مرۆڤێکەوە بزانین؟ بە گومانی من بە هۆی شیکردنەوەیەکی تایبەتەوە دەتوانین وەڵامێ بۆ ئەم پرسیارە بدۆزینەوە: چ شتێ بۆ نموونە لە بارەی گۆستاو و فلۆبیرەوە دەزانین؟"[51] فلۆبیر وەک کەسێ کە بەڵگەنامەی زۆر لەسەر ژیانی هەیە، بۆ بەرەو پێشبردنی ئەو شیکردنەوەیە گرنگە، نەک وەک نووسەرێ. من گرنگی ئەم چوار کتێبە ڕەت ناکەمەوە و دەزانم کارە بەناوبانگەکانی سارتەر لە پێناوی وەڵام دۆزینەوە بۆ ئەو پرسیارە فەلسەفیە تا چ سنوورێ بەکەڵکن، بەڵام بۆ کەسێ سەودای ناسینی دەقی ئەدەبی لەسەردایە، پێشنیاری پەیڕەوکردن لە شێوازی سارتەر ناکەم و باوەڕم وانییە کە لێکۆڵینەوە لە ژیانی نووسەران، بناخە یاخود سەرەتایەکی ڕاست بێت.

هەزار ساڵ بەر لە ئێستا عین القظاتی همدانی نووسیویەتی:

جەوانمەرد! ئەم شیعرانەت پێ وەک ئاوێنە بن! تۆ دەزانی کە ئاوێنە لە خۆیدا سیمای نییە، بەڵام هەر کەسێ تێیڕوانێ سیمای خۆی تیا دەبینێ، هەروەها بزانە کە شیعریش لە خۆیدا هیچ مانایەکی نیە، بەڵام هەرکەسێ توانای هەبوو تیایدا گلەیی ڕۆژگاری تێدا دەخوێنێ، ئەوە کاری وی لە کەماڵدایە، جا ئەگەر دەڵێی مانای شیعر ئەوەیە کە هەستیارەکەی دەیەوێ، و خەڵکانی دی مانایەکی دیکەی بۆ دەدۆزنەوە، ئەمەش وەک ئەوە وایە کە کەسێ بڵێ:

سیمای ئاوێنە، سیمای ئارایشە کە یەکەمجار ئەویان وەدەرکەوت[52].

## پەراوێز ویاداشتەکان

*1-entretien avee “Le monde”, rhilosophiem parism 1984.*

یەکەم گفتوگۆ لەگەڵ "فەیلەسوفی پشت دەمامک"ە (ل 21–30) ئەوانی دیکەش لەگەڵ پۆل ریکۆر، هانس جۆرج گادامێر، یورگن هابرماز، ژان فرانسوا لیوتار، ئیمانویل لویناس، ڤلادیمیز یانکلەفیچ، جاک دریدا و ئەوانی تر دان.

*2-M. Foucault, L archcologi du savoir, paris, 1969.*

*3-M. Foucault, Les mots et les choses, paris, 1966.*

*4- M. Foucault, Historie de la folie a Lage classique, paris, 1961.*

*5- M. Foucault, Naissance de la clinique, paris, 1963.*

*6- M. Foucault, Surviller et punire, paris, 1975.*

*7- M. Foucault, histoire de la sexulite*

*-Vol 1. Ia volont de savori, paris, 1976.*

*-Vol 2. I usage des plaisirs, paris. 1984.*

*-Vol 3. Le souci de soi, paris, 1984.*

8-G. Deleuze, Foucault, paris, 1986

9–لە قسەکانی فۆکۆ لە کۆلێژ دو فرانس (2ی دیسەمبەری 1970) ووردبەرەوە کە بە ناونیشانی سیستەمی گوتار (وەبە گومانم باشترە بە حوکمی گوتار تەرجەمەی بکەین) بلاْوکراوەتەوە: *M. Foucault, Lorder du discourse, paris, 1971.*

*10- M. Foucault, L historie de la polie, paris, 1972, p. 417.*

"سەد داوەلی وەکو من! حەزرەتی فەیلەسوف، لەم جۆرە داوەلاْنە هێندە زۆریش پەیدا نابن، بەلْی، داوەلی ساختە زۆرن.. بەلاْم ئەز لە جۆری خۆم نمونەم نییە. ئەز بۆ ئەوان تیمارستانی جەنگ بووم."

*D, Diderot, Le neven de Ramean, Paris, 1967, p.122.*

هەروەها من بێهودە خۆم ماندوو دەکەم بۆ ئەوەی بە نیشتەجیْ بووەکانی نەخۆشخانە بگەمەوە. ئەم کارە هیچ سوودێکی نییە. (سەرچاوەی پێشتر ل96).

11–لە بەشی دووەمی رووبەری شەشەمدا "رۆح" وەك "رۆحی بەخود نامۆ، فەرهەنگ" هاتووە، کتێبەکەی هیگلْ – بڕوانە:

*G.W.F. Hegel. La Phenomenologic de lesprit. Trans. J. Hyppolite. Paris, 197, Vol. Pp. 80-81.*

*12-M. foucault. Les most et les choses. Pp. 62-63.*

سەبارەت بە باسی فۆکۆ لەمەڕ برازاکەی رامۆ و دۆن کیشوەت بڕوانە:

*J.M. Auzias. Michel foucault, paris. 1986. Pp. 95-102*

*13-M. foucault. Les most et les choses. Pp. 62-63.*

14–پێش کتێبەکەی فۆکۆ، لە زمانی ئینگلیزیدا، کتێبی بە ناونیشانی ووشەکان و شتەکان بلاْوببۆوە. ئەم کتێبە لە نووسینی ئیرنست گلنەر و ڕەخنە بوو لە گرنگیپێدانی فەیلەسووفە ئینگلیزەکان بە فەلسەفەی زمان، فۆکۆ لەبەر ئەم هۆیە وای بە باشتر زانی ناونیشانی وەرگێڕانی ئینگلیزی کتێبەکەی بگۆڕێ.

*15-A.K. Marictti, michel foucault, paris, 1985, p. 102.*

*16-Critique, 195-196, 1963.*

من سوودم لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکە وەرگرتووە لەم سەرچاوەیەوە:

*M. foucault, language, Counter memory, practice, Cornell u.p, 1986. Pp. 29-52.*

*17-Tel quel, 15, 1963.*

*18-M. foucault, language, Counter memory, practice, Cornell u.p, 1986. Pp. 53-69.*

*19-Ibid, p. 61.*

*20-Ibid, p. 66.*

*21-M. Blanchot, Le livre a venir, paris, pp. 265-267.*

22–ئەم پرسیارە پێشتر لە وتارێکدا بە ناوی "گەمەی باوك" بلاْوبۆتەوە: *Critique, 178, 1962*.

باسەکەی فۆکۆ لەمەڕ کتێبەکەی لاپلانشەوەیە کە لە بارەی هۆلْدرێنەوە نووسیویە:

*J. Laplanche, Holderlin la question du pere, paris, 1961.*

من سوودم لە چاپی سێهەمی کتێبەکەی لابلانش (1984) وەرگرتووە و، هەروەها لە وەرگێڕانی ئینگلیزی ووتارەکەی فۆکۆ لە:

*M. foucault, M. Language, Counter memory, practice, pp. 68-86.*

*23-M. Foucault, M. Lordre de discours, paris, 1971.*

*24-G. Vasari, Lives of Artists, trans G Bull. London. 1974.*

ڤاساری خۆی شێوەکار بوو (1517–1574)، سالْ 1568 (ژین نامەکان)ی بلاْوکردەوە کە گرنگترین دەقە لە بارەی ژیانی هونەرمەندانی ڕێنیسانسەوە.

*25-M.Foucault, Les mots les choses, p. 3b.*

26–ئەم وتارەی فۆکۆ یەکەمجار لەم بلاْوکراوەیەی خوارەوەدا بلاْوکرایەوە:

*Cahiers Renaud – Barrault, 59, Mars, 1967.*

هەمان وتار لەم کتێبەی فۆکۆدایە:

*M. Foucault, et la, iravail de Flaubert, paris, 1983, pp. 103-122.*

*27-Ibid, p.118.*

*28-J, Roudaur, “Biblioteque imaginair”, Magazin literaire, Mai 1984, pp. 46-48.*

*29-M. Foucault, Raymond Roussel, paris, 1968.*

**رۆسێل لەسەردەمی ژیانیدا پاك بە نەناسراوی مایەوە، کتێبەکەی فۆکۆ لە بارەی دووبارە خوێندنەوەی کارەکانییەوە کاریگەری خۆی هەبوو ئەو چەند کتێبەی رۆسێل لە دەورانی ژیانیدا بڵاوی کردنەوە، تۆزقاڵێ ناوبانگیان پێ نەبەخشی، ئەو کارەی بووە هۆی ناوبانگ دەرکردنی لە دوای مردنی بڵاوکرایەوە: چۆن هەندێ لە کتێبەکانم نووسین" (1935).**

*30-Ibid, p. 23.*

*31-Ibid, pp. 209-210.*

*32-Ibid, pp. 211-212.*

*33-M. Foucault et la, Travail de Flaubert, p. 166.*

*34-J. Roudaur, op. Cit. P. 47.*

*35-R. Roussel, comment j., ai cerit certains de mes livres, paris, 1963, p. 27.*

*36-M. foucault, Language, Counter memory, practice, pp. 113-138.*

*37-Ibid, p. 115.*

**بیروڕای فۆکۆ لە بارەی ڕەتکردنەوەی خودی فەلسەفی (یان بەجێهێنەر، یاخود بیرکەرەوەی فەلسەفی) کە لە هەمان کاتیشدا ڕەنگدانەوەی بنەمای بیری بونیادگەرایە، هێندە رادیکاڵانەیە بۆتە هۆی ئەوەی زۆربەی ڕەخنەگران هێرشی بکەنە سەر ئەم دوو کتێبەی خوارەوە، یەکەمیان ڕەخنەگرتنێکی هێمنانەیە لە تیۆرەکانی بونیادگەری و فۆکۆ، بەڵام دووەمیان بە زمانێکی توندی جەدەلی، لە هەموو کەس زیاتر هێرشی کردۆتە سەر فۆکۆ:**

*L. Ferry and A. Renaut, Le pensee 68, Paris 1988.*

*T. pavel les mirag linguistique, paris. 1988.*

*38- M. foucault, Language, Counter memory, practice, p. 117, p. 118.*

*39-T.S. Eliot, The Sacred Wood, London, 1960. P. 56.*

*40- M. foucault, Les most et les choses, p. 398.*

*41-C. Livi Strauss, Les cru et le euit, p. 20.*

*42-R. Barthes, Le bruissemen de la langue, paris, 1984, pp. 61-67.*

*43-Ibid, p. 67.*

*44-J. P. Sartre, Situations, paris, 1984. Vol. 2, pp. 63-64.*

*45-T. Todorov, Critiquede la eritique, paris, 1984, p. 56.*

*46-J.P. Sartre. Op. Cit. P. 73.*

*47-T. Todorov, op. Cit. P. 57.*

**ئەمە خاڵێکی گرنگە کە زیاتر لەبیر دەچێ تێگەیشتنێکی سادەی بێ بایەخ تێڕوانینی سارتەر لە بارەی بەرپرسیاری نووسەرەوە دادەبەزێنێتە سەر ئاستی قبوڵکردنی ئایدیۆلۆژییەکی تایبەت.**

*48-J.P. Sartre, Baudelaire, paris, 1979. P. 245.*

*49- J.P. Sartre, sanit Genet, Comedien et martyre, paris, 1952, p. 536.*

*50-Ibid, pp. 535-539.*

*51- J.P. Sartre, Lidiot de la famille, paris, 1971, vol. 1, p.7.*

52-**ابو المعالي عبدالله بن محمد ميانجي همداني، نامەهای عين القضات همداني، تصحيح م منزوي- ع عسيران، تهران،** 1362، **چ**1، **ص** 216، **نامەی** 35.

**تێبینی:**

**ئەم بابەتە لە فایلی "دابرانی ئەپستمۆلۆژی" بەسەرپەرشتی ڕێبوار سیوەیلی لە ژمارە دووی گۆڤاری (دەروازە)دا بڵاوبۆتەوە، لەبەر گرنگی بابەت و تیراژی کەمی گۆڤارەکە بە چاکمان زانی جارێکی تر لەم فایلەدا بڵاوی بکەینەوە، بەو مەبەستەی خوێنەران سوودی لێ ببینن.**

# له گریمانەی سەرکوتەوە بۆ دەسەڵاتی چاودێرکەر بەسەر ژیاندا

**هیوبرت دریفوس – بول رابینو**

**له فارسییەوە: رێبین هەردی**



فۆکـۆ لـە وانـە و چـاوپێکەوتن و کتێبـەکانی دەیـەکانی *1970*ی خۆیـدا جـارێکی دی دەسـتیکرد بەشـیکردنەوەی کـردارە کۆمەڵایەتیـەکان لـە "چاودێری و سزا *1975*" ومێژووی سێکسوالیتەدا *1977* بەشێکی سـەرەکی لـە تەفسیر و راڤـەی خـۆی بوو مۆدێرنبوون بەدەستەوە دەدا. لەم بەشەی ئەم کتێبـەدا کورتەیـەکی گشـتی لـەبارەی تیـورەی هەمەکی فۆکۆ بەپێی هێڵە سەرەکیەکانی بەڵگاندنە سـەرەکیەکانی خۆمـان لـەم کتێبـەدا دەهێنینـەوە. دەبـێ جـەخت لـەوە بکـەین کـە هـیچ کاتێـك فۆکـۆ تێڕوانینـەکانی خـۆی بەمشـێوەیە نەخسـتۆتە روو. بـیری ئـەو تـا هەنوکـەش لـە حاڵـەتی گـۆڕان و پیاچونەوەدایە.. هەندێك بواری ئاڵوز و گشتگۆیی لـە بەرهەمـەکانی فۆکـۆدا هەیـە کـە یـان دەبێـت بـە پەشـێوی و پەریشـانی فکـری دابنـێین و یـان بـە هاودەردیەکی زیاترەوە بە بوارگەلێك بزانین کە ئەو بۆ تاوتوێکردنی زیاتر لەبەرهەمەکانی دوایی خۆیدا یان کەسانی تردا، هێناویەتیە پێشێ.

نەگونجانی ئەو وردەکاریە مێژووییەکانی فۆکۆ جەختی لەسەر دەکات، لەگەڵ مێژوونوسی باودا،

هـەم كێشـەئامێز و هـەم وتوێـژئامێزە لەبەرئـەوەی ئێمـە لەهەلومەرجێكدا نـین كـە بتـوانین وردەكاریـە مێژوویـــەكانی تیـــورەی فۆكـــۆ هەڵســـەنگێنین، لەبەرئەوە تەنها هەوڵدەدەین بابەتە مێژوویـەكانی تا ئـەو شـوێنەی كـە پێویسـتە بـەروونی، دەربـبڕین. لەئـەنجامی (ئـەمكارەش)دا قەبارەیـەكی گـەوەرەی بابەتە ورد و بچوكەكانی كە فۆكۆ وەك ڕەگەزناسێك ـ جینلۆجیسـت . بەهۆیـەوە خەسـڵەتی تایبـەت، هەمـــــەرەنگی ناوچـــەیی و چـــنینی (كـــرداره كۆمەڵایەتیـەكان) ڕوندەكاتـەوە، فەرامۆشـدەكرێت. هـــەروەها لێـــرەدا شـــێوەی پـــڕ پێچـــوپەنای لێكۆڵینەوەكانی فۆكۆ لـە بواری مێـژوودا فـەرامۆش دەكرێـت، ئامـانجی ئێمـە چارەسـەری مەسـەلەكانی واقع نیە، بـەڵكو دەمانـەوێت شێوەی ڕوانینی فۆكو ڕونبكەینـەوە. ئەگـەر تێگەیشـتنێكی باشـتر بـۆ ئـەم ڕوانینــە بەدەســتبێ، لــەم حاڵەتــەدا وتوێــژەكانی پەیوەندیـدار بـە شـێوەی تایبـەتی كـاری فۆكـۆوە. لـــەبواری پێشكەشـــكردنی ڕوداوە مێژووییەكانـــدا، ڕەنگـە لایەنیكـەم لەچوارچێوەیەكدا بمێنێتـەوە كـە سنورەكانی بۆ پێشكەشكەرانی ئەمجۆرە وتوێژانە لەهەموو ڕویەكەوە، ڕوون بێت.

فۆكۆ بێگومان دەبوو ڕونكردنەوەیەكی ڕونتری لـــەبارەی شـــێوەی كـــاری خۆیـــەوە لـــەزۆرێك لەبوارەكاندا، بەدەستەوە بدایە. پێوەرە پێویستەكان بـۆ سـەلماندن، نـەفیكردن و تەفسیری شـیكردنەوە تەعبیریەكانی یان ڕوانینی ئەو بۆ مێژووی هەنوكە، بەروكـەش لـە بەرهەمەكانیـدا دەدۆزرێتـەوە، بـەڵام دەبـێ ئەمشتانە مەزەنـە بكرێت. مەبەست ئەوەنیـە فۆكـۆ قـەرزێكی لـە ئەسـتۆیە كـە تیورەیـەك لـەبارەی مێژوو یان كتێبێك لەبارەی میتۆدۆلۆجیەوە بدات بە ئێمە. بەڵام هێواش هێواش كە تیورەكانی لایـەنگری زیـاتر بـۆ خـۆی پەیـدا دەكـات و ئەنگێزەگـەلێك بـۆ لێكۆڵینەوە دروستدەكات، دەبێت ئـەم مەسـەلانە بـە ڕوونـی بخرێنـە بـەر بـاس، ئـەگینا لـەناو شـێوازە مێژوویـە ئەزمونگەریەكانـدا، دەتوێنـەوە. (بێگومـان فۆكـۆ نـاتوانێ ڕێگـری لـەم ئاراسـتەیە بكـات، بـەڵام لەهەمانكاتـدا نایـەوێت پشـتیوانی لـەم گۆڕانـە بكـات... لەبەرئـەوە بێـدەنگی ئـەو لەمبارەیـەوە، یارمـەتی ئامانجـەكانی نـادات. ئـەوەی مومكینـە لـەبواری ڕۆشـنبیری پاریسـدا تـاكتیكێكی كاریگـەر بێـت، لـەزانكۆكانی ئەمـەریكادا، كردارێكـی جیـاواز دروستدەكات).

دوو چـەمكی پێكـەوە گرێـدراو، بنایتنـەری بەرهەمـەكانی دەیـەكانی *1970ی* فۆكۆیـە: یـەكێكیان چـەمكی گریمانـەی سـەركوتكردن و ئەویـدیان چەمكی دەسـەڵات و تـەكنیكی چاودێركەرە بەسـەر ژیانـدا. فۆكـۆ لـە مێـژووی سێكسـوالیتەدا دژی گریمانـەی سـەركوتكردن بەڵگـەی هێناوەتـەوە.. بـەپێی ئـەم گریمانەیـە هەقیقـەت خـۆ بـەخۆ دژی دەسەڵاتە و لێرەوە خۆ بەخۆ دەورێكی ڕزگاریخواز دەبینێ. ئـەم تێڕوانینـە ڕاستەوخۆ ناگەڕێتـەوە بـۆ هـیچ بیریـار یـان قوتابخانەیـەكی فكری، بـەڵكو وەك هەڵسەنگاندنێكی نیتچەیی تانەئامێز لە بیروڕای باو و لایەنیكەم لە بیروڕای ناوندە چەپەكانی فەڕانسە، پێشكەشـدەكرێت. ) نـەك تـەنها لـە تەفسـیرە مێژوویەكانـدا، بـەڵكو لـە بانگەشـە تیوریـەكانی فۆكۆشدا جۆرێك ئاراستەی نیشتمانی و سنوردراو دەبینـرێ.. ئەگەرچـی نمونـە لـەوڵاتانی تـری وەك ئینگلتـەرا و ئـەمریكا دەهێنێتـەوە، بـەڵام بەشـی سـەرەكی بابەتـە مێژوویـەكان، چوارچێوەی بـاس و ئەو نەیارانەی كە فۆكۆ لـەزیهنی خۆیدا ململانێیان لەگـەڵ دەكـات، هـەر هـەموویان پەیوەنـدیان بـە فەرەنسـاوە، هەیـە. (بـەڵام دەبـێ لەهەمانكاتـدا ئەوەمان لەبەرچاو بێت كە مێژووی سێكسوالیتە كورتەی پرۆژەیەكی بەربڵاوترە كە جێبەجێكردنی پێویسـتی بەچـەندان سـاڵ هەیـە. لێـرەوە دیـدی هەمـەكی فۆكـۆ دەبـێ وەك زێدەرەویـەكی تیـوری دابنـێین كـە ئامانجەكـەی دیـاریكردنی وێنەیـەكی



بنەمایەکی ئەبستمۆلۆژی نویێ دێتە ئاراو مرۆڤ وەك بابەتێکی مەعریفی نویێ جیگای ئەو گوتارە دەگرێتەوە کەنوێنەرایەتی بابەتی زانستەکانی سەردەمی کلاسیکی دەکرد. لەکاتێکدا زانستی کۆن مرۆڤ وەك بونەوەرێکی چالاكو زیندو قسەکەر نەدەناسی، لەگەڵ هاتنە ئارای زانستی نوێدا مرۆڤ بوو بەسەورباسی مەعریفەی تازە. بەمجۆرە فیلۆلۆگیا شوێنی سێنتاکسی گشتی و، ئابووری سیاسی جێگای سامان شیکاری و، بایەلۆژیاش شوێنی مێژووی سروشتی گرتەوە. هەر لەم قۆناغەشدا ڕێتمی گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکانیش توندتر بوو، لێرەشەوە مەدلولی پەرەسەندن (لە لێکۆڵینەوەی بوونەوەرە زیندووەکان)و مەدلولی مێژوو (لەبواری تاوتوێکردنی کۆمەڵگە ئینسانیەکاندا) سەریهەڵدا. لەپای ئەم بزاوتە فیکریەدا "فۆکۆ" دەرەنجامێکی سەرەکی دەسگیر دەبێت، ئەویش ئەوەیە: (زانستە مرۆڤایەتیەکان هاوتای ساتەوەختێکی دیاریکراوی مێژووی مەعریفەی ئێمەیەو، زۆر شتێکی ئاسایشە کەمرۆڤ وەك بابەتێك بۆ زانین بسڕێتەوە، وەك چۆن ئاو ئەو وێنەیە دەسڕێتەوە کە لەسەر لمی کەنار دەریا دەکێشرێت).

## هەڵکۆڵین لە بنەماکانی مەعریفەدا:

لەم خۆلە قەرەدانە ئەبستمۆلۆژیەوە ئاکامێكو خواستێکی میتۆدیمان دەسگیر دەبێت. ئاکامەکەش ئێجگار قورسو گرانە، ئەویش ئەوەیە هەموو شێوازەکانی مەعریفە ڕێژەیین. "فۆکۆ" لایەنگری ئەو بۆچوونەیە کەدەڵێت: (شێوازەکانی بیرکردنەوە لەقۆناغێکی دیاریکراودا- تەنانەت شێوازە زانستیەکانیش- سەرمەدی نینو ناچارن بەوەی بپوکێنەوە، بۆ ئەوەی شێوازی تر جێگایان بگرێتەوە. لێرەوە "فۆکۆ" دەگاتە گەیشتن بەپێشنیارەکانی ئەم خواستە میتۆدیەی لای خوارەوە: (پێویستە لەسەرمان مێژوویەك بۆ بیر چێ بکەین، کەپشت بەژینالۆژیا و هەڵکۆڵین ببەستێت). ئەو ژینالۆژیایەی "فۆکۆ" بانگەشەی بۆ دەکات، دەچێتەوە سەر ئەو میتۆدەی "نیچە" لەکتێبی (ژینالۆژیای مۆراڵ) دا کاری پێکرد بوو.

هەموو لێکۆڵینەوەیەکی ژینالۆژیای لەڕەتکردنەوە هەر جۆرە گەڕانێك لەبنەچە و بناغە، سەرچاوە دەگرێت. لەبەرئەوە ژینالۆژیا لەسەر ئیرادەی هەڵکۆڵینکردنی لە گۆڕانکاریو شێوازەکانی گواستنەوە دێتە ئارا کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەبەهاو ڕەفتارو سستمی بیرکردنەوە مانەوە هەیە. ژینالۆژیاش لەمێژووەوە سەرچاوە دەگرێت نەك لەمیتافیزیکەوە، بۆیە دەبێت: (ژینالۆژیا جەستەیەك نمایش بکات کە بە خاڵەکانی مێژوو کوتراوە، مێژوویەکیش نمایش بکات کە جەستە دائەڕزێنێ).

لەئاستی دووەمدا "فۆکۆ" پێچواندنێك لەنێوان هەڵکۆڵینکردن لەزەویو ئارکۆلۆژیای زانیندا دەکات، مەبەستیشی لەئارکۆلۆژیای زانین پرۆسەی لێك- شیتاڵکردنی ئەو گوتاریە کەقۆناغێکی دیاریکراو بەشێوازی جۆراو جۆر: (تێکستی زانستی یان نامیلکە یاخود ئامرازەکانی دیسپلینو یاساو.. هتد) بێت، بەرهەمی دێنێت.

ئامانجی ئارکۆلۆژیا ئەوە نییە ئەم یان ئەو گوتا لێك بداتەوە، بەڵکو دەیەوێت باس لەهەلومەرجی سەرهەڵدانو ئەرکی ئەو گوتارە بکات. بۆ نمونە "فۆکۆ" لەکتێبی (لەدایکبونی پزیشکی کلینیکی) دا، دەستبەرداری ئەوە نابێت ئەو سیاقە مێژوییە دیاری بکات کەزمانی پزیشکی مۆدێرنی تیا هاتە ئاراو ئەوەش لەکۆتایی سەدەی هەژدەدا بوو.

ئەو پێی وایە دابڕان لەم بوارەدا پەیوەندی بەکارەکانی *Bichat* هەیە کەئەزمونی کلینکی بەئەزمونی ئەناتۆمیکردن گۆڕی. بەر لە*Bichat*





پزیشك تەنها سەرنجی لەجستەی زیندوان دەدا، بەڵام پاش ئەو زانایانی بواری پزیشکی کەوتنە تاوتوێکردنی جەستەی مردوو، ئەویش بەمەبەستی چاکتر تێگەیشتن لەژیان. لێرەوە "فۆکۆ" دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە زانستی پزیشکی نویٚ لە دەروازەی مەرگەوە دەدەکەوێت.

دواجار "فۆکۆ" ئەم میتۆدە ژینالۆژیو ئارکیۆلۆژیە لەکۆی بەرهەمەکانیدا، بەگەڕ دەخات.

## ئەقڵ وەك دەزگایەك بۆ دیسپلینکردن:

"فۆکۆ" هەر هێندەی دەستیکرد بەنوسینەوەی کتێبی (مێووی دێوانەیی لەسەردەمی کلاسیکدا)، دەست بەجیٚ کەوتە مەشقپێکردنی ئەو نەخشەی ژینالۆژیەی لە "فردریش نیچە"ەوە وەریگرت. لەو کتێبەدا هەموو هەوڵی خۆی تەرخانکرد بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە بەرلەسەدەی حەڤدەهەم (شێت) مایەی بیرلێکردنەوە نەبووە، لەبەر ئەوەی بەتەواوەتی تێکەڵ بەژیانی خەڵکی بووبوو. بیریارانی سەدەی ناوەڕاست (پێیان وابوو شێت موزایەدەیەکی ئەهریمەنیە بەسەر ئەفراندنەکانی یەزدانەوە). سەیر دەکرد، ئەمەش پێگەیەکی پۆزەتیڤانەو واقیعی بەشێت دەبەخشی، لەبەر ئەوەی ئەو هەڵگری مەعریفەیەکە کە لەودیو بونی یەزدانەوە سەرچاوە دەگرێت.

لەسەردەمی ڕێنیسانسدا لەنێوان سەرجەم ئەو لێکدانەوانەی دێوانەیی دەچووە ژێر باریانەوە، هێڵێکی جیاکەرەوە بەدەرکەوت. لەلایەك، دێوانەیی هەروەك تەلیسمێك مایەوە کەهەندێك کلیلی مەعریفەو سروشی بەئینسان دەبەخشی، بەڵام لەلایەکی ترەوە گاف گاف لەئەقڵ دوور دەکەوتەوە، ستایشکردنی شێتی لەلایەن *Erasme* ئەمە ئاشکرا دەکات. بەمجۆرە مەعریفەی دێوانەیی درزی تێکەوت، ئەگەرچی مشتومڕی نێوان هەردوو ئەو جەمسەرە کۆتایی پیٚ نەهاتبوو. لەسەردەمی کلاسیکدانەبێت (واتە لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمەوە بۆسەرەتای سەدەی نۆزدە)، دێوانەیی نەبووە هاودژی ئەقڵ لە شێوەی دابڕاندا. لەبەر ئەوەی (دوژمنکاری ئەقڵی) کەسەردەمی کلاسیك هێنایە بەرباس، لەجیاکردنەوەی ئاشکرای نێوان ئەقڵو نائەقڵدا خۆی بەیانکرد.((دیکارت)) لەتێڕمانی یەکەمدا بەزمانێکی سەرپێی باس لەم جیاکاریە دەکاتو دەڵێت: (بەڵام چی، ئەوانە دێوانە)ن. پاش ئەوەی ((فۆکۆ)) ئەم لێکدانەوە کۆنکرێتیە دەخاتە روو (هاوکات ژاك دێردیداش دەیخاتە ژێر مشتومڕێکی سەختەوە)، ئیتر تێکڕای هەوڵی خۆی بۆ بەگژاچوونەوەی ئەم ئاقارە ئەقڵانیە دەخاتە گەڕ، رونیشی دەکاتەوە کەتاچ ئاستێك ڕێکەوتن هەیە لە جیاکاری نێوان ئەقڵ و دێوانەیی، بەوپێیەی بەرهەمێکی پەتی ئەو سەردەمە بووە، بەم پێیەش ئەقڵی سەردەمی رۆشنگەری ئەقڵێکی یۆنیڤێرساڵی نیە.

بەپێچەوانەی ئەوەی فەلسەفەی رۆشنگەری بانگەشەی بۆدەکات، "فۆکۆ" پیٚی وایە ئەقڵانیەت ئامڕازی نەهامەتیو کۆیلایەتیە. ئاقاری ئەقڵانیەت لەسەر پرانسیپی ڕەتکردنەوە (دێوانەیی واتە دژە ئەقڵیی) دامەزراوە. بەناوی ئەقڵیشەوە زیندان دێنێتە ئاراو خەڵکانێکی زۆریش پەراوێز دەخات. لەنیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا شێت لەپەراوێزکراوەکانی دی جیادەکرێتەوەو لەجێگایەکی تایبەتیدا (کەشێتخانەیە) بەند دەکرێت.

بەمجۆرە شێت دوچاری سەرکوتکردنێکی جەستەییو مۆراڵیو هەرزە تەماشاکردن دەبێتەوە، چونکە مرۆڤ وەك نەخۆشێك سەیری دەکردن، بڕیاری ئەوەی بەسەردادا کەدەبێت زیندانی بکرێت، ئەو نەخۆشیە بنەمای گوتارێکی نوێی دامەزراند، ئەویش گوتاری پزیشکی ئەقڵانییە. ئیتر لەو کاتە بەدواوە دەنگی شێت لەگویٚ کەسدا نازرەنگێتەوە.



## سەردەمی زیندانیکردنێکی مەزن:

ئەو قەڵەمبازە فیکریەی لەسەردەمی کلاسیکدا رویدا، بووە مایەی سەرهەڵدانی (زیندانیکردنی گەورە) بۆ شێت و بێ کارو دەرۆزەکارو وێڵگەردو گومڕاو ئەوانەی دوچاری پەتای زوهری هاتبوون و کە سانێکیش کەهۆمۆسێکسیواڵ بوون.

دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی گەورە لەساڵی 1656، دەرفەتی چاودێری کردنی هەژارانی رەخساند، ئەو هەژارانەی کۆمەڵگە چیدی وەك وێنەی خوا لەسەر زەوی سەیری نەدەکردن، بەڵکو بەهۆکاری پشێوی و نائارامی دەزانین. بەندکردنێکی لەمجۆرەش لەگەڵ هۆکارە سیاسی و ئابورییەکانەوە دێتەوە: بۆنمونە لەئان و ساتی قەیرانەکاندا بێ کارو وێڵگەردەکان لەدەزگا بیرازکارییەکاندا کۆدەکرێنەوەو لەسەر وەختی ئاسایشدا، بەندینخانەکان بەکارێکی تر هەڵدەستن ئەویش دەستەبەرکردنی هێزی کار هەرزان بەهایە. ئەم ستراتیژی بەندکردنەش جگە لەسەرەتایەك بۆئەوەی (فۆکۆ) ناوی دەنێت (کۆمەڵگەی تەمێکردن) شتێکی ترنیە.

سەردەمی کلاسیك بەفیعلی سەرەتای ئەو ساتە مێژووییەی رەنگرێژکرد کەتیایدا پرۆسەی کۆنترۆڵکردن گەشەی کرد، بەمەبەستی لەقاڵبدانی جەستەی کۆمەڵایەتی و راهێنانی بەشێوەیەکی مایکرۆفیزیای.

شەڕانگێزی ئەقڵ، بەشێوازێکی نوێ لە کۆنترۆڵکردن کەوتە تەعبیرکردن لەخۆی، ئەویش بەسەر لەنوێ راهێنانەوەی بەردەوامی کەسەکان.

ئەم دوژمنکارییە بەشێوەیەکی بەرچاوتر لەهاتنە ئارای زۆرو زەوەندی دەزگاکانی وەك: (وەرشەو کارگەو نەخۆشخانەو سەربازگەو قوتابخانەو زیندانەکان)دا گوزارشت لەخۆی دەکات، ئەم دەزگایانەش مرۆڤەکان رامدەکات تابیانکەنە مرۆڤگەلێکی (گوێڕایەڵ و بەکەڵك). کۆمەڵگە هەرچی لەتوانایدا بوو کردی تابەهۆی دیسپلینکاری و یاسا و نوسراوەکانەوە ئەندامەکانی رابهێنێت، هەروەها بۆ خاڵبەندیکردن و پۆلێنکردنیان و جۆرێك لە کۆنترۆڵکاری دوولایەنە لەناوجەرگەی گروپە ئینسانیە بچوکەکاندا.

## لەهونەری رابەرایەتیکردنەوە بۆ هونەری شوێنکەوتن:

لەساڵی 1976 بەدواوە فیکری (فۆکۆ) وەرچەرخانێکی رون و ئاشکرای بەخۆیەوە بینی، چونکە بەشێوەیەکی شێلگیرانە لەبابەتی دەسەڵات و هەژمونگەریەوە هاتە سەرشیکارکردنی حوکمڕانی (کەئەوپێی وایە لەیەك کاتدا هونەری رێبەرایەتی کردنی خود و ئەوانی دیکەیە). ئەو بۆچونانەی لەکتێبی (مێژووی سێکسوالێتی)دا هاتووە، زۆر دورە لەو پرۆسەی وەسفکردنە وردەی دەربارەی بەندکردن و پەراوێز خستن کەلە بەرهەمەکانی پێشوتریدا بەرچاودەکەون.

چیتر مەسەلەکە پەیوەندیدار نەبوونە بەتاوتوێکردنی رێوشوێن و یاسای هەڵس و کەوتەکان، وەك رەفتارگەلێکی زۆرە ملێ بەسەر خەڵکەوە، بەڵکو پەیوەندیان بە شیکردنەوەی ئەو شێوازانەوە هەبوو کەتاکە ئازادەکان دەیانکردە رێسای هەڵس و کەوتکردنی تایبەت بەخۆیان، وەکی هونەرێك لەهونەرەکانی ژیان. ئەو مەسەلەیەی "فۆکۆ"ی بەخۆیەوە خەریك کردبوو بریتی‌بوو لەوەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارە: یەکەم چۆن و بۆچی وەرچەرخانێك لە کۆمەڵگەی خۆرئاوای ڕویدا سەبارەت بە سێکس، لە هەقیقەتێکەوە کە زادەی هونەرێکی ئیرۆتیکی پەتی بوو (واتە ئەزمونێکی چێژبوو کە هیچ پەیوەندیەکی بە بەرژەوەندی و یاسای رەهای شتە حەلاڵەکانەوە نەبوو، وەکی ئەوەی لەچین و یابان و هندستان و ... هتد، باوبوو)، بۆ مەعریفەیەك دەربارەی سێکسوالێتی؟

دووەم/ بۆچی مەسەلەی سێکس لەخۆرئاوا، بووبە یەکێك لەو کلیلانەی کە دەرگای ئاشنابوونمان بەشوناس ناسی خۆرئاوایی بەروودا دەکاتەوە؟

بەپێچەوانەی ئەو بۆچونەی کۆمەڵگا بۆرژوازی سانا دەکاتەوە، مەسەلەکە لەسەدەی حەڤدەهەمدا پەیوەندی بەوەوە نەبوو کەهەموو قسەکردنێك دەربارەی سێکس سەرکوتدەکراو قەدەغەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە لێشاوێك لە گوتارەوە هەبوو دەربارەی خود.

لەم سیاقەدا (فۆکۆ) تێبینی ئەوەدەکات کە: (ژیانی شوانکارەیی مەسیحی ئەرکێکی بنەڕەتی گرنگی هێنایە ئارا، کە بریتی بوو لەوەی هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە سێکسەوە هەبوو بخرێتە ئاشی ئاخاوتنی ڕۆژانەو بەردەوام)[2].

دەسەڵات ترسی لە سێکس نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەزانێت چۆن وەك شێوازێکی ژیان بەکاری بهێنێت: کۆمەڵگەی مەسیحی کە (پرۆسەی فۆرمەلە کردنی سێکس لەگوتاردا) ڕێکدەخات، لە ڕێگەی درکاندن و دانپیانان لە کڵێسادا. بەمە دەتوانێت جۆرێك لەمەعریفە بخاتەگەر و جۆرێك لەدەسەڵاتیش ڕێك بخات، ئەم دوو پرۆسەیەش دەبنە مایەی لەقاڵبدانی هەموو جۆرە هۆشیاریەك‌و ڕەفتارێکی تاکەکەس. لەساڵی 1984 کە هەردوو کتێبی (چێژگوزاری)و (بایەخدان بەخود)ی تیا چاپکرا، "فۆکۆ" دەستبەرداری ئەوە دەبێت کەمرۆڤ وەك بابەتی دەسەڵات‌و مەعریفە تاوتوێ بکات، بۆئەوەی بەلێکۆڵینەوەی ئەو مرۆڤەوە خەریك بێت کەوەك بابەتێکی چێژ بەخۆی ئاشنا دەبێت‌و خۆی دەناسێت.

ئەم لێکۆڵینەوەش لەسەردەمی یۆنان‌و ڕۆمانی کۆنەوە دەست پێدەکات. لەمیانەی ئەم حاڵەتەوە "فۆکۆ" نیشانی دەدا کەیاساغ سەرەکیترین دەروازەیەك نیە بۆ تێگەیشتن لە دەرکەوتنی (سێکسوالیتی): لەبەرئەوەی مەسەلەی پەیوەندی سێکسی لەسەردەمی کۆنداولای هەموان ڕێپێدراوو پەسەندبوو، (وەك نێربازی).

ئەمە بووبووە مایەی وروژاندنی تەواوی پرسیارو تێرامانە مۆراڵیەکان، چونکە لەو قۆناغەدا پەیوەندیەکی توندوتۆڵ‌و لەنێوان ژیانی سێکسی‌و مۆراڵدا هەبوو.

لەسەردەمی کۆندا حەزو ئارەزوەکان لەجۆریێ لەسیستمی مۆراڵ و لە ستاتیکای بوون، جیانەدەبووەوە. ئەم بایەخدانە مۆراڵیە لە ڕێگای لەدان بەنەفسگرتنەوەو میانڕەوی‌و ڕێکی لە کەسایەتی تاکەکەسدا خۆی بەیاندەکرد، بەکۆنترۆڵکردنی خود. ئەمەش ئەوەی دەخواست کە تاکەکەس وەك مرۆڤێکی خاوەن فەزیلەت‌و ئازادو دڵسۆز بۆ جۆرێك لەجۆرەکانی هونەری بوون، هەڵسوکەوت بکات. بەمجۆرە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە سەردەمی کۆن جیاوازی نەدەکرد لەوەی گەر ئارەزوو ئارەزوکردن بێت لەپیاو یاخود لەژن: ئارەزوکردن لە هەرزەکارێکی گەنج‌و جوان، بەئارەزویەکی ئاسایی‌و ڕەوا سەیردەکرا. ئەم مۆرکە گرفت ئامێزەی بابەتی سێکس دەگەڕایەوە بۆ ستراکتۆری خودی خاوەن هاوسەنگی و ڕەفتاری ئازاد.

**(فۆکۆ)، بیریاری مۆدێرنە:**

بابەکورتی بڵێین بەرهەمەکانی "فۆکۆ" دوو جۆر بایەخ کەشف دەکات: یەکەمیان پەیوەندی بە کەشفکردنی هەقیقەتەوە هەیە کە لەساتە وەختێکی دیاریکراودا لەگوتار گەلێك سەبارەت بە (دێوانەیی‌و پزیشکی‌و زیندان‌و سێکس)دا بەدەست هێنراوە. لەبەرئەوە (فۆکۆ) سنوری ئەقڵ دەکێشێت‌و خەسڵەتی ڕێژەیی بونیشی دیاری دەکات. بایەخدانی دووەمیشی بەتوێکاری مۆدێرنەی خۆرئاوایە.

"فۆکـۆ" سـەروەختێك مەسـەلەی دەسـەڵات سـەرلەنوێ فۆرمەلـەدەکات، ئـەوا بـەم کـارەی کـۆی دیـدە دۆگماییـەکان لـەق دەکـات کەلـە سـەردەمی رۆشـنگەریەوە لـەئارەدان، ئـەوەش روندەکاتـەوە کـە پێویستە لە قولآیی کۆمەڵگەی خۆرئاوایدا پشکنین و گـەڕان ئـەنجام بـدرێت (کـە کۆمەڵگەیـەکی خـاوەن مەیلی تەمبێکاریە).

نوسـینەکانی "فۆکۆ" لەگـەڵ نـەریتی رەخنـەی ئەڵمانی (هەر لەماکس ڤیبەرەوە تایۆرگن هاپرماس) بەیەکـدا دەچـن، ئـەو نەریتـەی بـەردەوام پرسـیاری کـردووە دەربـارەی ئـەو دیاردەیـە سـێنترالەی کـە لـە رەوتی ژیاری تایبەتی خۆرئاوادا ئامادەیە.

ئەگـــەر ئـــەم جـــوت بایەخـــە بـــەردەوامی خەسـڵەتی بێـت، ئـەوا نوسـینەکانی "فۆکـۆ" دوا بڕیاری کەسێك نیە، کەپێویست بێت هەمیشە بیری لێ بکەینەوە.

کاتێك "فۆکۆ" پرسیار گەلێك دەخاتە روو، بـێ ئـەوەی وەڵامیـان بداتـەوە، ئـەوا بـەم کـارەی ئاسـۆی نوێ بۆپرسـیارکردن دەکاتـەوەو پێشـنیازی چەمكو ئامرازی لێکۆڵینەوەی نوێ دەکـات، ئامرازگـەلێك کـە پێویســـتە لەکایـــە جـــۆر بـــەجۆرەکانی زانســـتە مرۆڤایەتیەکانـدا بـەکاریان بێـنین، وەکـو ئـەوەی خواستی "فۆکۆ" خۆی بوو.

## پەراوێزەکان

1-ژاك دێریدا: کۆ ژیتۆو مێژووی دێوانەیی- کتێبی (نوسین و جیاوازی)، *Seuil* 1979، .

2-میشێل فۆکـۆ: ئـیرادەی زانـین- گالیمـار، 1976، ل . 30.

## سەرچاوە

گۆڤاری (فکرو نقد)، ژمارە (14).

# جوانناسیی بوون لای فۆکۆ

"ئامانجی ژیان ئەوەیە کە ببێتە کارێکی هونەری"

ئۆسکار وایلد

**ئەندرۆ ڤاکەر**

**لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف**



**جوانناسی (*aesthetics*) چ ڕۆڵێکی هەیە لە دوا کارەکانی میشیل فۆکۆدا؟ لە دوا بەرگەکانی کتێبی (مێژووی سێکسایەتی *History of sexulity*)دا (کە لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیدا بەم ناوانە هاتوون: بەرگی دوو ئامانجی خۆشی *the use of pleasure*، بەرگی سێیەم بایەخدان بەخود *the care of the self*) چالاکیی جوانناسی دەبێتە کلیلی تێگەیشتنی فۆکۆ بۆ هەوەسە سێکسییەکان لە سەردەمەکانی یۆنانی و یۆنانی – ڕۆمانیدا. تێگەیشتن لە سێکسایەتی لە کۆندا لە ڕێی گەڕانەوە دەبێت بۆ ئەو شتەی کە فۆکۆ بە گشتی ناویاندەنێت "بایەخدان بە خود"، "مەشقەکانی خود"، "تەکنیکەکانی خود" و "جوانناسیی بوون". وا دیارە، وەکو بیتەر دیوز تێبینیدەکات، فۆکۆ لێرەدا لە جیهانێکی بێبابەتی کەپسوولکراوی "مردنی مرۆڤ"ەوە (کتێبی یاسای شتەکان 1966) خۆی دەگوێزێتەوە بۆ جیهانی "کەسانی خۆ دامەزرێنەری" سەرقاڵی خۆ دروستکردن بە پێی پێوەرەکانی جوانناسی.**

من لێرەدا دەمەوێت گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەم کە دوا کارەکانی فۆکۆ لە نێوان سپاردنی recommendation شێوەیەك لە "جوانناسیکردنی" aestheticisation ژیانی رۆژانە و "بە کێشەکردنی" problematisation رۆڵی جوانناسی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و رامیاریی هاوچەرخدا ئەملاوئەولا دەکات. هەڵوێست دووەمیان بەشدارییەکی پۆزەتیڤ دەکات لە دوا مشتومڕە فەلسەفیەکاندا، بەڵام ئەوی پێشتریان تووشی تاگەرەی بیردۆزەیی گرنگ دەبێتەوە کە کارەکانی پێشووی فۆکۆ بەرەنگاری بوونەوە. بۆ ئەوەی بەردەوامیی هەندێك کێشەی بیردۆزیی تایبەت لە کارەکانیدا پیشانبدەم، رەچاوی سێ لایەنی بەکارهێنانی فۆکۆ بۆ چەمکی جوانناسی دەکەم:

یەکەم، زۆر گرنگە لەوە دڵنیابین کە فۆکۆ زاراوەی "جوانناسی" چۆن بەکاردەهێنێت. فۆکۆ دوو جۆرە ناروونی لەبەکارهێنانی زاراوەکەدا پیشان دەدات. لەلایەنی مێژووییەوە، چەمکی دوانناسی زۆر جیاوازە، ئایا مرۆڤ رەچاوی دەقە یۆنانییەکان بکات لەمەڕ هونەری سێکسی *Ars Erotica*، یان فەلسەفەی کانت، یان لێکدانەوەی بۆدلێر لە بابەت مرۆڤێك کە زۆر بایەخ بە قۆزی بدات — وەرگێڕ) لە سەدەی نۆزدەهەمدا. لەوە دەچێت کە فۆکۆ زۆر بە تەواوی ئاگای لەو جیاوازییانە نەبێت. ئەمە پایەی کێشەداری لێکۆڵینەوەکانی فۆکۆ لەمەڕ جوانناسی و پەیوەندیی بە ئێستاوە زیاد دەکات.

فۆکۆ هەتا چ ڕادەیەك پشتگیری دەکات (بە شاراوەیی، چونکە بە ئاشکرا نکوولی لەم خاڵە دەکات) لە "جوانناسی بوون" وەکو ستراتیجێکی هاوچەرخ؟ ئەنجامەکانی ئەم هەڵوێستەش چین؟ لایەنی دووەم کە دەمەوێت رەچاوی بکەم ئەو دژوارییەیە کە فۆکۆ رووبەرووی دەبێتەوە لە مەسەلەی بەهەمەندێتیدا (*normativity*). زۆر رەخنەگر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە فۆکۆ لە نووسینەکانی پێشویدا، بۆ نموونە نووسینەکانی لە بارەی بەندیخانە و پەناگاکاندا، لە وەسفەکانیدا بۆ رژێمە جۆراوجۆرەکانی دەسەڵات — زانیاری، هەوڵدەدات لەلایەن رامیارییەوە پەیوەست بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا لەلایەن بەهامەندییەوە بێلایەن بێت، داوا دەکات بەرهەڵستی هەندێك شێوەی دەسەڵات بکرێت، بەڵام ناتوانێت، وەکو نانسی فرەیزەر دەڵێت، بڵێت بۆچی تێکۆشان پەسەندترە لە ملکەچبوون. فۆکۆ، بەم شێوەیە، پێوەرێکی بەهامەندی *normative* نییە بۆ دەربڕینی جیاوازی لە نێوان شێوە "باش" و "خراپەکانی" دەسەڵات یان مەشق و کاری کۆمەڵایەتیدا. ئایا بەکارهێنانی دوایی فۆکۆ بۆ جوانناسی، ئەگەر بتوانین وایپیشانبدەین کە لەلایەن مێژووییەوە دیاریکراوە و گرنگییەکی هاوچەرخی هەیە، خۆی لە کێشەکانی ئەم بێلایەنییەی بەهامەندێتی لابدات، یان تەنها ئاوێتەیان دەکات. پاشان ئەو پەیوەندییەی کە فۆکۆ پێشنیازیدەکات لە نێوان جوانناسی و دەسەڵاتدا پێویستیی بە روونکردنەوە هەیە. ئەگەر فۆکۆ خۆی لە دانپیانانی ئاشکرای پێوەرێکی بەهامەندی بۆ جیاکردنەوەی شێوەکانی دەسەڵات لابدات، راستی ئەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆر جار بەنهێنی جۆرە پەیوەندییەکی تایبەتی دەسەڵات پەسەند دەکات. وا دیارە دۆزەکە بەم شێوەیە ئەگەر ئێمە "جوانناسی بوون" وەکو ستراتیجێك لێکبدەینەوە کە دانرابێت بۆ پراکتیزەکردنی دەسەڵات لەلایەن خودەوە بەسەر خوددا، لە کاتێکدا ئەو "هێزی تەمێکردن"ەی سەرجەستە کە لە "دابینکردن و سزادا" (*Discipline and panish*) شیکراوەتەوە دەتوانین ناویبنێین پەسەندنەکردنی نابەهامەندانەی (*non-normative*) فۆکۆ، کۆنترۆڵکردنی جەستە لەلایەن خودەوە، کە لەو بەرگەی لەسەر سێکسایەتی یۆنانینەکان لێیکۆڵراوەتەوە بە شێوەیەکی زۆر پۆزەتیڤانە پێشکەشی کردووە. ئەم ڕاگۆڕکێیە لەسەر دەسەڵات و جەستە چییە؟ ئایا

جوانناسی لێرەدا بۆ ئەوە بەکارهاتووە کە شێوە "باشەکانی" دەسەڵات جیابکاتەوە لە شێوە "خراپەکانی"؟ ئەگەر وایە، ئایا مەرجی تەواو هەیە بۆ دروستبوونی ئەم جۆرە بڕیارانە؟

پەیوەندییەکی نزیك هەیە لە نێوان ئەم پرسیارانەداو، جیاکردنەوەیان بۆ مەبەستی ئەوەیە کە ڕێسایەکی پێکهاتە ***structure*** پێشکەش بکات. دەمەوێت گفتوگۆ لەسەر مەودای زاراوەی "جوانناسی" و ئایا دەتوانێت یان ناتوانێت بەرپرسێتی ئەنجامەکانی بەهامەندێتی هەڵبگرێت، ئەمە لە پێویستی فۆکۆ بۆ جیاکردنەوەی دەسەڵات لە تیۆری زالبووندا ***domination*** دەردەکەوێت. ئەمەش لەلای خۆیەوە، پێویستی بە چەمکێکی ئازادی هەیە کە بتوانێت بنەمایەکی قایم بۆ ئەو بیرۆکەیەی کە بۆ دەسەڵات دایناوە، دابنێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو جوانناسکردنەی (***aetheticisation***) کە فۆکۆ بۆ چەمکی ئازادی بەکاریهێناوە کێشەی سەخت دەخەنە ڕوو ئەگەر وایدابنێین ئەم دوا دەقانە بە زاراوەی سەردەم دانراون نەك بۆ بارودۆخی سەردەم.

# I

لەوەتی جوانناسی دامەزراوە، لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە، هونەر لە مەبەستی کردەیی (***practical***) جیا دەکرێتەوە: بە بۆچوونی (کانت) بڕیارە جوانناسییەکان "خۆشییەکی پاك و بێلایەن ***disinterested*** دەبەخشن. بابەتە جوانناسییەکان نابێت جگە لە مەبەستی خودی خۆیان هیچ مەبەستێکیان هەبێت، بڕیاردان لەسەر ڕەفتارەکانی مرۆڤ (کە جاران پەیوەندیی بە بواری ئاکارەوە هەبوو) دەبێت ئەم هاوکێشەیە ئاشکرا بکات چونکە بەرژەوەندییەکیان هەیە: (چی بکەم؟ چ ڕەفتارێك بۆ من باشە؟) بە بۆچوونی کانت ئەم بڕیارە ئاکارییانە بەهۆی شتێکی دیکەشەوە لە جوانناسی جیا دەکرێتەوە ئەویش ئەوەیە کە سروشتی پابەندبوونیان بەیاساوە هەیە ***rule-bound***.

ئەم ڕێبازەی سەربەخۆیی جوانناسی ڕەخنەیەکی لێکرا. بەڵام، ئاشکرا نییە ئەم کارەی فۆکۆ لەسەر سێکسایەتی لای یۆنانییەکان ڕەخنەیە یاخود دانپێنانە بەم کەلەپوورەی دوای کانت (***post-kantion***)، لەبەر ئەوەی واتا یۆنانییەکەی زاراوەی جوانناسی و واتا (دوای کانت)ییەکەی لێ تێکچووە. لە چاو پێکەوتنێکدا لە ساڵی 1983 پرسیار لە فۆکۆ کرا دەربارەی ئەو ڕاگۆڕکێیەی کە لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەرچاو دەکەوێت لە بارەی سێکسایەتی، لە سێکس (خۆی – لە خۆیدا ***per se***)ەوە بۆ "تەکنیکەکانی خود"؟ فۆکۆ لە وەڵامدا دەڵێت کە دیارترین ڕاستی لە بارەی یۆنانییەکان ئەوەیە کە ئەم "تەکنیکانەی خود"، گونجاندنی کەسایەتی خود، بریتییە لە تێکەڵکردنی ئاکارزانی (***ethics***) و جوانناسی: "ئاکارزانی یۆنانی لەسەر کێشەیەك چەقی بەستبوو کە هەڵبژێراوی خۆیە، لەسەر جوانناسی بوون ***aethetics of existance***" بایەخدانی سەرەکیی ***stoic*** (خۆڕاگرەکان)، بۆ نموونە، وەکو "جوانناسی" وەسفدەکرێت. ئەم واتایەی "جوانناسی" بە تەواوی هی (کانت) نییە، چونکە نەڕێی سەربەخۆیی جوانناسی دەکات و ئاکارزانی لە ڕێی کۆدە ئاکارییە گەردوونییەکانییەوە نازانرێت بەڵکو لە ڕێی لایەنە کەسییەکان و "هەڵبژاردنە کەسییەکانی" بڕیاری جوانناسییەوە. بەڕاستی، وەکو دیوز (***dews***) تێبینیدەکات، چەسپاندنی واتای پۆست کانتی جوانناسی بەسەر زاراوە یۆنانییەکەدا نەگونجانێکی مێژووییە، کە تیایدا جوانناسی تێکەڵدەکرێت لەگەڵ ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و ئاکاریدا. بەهەرحاڵ ئەمە هەڵەیەکە فۆکۆ لە سەرەتای کتێبی (ئامانجی خۆشی ***the use of pleasure***)دا دەیکات، کاتێك کە لە بەرگریکردنی جوانناسی بوون لای یۆنانییەکان ئاشکرایدەکات کە "لەگەڵ بەهێزبوونی

مەسیحییەتدا، بێگومان، هەندێك لە سەربەخۆیی و گرنگییان لە دەستدا".

ناروونی مانای مێژوویی هەندێك لە زاراوە سەرەکییەکان ئاشکرایە لەو لێدوانانەی فۆکۆ لەمەڕ گریمانەی هاوجووتکردنی ئاکارزانی لەگەڵ جوانناسیدا. نموونەیەکی ئەم ناروونییە لە لێدوانەکانی فۆکۆ لە بارەی جیاوازی نێوان دوو واتای رەوشت: "کۆدەکانی رەفتار و شێوەکانی خۆییکردن (*subjectivation*). فۆکۆ زیاتر بایەخ بە واتای دووەم دەدات، واتا لێکۆڵینەوەی ئاکارزانی، یاخود "رەفتارەکانی خود" کە وەکو بابەتێکی ئاکاری یەك شت پێکدەهێنن، نەك کۆدەکانی رەوشت یان ئەو فۆرمانەی کە مرۆڤ دەبێت لەگەڵیاندا بگونجێت. فۆکۆ بایەخدەدات بەشێوەی گۆڕینی رەوشت وەکو "شێوەی خۆییکردن" لە نووسینەکانی یۆنانی و یۆنانی – رۆمانییەکاندا بۆ جۆرێکی زیاتر کۆدکراو (دەستوورکراو)ی رەوشت لە سەردەمی سەرەتای مەسیحییەتدا. مەسیحیەت هەڵنەستا بە وەرگرتنی هەندێك کۆدی ئاکاریی یۆنانییەکان لە بارەی سێکسایەتییەوە و رەتکردنەوەی هەندێکی دیکەیان، بەڵکو مەسیحیەت رەفتارە ئاکارییەکانی یۆنانییەکانی گۆڕی یان گونجاندنی.

دەقە یۆنانیەکان لەسەر رەهەندی ئاکاری سێکسایەتی "بایەخدان بە خود (*care of the self*) وەکو یاسایەکی گەردوونی کە هەموو کەسێك دەبێت پەیڕەویی بکات پێشکەش ناکات، بەڵکو وەکو "ڕێسایەکی رەفتار بۆ ئەو کەسانەی کە حەزیاندەکرد جوانترین و کارامەترین شێوازی شیاو بەبوونیان ببەخشن". کردە سێکسییە یۆنانی – رۆمانییەکان ڕێسای بۆ دانەنرا بوو و بە پێی "باشە" و "خراپە" هەڵنەبژێرابوون، بەڵکو بە پێی پێوەرە جوانناسییەکانی جوانی و شێواز دانرابوون.

بۆ روونکردنەوەی ئەم خاڵە فۆکۆ لە هەڵوێستی (بلوتارك) دەدوێت لە بارەی ژیانی هاوسەرێتی. وەکو فۆکۆ دەڵێت، هیچ جۆرە یاسایەك لە بارەی کردارە ماوە دراوەکان و کردارە قەدەغەکراوەکان بە پێی فۆرمێکی ئاکاری، یان بەپێی یاسایەکی رەفتار لە نووسینەکانیدا نەبوو. لە بریی ئەوە (بلوتارك) راسپاردەی "شێوازێکی بوون و رێگایەکی پەیوەندیی" دەکرد. فۆکۆ پاشان دەڵێت: "ئاکارزانیی هاوسەرێتی و ئامۆژگاری دەربارەی بەختەوەریی ژیانی خێزانی لە هەمان کاتدا ڕێسای گەردوونی رەوانن و یاسان بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت شێوەیەکی رەسەن و بەرێز بەبوون ببەخشن، کە بریتییە لە جوانناسییەکی بوونی بێ یاسا و گەردوونی"، ئەمەش دەستەیەك ڕێسایەکە لە شێوەدا، بەئاشکرا، هی (کانت)ن. یاساکانی بەختەوەریی خێزان لە بواری روانیندا گەردوونین بەڵام لە ئەنجامی بڕیاری تاکە کەسیدا دورستبوون. فۆکۆ دەڵێت کە رەوشتی یۆنانییەکان بە جۆرێك بوو کە تیایدا مرۆڤی تاکی یۆنانی خۆی نەدەکردە ملکەچی ئاکار، بەڵام ئەو ڕێسایانەی کە رەفتارەکانی ئاراستە دەکرد بە گەردوونی و گشتگیری دادەنان، ئەمەش دووریدەخاتەوە لە بۆچوونی (کانت)، کە بیقەیدوشەرت فەرماندەر و توندترە. پێچەوانەی کەسی پابەند بە ئاکار ئەوەیە کە مرۆڤ بەپێی هەڵوێستێك یان داخوازییەك بجووڵێتەوە کە تایبەتمەندییەك بدات بە رەفتارەکانی و بیانگۆڕێت و لەوانەشە بەهۆی ژێری و پێکهاتەی تایبەتی کارەکەیەوە جۆرە درەوشانەوەیەکی پێببەخشێت. ئەم رەفتارە کاتێك لەگەڵ پێکهاتەی عەقڵانیی جوانناسیدا دەگونجێت کە بگاتە ئەوانیتر و ببێتە، بە زاراوەی کانت، گەردوونییەکی کەسی *subjectively universal*، رەفتارێکی "هەڵبژاردەی خود" لەگەڵ "جیهانگیرییەکی بێ یاسادا" لێکدەدرێن بۆ ئەوەی رەفتارێکی "پێکهاتەیی" هەبێت کە پشتبەستبێت بە دانپێنانێکی گەردوونی بەو شتانەی یان ئەو رەفتارانەی کە بە پێکهاتەیی وەسفدەکرێن.

لەبەرئەوە، ئەو جوانناسییەی کە فۆکۆ باسی دەکات زۆر قەرزاری ئەو چەمکەی کانتە کە هونەر وەکو گەردوونی و لە هەمان کاتدا کەسی پیشاندەدات. لەبەرئەوە وەسفکردنی "رەفتارەکانی خود" لەلایەن فۆکۆوە هەندێك هەڵەی تێدایە لە واتاکەیدا لە پەیوەندیدا لەگەڵ زاراوەی جوانناسی. دژواریی زیاتر زیاتر کاتێك دەردەکەوێت کە نووسینەکانی پەیوەندییان بە ئێستاوە دەبێت. ئەگەر یۆنانییەکان هەستی جیاکردنەوەی جوانناسی و ژیانی ئاکارییان هەبووبێت، ئایا ئێمە، کە جوانناسی و ئاکارمان ئەوەندە بە ئاشکرایی جودا کردۆتەوە، ناتوانین وەکو نموونەیەك سەیریان بکەین؟ لە زۆر شوێندا فۆکۆ نکوڵی لەوە دەکات کە دەیەوێت رەفتاری یۆنانییەکان بچەسپێنێت و وەکو ستراتیجێکی هاوچەرخ پێشکەشی بکات. بەڵام لە ساڵی 1983 لە چاوپێکەوتنێکدا فۆکۆ دان بە پەیوەندییەکی بەتین دەکات لە نێوان ئاکاری یۆنانی و پرۆژە رامیارییە هاوچەرخەکاندا: "کێشەی بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی سەردەم لەوەدایە کە ناتوانن هیچ جۆرە بنەمایەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی ئەخلاقێکی نوێی لەسەر دابمەزرێت. پێویستیان بە ئەخلاقێکی نوێ هەیە، بەڵام ناتوانن هیچ جۆرە ئەخلاقێك بدۆزنەوە جگە لەوەی کە پێیدەوترێت مەعریفەی زانستیانە دەربارەی خود. ئەخلاقی کانت، کە لەسەر ملکەچبوونی ژیرانە بۆ یاسا گەردوونیەکان دامەزرابوو، جارێکی تر دەبنە ئامانجی رەخنەکانی فۆکۆ. بزوتنەوە رزگاریخوازەکان ناتوانن ئاکاری خۆیان لەسەر فۆرمە کۆنەکان دابمەزرێنن بەهۆی داروخانی باوەڕی "رزگاربوون *univer salism*"ی رۆشنەنگەرییەوە فۆکۆ لەو باوەڕەدایە کە ئەو ئەخلاقە نوێیەی کە سیاسەت ئاراستە دەکات دەبێت شێوەیەکی نوێی هەبێت و جوانناسی ئاراستەی بکات (*aestheticised*). لە هەمان چاوپێکەوتندا و لە وەڵامی پرسیاری (چ جۆرە ئەخلاقێك دەبێت ئێستا بنیات بنێین؟) دەڵێت: "ئەوەی سەرسامم دەکات ئەو راستییەیە کە هونەر لە کۆمەڵگای ئێمەدا بۆتە شتێك کە پەیوەندیی تەنها بە شتەکانەوە هەیە، نەك بە کەسەکان و ژیانەوە، کە هونەر ئەوەندە تایبەت بووە کە تەنها هونەرمەندە پسپۆڕەکان پێی هەڵدەستن. بەڵام پرسیار ئەوەیە، ئایا ناتوانین ژیانی هەموو کەسێك بکەین بە کارێکی هونەری؟ بۆچی چرایەك یان ماڵێك ببێتە ئامانجی هونەر و ژیانمان نەبێتە ئامانج؟".

ئاشکرایە کە ئەمە پێناسەی سەربەخۆیی جوانناسییەو نەرێکردنی واتا کلاسیکییەکەیەتی: هونەر لە "تاك" و لە "ژیان" جیاناکرێتەوە، بەڵام لە پێشنیارکردنی ئەوەی کە ژیان ببێتە کارێکی هونەری روون نییە مەبەستی کام واتای جوانناسیکردنە (*aestheticisation*). لەلایەکەوە لەوانەیە مەبەستی هونەری (پێشەنگ *avant-garde*) بێت، کە پیتەر بێرگەر باسی دەکات، کە هونەر دابڕاوە لە بنکە سەربەخۆکەی و تێکەڵ بە ژیانی رۆژانە کراوە بۆ ئەوەی ببێتە بنەمایەکی رێکخەر بۆ پراکسیسی (ئەنجامدانی کردەیی) نوێی ژیان. لەگەڵ ئەوەشدا، وەکو بێرگەر دەڵێت، ئەم پرۆژەیە نوشستی هێنا بە هۆی پشتگوێخستنی بنەما دامەزراوەییەکانی هونەر.

هونەر وەکو سەربەخۆییەکی دامەزراوەییکراو (*institutionalised autonomy*) هەموو هەوڵێك بۆ جوانناسیکردنی ژیان پووچەڵدەکاتەوە، لەبەرئەوە راسپاردەکەی فۆکۆ لێرەدا پابەندی واتا یۆنانییەکەی زاراوەی جوانناسییە، بەڵام هیچ جۆرە جیاکردنەوەیەك نییە لە نێوان هونەر و ژیانی رۆژانەدا، بەڵکو جوانناسی پابەندی بواری ئاکاریی پراکسیسە ئەگەر فۆکۆ پشتگیریی نوسخەیەکی یۆنانیی جوانناسی/ ئاکار بکات، ئەوا گۆڕینی ژیانی کەسێك لە ئێستادا بۆ بابەتێکی هونەری ئەو چەمکە یۆنانییە ناگرێتەوە، لەبەر هۆیەکی سادە ئەویش ئەوەیە کە ئەو بابەتە هونەرییانەی ئێستا

پێشکەش دەکرێن هیچ ڕەهەندێکی ناوەکی ئاکارییان تێدا نییە. دروستکردنی خود لە ئێستادا بەپێی بنەما هاوچەرخەکانی جوانناسی، ئەوانەی کە ئێستا لەبەر دەستماندان، ناتوانن بابەتێکی ئەخلاقی پێشکەش بکەن، بەڵکو تەنها هونەرێکی سەربەخۆ. ئەوە گوێنەدانە بەوفشارە دامەزراوەییەی کە ناهێڵێت ئەو سەربەخۆییە ئاراستەکەی بگۆڕێت لە چرا و ماڵەکانەوە بەرەو ژیانی مرۆڤ.

## II

لە چاوپێکەوتنێکی دیکەدا فۆکۆ چالاکانە باس لە پەیوەندیی جوانناسی یۆنانییەکان بە ژیانی هاوچەرخەوە دەکات: لە کۆنەوە هەتا مەسیحیەت، ئێمە لە ئاکارێکەوە، کە لە بنەڕەتدا گەڕان بوو بە دوای ئەخلاقی کەسیدا، دەڕۆین بۆ ئاکاری پابەندبوون بە سیستەمی یاساکان. ئەگەر من بایەخم بە چاخە کۆنەکان دابێت لەبەرئەوە بووە، بۆ چەند هۆیەك، بیرۆکەی ئەخلاق *morality*، وەکو پابەندبوون بە کۆدی یاساکان لەناو دەچێت، بەتەواوی لەناوچووە. ئەم لەناوچوونی ئەخلاقەش پەیوەندیی هەیە، دەبێت پەیوەندیی هەبێت، لەگەڵ گەڕان بەدوای جوانناسیی بووندا. ئەوەی سەرنجڕاکێشە لێرەدا ئەو هێزە پێوانەییەی "دەبێت"ە. دەپرسین، بۆچی جوانناسی "دەبێت" جێگری چەند نوسخەیەکی دووبارە داڕێژراوەی ئاکارزانی (*ethics*) بێت؟ دانپێنانی پێوانەیی فۆکۆ بە جوانناسی بوون سەرسووڕێنەرە ئەگەر تێگەیشتنی باوی نووسینەکانی و ڕەخنەی کارەکانی وەکو هەڵوێستێکی بێلایەن دابنێین لەبەرامبەر ئەم بڕیارانەدا. ئاشکرایە، وەکو نیکولیناکۆس دەڵێت، کە ڕەهەندێکی پێوانەیی (*normative*) لە دوا کارەکانی فۆکۆدا هەیە، گۆڕانێکە بۆ ئەوە دانراوە کە زاڵبێت بەسەر ناکۆکییەکانی بەرگری بە تەنیشت هەڵوێستی بێلایەنییەوە. ئەو بەکارهێنانەی بۆ چەمکی جوانناسی شتێکی نێوەندییە لەو هەوڵەی کە دەیدا بۆ خۆلادان لەم ڕێگا داخراوەیە. ئەتوانین دوو لێکدانەوەی کورت بۆ ئەم بەکارهێنانەی جوانناسی دابنێین. لەوانەیە فۆکۆ داواکاری ئەوەبێت کە جوانناسییەکی هاوچەرخی بوون، ئەوەی کە لەوانەیە یارمەتیدەربێت لە بڕیاردان لە نێوان بوارە جیاکانی کار (*action*)، لەسەر مۆدێلی یۆنانییەکان دادەنرێت. لەم حاڵەتەدا ڕێبەرێکی پێوانەیی لە ئارادا دەبێت لەوەسفکردنی هەرکردەیەکدا بەوەی کە لەلایەن جوانناسییەوە خۆشە، جوانە یان لەسەر شێوازە بەهۆی یەکگرتن جوانناسی و ئاکارزانییەوە. کاتێك کە بەکارێك دەڵێین جوانە ئەوەش دەگەیەنێت کە کارێکی باشە. لە بەرامبەریشدا دەتوانین بڵێین کە جوانناسییەکەی فۆکۆ لەوانەیە نوسخەیەکی (کانت)ی بێت چونکە چەمکی سەربەخۆیی بەڕێوەیدەبات. لەم حاڵەتەدا هەرکردارێك جیاوازیی ئەوەی هەیە کە خۆپەڕینەوەیە (*self- justifying*) و خۆڕاستکەرەوەشە (*self- regulating*). کانت دەڵێت "چێژ وەرگرتن داوای سەربەخۆیی دەکات". دژوارییی لێکدانەوەیەکی یۆنانییانە بۆ هەڵوێستی فۆکۆ لەوەدایە کە، وەکو باسمانکرد، ئایا دەتوانین لە دنیای هاوچەرخدا بوارەکانی جوانناسی و ئاکارزانی، کە ئەوەندە بە ئاشکرا جیاوازن، پێکەوە دابڕێژنەوە. "دەبێت"ە بەهامەندییەکانی، کە جوانناسیی بوون دەبێت جێگری کۆدە ئاکارییەکان بێت، لەوانەیە ئاماژەبن بۆ ڕێکخستنەوەی بوارەکانی مەعریفە و ئەخلاق و جوانناسی، کە تیایدا بەهاکانی ئەم بوارانە تێکەڵدەبن و یەکتر بەهێز دەکەن. ئەمەش فۆکۆ نزیکدەکاتەوە لە بۆچوونەکانی هابەرماز لەمەڕ نەرێکردنی سەربەخۆیی جوانناسی. بەبۆچوونی هابەرماز "پراکسیسی ڕۆژانەی بەماددەکراو (*reified*) کاتێك چارەسەر دەکرێت کە بتوانین کارلێکردنی بێ سنوور دروستبکەین لە نێوان تێگەیشتن *cognitive*

لەگەڵ ڕەگەزەکانی ئاکاری/ کردەیی و جوانناسی/ دەربڕیندا. لەوانەیە ئەنجامەکەی لێکچوونێك بێت لەگەڵ بۆچوون یۆنانییەکان لە بارەی کارلێکردنی بوارەکانی ئاکار و جوانناسی، بەڵام بێگومان هاوشێوەی نوسخە یۆنانییەکە نابێت لەمەڕ جوانناسیی بوون. گەڕانەوە بۆ یۆنانییەکان تەنها بیرخەرەوەیەکی مێژووییە کە ڕێکخستنەوەی ئێستای ئەم بوارە جیاوازانە لە بەرد هەڵنەکۆڵراون و توانای ڕێکخستنەوەیان هەیە.

ڕەخنەیەکی تر لەسەر هەڵوێستی یۆنانیانەی فۆکۆ ئەوەیە کە، بەزاراوەی وۆڵف، جوانناسییەکی گشتگیرە (*pan-aestheticism*)، کە تیایدا زاراوەی جوانناسی سەرکێش دەبێت و سەرەڕۆیانە بەسەر هەموو بوارەکانی ژیاندا بڵاودەبێتەوە و دەبێتە سەرچاوەیەك. ئەمەش، بەڕای وۆڵف، وا دەکات کە تایبەتمەندێتی خۆی، وەکو بوارێکی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و بەڵێنی یۆتۆبیا، لە دەستبدات. ئاکامی ئەمەش ئەوەیە کە ستایشی کارگەلێك بکات کە بریتی بن لە راو رووت و دەستبەسەراگرتن بەرامبەر خەڵکانی دیکە.خەڵکانی دیکە تەنها دەبنە تەختەی بازدان بۆ مەشقکردنی خۆ داڕشتن *self-fashioning*. بەڵام، مشتومڕەکانی وۆڵف ناوەڕۆکێك دەخاتە سەر جوانناسییەکەی فۆکۆ کە مەرج نییە دەقاودەق لەسەر بنەماکانی تاك بێت بۆ شێوازدان (*stylise*) بە کردەکانی لەسەر شێوەیەکی جوانناسییانە. جوانناسیکردن (*aestheticisation*) لەوانەیە ببێتە هۆی پەیوەندیی "راوڕووتکەرانە" *predatory*، بەڵام بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی پەیوەندییەکی ئەندێشەیی و هاوسۆزی لەگەڵیاندا لە ڕێی گفتوگۆکردن لەسەر ئەوەی چ کردارێك دەتوانرێت بەجوان و باش و لەسەر شێواز دابنرێت. فۆکۆ دەنووسێت، کە هونەری بوون "پرسیارکردن بووە لەوەی کە چۆن مرۆڤی تاك بتوانێت ژیانی خۆی بەڕێوە ببات بۆ ئەوەی جوانترین شێوەی بداتێ (لەبەرچاوی ئەوانیتر و خۆی و نەوەی داهاتوودا". لەوانەیە بپرسین، بۆچی هەڵەبێت گەر بمانەوێت لایەنە زۆر چاکەکانی ژیانی تەقلیدی تێکەڵبکەین بە بوارەکانی دیکەی ژیان؟ لەوە دەچێت وۆڵف داوای بۆچوونێکی باری ئێستا *status quo* بکات بۆ بوارەکانی مەعریفە و ئەخلاق و جوانناسی، ئەمەش لەو ئارەزووەیدا دەردەکەوێت کە بوارە جیاوازەکان "هاوسەنگ" بنوێنن و "سنووری دیاریکراویان" هەبێت.

کێشە لە لێکدانەوەی (کانت)یانە بۆ جوانناسەییەکەی فۆکۆ لەوەدایە، وەکو تێری ئێگلتن دەڵێت، کە بەشێوەیەکی "بێزارکەر شێوە خوازانەیە *formatistic*" ئەگەر جوانناسیی بوون سەربەخۆبێت لە پەیوەندی لەگەڵ بوارەکانی دیکەدا، ناتوانێت هیچ بڕیارێکی بەهامەندیی تایبەتی هەبێت لە بەرامبەر نرخی کردارێکی تایبەت، دەتوانێت بڵێت، لەلایەن شێوەوە، کارەکە جوانناسانە ئەنجامدراوە، بەڵام ناتوانێت بڕیارێکی دیکە بخاتە سەر ئەو بڕیارە کە پەیوەندیی هەبێت بە ناوەڕۆکی ئەم کردارەوە بۆ ئەوەی پەسەندی بکات یان پەسەندی نەکات. تێری ئیگلتن لەسەر بەڵگاندنەکەی دەڕوات و دەپرسێت: "شێوازی ئەتککردن چۆن دێتە بەرچاو؟" بۆ ئەوەی فۆکۆ خۆی لەم تۆمەتە لابدات، کە تۆمەتێکی دیکەی بێلایەنیی بەهامەندێتییە، دەبێت پێناسەکەی بۆ جوانناسی بگەڕێنێتەوە بۆ نوسخە یۆنانییەکەی و بڵێت: کە ناوەڕۆکی بەهامەندیی ئەو کردارانەی کە شێوازەکەی لە جوانناسییەوە بڕیاری لەسەر درا، دەبێت لەو جیهانە کۆمەڵایەتییەوە وەربگیرێت کە رووداوەکەی تێدا قەوماوە. دەبێت سەربەخۆیی جوانناسی خۆی بە دەستەوە بدات بۆ ئەوەی هێزێکی بەهامەندێتی بدرێت بە بڕیارەکان. فۆکۆ بە روونی ئاشکرای دەکات کە جوانناسیی بوون دەبێت، بە شێویەك لە شێوەکان، بڕیاری مێژوویی و کۆمەڵایەتیی لەسەر بدرێت. فۆکۆ دەنووسێت، و بایەخدان بە خود، کە ڕۆمانەکان لە بری فەلسەفەی





بوون بەکاریان دەهێنا "مەشقێك نەبوو لە تەنیاییدا، بەڵکو کردەیەکی راستەقینەی کۆمەڵایەتی بوو". لە شوێنێکی دیکەدا فۆکۆ تێبینی ئەوە دەکات کە "مەشقەکانی خود *practices of the self*" لەلایەن کەسی تاکەوە دانەهێنراوە، بەڵکو چەند نموونەیەکن (*patterns*) کە لە فەرهەنگ و کۆمەڵگاکەو دەستە کۆمەڵایەتییەکەیدا دەیاندۆزێتەوە. بەمجۆرە رەگەزی بەهامەندێتی جوانناسیی بوون جۆرە پەردەیەکی کۆمەڵایەتین بۆ ئەو کردارانەی کە ناوی تازە لە بابەتیان (*stylish*) لێدەنرێت، پێشەکی هەندێك کردار دوور دەخرێنەوە لەوەی کە شایانی ئەم وەسفە بن. جارێکی تر، ئەم جۆرە بارە پێویستی بە رێکخستنەوەی بوارەکانی تێگەیشتن و ئەخلاقی ئەو جوانناسییەیە کە ئێستا دامەزراوە. هەروەها پێویست دەکات بە تەواوی وازبهێنین لە چەمکی سەربەخۆیی کە بەسەر بڕیارە جوانناسییەکاندا جێبەجێکراوە.

## III

فۆکۆ زیاتر بەهۆی تیۆری دەسەڵاتەوە ناسراوە کە لە کارەکانی زووتریدا هەن. دەسەڵات لە هەموو شوێنێکدایە، دەسەڵات بەرهەمهێنەرە زیاتر لەوەی سەرکوتکەر بێت، شێوەی مۆدێرنی دەسەڵات، دەسەڵاتی "دابینکردنە *disciplinary*"، ئامێرێکی موولوولەییە کە راستی و مەعریفە و خودی تاکەکان بەرهەمدەهێنێت. دەسەڵاتی دابینکردن، وەکو ئەلتوسێر دەڵێت، وامان لێدەکات کە خۆبەخۆ کاربکەین، و هیچ خاڵێکی سەرەتاکەی دیارنییە. لەبەرگی دوو و سێی کتێبی (مێژووی سێکسایەتی)دا راپۆرتێکی هاوشێوەمان بەرچاو دەکەوێت دەربارەی دەسەڵات کاتێك کە پێناسەی "بەیەخدان بە خود" دەکات. ئەو شێوازانەی کە تاکی یۆنانی پەیوەندیی لەگەڵ خوددا دروستدەکرد جێبەجێکردنێکی دەسەڵاتی تێدابوو بەسەر خوددا بە بەردەوامی ئەم بایەخدانە (*care*) وەکو شەڕی کۆنترۆڵکردن وێنا دەکرا: پەیوەندییەکی "ئازاربەخش بوو لەگەڵ خۆدا"، پەیوەندییەکە پێویستی بە جۆرێك لە "فەرمانکردن — ملکەچبوون، ئاغایەتی — بندەستەیی" دەکرد. لە دواییدا، فۆکۆ باسی ئەوە دەکات کە ستراتیجەکانی رەفتارەکانی سێکسیی راست پێویستی بە کەسێکی خۆدابینکەر دەکرد. ئەمە بابەتێکە زۆر جیاواز نییە لەو زیندانییەی (دابینکردن و سزادان *discipline and punish*) کە لە ژێر چاودێریی چاو پووچەکانی (چاودێر *panopticon*)دایە. لێرەدا دەمەوێت ئەم پرسیارە سادەیە بکەم: بۆچی بۆچوونی فۆکۆ لە بارەی ئەم شێوەیەی (دەسەڵاتی دابینکەر، لە گوناهبارکردنێکی بێلایەنی بەهامەندەوە گۆڕا بۆ ئەم ستایشکردنە تەمومژاوییەی "دابینکردنی خود" وەکو سەرچاوەیەك بۆ چالاکیی جوانناسی؟ بۆچی فۆکۆ ئێستا ئەم جۆرە دەسەڵاتە پەسەند دەکات کە زۆردارانە تاکەکان بەشێوەیەك دابیندەکات بۆ ئەوەی ژیانیان ببێتە کارێکی هونەری؟

هۆی ئەم گۆڕانە لە هەڵوێستی فۆکۆدا دەتوانین بگەڕێنینەوە بۆ ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان دەسەڵات و زاڵبووندایە کە لە چاوپێکەوتنێکدا ئاشکرای دەکات، "ئاکاری بایەخدان وەکو بەخود نواندنێکی *practice* ئازادی". ئەمە جیاکردنەوەیەکی بەهامەندە کەپشت بە واتای سەربەخۆیی جوانناسی دەبەستێت. فۆکۆ دەڵێت: "پەیوەندییەکانی دەسەڵات خۆیان خراپ نین" و ناتوانێت هزری کۆمەڵگایەك بکات بەبێ پەیوەندییەکانی دەسەڵات" ئەگەر ئەمە وابێت کەسە تاکەکان هەوڵبدەن "خۆیان بدەنە دەست یاسا و تەکنیکەکانی بەڕێوەبردن، هەروەها ئاکارزانی و خوو و ڕەوشت (*ethos*) و نواندنەکانی (کردەکانی) خود، کە ماوە دەدات ئەم گەمانەی دەسەڵات بەکەمترین زاڵبوون یاریبکرێت". ئازادیی بەڕێوەبردنی دەسەڵات بەسەرخۆ و (ئەوانیتردا)




تەواوكەری واتای ئەو دەسەڵاتەیە كە فۆكۆ بەكاریدەهێنێت. "پەیوەندییەكانی دەسەڵات ناتوانن ببن ئەگەر هاووڵاتییەكان ئازاد نەبن" هەروەها دەڵێت: "لە هەموو بوارەكانی كۆمەڵگادا پەیوەندییەكانی دەسەڵات هەن.. چونكە ئازادی لە هەموو شوێنێكدا هەیە". بە بۆچوونی فۆكۆ، زاڵبوون حاڵەتێكە كە پەیوەندییەكانی دەسەڵات دەبنە شتێكی ماددی (*reified*): "پەیوەندییەكانی دەسەڵات بە جۆرێكی وەها جێگیر دەبن كە بەردەوام نەگونجاو دەبێت و لێوارەكانی ئازادی زۆر سنووردار دەبن". ئەگەر ئەم پێناسەیەی زاڵبوون *domination* بە ئاستەم تروسكاییەكی هیوای تێدا هەبێت، ئەوا پێناسەیەكی دیكەی فۆكۆ مەسەلەكە زۆر روونتر ئاشكرا دەكات: "كاتێك كە تاكێك یان دەستەیەكی كۆمەڵایەتی دەتوانن بوارێكی پەیوەندیی دەسەڵات ئابڵووقە بدەن، بۆ ئەوەی بێهەست و جێگیری بكەن و رێگە لە هەموو جووڵەیەكی بەرپەرچدانەوە"لە ڕێی ئامرازەكانییەوە كە دەشێت ئابووری یان سەربازی بن" بگرن، لەم حاڵەتەدا ئێمە ڕووبەڕووی بارێك بوینەتەوە كە دەتوانین ناوی بنێین حاڵەتی زاڵبوون".

فۆكۆ دەبێت پشتگیریی ئەم پێناسە بەهێزترە بكات چونكە نوسخە لاوازەكەی كە تیایدا ئازادی سنووردار دەكرێت نەك ڕێی لێ دەگیرێت، جیاوازی نێوان دەسەڵات و زاڵبوون لێڵ دەكات. جیاوازییەكە خۆی كەمە. دەسەڵات "ئەو هۆكارەیە كە بەهۆیەوە كەسی تاك هەوڵدەدات ڕەفتارەكانی ئەوانیتر بەڕێوە ببات و دیارییان بكات". دیاریكردنی ئەوانیتر جیاواز دادەنرێت لە "زاڵبوون" بەسەر ئەوانیتردا. ئەم جیاوازییە دەبێت ڕەها بێت، نەك پلە بە پلە، چونكە ئەگەر دووەمیان بێت، ئەگەری ئەوە دەبێت كە "دیاریكردن" بخلسكێتە ناو "زاڵبوون"ەوە. "زاڵبوونی كەسێك بڕیاردانی كەسێكی ترە".

ئەوە چەمكی ئازادییە كە ماوە دەدات بە فۆكۆ ئەم جیاوازییە بكات، چونكە پەیوەندییەكانی دەسەڵات، بە پێچەوانەی پەیوەندییەكانی زاڵبوون، پیرۆكەی ئازادی ئاراستەی دەكات.

ئەمە وەڵامە بۆ چاڵس تەیلە *charles taylor* كە فۆكۆ بەوە تاوانبار دەكات كە هەستی ئازادیی نییە كە بتوانێت هێزی یەكگرتوویی *coherence* بدات بە تیۆرەكەی. چاوپێكەوتنەكەی فۆكۆ ئەوە ئاشكرا دەكات كە پێناسەی دەسەڵات – ئازادی لە چەمكی بایەخدان بە خودی یۆنانی – ڕۆمانییەوە بۆ جێبەجێكردنی جوانناسی/ ئاكارزانی وەرگرتووە. لەم بارەیەوە دەڵێت: بایەخدان بەخود رێگەیەك بوو بۆ ئەوەی ئازادیی تاك بە ئاكاری دابنرێت". ئەم جوانناسییەی بوون هونەرێكی ئامانجداری ئازادی بوو كە وەكو گەمەیەكی دەسەڵات تێبینیدەكرا" لەم "گەمەیەدا" ئازادی "دەسەڵاتێك بوو كە مرۆڤ دەیهێنا بۆ ئەوەی كاریتێبكات وەكو بەشدارییەك لە بەرژەوەندیی گشتیی شارە – دەوڵەتییەكانی یۆنان (*Greek polis*). ئەم جۆرەی ئازادیی تاك پاڵپشتی دەكرد لە دەسەڵاتی بایەخدان – بە خود: "جۆرە بەكوێلەكردنێك بوو – كویلەكردنی خود لەلایەن خودەوە". بەڵام هەروەكو چۆن كێشە هەیە لە داڕووخانی هەر جیاوازییەكی ئاكارزانی/ جوانناسی سەردەمدا لەبەر ڕۆشنایی بیری یۆنانییەكان، بەهەمان شێوە كێشە هەیە لەوەی كە داڕووخانی دەسەڵات بەرەو ئازادی بچێت. ئەم زاراوانە لای ئێمە واتای زیاتر لەوە دەگەیەنێت كە ئازادی یەكسان بێت بە توانای ئەوەی چالاكانە خۆمان بپارێزین *police anself*. لێكچوواندنی دەسەڵات بە جوانناسی و ئازادی بە ئاكارزانی پابەندمان ناكات بەوە قایلبین كە دەسەڵات و ئازادی یەك شتن.

جارێكی تر بەرەنگاری كێشەی خوێندنەوەی یۆنانییەكان دەبینەوە سەبارەت بە باری ئێستامان. هەتا چ رادەیەك دەشێت چەمكی "ئازادی" لە كۆمەڵگایەكەوە بهێنین كە لەسەر كۆیلەیەتی دامەزرابوو بۆ هەر كۆمەڵگایەكی سەردەم؟ ئەگەر وا

بیر لە کۆیلەکان دەکرایەوە کە هیچ جۆرە ئاکارێکیان نییە، کەواتە لەوایە لە حاڵەتی ژێر دەستەییدا بوون. هەروەها کێشەی رەگەز هەیە لە چەمکی ئازادی لە یۆنانیدا. "سەروەری *mastery* وەکو ئازادییەکی چالاك، خەسڵەتێك بوو دەخرایە پاڵ کەسایەتیی "نێرانە *virile*". واتا یۆنانییەکەی دەسەلآت – ئازادی پەرەیدەدا بەهاوولآتییەکی نێری ئاکاری کە جوانناسییەکەی لە بارەی بوونەوە "بونیادێکی نێرانە بەرێوەبرد کە خود دەبەستێت بە خودەوە". دەتوانین گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەین کە چەمکەکانی ئازادی و بایەخدان بە خود وەکو ئاکارزانییەك پشتدەبەستێت بە جیاکردنەوەی ئەو کەسانە لەو گرووپە کۆمەلآیەتییانەی کە بە تەواوی دەستەبەسەرا گیراون *totally dominated*. ئەم جیاکردنەوە تیۆرییەی کە فۆکۆ دەیەوێت رایبگرێت لە نێوان دەسەلآت و زاڵبووندا تەنها لە جیهانێکی یۆنانیدا واتای هەیە. بەلآم پەسەندکردنی رەهای فۆکۆ بۆ رۆحێکی "ئازادی" لەوە دەچێت خێوی لیبرالی سەربەخۆیی مۆدێرن تیایدا نیشتەجێ بێت. چۆن لە بارەی جوانناسییەوە فۆکۆ تووشی هەڵە دەبێت، بەهەمان شێوەش بێ توانا دەبێت لە روونکردنەوەی ئەوەی کام واتای ئازادییە کە دەیەوێت دانیپێدا بنێت. لەوانەیە فۆکۆ بیەوێت پێناسەی یۆنانییەکان بۆ ئازادی وەکو "خۆ کۆیلەکردن"ێك رەتبکاتەوە، بەلآم ئازادی وەکو جوانناسیی بوون بهێڵێتەوە، بەلآم، بێگومان ئەمە پێویست بە گەڕاندنەوەی چەمکی کانت لەمەر سەربەخۆیی جوانناسی دەکات بۆ پێناسەکە. لەوە دەچێت فۆك بیەوێت سەربەخۆیی کە بۆ جوانناسی داخراوە بگوێزێتەوە بۆ چەمکی ئازادی یان سەربەخۆیی کە لای یۆنانییەکان دەیانبینێتەوە. بەلآم ئەمە هیچ واتایەك نابەخشێتە جیاکردنەوەی جوانناسی/ ئاکارزانی لای یۆنانییەکان.

وا دیارە دەسەلآت لای فۆکۆ دەبێتە ئازادیی زاڵبوون بەسەرخۆدا بەشێوازێکی جوانناسیانە. ئەم یەکگرتنەی دەسەلآت و جوانناسی دوو مەسەلە دێنێتە ئاراوە:

1–ئەگەر تەیلەر راست بێت لە جەختکردنی ئەوەی کە "دەسەلآت پێویستی بە ئامانج هەیە". بۆ ئەوەی ببێتە چەمکێکی یەکگرتوو، کەواتە ئامانجی جوانناسیکردنی *aestheticisation* خود چییە؟ ئایا لە دەسەلآتی جوانناسی بەسەرخۆدا هیچ رەهەندێکی بەهامەندیی هەیە، یاخود بڵێین چۆن بۆمان دەردەکەوێت کاتێك دەسەلآت بەسەرخۆدا دەبێتە زاڵبوون بەسەرخۆدا؟ وەلآمی پرسیاری یەکەم جەستەیە و بە تاقیکردنەوەی دەسەلآت بەسەر جەستەدا دەتوانین وەلآم بۆ پرسیاری دووەم بدۆزینەوە.

بەرای فۆکۆ جەستە ئەو شوێنە بژاردەیەیە *privileged* کە تیایدا چالاکیی دەسەلآت ئەنجامدەدرێت. کتێبی (دابینکردن و دەسەلآت) پێشنیازی پەیوەندییەکی بنەڕەتی دەکات لە نێوان بەرزبوونەوەی دەسەلآتی دابینکردن و "خستنەگەری سیاسییانەی جەستە" لە بوارەکانی زیندان و فێرکردن و پارێزکردندا (*dieting*). دەسەلآت هەندێك ئەدگاری جەستەیی رادەگەیەنێت وەکو ئاماژەکردن و کەمکردنەوەی جووڵە و مەشقە هەمەلایەنەکانی جەستە. دەسەلآت لە ئەنجامی چالاکییەکانی جەستەوە ئاراستە نەکراوە، بەڵکو وەکو "چەند پرۆسەیەکی چالاکی". ئەنجامی ئەمەش "هونەرێکی جەستەی مرۆڤە" کە بۆ ئەوە دانراوە "جەستەیەکی گوێڕایەڵ" بەلآم "بەسوود" بەرهەم بهێنێت. رەخنەگرەکان زۆر کێشەیان دەرخستووە لە بۆچوونی فۆکۆ لە بارەی (بژاردەکردنی *privileging*) جەستە وەکو بابەتێکی رەخنەی رامیاری: ئەو مەیلەی بۆ یەکگرتنی جەستە جیاوازەکان لە چەمکی "جەستە"دا، ئەو شێوازەی کە تیایدا جەستە وەکو زاراوەیەکی میتافیزیکی دەبینێت، ئەو لە دەستچوونەی کە خۆی قەرزاربار کرد بەهۆی کەمکردنەوەی

ئالۆزییەکانی مرۆڤایەتی و گێڕانەوەیان بۆ فیزیۆلۆجیایەکی ساکار.

بەهەرحاڵ، نووسینەکانی فۆکۆ بوونە هاندەرێك بۆ کاری زۆر بایەخدار لەلایەن نووسەری دیکەوە لە بارەی پەیوەندییەکانی دەسەڵات بە جەستەوە.

ئەنجامی سروشتیی سووربوونی فۆکۆ لەسەر دابینکردنی جەستە ئەوەیە کە دەبێتە شوێنی بژاردەی بەرگریکردنی دەسەڵات، ئەم تێڕوانینە بەسەر کارەکانی دواییدا زاڵە. لە کۆتایی کتێبی (مێژووی سێکسایەتی: سەرەتایەك) دا فۆکۆ پێشنیاری "جەستەکان و خۆشییەکان ( ***bodies and pleasures***) دەکات وەکو سەرچاوە بەرگرتن لە گوتارەکانی ئارەزووی سێکس و هۆکارەکانی دەسەڵاتی دابینکەر. لەبەرگەکانی دوو و سێ ی کتێبی (مێژووی سێکسایەتی)دا زۆر جار تیشك دەخاتە سەر ئەم جوانناسییانەی بوون — پارێزکردن، هەرسکردن، مەشقکردن و خۆشتن — کە نموونەن بۆ کردەی خۆسەپێنەری دەسەڵات بەسەر جەستەدا. ئەمانە ئیتر جەستەی گوێڕایەڵ نین، بەڵکو چالاك و ماندوون و خەریکی خۆڕێکخستنن ***askesis*** ڕاهێنانی ئاکارین لەسەر شێوازی یۆنانییەکان. کاتێك کە فۆکۆ لە (بایەخدان بە خود) دەکۆڵێتەوە، لە چەمکی یۆنانی و یۆنانی — ڕۆمانیدا گیان (***soul***) پاشکۆی جەستەیە. هەڵوێستەکانی لەمەڕ نێربازی ***homo sexuality*** لەلایەن "گشت جوانناسییەکانی ئاکاریی جەستەی کوڕەوە" ئاراستە دەکرا. فۆکۆ دەڵێت "هەموو ئەو ڕژێمەی کە دەوری خۆشییە سێکسییەکان دەگرێت، لەوە دەچێت کە لەسەر جەستە جێگیر بێن.. وەك ئەوە وابوو کە جەستە فەرمانبدات بە جەستە" گیان بەرهەڵستیی ئارەزووەکانی جەستەی نەدەکرد، بەڵکو خۆی کۆنترۆڵدەکرد بۆ ئەوەی ڕێنمایی جەستە بکات" بەڵام "بەپێی یاسایەك کە هی خودی جەستە بوو". تەنها لە کاتی پەرەسەندنی مەسیحیەت لە سەدەی چوارەمدا گیان ئەم ڕۆڵەی ڕەوتکرد.

دەسەڵات، وەکو فۆکۆ لە پەیوەندی لەگەڵ یۆنانیەکاندا تیۆری بۆ دادەنێت ***theorize***، بنەمای جوانناسیکردنی خودە ***self- aestheticisation***، بەشێوەیەکی سەرەکی ئاراستەی جەستەکراوە. ئایا دەتوانین ئەم بنەمایە وەکو بەشێك لە بەرگرتن لە دابینکردنی هاوچەرخی جەستە دابنێین؟

جارێکی دیکە دەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئەم جۆرە تاکتیکە کێشەی بەهامەندێتی دروستدەکات بۆ ئەو نوسخەیەی فۆکۆ لەمەڕ جوانناسیی بوون. دەتوانین ئەمە لە ڕەچاوکردنی ئەو گونجاندنانەی کە فیمینستەکان دەیکەین بۆ تیۆری فۆکۆ پیشانبدەین.

ژمارەیەك لە تیۆریستە ***theorists*** فێمنستەکان پەرەیان بە شیکارە رامیارییەکانی فۆکۆدا بۆ ئەوەی لێکدانەوەیەك پێشکەش بکەن لە بارەی چۆنیەتیی "دابینکردنی" جەستەی مێ لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوای هاوچەرخدا. نووسەرانی وەکو سوزان بۆردۆ، ساندرالی بارکلی و مویا لوید تیشکیان خستە سەر دیاردەکانی پارێزکردن و مەشقکردن و نارێکییەکانی خواردن وەکو نموونەی دابینکردنی خۆسەپێنەر، بەسەر جەستەی مێدا. بۆردۆ دەڵێت: پشکنین و ڕێکخستن جەستە لە بارەی قەبارە و شێوە و ئارەزووی خواردن و باری لەش و ئاماژەکردن، دەرفەتی ئەوە دەدەنە ژنان کە هەست بە کۆنترۆڵکردنی جەستەی خۆیان بکەن. ئەم جەستە — دابینکردنە، وەکو جەستە — بنیاتنانێك "فانتازیا خود — سەرروەری" دەبەخشێت. ئاشکرایە کە ئەم بایەخدان — بەخۆیە بۆ ژنان لە پەیوەندیدا بەجەستەوە لە جوانناسییە یۆنانییەکەی فۆکۆ بۆ بوون دەچێت ( ***Foucaults Greek aesthetic of existence***).

بۆردۆ ئامۆژگاریی گۆڤارێکی ڕێکیی لەش دەگێڕێتەوە کە بەم شێوەیە ژنان هاندەدات:

"شاكارێك دروستبكە. لەشت لە كارێكی هونەرییدا دابتاشە". یەكێكی دیكەیان دەڵێت: "خۆت كاری كۆڵینەكە بكە، تۆ بوویتە پەیكەرتاشێكی لێهاتوو".

لەم كارە فێمنستەدا كە لەسەر دابەشكردنی جەستە بە پێی رەگەز دامەزراوە، ئەو دانپێنانە هێمنەی تیا نییە بە مەشقەكانی خود كە لە كارەكانی فۆكۆ لەسەر یۆنانییەكاندا هەیە. ئەگەر پارێزكردن و ئەو مەشقانەی كە دەكرێن بۆ بەهێزكردنی دڵ و سییەكان نموونەی هاوچەرخی خۆ – رێكخستنەوەبن لەگەڵ شێوازدا *self-fashioning*، كە توندیی خودابینكردن دەردەخات، كەواتە هۆی باش هەیە، كەلەسەر بنەمای ئەو بڕیارە بەهەمەندییانەی كە هەن لە بارەی بنكەی كۆمەڵایەتیی دامەزراوە، بۆ پرسین لەوەی بۆچی فێمستەكان رەخنەدەگرن لەو مەشقانەی دەسەڵاتی جوانناسی كە ئازادانە هەڵبژێراون.

دەتوانین خۆ – جوانناسكردنی جەستەی مێ وەكو بنەمایەك وەسف بكەین "بۆ شێوازدان بە رەفتار بۆ ئەوانەی كە حەزدەكەن كە قەشەنگترین و لێهاتووترین شێوەی شیاو بدەن بە بوونیان" بەڵام، وەكو باركلی دەڵێت، دەشێت ئەم "خۆ چاودێركردنە ببێتە شێوەیەك لە ملدان بۆ باوكسالاری" بۆ هەڵبژاردن لە نێوان ئەم لێكدانەوانەدا پێویستمان بە دەستەیەك پێوەری بەهامەندێتی *normative criteria* دەبێت. چونكە، وەكو رۆی بۆین دەڵێت، ئەم چەمكەی فۆكۆ لە بارەی بایەخدان بە خود "میكانیزمێكە بەبێ یاسای بەكارهێنان" لەوەش زیاتر "بەبێ رژێمێكی بەهامەندێتی ناتوانین بڕیار لەسەر سنوورە بنەڕەتییەكانی خۆدابینكردن بدەین". ئەو مەشقانەی كە مێ لەسەر جەستە ئەنجامیدەدات دەشێت، بەزاراوەی فۆكۆ، نەك وەكو جێبەجێكردنی وەسف بكرێت، بەڵكو نزیكترە لە حاڵەتی زاڵبوون *domination*، چونكە ئەگەر مەشقی وەكو پارێزكردن بە دەسەڵات دابنێین نەك زاڵبوون، ئەوا دەشێت، ئەو شتەی كە فۆكۆ ناویدەنێت "پێچەوانەكردنەوەی ستراتیجی *strategic reversal* بۆ ئەو پەیوەندییانەی دەسەڵات كە ئێستا سەپێنراوە، بەكاربهێنین. دەتوانین وایدابنێین كە دەتوانین پێچەوانەی ستراتیجی پارێزكردن بكەین، هەروەها راهێنانە قورسەكانی لەش رێكخستن، بەوەی كە بیانكەین بە خواردن و جوانناسی قەوارەی لەش بكەینە "جۆرە پان و پۆرییەكی كۆنترۆڵكراو". بەڵام ئەمە دەبێتە هۆی فەرامۆشكردنی تۆڕی كۆمەڵایەتیی پەیوەندییەكانی دەسەڵات كە كاریگەرانە رێگە لەم جۆرە پرۆژانە دەگرن و نایانهێڵن، ئەمەش بەهۆی بڕیارە بەهامەندییەكانەوەیە كە لەسەر بنەمای دامەزراوە كۆمەڵایەتییەكان و بەها فەرهەنگییەكان و نابەرامبەری رەگەز دامەزراون، كە ئێستا پشتگیری لە جوانناسێكردنی جەستە دەكات: ئەمەش پەیوەندیی هەیە بەوەی كە پێیدەوترێت: "زۆرداریی باریكەلەیی *tyranny of slenderness*". جوانناسیی دەسەڵات، بەقەدەر دەسەڵاتی جوانناسی پێویستی بە شتێكی زیاتری هەیە لە بنەمای ئازادیی رەها یان یاسای سەربەخۆییەكی بەتاڵ.

# IV

لێكۆڵینەوەكانی ئەم دواییە لە بارەی چارەنووسی پرۆژەی رۆشنگەری لەوە دەچێت بگەرێتەوە بۆ یەكێك لە خاڵە سەرەكییەكانی بایەخدان بە ئەقلانییەتی رۆشنگەری: ئەویش دامەزراندنی كۆمەڵێك زانیاری لە دەوری پرسیارەكانی جوانناسیدا. لیوتار لەگەڵ (رەخنەی بڕیاردان *critique of judgement*)ی كانتدا یەكدەگرێ "ئەو كانتەی خەیاڵ، ئەوەی كە لە نەخۆشیی مەعریفە و یاساكان چاكببووە وەو هەڵگەرابووەوە بۆ بتپەرستیی هونەر و سروشت". كتێبەكەی ریچارد رۆرتی (كوتوپڕی، تەوس، پشتگیری (*contingency, Irony and solidarity* (1989)،

نەخشەی یۆتۆبیایەکی لیبرال دەکێشێت لە زاراوەی دنیایەکدا کە شیعر "وەکو خۆ داهێنەرێك" سەردەکەوێت بەسەر فەلسەفەدا "وەکو دۆزینەوە *discovery*" بە بۆچوونی رۆرتی ئەقلأنیەتی رۆشنگەری دیموکراتییەکان بەهێز ناکات، بەڵکو رێیان لێدەگرێت و تەنها بەسوود وەرگرتن لە زمانێك کە لە جوانناسیی بواری خوازە *motaphor* و خۆ داهێناوە وەرگیرا بێت دیموکراسییەت مسۆگەر دەکرێت.

"یۆتۆبیای لیبرال" رۆرتی دەڵێت "فەرهەنگێکی بەشیعر کراو *poeticized* دەبێت کتێبەکەی تێری ئیگڵتن: ئایدۆلۆجیای جوانناسی *the Ideology of aesthetics* (1990)، شوێنپێی گەشەکردنی جوانناسی هەڵدەگرێت لە سەدەی هەژدەوە هەتا ئێستا. ئیگڵتن شیکارییەکی دایەلێکتیکی وردی جوانناسی دەکات و دەڵێت: جوانناسی بینینێکی چالاکییەکانی مرۆڤە وەکو ئامانجێکی بنەڕەتی خۆی لە خۆیدا.. کە وێنەیەکی یۆتۆبیایی بەخشندە بە ڕێکەوتنی نێوان ژن و پیاو پیشاندەدات کە ئێستا لە یەکتر جیا بووتەوە، (بەلأم) لە هەمان کاتدا بەر لە بزووتنەوەی راستی رامیاری بەرەو ئەم جۆرە کۆمەڵە مێژووییە دەگرێت و ئاڵۆزی دەکات".

جوانناسی پەیوەندییەکی، لە بنەڕەتدا شاراوە، بەلأم گرنگی هەیە لەگەڵ پرۆژە رامیارییەکاندا. کارەکانی دوایی فۆکۆ لەسەر سێکسایەتی یۆنانی – رۆمانییەکان دەگونجێت لەگەڵ دووبارە دۆزینەوەی مەسەلەکانی جوانناسی لەلایەن بیرمەندە هاوچەرخەکانەوە. وەکو لەپێشدا وتم، ئەگەر ئەم کارە تەنها جۆرە هەوڵێك بێت بۆ دانانی چەمکی جوانناسی، (کانت)ی بێت یان یۆنانی، لەبری ئەقلأنییەتی رۆشنگەری، ئەوا کێشەی مەزن هەیە لەم مانۆڕەدا. بەهەر حاڵ، ئەگەر مەبەست و ئەنجامی دووبارە پێداچوونەوە بێت لەسەر پەیوەندییەکانی بوارەکانی مەعریفە و ئەخلاق و جوانناسی، ئەوا کارەکانی فۆکۆ لەوانەیە سوودمەندانە بەشدارییبکات لەو مشتومڕانە. نووسینەکانی، بەزاراوەی خۆی، بە کێشەکردنی *problematization* مەسەلەکانی جوانناسین. کاتێك کە لەبەر ئەم رۆشنایەتیەدا دەیانخوێننەوە، دەقەکانی فۆکۆ هیچ وەسفێکی بەرنامەڕێژکراوی بوارەکانی ئاکاری و ئەقلأنی تێدا نییە کە بە جوانناسی بەهێزکرابن. بەمجۆرە کارەکەی فۆکۆ "بەتاڵ" دەبێت، ئەو ناوەرۆکەی تێدا نابێت کە دەستنیشانی واتای "جوانناسی" بکات لەم رۆژانەدا. تەنها ناوەرۆکێك کە دەشێت زاراوەکە بگەیەنێت ئەوەی کانت و یۆنانییەکانە، کە بە ئاشکرا پەسەندنەکراون.

پاشان بایەخدانی فۆکۆ بە جوانناسیی بوون لای یۆنانییەکان دەبێتە "ئۆنتۆلوجیای مێژوویی خۆمان".

جارێکی تر بیر لە مەسەلەی بوار و رۆڵی هاوچەرخی جوانناسی دەکەینەوە بە تاقیکردنەوەی "سنوورەکانی ئەو رووداوانەی کە وای لێکردین ئەمرۆ خۆ دابمەزرێنین"، واتا، سنوورە تیۆرییەکانی رێکخستن بوارەکانی مەعریفە و ئەخلاق و جوانناسی. ئەم لێپرسینەوە مێژووییە دەبێت بهێنرێتە ناو ئەمڕۆوە، دەبێت خۆی بخاتە ناو ئەزموونی راستییەکانەوە، راستیی هاوچەرخ، هەم بۆ ئەوەی بزانین لە چ خاڵێکدا گۆڕان دەشێت و خوازراوە، هەم بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر شێوەی وردی ئەو گۆڕانکارییە بدەین". لەم خاڵەدایە کە بڕیارەکانی فۆکۆ گرفتارکردنە *problematisation* جیاوازەکانی سنووری شێوەکانی هزرمان، کە ئاماژەیەکە هاوشێوەی جوانناسی "خۆشیی پاك و بێلایەن"، جێ دەهێڵێت و دەچێتە ناو بوارێکی گرفتارکەری زیاتر، کە بریتییە لە ناوەڕۆك و رۆڵێکی هاوچەرخ بۆ جوانناسی.

جوانناسییەکەی فۆکۆ بۆ بوون، وەکو پیشانمدا ژمارەیەك ئاڵۆزیی دژواری تێدایە. ئەم

جوانناسیکردنه سەرەتای گۆڕان فەرامۆشدەکات — ئەمەش خاڵێکە کە گۆڕانی ورد و دیاری ئێستا دەشێت لەوێوە دەستپێبکات. داواکاریی ئەوەی کە "ژیانی هەموو کەسێك ببێتە کارێکی هونەری" نادیارییەکی گرنگی تێدایە. کردنی ژیانی کەسێك بە کارێکی هونەری یان بە جۆرێك لە (بەماددەکردن *reification*) دەگەیەنێت: هونەرو ژیان ببنە بابەتێکی جوانناسی، یان جوانناسیکردنی ژیانی مرۆڤ لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ پرۆسەیەك: ژیان و جوڵانەوە بەپێی دەستەیەك پێوەری جوانناسی. ئەگەری یەکەم پیشاندەری حاڵەتی ئێستای زۆربەی ئەو بابەتانەیە کە بە جوانناسی ناو دەبرێن. بەهاکانی بریتین لە بەهای بەکوتاڵکراوەکان *commodified*. ژیانی مرۆڤ کاتێك ناو دەنرێت "جوانناسی کە پێشینە بابەتە هونەرییەکان لە بەهاکانی کوتاڵ رزگار کرابن. بە واتایەکی دیکە، زۆر ستەمە ئەندێشەی ژیانێکی "جوانناسی" بکەین، ئەگەر خودی کارە هونەرییەکان ئەم بوونە نەپارێزن. خستنی چەمکی جوانناسی بەر تاقیکردنەوەی واقیعی هاوچەرخ پێویست بە ناسینەوەیەکی راستیی پایەی هەنووکەیی هونەر و جوانناسی دەکات، ئەمەش شتێکە فۆکۆ نەیتوانیوە پێشکەشی بکات. بەڵام ئەم پرۆژەیە دەتوانێت سوود لە ئاشکرا کردنەکانی جیهانی یۆنانییەکان (کە فۆکۆ پێی هەستا) وەربگرێت، بەڵام بە مەرجێك رۆڵێکی زۆر جیاواز بدرێت بە بڕیارە جوانناسییەکان.

فۆکۆ پێی خۆشە جوانناسی سەربەخۆیی هونەر – بابەتەکان بگەڕێتەوە بۆ تواناکانی خۆداهێنەری تاکەکان، بەڵام کێشەی ئەمە، کە هەندێجار سەردەمی گەشانەوەی فەرهەنگی یۆنانییەکان فەرامۆشدەکات، لەو پرسیارەدایە کە خۆی دەیخاتە روو: "چۆن دەتوانرێت گەشەکردنی تواناکان لە توندوتیژبوونی پەیوەندییەکانی دەسەڵات جیابکرێنەوە؟" ئەوەی سەیرە، جوانناسی لای فۆکۆ بەشێوازی یۆتۆبیایەك کار دەکات، هاوتەریبە لەگەڵ بۆچوونەکانی رۆرتی و ئیگڵتن کە پێشبینی دنیایەك دەکەن کە تواناکانی مرۆڤ تیایدا "جیاکراونەتەوە" لە دەسەڵات (یان زاڵبوون)، یان بەلایەنی کەمەوە، دنیایەك کە تیایدا مرۆڤ جارێکی دیکە پەیوەندیی کردۆتەوە بە دەسەڵاتەوە بە شێوەیەکی پۆزەتیڤتر و بەسوودتر.

وەکو وتم، کێشەی زۆر هەیە لە بۆچوونەکانی فۆکۆ لەمەڕ جوانناسییەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە دەبێت وازی لێ بهێنین چونکە یۆتۆبیاییە. وەکو چۆن ئۆسکار وایلد تێبینی کرد "ئەگەر نەخشەیەکی جیهان یۆتۆبیای تێدا نەبێت شایانی ئەوە نییە کە سەرنجی بدەین". رەنگە گرفتی سەرەکیی نەخشەکەی فۆکۆ ئەوەبێت کە یۆنانییە.

**سەرچاوە**

***Radical philosophy 63 (spring 1993)***

***Foucaults Aesthetics of Existence***

# فۆکۆ و مۆدێرنیته

## ئەگنش هیللەر دەربارەی فۆکۆ ئەدوێت

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی



"ئەگنش هیللەر" قوتابییەکی هەڵکەوتووی "قوتابخانەی بوداپست" بووە کە لە سەرەتای حەفتاکاندا لە هەنگاریاوە بەرەو ئوستورالیا ڕۆیشت و لەو کاتەوە چالاکانە لە بواری فەلسەفەی مێژوو و ئاکار و تیۆرەکانی مۆدێرنیتەدا کاری کردووە.

ئەگنش هیللەر مامۆستای کورسیی "هانا ئارینت"ە لە قوتابخانەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکانی نیویۆرك و تا ئێستاش لەوێ وانەی "ئاکاری کانت" و "فەلسەفەی میشیل فۆکۆ" ئەڵێتەوە.

لە کتێبەکانی: کۆمیدیای نەمر، شەکسپیر وەك فەیلەسووفی مێژوو، تیۆرەی مۆدێرنیتە، ئەودیو داد، تیۆرەی مێژوو، تیۆرەی پێداویستی لە ڕوانگەی مارکسەوە، ئایا دیموکراسی ڕزگاری دەبێت؟

ئەمە پوختەی موحازەرەیەکێتی بەناوی "فۆکۆ و مۆدێرنیتە"وە کە لە ئۆردیبەهەشتی ئەمساڵ (1384) دا لە تاران پێشکەشی کرد.

هیللەر قسەکانی خۆی بەو پرسیارە دەستپێکرد کە بۆچی پێویستە بایەخ بە فۆکۆ بدەین؟ بە بۆچوونی ئەو فۆکۆ فەیلەسووفێکی ناسراوە و لە دوا وەچەی فەیلەسووفە گەورەکانی فەرەنسایە.

ئەو لە وەڵامی پرسیاری: "بۆچی من فۆکۆم هەڵبژارد؟"دا وتی کە هۆی ئەو هەڵبژاردنەی فۆکۆ ئەوەیە کە ئەو وەڵامێکی گرنگ و سەرنجڕاکێشی مۆدێرنیتەی داوەتەوە.

هیللەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت کە: "نزیکەی بیست ساڵێك لەمەوبەر ئێمە بە چەمکی پۆستمۆدێرنیزم ئاشنابووین و بە تەواوی

فەیلەسووفەکانی ئەم قۆناغەمان وت فەیلەسووفی پۆستمۆدێرن، بەڵام فۆکۆ هەرگیز خۆی وەك فەیلەسووفێکی پۆستمۆدێرن نەناساندووە و هەمیشە لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا نەیار بووە و دەیزانی کە پۆستمۆدێرنیزم قۆناغێکی تازە نییە لە مێژووی خۆرئاوادا، تەنانەت کۆتایی مێژووش نییە، بەڵکو ڕوانینێکی تازەیە بۆ مەسەلەی مۆدێرنیتە. بەم پێیە مۆدێرنیتە لەگەڵماندایە. لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسادا لەدایکبوو و ئیدی لەو کاتەوە هەمیشە لەگەڵماندا بووە". ئەمەش ئەو هۆیەیە کە وای لە ئەگنش هیللەر کردووە کە فۆکۆ هەڵبژێرێت تا دەربارەی خودی ئەو و دەربارەی مۆدێرنیتە بدوێت.

وەکو هیللەر دەڵێت: "کاتێ فۆکۆ لە بارەی مۆدێرنیتەوە بیری کردەوە و لەسەری نووسی، هاوکات بوو لەگەڵ هەندێ ڕێبازی گرنگی تری وەکو بوونگەرایی کە سارتەر لێی ئەدواو، هەروەها ڕێبازی ماتێریالیزمی مێژوویی کە خۆی بە درێژەپێدەری مارکس دەزانی و پاشانیش ڕێبازی دەروونشیکاری کە ئەمیش خۆی بە درێژەپێدەری فرۆید و قوتابییەکانی دەزانی.

سارتەر تیۆرەکەی خۆی لەو قۆناغەدا خستەڕوو کە "ڕەخنە لە ئەقڵی دیالەکتیك"ی تیا نووسی و ئەودەم هەم بوونگەرا و هەم مارکسیست بوو و هەڵوێستێکی تەواو مێژووگەرایانەشی هەبوو.

مێژووگەرایی وەك حیکایەتێکی گەورە بایەخی بە مێژوو ئەداو مەسەلەکەش ئەوە بوو کە مێژوو هەر قۆناغێکی بڕیبێت، ئەوا ئەو قۆناغانە قۆناغی ئەقڵانی بوون و لەسەرخۆ تێپەڕاندوون، کەسانێکی وەکو هیگڵ و مارکس و سارتەریش پتر بایەخیان بەم مەسەلەیە داوە.

تێڕوانینی مێژووگەرایی و ئەو بایەخەی کە بە مۆدێرنیتەی دا ئەوە بوو کە مێژوو بریتیە لە یەك پرۆسە و ئەم پرۆسەیەش توانیویەتی لە شێوەی وزەیەکی پەنهاندا لە دونیای ئێستادا فۆرمەلە ببێت لەو کاتانەدا کە فۆکۆ دەستی بەکاری خۆی کرد، کۆمۆنیستەکان دەیانوت کە کۆمۆنیزم مێژووی ڕاستەقینەیە، لەبەرئەوەی (پێش – مێژوو) لە شوێنێکدا کۆتایی دێت و ئێمە دەچینە ناو مێژووی ڕاستەقینەوە. کەسانێکیش هەبوون کە باوەڕیان بە تیۆرەی داڕووخان هەبوو، نەك بە تیۆرەی پێشکەوتن و پەرەسەندن. واتە بەرامبەر بە تیۆرەی مێژووگەرایی کە باوەڕی بە پێشکەوتن هەبوو، ئەوان باوەڕیان بە داڕووخان هەبوو و، چەمکی داڕووخانیان بەرامبەر بە پەرەسەندن دادەنا.

فۆکۆ لە دۆخێکی وەهادا دەستی بە بیرکردنەوە و نووسین کرد و کاتێکیش دەستی بەکارکرد دەسبەرداری چەمکی پەیوەندیی گشتی بوو. بەبێ ئەوەی خۆیشی بە پۆستمۆدێرن لە قەڵەم بدات، لەگەڵ مێژووگەراییدا کەوتە زۆران. ئەوەی بەلای فۆکۆوە گرنگ بوو مێژووگەرایی نەبوو، بەڵکو تێڕوانینێکی نوێ بوو بۆ مێژوو و ئەوەش کە تۆ ناتوانیت لە مێژوودا بایەخ بە گشتێتییەك بدەیت و، ئێمە بەرامبەر بە یەك مێژوو نین، بەڵکو بەرامبەر بە کۆمەڵێك مێژووین".

هیللەر بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "هەر زوو سارتەر تێگەیشت کە فۆکۆ ڕەخنە ئاڕاستەی ئەو دەکات، بۆیە دەستی بە ڕەخنەگرتن لە فۆکۆ کرد. لەوە بەدواوە ئەو مەسەلەیەی کە هاتە ئاراوە ئەوە بوو کە فۆکۆ وەکو یەك مەسەلەی گشتی سەیری مێژوو ناکات. سارتەر ڕاستی دەکرد، بەڵام لەو ئەنجامانەدا کە پێیان گەیشتبوو، بەهەڵەدا چووبوو. تەنانەت هابرماسیش لە ڕەخنەکانیدا لە فۆکۆ بەهەڵەدا چوو بوو، لەبەرئەوەی سارتەر بە فۆکۆی دەوت کە وەکو یەك مەسەلەی گشتی سەیری مێژوو ناکات، هابرماسیش بە فۆکۆی دەوت تۆ فەیلەسووفێکی پارێزکار (موحافەزەکار)یت (کە لە بنەڕەتدا وانەبوو). فۆکۆ وەکو پرۆسەیەکی نەرم بایەخی بە مەسەلەی مۆدێرنیتەدا. ئەو شتەی کە

بەلای فۆکۆشەوە گرنگ بوو مەسەلەی حەقیقەت بوو، واتە ئەوەی کە "حەقیقەت چی بووە؟"

هیللەر دەڵێت: "لە چاخی ڕۆشنگەری بەدواوە دەبینین کە سەرچاوەی زانین لە جیهاندا و سەبارەت بە سروشت دەگۆڕێت، لەوە بەدواوە هەروەکو "ئارێنت"یش دەڵێت چەمکی سوننەتیانەی حەقیقەت بەرەو ئاوابوون دەچێت و لە "ماکس ڤێبەر" بەدواوە ڕووبەڕووی چەمکێکی نوێی حەقیقەتێکی زانستی دەبینەوە کە بەجۆرێك لە جۆرەکان چەمکێکی پووچەڵئامێزە (واتە قابیلی پووچەڵ کردنەوەیە — و. کوردی). کەواتە تەواوی فەلسەفە مۆدێرنەکان بەو ئەنجامە گەیشتبوون کە ئێمە شتێکمان نییە ناوی حەقیقەتی ڕەها بێت و پایە و بناغەیەکی قایمی تریش نییە. (ئەمە هەڵوێستێکە کە دێریداش ئاماژەی پێداوە). بەڵام مەسەلەی سەرەکی لای فۆکۆ ئەوە بوو کە "حەقیقەت چییە؟" و بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش پرسیارێکی تری هێنایە پێشێ کە "حەقیقەت چۆن بەرهەم دەهێنرێ؟" وەڵامی فۆکۆش ئەوەیە کە حەقیقەت لە گوتارێکی تایبەتدا بەرهەم دێ و ئەم گوتارە هەمیشە لە شێوەی ئۆتۆریتەیەکدا خۆی دەخاتە ڕوو. فۆکۆ دەڵێت کە مۆدێرنیتە بریتییە لە گوتاری جیاجیا و ئێمەش بەو پێیەی کەسانێکی مۆدێرنین و لە مۆدێرنیتەدا دەژین، لە کۆمەڵگایەکی گوتاریداین. ئێمە لە کۆمەڵێك گوتاردا دەژین کە هەندێك هەن بە گوتاری خۆیانی دەزانن و تیایدا جێگیر دەبن و هەندێکی تر لێی دەرکراون و هەندێکیش هەن نە لەناو گوتارەکەدان و نە دەرکراون لێی، بەڵام دیسانەوە ناشتوانن بچنە ناویەوە.

بەم پێیە ئەنجامەکە ئەوەیە کە ئێمە لەگەڵ پرۆسەی پەیوەندیی جۆراوجۆری ناو گوتاری جیاجیادا سەروکارمان هەیە."

هیللەر ئاماژە بۆ مێژووی شێتی دەکات و دەڵێت: "کاتێ فۆکۆ سەرگەرمی مێژووی شێتی دەبێت، ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکات ئەوەیە کە "شێت کێیە؟" وەڵامەکەشی ئەوەیە کە شێتی مانایەکە لە مۆدێرنیتەدا پەیدا بووە و وەکو گوتارێکی بابەتی خۆی نمایشدەکات. ئەم مەسەلەیە لە سەدەی نۆزدەدا لە شێوەی گوتارێکدا دەردەکەوێ، کە پێشتر وانەبووە. کەواتە ئەو حەقیقەتەی کە سەبارەت بە شێتی ئەدوێت سەبارەت بەو دەزگایانەیە کە ئەوانی تر بەشێت لەقەڵەمدەدات. ئەو شتەی کە حەقیقەتە یان حەقیقەت نییە ئێمە بە کۆمەڵێك دەزگاوە دەبەستێتەوە کە دەیانەوێ زانینێك کۆنترۆڵ بکەن یان قەوارەی زل بکەنەوە.

گوتار سەبارەت بە شتێك گوتارێکە کە سەبارەت بەو شتە دەزگایی کراوە. ئەمە ئەو مەسەلەیەیە کە دەربارەی شێتی لە ئارادایە، کە ئەم گوتارە لە شێوەی دەسەڵاتداردا دێت و ئەوانی تر بەشێت لە قەڵەم دەدات".

هیللەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: "کاتێك فۆکۆ لە زانستە مرۆییەکانی تۆژییەوە، ئەو شتەی بەلایەوە گرنگ بوو گۆڕینی ئەو گوتارانەی زانستە مرۆییەکان بوو کە قابیلی گۆڕانن. فۆکۆی لاو باس لە زانستە سروشتیەکان دەکات، بەڵام بەلای فۆکۆی پیرەوە زانستە سروشتیەکان مەسەلەیەك نییە جێی بایەخ بێت. فۆکۆ لە "سیستمی ستەکان"دا گوتارێکی نوێمان پێ دەناسێنێت. گوتارێك کە لەم کتێبەدا لە مەسەلەی شێتی جیاوازە و بابەتی سەرەکیی مەسەلەی "چەمکی مرۆڤ"ە. ئەوەی بەلایەوە گرنگە ئەوەیە کە گوتار سەبارەت بە مرۆڤ چۆن گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئەو ئەنجامەی پێیشی دەگات ئەوەیە کە هەموو ئەو شتانەی لەم گوتارانەدایە مەسەلەیەکی پێشینەیی مێژووییە و لە تەواوی گوتارەکاندا خۆی دەخاتە ڕوو.

فۆکۆ لە کارەکانی دواتریدا، کاتێ قسە لەسەر ئاکار و پەیوەندیی ئاکار بەدەسەڵاتەوە ئەدوێت، دەبینین چۆن ئەم کارەشی ئەنجامێکە بۆ تەواوی

توێژینەوەکانی پێشووی و، دیسانەوە لێرەشدا ڕەخنەگرانی فۆکۆ دەڵێن کە ئەو لایەنگری کۆتایی خود و کۆتایی مرۆڤە، لە کاتێکدا فۆکۆ خۆی لە دوا قۆناغیدا ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە کە تاقە شتێك بەردەوام تەوەری کاری ئەو بووە، مەسەلەی خود بووە نەك شتێکی تر."

هیللەر بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "فۆکۆ لە بەشی ئارکیۆلۆژیای زانیندا کاتێ دەیەوێ باس لە کاری خۆی بکات، لەو بەردەوامبوونەی قایل نییە و لەبری وشەی ئارکیۆلۆژیا وشەی جینالۆژیا بەکار دەهێنێت. هەروەها ئەو بایەخەی کە فۆکۆ بە کەسانێکی وەکو بلانشۆو تای و کەسانی تری داو کە قسە لەسەر کۆتایی نووسەر یان مەرگی نووسەر دەکەن، بەرو ئەوەمان دەبات کە بڵێین فۆکۆش هاوڕا لەگەڵ ئەواندا سەبارەت بە کۆتایی خود یان کۆتایی مرۆڤ ئەدوێت، بەڵام دەبێ وردبین و بزانین کە فۆکۆ لێرەدا بەشێوەیەکی نیچەییانە کاردەکات و هەرچۆن نیچە لە بارەی مەرگی خواوەندەوە قسەی کرد، ئەمیش بەوجۆرە باس لە مەرگی مرۆڤ دەکات.

ئێمە دەبینین فۆکۆ لە بەشێکی کارکردنیدا دەربارەی تەکنۆلۆژیای زانست و لە بەشێکی تردا دەربارەی تەکنۆلۆژیای دەسەڵات ئەدوێت و ئەمانە بەیەکەوە گرێدەدات و دەسەڵات وەکو گوتارێکی زانین بەکاردەبرێ، واتە وەکو فۆرمێکی دەسەڵات بەکاردەبرێ".

هیللەر لە ئاماژەکردنیدا بۆ مەسەلەی دەزگاکان و کتێبی "چاودێری و سزا" وتی: "چۆن زنجیرەیەك دەزگا وەکو دەزگای بەندیخانە بە دەوری شێوەیەکی نوێی زانیندا فۆرمەلە دەبێت و دەزگایی دەبێت. بەر لە قوتابخانەو دەزگا سەربازییەکان، ئەو مەسەلەیەی کە بەلای فۆکۆوە گرنگە، مەسەلەی بەندیخانەکانە. بێگومان لە قۆناغەکانی پێشوودا سیستمی بەندیخانەکان بەمجۆرە نەبووە و فۆکۆ لە خۆی دەپرسێت، کەواتە ئەمە چ مانایەکی هەیە کە ئێمە ئێستا ڕووبەڕووی سیستمێکی نوێی بەندیخانە بووینەتەوە؟ وەڵامەکەش لەوەدایە کە گوتاری زانین و گوتاری دەسەڵات پێکەوە و لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدان و هەموو شتێك دەگۆڕێ بۆ دەسەڵات و هەڵبەت لە پەیوەندییە مرۆییەکانیشدا پەیوەندییەکی دەسەڵاتیانە هەیە.

فۆکۆ لە سیاسەتدا ئەم مەسەلەیە لە شێوەی مایکرۆپۆلیتیکدا دەخاتە ڕوو و، قەسەکردنیشی لێرەدا بەتەنها دەربارەی دەوڵەت نییە، بەڵکو دەربارەی دەزگاکانەو، ئەوەی کە کام دەزگایانەی دەسەڵاتن کە لە پەنا دەوڵەتدا کاردەکەن، هەر بۆ نموونە قوتابخانە و بەندیخانە، کە بەندیخانە جەستە و بەدەنی ئێمە کۆتدەکات و فۆکۆ تەواوی ئەو مەسەلەیەی فەلسەفەی کۆن کە دەڵێت ئەوە نەفسی ئێمەیە کە لەناو جەستەماندا زیندانییە، هەڵدەگێڕێتەوەو دەڵێت لە ڕاستیدا ئەوە جەستەی ئێمەیە کە لە ڕۆحماندا زیندانی بووە، لەبەرئەوەی ڕۆح خودی زانین (مەعریفە)یەو زانینێکە کە جەستەمان زیندانی دەکات".

هیللەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: "کاتێ فۆکۆ دەربارەی دەسەڵات ئەدوێت، دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە لە ڕوانگەی فۆکۆوە دەسەڵات جۆرێکە لە بەرەنگاریش. واتە ئازادی وەکو بەرەنگاربوونەوە لەناو پەیوەندیی خودی ئەو دەسەڵاتەدا فۆرمەلە دەبێت.

فۆکۆ لە قۆناغی کۆتایی ژیانیدا و لە سیمینارەکانی کۆلیژ دۆفرانسدا لە توێژینەوەیەکیدا کە دەربارەی فەرمانڕەواییە سەرنجی ئەوە ئەدات کە دەوڵەت حاڵەتی "شوان"ی هەیە و دەیەوێ ڕێپیشاندەری خەڵك بێت، بەڵام فەرمانڕەوایی بەدیهێنەری بایۆپۆلیتیك یان سیاسەتی ژیانە کە بەتەنها دەیەوێ حوکم بکات.

کەواتە لێرەدا ئێمە دەگەینە فۆکۆی سێیەم کە پاش ئەوەی باس لە تەکنۆلۆژیای دەسەڵات و تەکنۆلۆژیای زانین دەکات، دەگات بە تەکنۆلۆژیای خودو، لەم قۆناغەشدا ستراتیژیەکی نوێ

دەستپێدەکات. ئەو بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی ئاکار (ئەخلاق) و ئاکاری کەسێتی دەدات، ئەو کەسێتییەی کە لە قۆناغی مۆدێرندا خۆی دەخولقێنێت.

لێرەدا فۆکۆ دەڵێت کە چۆن ئاکاری مۆدێرنیتە خۆی لە فۆرمێکی نوێدا دەبینێتەوە. ئەم توێژینەوەیەی فۆکۆ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەو لێکدانەوەیەوە هەیە کە بۆ مەسیحیەت دەیکات و ئەوەی کە مەسیحیەت بە چاولێکردن لە فەلسەفەی (ڕواقی) بەجۆرێك لە جۆرەکان جەستە دیل دەکات و ئارەزووش بە "شەخسی" دەکات. دوا بەدوای ئەمە مەسەلەی تەمێکردن و گوناهی یەکەم دێت. فۆکۆ لە یۆنانی و ڕۆمەکانی کۆن ئەدوێت و سەرنجی ئەوە ئەدات کە ئاکاری ڕۆمی و یۆنانیەکان تەواو لەگەڵ ئاکاری مۆدێرنەکاندا جیاوازە و لەوێدا ئێمە ڕووبەڕووی "فەزیلەت" ئەبینەوە نەك ئاکارێك کە ئەیەوێ جەستە بەند بکات. فۆکۆ هەرگیز وەکو مۆدێلێك سوودی لەوە نەبینی، بەڵام ئەوەی بەلاوە گرنگ بوو کە چۆن ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر "سێکشوالیتی" کە لە مۆدێرنیتەدا لە ئارادایە، لە درێژەی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەسەر مەسیحیەت، ئێمە دەخاتە ناو ئاکارێکی نوێوە و، باوەڕیشی وابوو کە "سێکشوالیتی" داهێنراوی مۆدێرنە کە لە درێژەی فرۆیدیزمدا هاتۆتە ئاراوە.

کەواتە لە سەردەمی مۆدێرندا ئەو مەسەلەیەی کە لەگەڵ سێکشوالیتیدا هاتە گۆڕێ ئەوەیە کە مەیلی سێکسی جێی هەموو لەزەتەکانی دونیای کۆنی گرتۆتەوە".

هیللەر گوتی: "ئەو پرسیارەی کە دێتە پێشێ ئەوەیە کە پێویستە لەگەڵ ئەم گوتارە سێکسیەدا چی بکرێ کە لە ڕێی فرۆیدیزمەوە هاتە ئاراوە؟ وەڵامی فۆکۆ ئەوەیە کە پێویستە "هەست" ببێتە بناغەی ئاکار و لە وتاری "نیچە، ژینالۆژیا و مێژوو"دا دەڵێت کە چیدی جیهانی ئێمە جیهانی پارادیم (نموونەی باڵا) نییە. بەهەرحاڵ ئێمە لەم دونیایەدا لە دایك بووین و هەر لە ناو ئەم دونیایەشدا دەمرین، دونیای باشتریش نییە و، ئەم جیهانەش جیهانێکی خەتەرناکە و هەمیشەش هەروا بووەو شتێك نییە ناوی یۆتۆپیا بێت و یۆتۆپیا نابێتە مۆدێلێکی کردەیی بۆ ئێمە. ئاسۆی بەردەممان ئاسۆیەکی داخراوە.

فۆکۆ لە کۆتایی ژیانیدا ئەگات بە "کانت" و خوێندنەوەی خۆی بۆ کانت و وتارە بەناوبانگەکەی "ڕۆشنگەری چییە؟". ئەوەی دەیشیڵێت ئەوەیە کە هەر بەڕاستی "کانت" ڕۆڵەی سەردەمی ڕۆشنگەرییە. لێرەدا هەڵوێستی فۆکۆ هایدگەری نییە و فۆکۆ هەڵوێستی تایبەتیی خۆی دەردەبڕێت".

هیللەر لە کۆتایی قسەکانیدا دەڵێت: "ئەوەی کە سەبارەت بە فۆکۆ زۆر گرنگە ئەوەیە کە ئەو بیرمەندێکی "شەخسی"یەو شوێنپێهەڵگری هیچ جۆرە "یزم —*ism*"ێك نییە. فۆکۆ نەیدەویست هیچ قوتابخانەیەك دابمەزرێنێت و لەسەروو هەموو ئەو قوتابخانانەوە بوو و خۆی بە بیرمەندێکی شەخسی دەزانی، تا ئەو ڕادەیەی کە وەختێ ڕۆژنامەوانێك لێی پرسی کە ئایا تۆ بونیادگەرایت یان پاش بونیادگەرا؟ ئەو لە وەڵامدا وتی: من میشیل فۆکۆم.

ڕەنگە فۆکۆ لەو کەسە کەمانە بێت کە پێمان دەڵێت سەر بە هیچ قوتابخانەیەك نییە. ئەمەش ئازایەتیەکە کە پێویستە ئەمڕۆ ئێمە بایەخی پێ بدەین و هەر ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی وای لە من کرد لەم کوڕەدا دەربارەی فۆکۆ بۆتان بدوێم".

**سەرچاوە**

www.iranartists.org

# "فۆكۆ" و سیاسەت

**كریستیان دولا كامبانی**

**لەعەرەبییەوە: سەردەم**



**رۆشنبیرو سنور بەزاندنەكانی دەسەلات:**

بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بۆچوونەی پێیوایە هۆشیاری سیاسی "فۆكۆ" لەدوای شۆڕشی 68 ی خوێندكارانەوە نەبێت دروست نەبووە، پێویستە ئەوە بەیاد بهێنینەوە كەتێڕامانی ئەو سەبارەت بەدەسەلات و هەستكردنی بەدەروەستی سیاسی، دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغەكانی سەرەتای ژیانی.. "فۆكۆ" ساڵی 1950 تا 1953 پەیوەندی بەریزەكانی پارتی كۆمۆنیستی فەرەنساوە دەكات، پاش ئەوە ماوەیەكی دورو درێژ لەولاتانی (سویدو ئەڵمانیاو پۆڵەندا)دا دەمێنێتەوە- لەو ماوەیەشدا بەتەواوەتی دەبێتە نەیارێكی سەرسەختی كۆمۆنیزم-. ماوەی نێوان ساڵانی 1966- 1968 كە لەولاتی تونسدا بەسەری برد، دوور لەتیورەكان بەواقعی جیهانی سێیەم ئاشنابوو، هەر لەوێشدا یەكەمین چالاكی خۆی بۆ پاڵپشتی كردنی خەباتی خوێندكاران دەستپێكرد.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش كتێبی (مێژووی دێوانەیی لەسەردەمی كلاسیكدا - 1961) لەهەموو رویەكەوە بەكتێبێكی سیاسی دادەنرێت، لەبەرئەوەی باس لەچارەسەركردنی نەخۆشیەكانی ئەقڵ دەكات *psychiatrie* و ئەو یاسا كۆمەڵایەتی و كلتوریانەشی ئەم زانستە پشتیان پێ دەبەستێت، ئەو شتەیەكە "میشێل فۆكۆ" زۆر بەتوندی دژایەتی دەكات.

راستە "فۆكۆ" بایەخێكی زۆری بەئەدەب و بواری زمانەوانی داوەو ئەمەش بەزەقی بەگوتاری كتێبی (وشەكان و شتەكان)ەوە دیارە كەساڵی 1966 چاپكراوە، هەروەها بوونی پەیوەندیەكی كەم و كورتخایەن لەنێوان ئەوو بونیادگەریدا، رەنگە وامان لێبكەن بڵێین "فۆكۆ" خۆی لەقەرەی كێشە كۆمەڵایەتیەكان نەداوە، چونكە كارێكی وا دەبێتە مایەی ئەوەی گوتاری فیكری ئەو بەسیاسەت بارگاوی بێت. بەلام مەسەلەكە بەوجۆرە نیە،



بەڵگەش بۆئەمە ئەوەبوو ساڵی 1975 کتێبی (کۆنترۆڵ و سزا)ی بڵاوکردەوە. ئەم کتێبەی کەباشترین کتێبی "فۆکۆ" یەو لەهەموو کتێبەکانی دیکەشی سیاسیترە، پەیوەندی بەناوەڕۆکی کتێبی (مێژووی دێوانەیی) یەوە هەیە.

پاش رەخنەگرتنی لەدامەزراوەی چارەسەرکردنی دەرونی، "فۆکۆ" دەستی کردبە رەخنەکردنی دەزگابیرازکارەکان *penitentiaire*. ئەوەشی زیاتر دەکەوتە بەرشاڵاوی رەخنە، کۆمەڵگەی تەکنۆکراتی و ئیرادەی ئەو کۆمەڵگەیە بوو لەچاودێریکردنی تاکەکەسدا. "فۆکۆ" هێندە بەتوندی کەوتە رەخنەگرتن لەوکۆمەڵگەیە، ناچار بوو ساڵی 1970و کاتێك لەکۆلێژ دی فرانس دەست بەکاربوو، جارێکی تر خۆی لەجموجوڵە شۆڕشگێڕیەکانی چەپە توند ڕەوەکانی ئەو سەردەمە نزیك بکاتەوە، بەتایبەتیش چەپە ماوییەکان.

لێرەوە "فۆکۆ" لەشوباتی 1971 تیمێکی بۆ لێکۆڵینەوەکردن دەربارەی شێتی (*Gip*) دروستکردو تاساڵی 1976 سەرپەرشتی چالاکیەکانی کردن. لە ماوەی ئەو ساڵانەداو سەرباری توێژینەوەکانی لەکتێبخانەی نیشتمانی پاریس، بەشێکی گەورەی کاتی خۆی بۆ جموجوڵ و چالاکیە جۆراو جۆرەکانی وەك: (کۆڕو کۆبونەوەو رێپێوان و بەیاننامە دەرکردن) تەرخان کردبوو، هەموو ئەمانەش دەچێتە چوارچێوەی بەشداریکردنی لەبواری سیاسیدا.

ئەم بەشداریکردنانەش "فۆکۆ" بەبەشێك لەئەرکی رۆشنبیرانی دەزانی و پێی وابوو دەبێت رۆشنبیران لەبەرەی کەمینە زۆر لێکراو چەوساوەکاندا بن: (پەناهەندەو زیندانیکراوو نەخۆش و..هتد)، ئەمەش بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو دەسترێژی و سنور بەزاندنانەی دەسەڵات ئەنجامی دەدات و قوربانیەکانیشی کەمینەکان و پەراوێز کەوتوەکانی کۆمەڵگەن.

"فۆکۆ" بەپێچەوانەی مارکسیستە ئەرسۆدەکسیەکان و تەنانەت بەپێچەوانەی هاوڕێ و دۆستانی "ژان پۆل سارتەر" یشەوە (ئەمانیش سەرگەرمی هەمان ئەو خەباتە بوون کە فۆکۆ خەریکی بوو)، دژایەتی ئەو ناهەقیانەی نەدەکرد کەدەسەڵاتێکی دیاریکراو ئەنجامی دەدان، بەڵکو ئەو دەسەڵاتی بەشێوەیەکی گشتی رەخنەدەکردو ناڕەزایی لەدژی دەردەبڕی.

هاوکات رەخنەی زۆری لەحکومەت دەگرت، نەك هێرشی بکاتە سەر. ئەو ناڕەواییانەی حکومەت رێدەدات بەکردنیان، سەرەڕای بوونی یاساگەلێك کە پێویستە خودی حکومەت خۆی رێزیان لێ بگرێت (لەوانە بۆنمونە کەپەیوەندی بە پەنابەرانەوە هەیە).

"فۆکۆ" بەشێوەیەکی رادیکاڵی دژایەتی دەسەڵاتی نەدەکرد، بەڵکو بایەخی زیاتری بە کێشە یاساییەکان دەدا (ئەم کێشە یاساییانەش پانتایی بیرکردنەوەی ئەویان داگیرکردبوو). لەلایەکی ترەوە "فۆکۆ" سڵی لەوە نەدەکردەوە کارو ئەرکی بەڕێوەبردن لەسەر ئاستی ئەکادیمی بگرێتە ئەستۆ (وەك دامەزراندنی زانکۆی ڤانسین ساڵی 1979)، هەروەك چۆن بەرلەوەش لەسەر ئاستی رۆشنبیری لەدەرەوەی فەرەنسا، چەند بەر پرسیارییەتێکی وەرگرت. بەکورتی دەتوانین بڵێین ئەو لەیەك کاتدا رۆشنبیرو ئەکتیڤیستیش بووە.

دواتریش رووداوێکی تێپەڕ دێتە گۆڕێ، ئەویش لایەنگیری کردنی "فۆکۆ" یە لەشۆڕشی ئێرانی و ئیمام "خومەینی" لەساڵی 1978 (خومەینی لەو سەردەمەدا پەناهەندە بوو لەفەرەنسا)، تەواو دوپاتی ئەوە دەکاتەوە کەئەگەرچی "فۆکۆ" نەیاری هەندێ رژێم بوو، (وەك رژێمی حەمە رەزا شاو فرانکۆ)، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دژایەتی ئایدیای دەوڵەتی وەکی خۆی کردبێت، یان دژبە تەواوی ئەو کەسانە بووبێت کەکاروباری رۆژانەی دەوڵەتیان بەڕێوەبردووە.

بێگومـان تێگەیشـتنی "فۆکـۆ" بـۆ جەوهـەری ڕاسـتەقینەی ئیسـلامیزم، تێگەیشـتنێکی هەڵـەبوو، بـەڵام هـەر زوو درکـی بـەم هەڵەیـەی خـۆی کـردو پەشیمانی نیشاندا. کەواتە بەبۆچونی ئەو دەسەلات شـەڕو خراپـە نیـەو لـەئارەدا نـەبوونی دەسـەلاتیش (ئەنارخیا) خێرو چاکە نیە. ئەڵبەتە هەڵوێستی ئەو لەم مەسەلەیە زۆر لەوە ئاڵۆزترە.

بـەر لەهەرشـتێك "فۆکـۆ" بـەڕاناوی تـاك بـاس لەدەسـەلات ناکـاتو باوەڕیشـی بەوەنیـە دەوڵـەتی سـێنترالْ تـەعبیر لەدەسـەلات بکـات. ئەوپێیوایـە دەوڵــەت پەیکــەرێکی بەتاڵــەو دەســەلاتە زۆرو ڕاسـتەقینەکانیش لەجێگەیـەکی تـرن، یـان ڕاسـترە بڵێین بەجەستەی کۆمەڵایەتیدا ڕۆچوونەتە خوارێ. "فۆکۆ" پێی وایـە دەسـەلات لەهەموو شوێنێکدایەو وردە دەسـەلات (یـان مـایکرۆ دەسـەلات) لەپانتاییـە بچوکەکانەوە سەرهەڵدەدات.

ترسناکترین جۆری دەسەلاتیش بەبڕوای ئەو، ئەو مۆدێلەیـە کەلەسـەرەتای سـەدەی نۆزدەهەمـەوە ئامادەیـەو خـۆی خزاندۆتـە نـاو ڕێوشـوێنە جـۆراو جۆرەکــانی چــاودێرکردن کەلەلایــەن سســتمی بــەڕێوەبردنی دەوڵەتــەوە ســەپێنراوە، هاوکــات بەشێوەیەکی ناڕاستیش خۆی خزاندۆتە ناو گوتارە زانستیەکانیشــەوە کەئــەو سســتمە پشــتی پــێ دەبەسـتێت، بۆئـەوەی خەسـڵەتێکی ئـەقلانی بداتـە ئـەو تـەکنیکی کۆنترۆڵکردنـەی لەئاستی کۆمەڵگـەدا پەیڕەوی دەکات.

ئـەو چۆنیەتیەی کـە "فۆکۆ" باسـی لەچـەمکی دەسـەلات دەکردو هاوکات ڕەخنەگرتنیشی لەئـەقڵ بەشــێوەیەکی گشــتی، وایکــرد ڕوبــەڕوی خــراپ لێتێگەیشـــتنی "یـــۆرگن هاپرمـــاس" بێتـــەوە. "هابرمـاس" پێیوایـە ئـەقڵی یۆنڤێرسـاڵی لەسـەروی ڕەخنـە لێگرتنەوەیـەو دەوڵـەتیش قسـەکەری یـەك لایەنە. ئێمـە سـەبارەت بـەم مەسـەلانە، خەفەت لـەوە دەخۆین کـەدیالۆگێکی ڕاستەقینە لـەنێوان ئـەم دوو فەیلەسـوفەدا دروسـت نـەبوو. بێگومـان ئەمـەش دیــالۆگێکی قــورس و گــران بــوو، لەبەرئــەوەی "هاپرماس" تائەوپـەڕی باوەڕی بـەڕۆڵی تـەبابوون و کـۆدەنگی هــەبوو، لەکاتێکــدا "فۆکــۆ" بــاوەڕی بـەجیاوازی زیـاتر بـوو. لەگـەڵ ئەوەشـداو سـەڕای جیـاوازی نێوانیـان، نابێـت ئـەوەمان لـەیاد بچـێت کەهەریـەك لـەوان لەواقیعـدا نـەیارێکی هاوبەشـیان هەبوو: ئەوان دژایەتی خودی دەسەلاتیان نەدەکرد، هێنـدەی بەگژ ئـەو مۆدێلی دەسـەلاتەدا دەچوونەوە کەلــەم ســەردەمە تەکنۆکراتیــەدا لەئارەدایــە، واتــە لــەدژی مــایکرۆ– دەســەلات *Micro- Pouvoir* دەجـەنگان، ئـەو مـایکرۆ– دەسـەلاتەی بـەبیانوی ئـەوەی ژیـانی ڕۆژانـەمان ئـەقلانی دەکـات، ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ هەوڵـدەدات ڕۆح و جەسـتەمان کـۆنترۆڵ بکات.

"فۆکـۆ" وەك چـۆن دژی مانەویـەتی سیاسـی بـوو، بەهــەمان شـێوە دژ بـەتیرۆرزمیش بـوو کـە ئەمەش جگە لە دەرەنجامێکی مانەویەت شتێکی تر نییـە.. "فۆکۆ" دژی دەرکردنـی "کلـۆس کراوسـن" بـوو لەفەرەنسـا، وەك ڕێـز گرتنێکـی ئـەو لەڕاسـتی، هاوکات بەتوندیش دژایەتی ئەو ڕەفتارانەی دەکرد کەرێکخراوی (بادن بادەر) ئەنجامیان دەدا.

لەواقیعدا "فۆکۆ" کەسێکی دیموکراسی بوو، ئەگەرچــی مەســـەلەی ململانێـــی چـــینایەتی نەیدەجولانـــد، بـــەڵام زۆر بەگــــەرمی داکــــۆکی لەمافەکانی تاکەکەس دەکرد.. فەردگەرایی ئەویش لەفیکری "فردریش نیچە"وە سەرچاوەی دەگرت.

ئێمـە تـەنها بـۆ ئـەوە بـەداخین کـەزوو مـرد، بەرلــەوەی بەچــاوی خــۆی ببینێــت ژیــان و بەرهەمـەکانی چ کاریگەرییـەکیان لەسـەر گـەنجان– لەوانـەش مارکسیسـتە کۆنـەکان– دروسـتتکردووە، "فۆکـۆ" زانـی چـۆن چـۆنی چـاوی ئەوانـە بەسـەر شێوازی بیرکردنەوەی نوێدا بکاتەوە.

### سەرچاوە

گۆڤاری "الفکر العربی المعاصر"، تشرینی دووەم/ کانونی یەکەمی 1989.

# میشیل فۆکۆ، حەقیقەت و دەسەڵات

عەلی تاجداری

لە فارسییەوە: فەرەیدون بێوار



**ژیاننامە:**

میشێل فۆکۆ لە (15ی ئۆکتۆبەری 1926) لە پواتیەی فەرەنسا هاتۆتە دنیاوە. دوای خوێندنی لە خوێندنگە حکومیە ناوچەییەکان لە پواتیە، لە خوێندنگەی کاتۆلیکەکان کۆتایی بە خوێندن هێناو لە ساڵی 1945ز لە ئامادەیی (هانری چوارەم) وەرگیرا. ئەم ئامادەییە تایبەت بوو بە دەستەبژێر و هەڵکەوتووەکان. میشێل فۆکۆ لەو خوێندنگە ئامادەییەدا لای –ژان هیپۆلیت– هیگڵ ناسی بەناوبانگ، سەرگەرمی خوێندن و خوێندنەوە بوو، تاکو لە ساڵی 1948دا بەکالۆریۆسی فەلسەفەی لە ژێر چاودێری هیپۆلیت و ئالتۆسێردا وەرگرت.

لە ماوەی ساڵەکانی (1950–1952) بەکالۆریۆسی پزیشکی دەرونی و دیپلۆمی ژیاننasی دەرونی بەدەستهێناو دوو ساڵ لە ئەکول نرمان وانەی ووتەوە، لە ساڵی 1954دا فەرەنسای بەجێهێشت و لە زانکۆی ئیسپالای سوید خەریکی وانە ووتنەوەبوو.

دواتر لە ساڵی 1970دا بە پرۆفیسۆری کۆلێژی دوفرانس هەڵدەبژێردرێت، واتا لە تەمەنی چل و چوار ساڵیدا دەبێتە خاوەن کورسی ژان هیپۆلیت.

"رۆژی (2ی دیسامبەری 1970) کارتیەلاتن لە پاریس، روخسارێکی ئاوارتەیی هەبوو، سەدان کەس کۆببوونەوە تاکو گوێ لە قسەکانی پیاوێك بگرن کە لە تەمەنی چل و چوار ساڵیدا بەجێنشینی یەکێك لە ناودارترین و کاریگەرترین پرۆفیسۆرانی فەلسەفە لە سەدەی بیستەم، واتە ژان هیپۆلیت –

هەڵبژێردرابوو. پیاوی تەمەن چل و چوار ساڵەی پشت مێزی وتاردان.. کەسێك نەبوو جگە لە میشێل فۆکۆ.."

هەموو کاتێك لە خۆناساندن خۆی بە دوور دەگرت، چونکە بەراوبۆچوونی ئەو ناسنامە سەرکوتکەری دەسەڵاتە. فۆکۆ دەڵێت: "کاری پشکنینی ناسنامەکان بۆ پۆلیس و بوروکراوتەکان دابنێن، بهێڵن لە ناسنامەکەم ڕابکەم، ڕێگەیەکم پیشان بدەن بۆ ئازادبوون لە دیکتاتۆری روخسارم".

بە بۆچوونی ئەو ئازادبوون لەو بەندە پێویستی بەئەوە هەیە کە بڵێین قابیلی ناونان نین، ئیتر نە ئەوانین و نە ئەوانیش هەن.

سەبارەت بە سەرچاوەی کۆمەڵایەتی فۆکۆ، لەوانەیە هیچ دەربڕینێك لە وتەکانی خۆی باشتر نەبێت کە ساڵی 1986 لە دیمانەیەکی گۆڤاری تایمدا کردوویەتی، لەوێدا دەڵێ: "من یادەوەرییەکی دوورم هەیە لە جیهانێك کە بە شێوەیەکی تەواو هەڕەشەکار بووە و دەشیتوانی تێکمان شکێنێت. ژیان لە تازە لاویدا لە بارودۆخێکدا کە دەبوو کۆتایی بێت، کە دەبێ ببێت بە دنیایەکی دی. جیهانێکی چاکتر یان خراپتر، ئەو مەزەندەیە دەخولقێنێ کە تەواوی دەورانی منداڵیت لە شەودا بەسەر بردووە، لە چاوی چاوەڕوانی بەیاندا ئەو چاوەڕوانیە بۆ جیهانێکی دی مۆرێکی بە مرۆڤەکانی نەوەی منەوە ناو، ئێمە خەونی ئاخر زەمانمان لەگەڵ خۆدا ڕەنگە بە زیادە ڕۆییەوە، تا ئێستا ڕاکێشابێت.

فۆکۆ جەنگی جیهانی ئەزموون کردبوو، لە لوتکەی هیواخوازی بە دیموکراسی رووبەڕووی فاشیزم ببۆوەو، لەبەرئەوە بەرانبەر بە ئاییندە رەشبین و بێ ئومێد بوو، فۆکۆ هەموو جۆرە خۆشبینیەکی لە شێوەی مارکسیزم، هیگلی، دیاردەناسی، هێرمۆنۆتیك یان زانست بە جۆرە بیرکردنەوەیەکی ئارەزومەندانە دەزانی کە دەرەنجامێکی زیانبەخشی هەیە.

شۆڕشی خوێندکارانی فەرەنسی لە ساڵی 1968داو پارێزکاری (یان کۆنەپەرستی) حیزبی کۆمۆنیست و پشتگیری نەکردنی حیزب لە خوێندکاران، سەرنجی ئەوی بۆ هەرەسهێنانی مارکسیزم و بێ توانایی لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هاوکێشە نوێیەکاندا (وەکو ئافرەتان و ژینگە و کەمایەتیەکان و تاوانکاری..) راکێشا.

ئەو دەڵێت: "مارکسیزم بۆ تێگەیشتن لە نهێنیەك کە ئێمە ناوی دەسەڵاتمان لێناوە هاوکاریمان ناکات".

فۆکۆ ئومێدی خۆی بە هێزی مرۆڤەکان (خودەکان) بۆ بەرانگاربوونەوەی بونیادەکان لە دەستدا. چونکە بڕوای وابوو کە نەریتی هیگلی نەك تەنیا گوشاری بونیادەکان لە تاکەکان دەشارێتەوە، بەڵکو زیاتریان دەکات. پاشماوە نائومێدەکانی رووداوی مایسی ساڵی 1968 لەو هەلو مەرجەدا لە مارکسەوە رویانکردە نیچە. بەڵام دەبێ بزانین بۆچی؟ گیدنیز بەمجۆرە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە: "چونکە نیچە پەناگەی ئەو کەسانەیە کە وەهمی مۆدێرنگەرایی خۆیان لە دەستداوە بێ ئەوەی کە بکەونە ناو رەشبینی یان بێ لایەنی تەواوەوە.

### سەرچاوەی بیری فۆکۆ

ئەگەرچی سەرچاوەی بیری فۆکۆ بە سانایی لەسەرچاوە کۆمەڵایەتیەکەی جیاناکرێتەوە، بەم حاڵەشەوە هەندێك لە رێباز و قوتابخانە گرنگەکانی رۆژگاری خۆی کاریگەری دوولانەیان لەسەری داناوە، فۆکۆ ئەو رێباز و قوتابخانانەی خوێندەوەو فێریان بوو، بەڵام هیچ کاتێك پابەندیان نەبووە و رەنگە بە هۆی رەخنەگرتن لەو رێباز و قوتابخانانەوە لە ئەوان سەروتر چوو بێت.

هیگڵ و تێڕوانینی نوێی روناکبیران بۆ هیگڵ:
ناوەڕۆکی سەرەکی باسی ئەم روناکبیرانە: "چۆنێتی پێوەندی نێوان بونیاد و خود لە مێژوو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا" بوو، پرسیار ئەوە بوو کە ئایا تاك توانای ئەوەی هەیە دەسەڵات و هێزی خۆی لە بەرامبەر بونیادە دامەزراوەکانی و سەرو تاکە کەسیەکاندا بخاتە گەڕ. وەڵامی هیگڵ بۆ ئەم پرسیارە تەواو خۆشبینانە بوو، ئەو هەستەیشی دروست دەکرد کە مرۆڤەکان (خودەکانی مێژوو) لە توانایاندایە کۆتایی بە ملکەچێتی خۆیان بێنن. "هێگل لە وەڵامدا بۆ بارودۆخە نوێیەکان گوتی: خودەکان هەردەم لە باری فۆرم پێدان و شەڕکردن و جێنشین کردنی بونیادە واقیعییەکانی خۆیانن.. سەرەنجام لە نێوان ئومێدە زەینیەکانی مرۆڤ و هەلومەرجی مێژوویی و بونیادە واقیعیەکانیدا سازش و ئاشتی بەدی دێت".

بەڵام فۆکۆ دژی گشت نەریتی هیگلی شۆڕشی کرد. ئەو بڕوای وابوو دەبێ مرۆڤ فەرامۆش بکەین. "دەبێ کرۆکی گوتارەکان و بونیادە رواڵەتیەکان بناسین کە تیایدا مرۆڤ بە شێوەیەکی رێکەوت دروست دەبێت، و لێکدەپچڕێت". هیگڵ بڕوای وابوو سەرچاوەی بیر و مێژوو دیارنییە. لە کاتێکدا فۆکۆ دەڵێت: دەبێ بەدوای سەرەتا مەوجودانەدا بڕۆین و گۆڕانکارییە ناتەواوەکانی سەردەمی ئەمڕۆ تاوتوێ بکەین. ئەگەر هیگل دەیگوت مێژوو هوشیاریەکی ڕوو لە پێشە بەرەو لای حەقیقەت، فۆکۆ ئارەزوی بوو " ئەرکۆلۆژیای "خواستی حەقیقەت" بکات و بزانێ چۆن حەقیقەت وەك بەهایەکی ویستراو بۆتە پێوەری دیاریکردن و هەڵسەنگاندنی شتە دروستەکان لە نادروستەکان.

فۆکۆ جگە لە هیگڵ، رەخنە لە رێباز و قوتابخانەکانی دیکەش دەگرێت. ئەگەر دیاردەناسی و ئێگزیست نسیالیزم جەخت لەسەر هوشیاری ئازادی خودی تاکەکەسی دەکەنەوە و لە مرۆڤدا بە دوای واتادا دەگەڕێن. ئەوا فۆکۆ چالاکی واتابەخشی خودی خودموختار و ئازاد پەسەند ناکات، ئەگەر هێرمۆنۆتیك بەدوای دۆزینەوەی سەرچاوەکانی مانایە لەناو دەق و کردارە کۆمەڵایەتی و مێژویی و کلتوریەکاندا دەگەڕێت، نەوەك لە مرۆڤدا ئەوا فۆکۆ بڕوای بە حەقیقەتی کۆتایی نییە بۆ دۆزینەوە، فۆکۆ بە پێچەوانەی بونیادگەری لیڤی شتراوس و ئالتۆسێرەوە، حەزی بە دروست کردنی نموونەیەکی وێنەیی یاسارێژکراوی بۆ رەفتاری مرۆڤ نییە. هەروەها بە پێچەوانە مارکسیزمەوە لە بری جەختکردن لە پرۆسە گشتییەکانی مێژوو، جەخت لەسەر خەسڵەتە تاك نەیار و پەرشوبڵاویی روداوە مێژوویەکان دەکات، بۆ تێگەیشتن لە بەرهەم و بیرکردنەوەکانی فۆکۆ دەبێ چەمکە گرنگەکانی خوارەوە بە جوانی بناسین و تێیانبگەین.

مەرگی خوا (بەدەستهێنانی سنورداریێتی، مەرگی نووسەر، پێوەندی نێوان زانست و دەسەڵات، گوتار، رەگەزناسی مرۆڤی مۆدێرن، پێوەندیەکانی شێتێتی، مەرگ، تاوان و سێکسیەت لەگەڵ چەند تەکنەلۆژێکی دەسەڵات، پرۆسەی بە خودبوون یان ملکەچێتی. لەم وتارەدا چەمکی دەسەڵات لە تێڕوانینی فۆکۆدا دەخەینە ڕوو.

## دەسەڵات

فۆکۆ هاوکێشەی دەسەڵات بەمجۆرە دەخاتە ڕوو "من بڕوام وایە کە تێگەیشتن و ناسینی ئەوەی کە دەسەڵات لە کۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەی ئێمەدا بە چ شێوازێك بەڕێوە دەچێت و چ کارو ئامانجێکی هەیە، هێشتاکە زۆر کەمە". فۆکۆ چیدی هەژاری لە کۆمەڵگە رۆژئاواییەکاندا بە خاوەنی باڵاترین بایەخ دانانێت. پرسیاری ئەمڕۆ ئەوەیە کە چ کەسێك لە جیاتی من بڕیار دەدات؟ چ کەسێك لێناگەڕێ من فلان کار بکەم و دەڵێ فلان کار بکە؟ چ



کەسێك بەرنامە و پرۆگرام بۆ کار و چالاکیەکانی من دادەنێت".

هەرچەندە توێژینەوەکانی کۆمەڵناسی تارادەیەك توانیوێتی پیشانی بدات چ کەسانێك ئێستاکە بەسەر پیشەسازیدا، رابەرێتی دەکەن و داڕێژەرانی سیاسەت چۆن دروست دەبن و پەروەردە دەکرێن و لە کوێوە دێن، و هەرچەندە توێژینەوە مارکسیستیەکان سەبارەت بە دەسەلأت و سەروەری چینی بۆرژوا باشە. بەلأم بەبۆچوونی فۆکۆ بۆ وەلأمدانەوەی پرسیارەکانی سەرەوە دەبێ سەرنج بدەینە ستراتیژیەتی دەسەلأت و دامو دەزگاکان، و ئامرازەکان و هەموو ئەو هونەر و شێوازانەی کە بە هاوکاری ئەوان بڕیار قبوڵدەکرێت بۆ نمونە فۆکۆ لە توێژینەوەی بەندیخانە و دەسەلأتی سزایدا، بەمجۆرە پرسیاری خۆی دەخاتە روو کە بۆچی رەخنەگرتن لە بەندیخانە وەکو یەکێك لە بەها سزاییەکان جێگەی پەنابردن بۆ دوورخستنەوە یان ئەشکەنجەی گرتەوە؟

ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت وەلأمی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە، بە بڕوای ئەوان لە سیستەمی سەرمایەداریدا کار گرنگە هەر بۆیە قازانجدارترین سزادان، مەحکوم کردنیانە بە کاری ئیجباری، بەلأم چۆن دەکرێ ئەوان ناچار بەکار بکرێن؟ چاکترین شێواز بەندکردنیانە لە بەندیخانە و ناچار کردنیانە بەکار بەرێژەیەکی دیاریکراوو لە کاتژمێری دیاریکراودا. بەلأم فۆکۆ زۆر قەناعەتی بەم "بەڵگاندنە" نەبووە، لێرەوە بە دوای وەلأمێکی تردا دەگەڕێ. بە بڕوای ئەو دەبێ هۆکارەکە لە پرۆسەی پەرەپێدان و کامڵ بونی تەکنیکێك بۆ تەمێکردنی مرۆڤ لە رێگەی دیاریکردنی جێگە و بەندکردن و چاودێری و کۆنترۆڵی بەردەوام بەسەر هەڵسوکەوتیەوە و شێوازی ئەنجامدانی، بە کورتی (تەکنیکی بەرێوەبردن) بدۆزرێتەوە. بەندیخانە تەنیا یەکێك لە رواڵەتەکانی و ئاکامی گشتگیربوونی ئەو شێوازانەیە بۆ نێو بواری سزا، لەگەڵ بوارەکانی تری وەکو بارەگا، قوتابخانەی شەوانە رۆژی، کارگە گەورەکان و..

فۆکۆ لە توێژینەوەی دەسەلأتدا هەندێك گریمانەی لە زەیندایە:

1–دەسەلأت نەجەوهەرەو نە روکەش، بەڵکو جۆرێکی دیاریکراوی پێوەندی نێوان تاکەکانە.

2–تایبەتمەندی دەسەلأت ئەوەیە کە هەندێك لە تاکەکان دەتوانن کەمتازۆر تەواوی ئاکاری ئەوانی تر دیاری بکەن.

3–بەبێ بوونی زۆرەکی (بالقوە) یاخیبوون یان شۆڕش "بەرگری" یا دەسەلأت بوونی نییە.

4–عەقلأنی کردنی دەسەلأت هەموو سات و ئانێك لە کاردایە.

5–ئەم عەقلأنی کردنە کۆمەڵێك وێنەی دیاریکراو لە خۆ دەگرێت و لەگەڵ عەقلأنی کردن لە بواری ئابوری و پەیوەندییەکان و ئەوانی دیدا جیاوازە.

6–رەخنەگرتن لە دەسەلأت: چۆن شێوەیەکی عەقلأنی دەدرێتە پێوەندییەکانی دامەزراو لەسەر بنەمای دەسەلأت؟

7–دەوڵەت، هەم هۆکاری تاکانەیی کردن و هەم بنەمای تەواوخوازیشە.

رەنگە بتوانرێ بووترێت سەرەکیترین باسی فۆکۆ سەبارەت بە دەسەلأت لە کتێبی (چاودێری و سزا)دا خراوەتە روو.

فۆکۆ بۆ خۆی دەڵێت: دوای هەڵگیرسانی چەند بزاڤێك تایبەت بە سیستەمی بەندیخانەکان و رەوشەکانی بەندکردن، منیش پێم کێشرایە نێو ئەم بزوتنەوانەوە و بەهاوکاری بەندکراوە کۆنەکان کتێبێکم نووسی. مەبەستی فۆکۆ لەو کتێبە نوسینێکی مێژووییە کە بارودۆخی هەنووکە زیاتر شیاوی تێگەیشتن بکات و لەوانەشە ببێتە هۆی هەنگاونان. بە مانایەکی دی فۆکۆ ویستوویەتی ئەو

بارودۆخە شیاوی تێگەیشتن و شیاوی ڕەخنەگرتن بکات.

بە بۆچوونی گیدنیز درەوشاوەترین و ناوەڕۆکی سەرەکی باسەکانی فۆکۆ لە بارەی حەقیقەتەوەیە. پەسەندکردنی بەرفراوانی بەندیخانە لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا لە سەدەی نۆزدەدا، گوشاری گواستنەوەی سەرەکی لە بوارەکانی دەسەلاَتدا بوو.

لەم گواستنەوەیەدا لە سێدارەدان لە بەرچاوی گشتی، و ئەشکەنجە و پیشاندانی، گرنگی لە دوو پێوەندی نێوان دەسەلاَت و جەستەدا، جێگەی خوای بەبەندکردن، و جیاکردنەوەی دەسەلاَت لە جەستە، و لابرردنی ئێش و ئازارەو بیَ بەشکردن لە ئازادی، و تەمێکردن و پەروەردەی ئیسلامی دەدات. بە مانایەکی دی ڕێکخستنی کۆمەلاَیەتی لە حالَەتی شانۆیی "نمایشی مانادار بۆ حالَەتی ناچاری، جەستەیی، تاکی و شاراوەیی دەگۆڕێت.

ئەم دەسەلاَتە دیسپلینیە نوێیە بۆتە شتێکی نادیار و دەرونی و بە ڕەزامەندییەوە و بەسەر ئەزموونگەرەکانیدا جێبەجیَ دەکرێت. لەسەردەمی کۆندا، ئەشکەنجە زۆر لە رادە بەدەر و درێژخایەنەکان لە پێش کۆمەلاَنی خەلَکیدا، ڕێگەیەك بۆ تۆ..

جەختکردن لەسەر چۆنێتی بیَ چەند و چون و ڕەهای دەسەلاَت، بەبۆچوونی فۆکۆ لە زیادەرەوی لە ئەشکەنجەدا، ئابوری تەواوی دەسەلاَتی خۆی حەشارداوە. "لە ڕێگەی ئەشکەنجەوە، ڕێبازێك کە حەقیقەتی بەرهەم دەهێنا (بەندکراو ئەوەندە ئەشکەنجە دەدرا تا ئیعتراف بکات) لەسەرو ئەو ڕێبازەوە دانرا کە سەپێنەری سزادان بوو".

لە بارەی پێوەندی نێوان زانین و دەسەلاَت دەتوانریَ چەندین تێڕوانینی جیاواز بخەینە ڕوو. لەسەر بنەمای ئەو گفتوگۆیەی فۆکۆ لەگەلَ بۆنسنا ئەنجامیداوە.

ئەو تێڕوانینانەش بریتین لە:

1-ستراتیژییەکانی دەسەلاَت دەبنە هۆی دروستکردنی زانین.

2-مەبەست، زانستە مرۆییەکانە و نەوەك زانستە سروشتیەکان.

3-دەبیَ لەو مەسەلەیەدا بە دوای ئەو پەیوەندیەدا بگەڕێن کە چۆن ڕەفتاری مرۆۋ لە خالَێکی دیاریکراو بە دواوە، بوو بە مەسەلەیەك کە دەبیَ شیبکرێتەوە و تاوتویَ بکرێت.

4-میکانیزمەکانی دەسەلاَتی کۆمەلَگە و مرۆۋ پیشان بدرێن و شی بکرێن و بەشێوەی کێشەیەك بخرێتە ڕوو کە دەبیَ چارەسەر بکرێت.

5-چۆن زانست (یان زانستەکان) لە ئەوروپا بەشێوەی دەسەلاَت، حالَەتی دامەزراوەیی لە خۆ گرتووە؟ زانست لە ڕێگەی سیستەمی زانکۆیی و لە ڕێگەی دەزگا پڕ لە کۆت و بەند و سنورداریێتی تاقیگە و تاقیکردنەوە، بووە بە دەسەلاَتێکی دامەزراو.

6-بێگومان حەقیقەت یەکێکە لە بەشەکانی دەسەلاَت.

## دەسەلاَت و سێکس

فۆکۆ دەلَێت: "ئارەزوی سێکسی لە کۆمەلَگەی ئێمەدا بە یاسا و داب و نەریتە توندو تیژەکان کۆنترۆلَ دەکرێت، پێموایە کە بوارێکی باشە بۆ هەلَسەنگاندنی ئەم مەسەلەیە کە بە راستی میکانیزمەکانی دەستەلاَت چین. هەربەو جۆرەی گیدنیز بڕوای وایە تیوری دەسەلاَت، کەمەرەی مێژوی ئارەزوی سێکسی فۆکۆ پێکدێنێت. ئارەزوی سێکسی بەرهەمی دەسەلاَتە، نەك ئەوەی کە دەسەلاَت سەرکوتکەری ئارەزوی سێکسی بێت. سێکسوالێتی بایەخێکی سیاسی تایبەتی لەسەردەمی مۆدێرندا هەیە، چونکە پێوەندی بەو تایبەتمەندی و چالاکیانەوە هەیە کە لە خالَی

لێکچراوی نێوان دیسپلینی جەستەیی و کۆنترۆڵکردنی دانیشتواندا هەیە.

سێکس تۆڕێکی ڕێکەوتە لە ووتەکان و کردارەکان و چەمکەکان کە لە سەردەمی ئێستادا مرۆڤەکان لە چوارچێوەی پێوەندییەکانی دەسەڵات و گوتاردا دادەنێت، لە کلتوری مۆدێرندا سێکس وەك ئامرازێك بۆ زاڵبوون بەسەر بوونی مرۆڤەکاندا بەکاردەبرێت. هەندێك لە بیرمەندان بڕوایان وایە کە لەسەرەتای سەدەی (17) حەڤدەی زایینییەوە وەکو سەدەی (19) نۆزدە شاردنەوە سێکسیەکان بەو جۆرە توندنەبوو، سەدەی نۆزدەیەم ڕەواجدان بە کەلتوری ڤیکتۆریایی بەس لە بواری ئازادی کردار و وتاری سێکسی، لە چوارچێوەی هاوسەرێتی دابوو. واتا کردار و وتاری سێکسی کەوتە ژێر سەرکوتکردنی کۆمەڵایەتیەوە.

بەڵام فۆکۆ بەنیازی هەڵگێرانەوەی وێنای سەرکوتکردن بوو. واتە لە سەردەمی ڤیکتۆریایدا نەك هەر تەنیا سێکس سەرکوت نەکراوە، بەڵکو زۆر پەرەشی پێدراوە. لایەنگرانی کەلتوری ڤیکتۆریایی زۆر بەجدی و پارێزەوە کەوتونەتە لێکۆڵینەوە و گفتوگۆکردن سەبارەت بە سێکس. کاریگەری دەسەڵات لەسەر سێکس لە ڕێگەی کۆمەڵێك نیشانەی وەکو ئیعتراف وەرگرتن لە ئیماندارەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست و کۆنترۆڵکردنی هاوسەرێتی و پێوەندی هاوسەرێتی بەهۆی یاسا و نەریتەوە (پێوەندی ناشەرعی و لاوازی سێکسی) هەستی پێدەکرێ.

جگە لە مە بە بۆچوونی فۆکۆ زانین و دەسەڵات لە ڕێگەی چوار سۆنگەوە لەگەڵ سێکسدا پێوەندیان هەیە:

1-شێکردنەوەی ئەندامانی جەستەی ئافرەتان.

2-ڕۆشنبیرکردنی مناڵان لە بارەی سێکسەوە.

3-بە کۆمەڵایەتی کردنی مناڵبوون و لەدایکبوون (ڕێکخستنی خێزان).

4-بوونی لەزەتە جنسیە لادەرەکان بۆ ناو چوارچێوەی زانستی پزیشکی دەرونییەوە.

## پەراوێز

1-فۆکۆ، میشل، نظم گفتار، ترجمه بافرپرهام.

2-برنر، اریك، میشل فوكو، ترجمه بابك احمدی

3-فولادوند، عزت الله، خرد در سیاست

4-گیدنز، انتونی، سیاست جامعه شناسی و نظریة اجتماعي، ترجمه منوچهر صبوری

5-دریفوس، فراسوی ساختگرایی و هرمنوتیك، ترجمه حسین بشریه.

6-ضمیران، محمد، دانش و قدرت.

## سەرچاوە

گۆڤاری جامعه نو، ژمارە 7، ساڵی 1381.

# له كۆمەڵگای سزاوە بۆ كۆمەڵگای كۆنترۆڵ

## پێداچوونەوەیەك بە كتێبی ( كۆنترۆڵ و سزا )ی میشێل فۆكۆدا

مەریوان وریا قانع




ئەگەر یەكێ لە "موعجیزەكانی" ڕۆژئاوا دوای تەكنیك، خوڵقاندن و بەرهەمهێنانی تاكەكەس – فەرد– بێت واتە ئەو بوونەوەرە "ئازاد"ەی لە دوای ڕێنسانسەوە هاتە كایەوە و بووە سەردێڕی گوتارە فەلسەفی و پرۆژە سیاسی و تیۆرە ئەخلاقییەكان، ئەگەر تاكەكەس ئەو هێزە سەرزەمینیە نوێیە بێت، كە چینی بەخوداوەند ئاسمانیەكان لێژ كردبێ و سەرەتای ئەو پرۆژەیەی خوڵقاندبێ كە بە كۆجیتۆی دیكارتی دەستی پێكرد و بە مردنێكی "نیتشە"وییانەی خودادا تێپەڕی و بە بانگێشەی "مردنی ئینسان"ی فۆكۆییانە كۆتایی هات، بە كورتی ئەگەر تاكەكەس یەكەی هەرە سەرەكی و دابنەمۆی ڕاستەقینەی كۆسیستەمی ڕۆژئاوایی بێت، ئەوا ئەم كتێبەی "فۆكۆ" ئاركۆلۆژیای لەدایكبوون و ئاركۆلۆژیای كۆنترۆڵ و ئاركۆلۆژیای بوونی ئەو تاكە كەسەیە، گەڕانێكی قووڵە بەو سەرزەمینە فیكری و سیاسی و ڕەوشتی و ئابووری و حقوقی و مەعریفیەدا، كە تاكەكەسی بەرهەمهێنا.

تاكەكەس چۆن لەدایك بوو؟ بۆ لەدایك بوو؟ كە لەدایك بوو ئەم سیستەم و دەزگایانە كامانەن لەگەڵ لەدایكبوونی ئەودا لەدایك بوون؟ پرۆسەی كۆنترۆڵ چۆن و بە چ شێوەیەك هاتە كایەوە؟ بۆچی بەندیخانە هاوشان بە لەدایك بوونی تاكەكەس، ئەویش لەدایك بوو؟ دەسەڵات چ پەیوەندییەكی بەم

لەدایك بوونەوە هەیە؟ سزا چی لێهات؟ لابرا یا گشتی کرا؟ بۆچی سزا لە جەستەوە بۆ ڕۆح و لە لاشەوە بۆ سایکۆلۆژیا، گواسترایەوە؟ چ پەیوەندییەك لە نێوان بەسەربازگەبوونی کۆمەڵگا و لەدایکبوونی تاکەکەس و پرۆسەی کۆنترۆڵ کردندا هەیە؟ ئایا مەعریفە (چ زانست، چ ئەدەب، چ تیوەرە ئەخلاقی و فەلسەفیەکان) چ ڕۆڵێکی لە بەرقەراربوون و چەسپاندنی بناغەکانی کۆمەڵگای کۆنترۆڵدا هەبوو؟ ئەمانە و چەندان پرسیاری دیکەی لەم بابەتە ناوەرۆکی ئەم کتێبە گرنگەی (فۆکۆ)ن. کە ئەکرێ بڵێین بە بێ کتێبە تێگەشتن لە بنەماکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ و میکانیزەکانی کارکردنی دەسەڵات تێیدا، تێگەشتنێکی نووقسان و ناکامڵە و بۆ زیاتر ناسینی دنیای هاوچەرخ، بە کۆی دەزگا و دامەزراوەکانییەوە، ئەم کتێبە یاریدەدەرێکی گرنگ و پڕ بایەخە.

* * *

مێژووی ڕۆژئاوا پێمان ئەڵێ: تاکەکەس و بەندیخانە، ئازادی و کۆنترۆڵ، جەستە و دەزگاکان بەیەکەوە لەدایك ئەبن، ڕەنگە ئەمە یەکەمین جار نەبێ کە فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا ئەم ڕاستییانەیان بە ئێمە ووتبێ و لەم دوو لایەنە کوشندانە ئاگاداریان کردبینەوە. ئەشێ (هیگلیەت) کۆتایی ئەو وەهمە فەلسەفی و لەوێشەوە حەیاتیانە بێت، کە ئازادی و کۆنترۆڵی لە یەکدی جیاکردبێتەوە و دواجار ئینسانی ئازادی بە کوڕی دەزگاکانی کۆنترۆڵ بە گشتی و دەوڵەت بە تایبەتی زانیبێ. هیگلیەت دوا فێڵی فەلسەفەیە لە ئینسان بەو پێیەی دوا فێڵی مێژووە لە ئازادی، بەم مانایە (فۆکۆ) ئەڵێ: "سەردەمی ئێمە، بریتیە لە هەوڵدان بۆ دەرچوون لە ژێر چەپۆکی هیگل" یان "ئایندەی دنیا (...) پابەندی ئەوەیە ئەمڕۆکە ئێمە چۆن هیگل لێك بدەینەوە". هیگلیەت گەڕانێکی سەرسەختە بە

دوای شێوە جیاوازەکانی (فەلسەفە = عەقڵ) لە مێژوودا. پرسیاری سەرەکی هیگل ئەوەیە لۆگۆس یان فەلسەفە لە مێژوودا، پرسیاری سەرەکی هیگل ئەوەیە لۆگۆس یان فەلسەفە لە مێژوودا بەرجەستە ئەبێ؟ لێرەدا لۆگۆس ئەو ئەسڵە نەگۆڕەیە کە مێژوو هەوڵ ئەدات لە ڕێگای گۆڕانکاریە بەردەوامەکانیەوە پێی بگات. ئەو ئازادیە ڕەهایەیە کە عەودالی بەرجەستەبوونی واقیعانە و مێژوویانە و فیکرییانەی خۆیەتی، مێژووش، بە کۆی دەزگا و ڕووداو پێکهاتە جیاجیاکانیەوە، جگە لەو گشتەی هەوڵی گەیشتن بە موتڵەقە ئەزەلیە ئەدات، شتێکی دیکە نییە، بەڵام لەو ساتەوەختەدا کە پێکهاتەی ئەو گشتە لەگەڵ موتڵەقدا یەکانگیر ئەبێ و لەیەکدیدا بەرجەستە ئەبن، ئیدی ئەوە دواهەمین قۆناغ و مەزنترین قۆناغی (ئازادی)یە. ئالێرەدا ئیدی ترسناکترین و ناسراوترین و تۆقێنەرترین دەزگای دەسەڵات، کە (دەوڵەت)ە، بەو پێیەی بەرجەستەبوونی خودی لۆگۆسە لە نێو مێژوودا، لای هیگل ئەبێ بە بەرجەستەبوونی ئازادی و بەرقەراربوونی هەمیشەیی. لای هیگل لۆگۆس لە ناسینی خۆیایەتی بۆ خۆی، فەلسەفەی دەوڵەت بەرهەم دەهێنێ، بە مانایەکی دیکە فەلسەفەی دەوڵەت دەرەنجامی خۆناسینی لۆگۆسە بۆ خۆی، شووناسی عەقڵە لە تێگەیشتنی خۆیدا بۆ خۆی، هەر بەم مانایەشە (دەوڵەتی نێو واقع)، واتە ئەو دەوڵەتەی لەم ساتەدا لە ئارادایە، خۆی لە خۆیدا خودی لۆگۆسە لە بوونی واقیعیانە و حەیاتیانەیدا، لای هیگل "دەوڵەت نە (ئایدیال)ە نە خۆزگە" بەڵکو بەرجەستەبوونێکی حەتمی و واقیعیانەیە کە دەربڕی باڵاترین و عەقڵانیترین دەرکەوتەی ڕۆح و کۆتایی سەفەری ئازادیشە ڕووەو ڕەهایی موتڵەق. دەوڵەت لای (هیگڵ) ئەبێتە ئەو واقیعە عەقڵییەی کە لۆگۆسی هەم لەگەڵ جەوهەری خۆی و هەم لەگەڵ دەرەوەی خۆشیدا ئاشت کردۆتەوە، هەر ئەم

واقیعیەتە عەقڵییەشە (هیگڵ) بەرەو یەکێ لە ترسناکترین دەرەنجامە فیکرییەکان، لە مێژووی فیکردا ئەبات، مەبەستم ئەو بۆچوونەی هیگلە کە ئەڵێ: هەموو واقیعێك ماقوڵێ و هەموو ماقوڵێکیش واقیعە.

بەم جۆرە دەوڵەت و تیوەرەی دەوڵەت لای هیگل ئەبنە مەملەکەتی ئازادی و تاکەکەس فڕینێکی ئازادانە لە نێو ئەو زەمینە مێژوویی و عەقڵییەدا ئەفڕێت. بەم مانایە کتێبی (کۆنترۆڵ و سزا) کتێبێکە بە درێژایی لاپەڕەکانی دژ بە هیگل و هیگلیەتە، کتێبێکە خەریکی دۆزینەوەی ئەو قفڵ و تەلبەند و زنجیرانەیە کە چ لە ئاستی دەزگاکان و چ لە ئاستی مەعریفەدا، بۆ ڕێگرتن لە ئازادیی ئینسان و کۆنترۆڵ کردنی هێنراوەتە کایەوە، ئارکۆلۆژیای لەدایکبوونی کۆمەڵگای کۆنترۆڵ و ئینسانی کۆنترۆڵ کراوە، بەرخوردێکی نوێیە بۆ ئازادی، بەو پێیەی بەرخوردێکی نوێیە بۆ دوژمنەکانی ئازادی، بۆ شێوازە نوێکانی کۆنترۆڵ و شێوازە نادیار و گشتی کراوەکانی سزا. سەفەری (فۆکۆ) تەنها سەفەر بە نێو دەزگاکانی کۆنترۆڵ و چۆنیەتی لەدایکبوونیاندا نییە، بەڵکو لەو کاتەدا کە دەزگا بینراو و نەبینراوەکان دەبنە یەکەی سەرەکی خوێندنەوە و کەشف کردن، لە هەمان کاتدا ئەو تەرسانە مەعریفییەی لەودیو ئامادەگی ئەو دەزگایانەوە نادیارانە هێڵەکانی دەسەڵات و کۆنترۆڵ بە ناوی ئازادیەوە تۆختر و قورستر ئەکەنەوە، ئەوانیش وەبەر خوێندنەوەیەکی ئارکۆلۆژی ئەکەون. بۆیە لە کاتێکدا بەندەکانی یاسا و حوکمە قەزاییی و قانونیەکان دەخوێنێتەوە، لە هەمان کاتدا پێکهاتەی سەربازگەکان و قوتابخانەکان و خەستەخانەکان و کارگاکان و، هەموو ئەو تیوەرانەش کە بە بنەمای کۆمەڵگای نوێ ئەزانرێن ئەوانیش وەك موتیڤێکی دەسەڵات نیشان ئەدرێن.

لێرەوەیە (فۆکۆ) چەند باس لە دەسەڵاتی دەزگاکان ئەکات، بە هەمان ئەندازەش باس لە دەسەڵاتی مەعریفەش ئەکات، بە هەمان ئەندازەش باس لە دەسەڵاتی مەعریفەش ئەکات.. دواجار ئەو ستراتیژیەش ئاشکرا ئەکات کە لە هەناویدا هەم دەسەڵاتی دەزگاکان و هەم دەسەڵاتی مەعریفە، پێکەوە کۆ ئەکاتەوە و ئەو پێکهاتەیە دروست ئەکات کە ناوی ئەنێ "کۆمەڵگای کۆنترۆڵ".

گومانی تیا نییە پێش (فۆکۆ) ڕەخنەگری ڕادیکاڵی دیکە بەرەنگارییەکی فەلسەفیانەی سەرسەختیان بەرامبەر بە تێڕوانینە میتافیزیکیانەی (هیگل) هەبووە. کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، دەکرێ لە ناویاندا مارکس و کیرکجارد و دواجار سەرجەمی ئەو ڕێبازە فەلسەفیانەی دیکە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بەردەوامی ئەو دوو شێوە ڕەخنەگرتنەن لە هیگل، بناسینەوە. بەڵام هەموو ئەمانە ڕووی جیاکار و جیاوازی تێگەیشتنی (فۆکۆ) بۆ هیگل و لەوێشەوە بۆ سەرجەمی سیستەمی دەسەڵات و سیستەمی کۆنترۆڵ ناشارێتەوە. بۆ نمونە فەیلەسوفێکی گەورەی وەك (هربرت مارکوز) کە دەشێ لە هەمووان زیاتر بەم کتێبەی (فۆکۆ) نزیك بێت، بەتایبەت لە کتێبی "مرۆڤی یەك مەودا"دا. لە هەموو ڕەخنەیدا بۆ کۆمەڵگای نوێ و چەند جارەبوونی دەسەڵات لە ناویدا، ناتوانێ سنووری ئەو مەقولات و چەمکانە تێپەڕێنێ کە خۆیان بەشێکن لە گوتاری دەسەڵات. ڕەخنەی (مارکوز) لە دەسەڵات ڕەخنەیەکە لەناو خودی گوتاری دەسەڵاتدایە، لەناو سیاسەتی هەقیقەتەوە هاتووە کە دەسەڵات، پۆلینی ڕاستیەکان و ناڕاستەکان، ڕەخنە و قبوڵکردن، بینین و نەبینینەکانی پێ دەکات. (مارکۆز) بەوەی لە چوارچێوەی چەمکەکانی لۆگۆس، عەقڵانیەت، ناعەقڵانیەت، نەفی، سەلب.. هتد قسە لەسەر گەشەکردنی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی و چەند



جارەبوونی دەسەڵاتی کۆمەڵگای تەکنیك ئەکات، واتە لەو چوارچێوە فیکریەدا کە وای دائەنێ "ئەقلانیەتی کۆمەڵگای هاوچەرخ و پێشکەوتن و گەشەکردنی، لە پرنسیبدا ناعەقلانیەتە" و توندوتیژی کۆمەڵگای هاوچەرخیش بە "نا عەقلانیەتەوە" گرێ ئەدات. بۆیە ناتوانێ بەو ئاستە دیاریکراوەی خوێندنەوە بگات. کە دەسەڵاتە گوتاریەکانی لۆگۆس و ئەقلانیەت خۆی بدۆزێتەوە و دواجار سیستەمی کۆنترۆڵ لەناو ئەو یەکە گوتاریانەدا ئاشکرا بکات کە گوتاری ئەقلانیەت خۆی بەرهەم ئەهێنن و بەرقەراری ئەکەن. بە مانایەکی دی، (مارکۆز) بە تەفکیکی – لەبەریەك هەڵوەشاندن، چەمکەکان و مەقولەکانەوە خەریك نییە، تا لە قولایی و زەمینەی دروستبوونیاندا کاریگەریەکانی دەسەڵات بدۆزێتەوە، ئەو کاریگەریانەی لە ناوەوەڕا خودی ئەو چەمکانە و ئاراستەی کاکردنەکانیان دیاری ئەکەن و دواجار بەو مەودایەشدا ئەیخەنە گەڕ کە بنەماکانی دەسەڵات هەم بپارێزن و هەم لە ئاستێکی بەرفراواندا بەرهەمی بهێننەوە، کارێك کە سەرجەمی پرۆژەی ئارکیۆلۆژیانەی (فۆکۆ) پێیەوە خەریکە. مەسەلەی سەرەکی بەلای (مارکۆز)ەوە ئەوەیە چۆن چەمکەکانی لۆگۆس، نەفی ڕەخنە، ئێستاتیکا.. هتد بە چ شێوەیەك بخەینە گەڕ تا بکرێ کۆمەڵێ دەرەنجامی شۆڕشگێڕانە و دژ بە دەسەڵاتی مۆدێرنی کۆمەڵگایان لێوە بەرهەم بهێنین، بەڵام پرسیاری سەرەکی (فۆکۆ) ئەوەیە چی وا لەو چەمکانە ئەکات لە سەردەمانێکی دیاریکراودا و لەناو گوتارێکی فیکری و فەلسەفی تایبەتدا بێتە کایەوە، چ ستراتیژیەتێکی دەسەڵات لە پشتی ئامادەبوونی ئەو چەمکانەوەیە، وە دواجار، ئەو چەمکانە تا چ ئەندازەیەك، لە هەموو شێوە جیاجیاکانی بەکارهێناندا، بەشدارن لەسەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی دەسەڵاتدا. پرسیاری (فۆکۆ) پرسیارە لە (ژێرخانی) تێز و تیوەرە فەلسەفییەکان، بەڵام پرسیاری (مارکۆز) پرسیارە لە چۆنیەتی وەگەڕخستنی "سەرخان"یانەی ئەو تێز و تیوەرانە. لێرەوە ئەو ڕەگەزە ژێرخانییەی لە هەناوی هەموو چەمکەکانیدا و لە زۆربەی کاتدا ڕەگەزێکی دەسەڵاتگەرە لای مارکوز نەناسراوو ونە و لای (فۆکۆ) ناسراوترین و بەرچاوترن و دیاریترین ڕەگەزە. ئەمەشە وا دەکات تیورەی دەسەڵات لای (فۆکۆ) لە زۆر ڕووەوە زۆر ڕادیکاڵتر و قوڵتر و کاریگەرتر بێت، لە هەمان تیوەرە لای فەیلەسوفان و تیوەرە فەلسەفیەکانی بەر لە خۆی.

* * *

گواستنەوەی سزا لە سزادانی ئاشکراوە بۆ نهێنی، لە سزادانی جەستەوە بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆی سیستەمی سایکۆلۆژی و ڕۆحی ئینسان. لە سزای توندەوە بۆ سزای سوکتر، لە سزای تاکەکانەوە بۆ سزای بەگشتی کراو. هەموو ئەم پرۆسانە هاوکات و هاوزەمانی لەدایکبوونی تاکەکەسن، چ لە واقعی مێژووی ڕۆژئاوادا و چ لە دنیای فیکریی و فەلسەفیدا. لێرەوە بە باوەڕی (فۆکۆ) ئەوەی (تاکەکەس)ی لە دنیای واقعی و لە فیکری ڕۆژئاوادا دروست کردووە، نە بە تەنها ئەو ڕەهەندە ئابووریەیە کە (مارکس) پێی لەسەر دائەگرت و بەسەرچاوەی هەموو دیاردەکانی دەزانی. نە ئەو شوێن و جێگا ئەنتۆلۆژیەشە کە فینۆمینۆلۆژیەکان و سەرجەمی ڕێبازە جیاجیاکانی وجودیەت لە (کیرکجارد)ەوە تا (سارتەر) باسیان لێوە ئەکرد..

(فۆکۆ) بەوەی تیوەری دەسەڵاتی لەوە ڕزگارکرد کە ڕەنگدانەوەی دۆخێکی تایبەت و، بوونەوەرێکی سلبی بێت. بەو دەرەنجامە گەیشت کە لە پشتی ئامادەگی (تاکەکەس) و لە پشتی گواستنەوە لە کۆمەڵگای سزاوە بۆ کۆمەڵگای

کۆنترۆڵ، ستراتیژیەتێکی دەسەڵات لە ئارادایە. کە نەك ڕەنگدانەوەی واقیع نییە بە تەنها، بەڵکو خۆی فاکتەرێکی گرنگی بەرهەم هێنانی ئەو واقیعەیە. وە واقیعی ئەنواری و ڕێنسیانسیانەی ڕۆژئاوا. بە هەموو پێکهاتە فیکری و ڕەوشتی و حەیاتی و سیاسیەکانیەوە. بەری ئەو ستراتیژەی دەسەڵاتە، کە لە جەستەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایدا دەست بەکاربوو. لێرەوە دەسەڵات ئەو پێکهاتە ئەفسانەییە کە ئەبێ لەناویدا بەدوای سەرجەمی شتەکاندا بگەڕێین.

* * *

بە باوەڕی فۆکۆ مەعریفەی ڕۆژئاوایی، بە هەموو لق و بەشە جیاجیاکانیەوە، بەشداریەکی ڕاستەوخۆیان هەیە لەبەرقەرارکردنی ئەو ستراتیژە نوێیەی دەسەڵاتدا کە لە سەدەی هەژدەهەمدا هاتە کایەوە. (فۆکۆ) بەڕاشکاوی ئەنووسێ: (دیکارت) لە ڕووی بۆچوونە فەلسەفی و میتافیزیکییەکانەوە لاپەڕەی یەکەمی ئەو کتێبەی نووسی کە دوای خۆی پزیشکە فەیلەسووفەکان تەواویان کرد، ئەو کتێبە لاشەی ئادەمی وەك "لاشەیەکی سوودبەخش" ناساند، دوای ئەمانیش بەشی دووهەمی هەمان مەسەلە، کە بەشێکی تەکنیکی سیاسییە و کۆی سیستەمی سەربازی و پەروەردەیی و بیمارگەیی ئەو کۆمەڵگایە هاتە کایەوە و نووسرا، ئەو بەشەی کە جەستەی تاکەکەسی بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕام و دەستەمۆ ئەکرد، لێرەدا ئارکیۆلۆژیا زۆر قووڵ بەناو ئەو زەمینە تیوریەدا ڕۆئەچێت کە فەیلەسوفانی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" و "مافی سروشتی" هێنایانە کایەوە، لێرەدا ئیدی خوێندنەوەی (فۆکۆ) بۆ (ئەنوار) بە گشتی و بۆ (ڕۆسۆ) وەك فەیلەسوفی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" دێتە پێشەوە. خوێندنەوەیەك، نە بە ئاراستەی نیشاندان و ئاشکراکردنی ئەو "ئازادی"یەی فیکری ئەنوار ئەیەوێ وای نیشاندات کە هەڵگریەتی، بەڵکو خوێندنەوەیەك بە ئاراستەی ناساندن و دۆزینەوەی ئەو کۆت و قوفڵ و دەزگا چەمکیی و مەعریفیە کۆنترۆڵکەرەی، فیکری ئەنوار ئەیەوێ، لە ژێر دروشمەکانی (ئازادی)دا بیانشارێتەوە. بە باوەڕی فۆکۆ فیکری ئەنوار و فیکری دوای ئەنواریش تیوەرەی گشتی ڕامکردنی ئینسانی ڕۆژئاوایی بە تایبەتی و ئینسانە بە گشتی، فیکری ئەنوار فیکری کۆمەڵگای کۆنترۆڵ و بەرقەراربوونیەتی، فیکری ئەنوار لە جەوهەردا، وە بە تایبەتی پەیمانی کۆمەڵایەتی، هەوڵدانێکی سەخت و پەڕگیرە بۆ کەمکردنەوە و بەرتەسککردنی مەوداکانی ئەو "ناشەرعیەتە کۆمەڵایەتیەی" کە ئینسانەکانی کۆمەڵگای سزا بوویانە. (پەیمانی کۆمەڵایەتی) ڕۆسۆ، بە باوەڕی فۆکۆ، ئەو دەروازە گەورەیەیە کە ئینسانی هاوچەرخ لێوەی ئەچێتە ناو هەرێمە ئەهریمەنیەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵگای هاوچەرخەوە. ئەم تیوەرییە لە قاڵبدان و کوژاندنەوەیەکی ترسناکی ئەو ناشەرعیەتە کۆمەڵایەتییەیە. لە قۆناغی پێش کۆمەڵگەی کۆنترۆڵدا، بەشێك بووە لە پێکهاتەی حەیاتی ئینسانەکان و کۆمەڵگاکان. لێرەوە (پەیمانی کۆمەڵایەتی) لە خوێندنەوەی (فۆکۆ)دا، پێچەوانەی زۆربەی هەرە زۆری خوێندنەوەکانی بەر لە خۆی، ئەبێتە تیوەرەی گشتی ڕامکردنی ئینسانی ڕۆژئاوای، (پەیمانی کۆمەڵایەتی) گواستنەوەی وزە و توانا فراوانەکانی دەسەڵاتە بۆ ناو یەکەیەکە خانەکانی کۆمەڵگا بە گشتی و بۆ ناو جەستە و دنیای ڕۆحی و سایکۆلۆژی ئینسانەکانە بە تایبەتی. بۆ ناو پێکهاتەی فیکرییەکان، بۆ ناو پەیوەندییەکان و ناشەرعیەتەکان، گواستنەوەی دەسسەڵاتە لە دۆخی ماتریال بوونیەوە بۆ دۆخی "وێناکردن". لە پرۆسەیەکی سزاییەوە بۆ

میکانیزمەیــەکی ســایکۆلۆژی. لــە دەزگاکانــەوە بــۆ ئینسانەکان.

لە قۆناغی پێش (پەیمانی کۆمەڵایەتی)دا سزا لـە دەرەوەی ئینسـانەکان و لـە دەرەوەی کۆمـەڵگادا بـــوو، کـــۆنترۆڵ لـــەناو قامچـــی و شمشـــێر و ســـێدارەکانەوە ئـــەهات و نەیئـــەتوانی ســـەرجەمی کۆمەڵگا بگرێتەوە. سزا تۆڵەیەك بوو، لەو ئینسانانە ئەکرایەوە کـە فەرمایشـەکانی ئـەمیر و پادشاکانیان شکاندبوو. بـەڵام لـە دوای پـەیمانی کۆمەڵایەتیـەوە، کۆنترۆڵ لە شمشێر و قامچییەکانەوە گواسترایەوە بۆ دەزگاکـان، بـەوەش رانەوەسـتا لـە دەزگاکانـەوە، بـە هـۆی کۆمـەڵێ میکـانیزمەی ئـاڵۆزەوە کـە کۆمـەڵگای هاوچەرخ سـەرکەوتوانە بەرهـەمی هێنـا، راسـتەوخۆ خودی پرۆسەی کۆنترۆڵ کردن گوێسـرایەوە بۆ نـاو دنیـای رۆحـی و بونیـاد و پێکهاتـەی سـایکۆلۆژی ئینسـانەکان. تۆڵـە و سـزا چیـدی تۆڵـەی پادشـا و ئـەمیر لـە ئینسـانەکان نییـە، بـەڵکو تۆڵـەی هـەموو کۆمەڵگایـە لـە تاکەکـەس. تۆڵـەی ئـەو پەیمانەیـە کـە هەموو کەسەکان بە "ئازادی" لـە نێوان خۆیانـدا بۆ بەرقەراربوونی کۆمەڵگا بەستوویانە.

ئــەم پەیمانــە لــە شــێوە رۆســۆییەکەیدا، وەك فۆکـــۆ ئەنووســـێ، خوڵقانـــدنی ترســـناکترین و بەهێزترین شێوەی دەسەڵاتە لـە مێـژووی ئینسـاندا، وە کۆنترۆڵ کردنی ئینسانە لە باڵاترین پلەیـدا، لـەم پەیمانەدا "هەموو کۆمەڵگا لـە بچووکترین سزاداندا ئامادەیـە". وە تاکەکـەس رووەو هـەر لایـەك و بـە هـەر ئاراسـتەیەکدا ئـەروانێ خـۆی لەبـەردەم ئـەو کیانـە تۆقێنـــەرەدا ئەدۆزێتـــەوە کـــە (رۆســـۆ) نـــاوی (کۆمـــەڵگا)ی لێئـــەنێ و بـــە دەرەنجـــامی ئـــەو پەیمانەشـی ئـەزانی کـە تاکـەکان لـە نێـوان خۆیانـدا ئەیبەستن. لێرەوە (پەیمانی کۆمەڵایەتی) هەڵقەیەکە لە زنجیرەی ئەو هەوڵدانە بنەڕەتی و بێ برانەوەیـەی کۆمـەڵگای نـوێ، بـە هۆیـەوە تـۆڕی کـۆنترۆڵی خـۆی بەسەر هەموو جەستەی کۆمەڵایەتیدا بڵاوئەکاتـەوە.

لـەم پەیمانـەدا بچـوکترین تـاوان و ناشـەرعیەت، نـە رووبـەڕووی پادشـا یـان ئـەمیر، بـەڵکو رووبـەڕووی هــەموو کۆمــەڵگا ئەبێتــەوە، لێــرەوە هــەموو لــە ڕێ لادانـــێ، بچوکترینیشـــیان ئینســـان راســـتەوخۆ لەبــەردەم دادگــای هــەموو کۆمــەڵگادا دائــەنێ و بەرپرسیاری ئەکات. لە دوای ئەو پەیمانـەوە هـەموو یاخی بوونێ بەڕووی کۆمەڵگادا دەرچوونە لە بەنـدە "پیرۆزەکانی" ئـەم پەیمانـە، هـەر ئەمەشـە وا ئـەکات هــەموو یاخیکــەرێ، وەك فۆکــۆ ئــەڵێ، ســیفەتی "خائن"ی بدرێتە پاڵ.

* * *

"دەسەڵات واقع بەرهەم ئەهێنێت" بەم رسـتەیە تیــوەرەی دەســەڵات لای فۆکــۆ، خــۆی لــە هــەموو تیوەرە تەقلیدیەکانی دەسەڵات جیا ئەکاتەوە لێرەدا ئیـدی دەسـەڵات بـەو پرۆسـەی بەرهـەم هێنانـە لـەوە ئەچێتە دەر کـە "مڵکیـەت"ی چینـێ یـان دەسـتە و تـاقمێکی دیـاریکراو بێـت، ئەوەنـدەی پراکتیکێکـی دیـاریکراوی کۆمەڵگایـە و، دەرەنجـامی کـۆی ئـەو پەیوەندیانەیـە کـە لـە نێـوان شـوێن و جـێ و تـەوەرە جیاجیاکانـدا دروسـت ئـەبێت. لێـرەدا (فۆکـۆ) پـێ لەسـەر ئـەوە دائـەگرێ کـە دەسـەڵات لـەو کاتـەدا کـە بەرهــەم هێنــەری واقیعــە لــە هــەمان کاتــدا "بەرهــەم هێنەری هەقیقەتیشە"، هەقیقەتێ کە دواجار ئەبێتـە ئـەو ژێرخانـە ئـەخلاقی و فیکـری و سیاسـیەی کـە کۆی تاکتیکە کۆمەڵایـەتی و ستراتیژە جیاجیاکـانی لەســـەر بنیـــاد ئـــەنرێت: هـــەموو کۆمەڵگایـــەك سیاســـەتێکی دیـــاریکراوی هەقیقـــەتی هەیـــە، کـــە دەشـێ ئـەو سیاسـەتە بـە ناسنامەی ئـەو کۆمەڵگایـە بدەینـە قەڵـەم، بـەڵام وەك پێشـتریش ئامـاژەمـان بـۆ کـرد، خـودی ئـەو هەقیقەتـە، دەسـەڵات بەرهـەمی هێنـاوە. بـەم جـۆرە تیـوەری دەسـەڵات لای فۆکۆ بـە گشـتی و لـە کتێبـی (کۆنترۆڵ و سزا)دا بـە تایبـەتی لەوە ئەچێتەدەر کە راستەوخۆ بە بوونی دەوڵـەت و

دەزگاکانییەوە ببەستریتەوە، چ دەزگاکانی سەرکوتکردن و چ دەزگا ئایدیۆلۆژیەکانی. هەروەها مەودای کارکردن و پراکتیک کردنیش تەنها لەو دەزگا و دامەزراوانەدا نییە، لێرەوە تیوەرەی هەرەمیەتی دەسەڵات، ئەو تیوەریەی کە جۆرێك هەرەمیەت گریمان ئەکات و لووتکەی هەرەمەکە بە سەرچاوەی دەسەڵات ئەزانێ، چیدی ناتوانێ وەڵامدەرەوەی ئەو پرسیارانەی دەسەڵات بێت کە لەودیوی ئەو دەزگایانەوە و لەودیوی ئەو هەرەمیەتەوە ئەبینرێت. لە تیوەرەی دەسەڵاتی فۆکۆییدا خودی دەوڵەت و دەزگاکانی، جگە لە دەرکەوتێك لە دەرکەوتەکانی دەسەڵات بەولاوە شتێکی دیکە نین، وە دەسەڵات جگە لەو دەرکەوتانە چەندان دەرکەوتەی دیکەی هەیە کە بەبێ گۆڕینی گۆشەنیگای تێڕوانینمان بۆ دەسەڵات و بە بێ گۆڕینی ئەو زەمینە تیوەریەی تیوەرە تەقلیدییەکانی دەسەڵات هێنابوویانە کایەوە ناکرێ و ناتوانین بیان ناسین و دەرکیان پێ بکەین.

ئەو گریمانە سەرەکییەی (فۆکۆ) وازی لێ ئەهێنێ و چیدی قبوڵی ناکات، گریمانەی جەمسەربەندیی کردنی دەسەڵاتە، ئەو گریمانەی دەسەڵات بەسەر دوو جەمسەر، دوو چین ، دوو تاقم، یان زیاد لە دوو جەمسەر، دوو چین، دوو تاقمدا دابەش ئەکات، (فۆکۆ) پێیوایە دەسەڵات لە شوێنێکی دیاریکراو"ەوە هەڵناقوڵێت جێگایەکی نەگۆڕ و جێگیری نییە لێوەی بێت و بەسەر جەستەی کۆمەڵایەتیدا بڵاو ببێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەسەڵات لە هەزاران هەزار خاڵی بزۆك و ناجێگیرەوە، لە هەموو لایەکەوە، دێت و هەر جارەی لە شوێنێکەوە سەر دەردێنێت و حاڵەتێ لە حاڵەتەکانی دەسەڵات بەرهەم دێنێ، تەنها لە دەزگاکانی دەوڵەتەوە نایەت، بەڵکو لە خێزان و ئاهەنگ و کارخانە و خەستەخانەکانیشەوە دێت، تەنها لەناو یاساکانەوە نایەت، بەڵکو لە ناو خودی مەعریفە و زمان و سێکسیشەوە سەردەردێنێت، بەمەش دەوڵەت نەك لەوە دەردەچێ کە بەرهەمهێنەری دەسەڵات بێت، بەڵکو خۆشی ئەبێتە یەکێك لە بەرهەم هێنراوەکانی دەسەڵات.

ووتمان دەسەڵات وەك (فۆکۆ) ئەڵێ "مڵکیەت نییە"، ئەو تێزەی مارکسیزم بەرگرییەکی سەرەکی لێ ئەکات، بەڵام بەمڵکیەت نەبوونی مانای ئەوە نییە، لە پراکتیکیدا ڕەنگ و رووی هەموو دابەشبوونە کۆمەڵایەتی و چینایەتیەکانی ناو پێکهاتەیەکی سۆسیۆلۆژی دیاریکراو ناگرێتە خۆی و بەو ڕەنگە کۆمەڵایەتیە رەنگرێژ نابێت.

"دەسەڵات واقع بەرهەم ئەهێنێت"، ئا لێرەوە (فۆکۆ) قسە لەو سێ ستراتیژە تایبەتەی دەسەڵات ئەکات کە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئارادا بوون و هەرسێکیان لەبەردەم سێ شێوەی جیاوازی بەرهەمهینانی واقیعدا بوون. بەڵام دواجار بۆ ئەو شێوازەی دەسەڵات، یان ستراتیژەی دەسەڵات باڵادەست بوو، کە سزای بە کۆنترۆڵ و گروپی بەتاکەکەس و، سزای ئاشکرای بە سزای نهێنی گۆڕییەوە؟

لە راستیدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەبێ خوێنەر کۆی کتێبی (کۆنترۆڵ و سزا) و ئەو سەدان و هەزاران بەڵگەنامە و بەندە یاسایی و رووداوانە بخوێنێتەوە کە لەو کتێبەدا ڕیزکراون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەوڵدەدەم لەم بەشەی ئەم نووسینەدا، هێڵە گشتییەکانی ئەو گۆڕانە بە خوێنەر بناسێنم، بەو هیوایەی دواجار خوێنەر خۆی بگەڕێتەوە سەر کتێبەکەیی (فۆکۆ).

* * *

سەدەی هەژدەهەم، سەدەی لەدایکبوونی تاکەکەس، سەدەی ڕێنیسانس و هیومانیزم و شۆڕشی فەرەنسی، ئەو سەدەیەی (هیگل) بە سەدەی ئازادی و ئاشتبوونەوەی خود و بابەت،




عەقڵ و مێژوو، عەقڵ و دەرکەوتەکانی خۆی ئەزانیٚ، ئا لەو سەدەیەدا، وەك (فۆکۆ) ئەڵیٚ: هەموو تەکنیکەکانی رامکردنی جەستە و دەستەمۆکردنی چالاکییەکانی تاکەکەس هاتە کایەوە. لەو سەدەیەدا جەستە بە هۆی ئەوەوە کە لەگەڵ پرۆژەی (دیکارت)دا ببووە (جەستەیەکی سوودبەخش) و لەگەڵ کۆی گۆڕانکارییە ئابوورییەکاندا، وەك (مارکس) ئەڵیٚ: ببوە هێزێکی کاری گرنگ. بۆیە نەدەکرا چیدی وێرانکرێت، بەڵام دەبوایە لە باتی وێرانکردن، ڕام و دەستەمۆ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش سیستەمی کۆنتڕۆڵ لەم سەدەیەدا نەیدەتوانی چیدی وەك سیستەمی کۆنترۆڵی سەدەکانی پێشوتر بێت، ئیدی کۆنترۆڵ رەوشت نەبوو، بەڵکو کۆنترۆڵ سیستەمی (بزاوت و چالاکییەکان) بوو کۆنترۆڵی خودە بەرهەم هێنەرەکان، بەرمەجەکردن و بەرنامەرێژی کردنی ئەو خودە بەرهەمهێنەبوو، بەم جۆرە سەدەی هەژدەهەم لەو کاتەدا کە سەدەی لەدایکبوونی چەمکی "ئینسان" و بەسەردێرکردنی چەمکی "ئازادی"یە، لە قوولاییە نادیارەکانیدا، سەدەی لەدایکبوونی تۆقێنەرترین سیستەمی کۆنترۆڵە لە مێژووی ئینساندا، لەم سەدەیە بەدواوە چیدی زۆر بۆ هێنان و ناچارکردن ڕوویان لە ئامارژە و هێما دەرەکیەکان نییە، بەڵکو راستەوخۆ لەناو هەناو و ناوجەرگەی ئەو هێزانەدا دەست بەکارن، کە توانای بەرهەمهێنانی ئامارژەکان و هێزەکانیشیان هەیە.

* * *

بە باوەڕی فۆکۆ لە سەدەی هەژدەهەمدا دوو پرۆسەی گەورەی خەون بینین لە ئارادا بوو، کە ئەشیٚ لە ئاستی ساکار و روکەشدا وەك دوو خەونی دژ بەیەك خۆیان بناسێنن، بەڵام لە ئاستە قوڵەکانیدا، لە ئاستی نادیار و نەبینراودا، لە ئاستی ئارکیۆلۆژیدا، نەك دوو خەونی دژ بەیەك نەبوون، بەڵکو دوو خەونی تەواوکەری یەکدی و دوو خەونی یەکانگیر بوون. مەبەستی (فۆکۆ) لەو دوو خەونەش، خەونە فەلسەفیەکان و خەونە سەربازیەکانە.

(فۆکۆ) ئەنووسیٚ: لەو کاتەدا کە فەیلەسوفەکان خەونیان بە بنیادنانی کۆمەڵگایەکی کامڵەوە ئەبینی، لە هەمان کاتدا خەونێکی سەربازییانە لە ئارادا بوو کە ئەیویست هەموو سیستەمەکانی کۆنترۆڵ و دیسپلینی سەربازیانە ببخشێتە کۆمەڵگا.

لەو کاتەدا کە رۆسۆ ئەیویست لە رێگای "پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە" کۆمەڵگایەکی کامڵ دروستکات لە هەمان کاتدا، لە سەربازگە و ئۆردوگاکاندا، سیستەمەکانی سەربازی "جەستە مەشق کراوەکان"یان بەرهەم ئەهێنا، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، (پەیمانی کۆمەڵایەتی) لە جەوهەردا شتێکی دیکە نییە، جگە لە بەرهەم هێنانی ئینسانێکی گوێڕایەڵ و دیسپلین کراو، وەك چۆن جەستەی مەشق پێکراویش، جگە لە جەستەیەك لە دوا پلەی دیسپلین و کۆنترۆڵ کردندا، زیاتر شتێکی دیکە نییە.

* * *

لە سەدەی هەژدەهەمدا، لە ئەنجامی کۆی ئەو گۆڕانکاریانەی لە شێوەکانی دابەشکردنی شوێن و کات و پرۆسەی پۆلێن کردن و داهێنانی خشتە جەدەلەکانەوە.. بە کورتی لە ئەنجامی کۆی ئەو تەکنیکە وردانەی کە لە مەودای لیٚ وردبوونەوە و تەماشاکردنی ئینسانەکانی زیاتر ڕەخساند، "زانستەکانی ئینسان" لەدایك بوو، زانستەکانی ئینسان دەرەنجامی سنووردارکردنی هەڵسوکەوتەکانی ئینسان و بەندکردنی بوو لەناو خشتە و لیستی ئامادەبوون و ئامادەنەبوونەکان، لە کارگە و سەربازگە و قوتابخانەکاندا، بەندکردنی کە




مەودای ئەوەی ڕەخساند، لە نزیکەوە هەڵسوکەوت و ڕەوشت و کار و کاردانەوە تووڕەبوون و پێکەنین و کۆی حاڵەتە ئینسانیەکانی دیکە، لەو ڕووبەرە تەسکانەدا، مەبەستم ڕووبەری کارکردن و خشتە و جەدەلەکان، تێبینی بکرێت. دەسەڵات کۆمەڵێ تەکنیکی "ناسینەوەی" کەسایەتی تاکەکەسی هێنایە کایەوە. کە خودی کەڵەکەبوونی ئەو "ناسینەوانە" بوو دواجار "زانستە ئینسانیەکان" هێنایە کایەوە لێرە بەدوا ئیدی ئینسان بووە بابەتی مەعریفە و چووە ناو کایەکانی "زانست"ەوە و بووە بەشێك لەو "گوتارە زانستیەی" ناسنامەی ڕێنیسانس و سەدەی هەژدەمین دروست دەکات. لەم سەدەیەدا ڕەوشت و پێویستیە ئۆرگانیەکانی بەشێنەیی جێگای فیزیای ساکاری جووڵە و هەڵسوکەوتەکانیان گرتەوە. لە فیزیای جووڵە ساکارەکانەوە بۆ فیزیای ڕەوشت، لە جەستەی میکانیکەوە بۆ جەستەی سروشتی، "زانست" هەنگاو هەنگاو "ئەچووە پێش". لە هەمان کاتدا بەو دۆزینەوە و دەسکەوتە "زانستیانەی" ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەڵەکە ئەکران و ئەدۆزرانەوە، ئیدی پانتایی کۆنترۆڵ و دیسپلین کردن تا دەهات زیاتر ئەبوو، ئیدی ئینسان لەوە چووە دەرێ بوونەوەرێکی نەناسراو، نەدۆزراوە بێت، تیوەرەکان و "زانستەکان"، فسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا، ئینسانیان ڕۆژ بە ڕۆژ ڕۆشنتر و ناسراوتر ئەکرد.

شانبەشانی ئەمەش، تەکنیکەکانی کۆنترۆڵ لە ژێر کاریگەری ئەو دۆزینەوە بەردەوامانەدا، قووڵتر و قووڵتر بە هەناوی ئینساندا ڕۆئەچوون، بە ڕادەیەك کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی چیدی پێوستی بە کۆنترۆڵ کردنی دەرەکی و بە سزادانی جەستەیی و ترساندنی ڕاستەخۆ و بە شانۆکردنی کوشتن و سزادان نەما، ئیدی میکانیزەکانی بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵات و دیسپلین کردن قووڵ و قووڵ بەناو بونیادی سایکۆلۆژی و ڕەهەندی ڕۆحی ئینسانی ڕۆژئاوادا ڕۆچوو، هەر ئەمەش وایکرد ئیدی سیستەمی قەزایی و پۆلیس و ماف و یاسا شەخسیەکان، ئەو ڕەهەندە توند و تیژە لە دەست بدەن کە جاران هەیان بوو. وە جۆرێك لە نەرم و نیانی لە پرۆسەی سزادان و داوەری کردن و قەزاییدا بێتە کایەوە. جۆرێك نەرم و نیانی کە ئەمڕۆ ئەوانەی لە دەرەوەی ڕۆژئاواوە تەماشای ئەکەن وەك جۆرێك لە (ئایدیال) ئەیبینن.

**تێبینی:**

ئەم بابەتە لە فایلی "دابڕانی ئەپستمۆلۆژی" بەسەرپەرشتی ڕێبوار سیوەیلی لە ژمارە دووی گۆڤاری (دەروازە)دا بڵاوبۆتەوە، لەبەر گرنگی بابەت و تیراژی کەمی گۆڤارەکە بە چاکمان زانی جارێکی تر لەم فایلەدا بڵاوی بکەینەوە، بەو مەبەستەی خوێنەران سوودی لێ ببینن.

# فۆكۆ له یادكه

## ئامادەكردنی: ڕێبوار سیوەیلی(*)




بۆدریار كاتێ له ساڵی 1967دا ئەم بابەتەی نارد بۆ گۆڤاری بەناوبانگی (كریتیك)، واته: ڕەخنه، میشێل فۆكۆ (1926ـ1986) له لوتكەی ناوداریی خۆیدا بوو. كاتێكیش دەستەی نووسەرانی گۆڤارەكه بابەتەكەیان پێش بڵاوكردنەوەی نارده لای فۆكۆ تاكو وەڵامی بداتەوە، فۆكۆ تەنیا گوتبووی: (كاتێ بیر له بۆدریار دەكەمەوە، دەردەسەرییەكانم زۆر تر دەبن). ئەوەی كه دەستەی نووسەرانی گۆڤارێكی وەكو (كریتیك) وتارەكەی بۆدریار له پێش بڵاوبوونەوەیدا بۆ فۆكۆ دەنێرن، نیشانەی نفوزی زۆری فۆكۆیه لەو سەردەمەدا و له پانتایی هزری فەرەنسیدا. بەدیوێكی تردا، كاتێ بۆدریار، كه تا ئەو دەمه تەنیا دوو بەرهەمی خۆی بڵاوكردبۆوە، تێزەكانی فۆكۆ ڕەخنەكاری دەكات، نیشانەی بوێری و سووربوونێكی زۆریەتی لەسەر داماڵینی هزری فۆكۆ له هەموو پیرۆزییەك و بەگژداچوونەوەی پانتایی ئەو كاتەی هزری فەرەنسی كه ئیشی دەكرد لەسەر پیرۆزكردنی فۆكۆ، دوای ئەوەی له چل و پەنجاكاندا سارتەری بەپیرۆز كردبوو. بڵاوبوونەوەی ئەم نووسینەی بۆدریار له شێوەی كتێبێكیشدا، جگه لەوەی جەختكردنەوەیەكی بۆدریار بوو لەسەر ڕەخنەكردنی كارەكانی فۆكۆ، ئاواش بووه هۆی تووڕەكردنی پەیڕەوكارانی خاوەن دەسەڵاتی فۆكۆ لەناو زانكۆكانی فەرانسەدا. بۆدریار له ڕەخنەگرتنیدا له كارەكانی فۆكۆ بەتەنیا نەبوو و بەتەنیاش نەمایەوە، بەڵام ئەم كارەی ئەو بووه هۆی بێبەریكردنی بۆدریار له وانه گوتنەوە لەناو دامەزراوه ئەكادیمیەكانی ئەوسای فەرانسەدا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمه نەبووە ڕێگر لەبەردەم بۆدریاردا تا پەشیمان بێتەوە لەو فەرمانەی دەریكردبوو: (فۆكۆ لەیادكه)!

لەم نامێلکە سی و حەوت لاپەڕەییەدا، گلەیی گەورە وخاڵی هەرە سەرەکی بۆدریار لەسەر تیزەکانی فۆکۆ ئەوەیە، کە دەڵێت: گوتاری دەسەڵات لەلای فۆکۆ، ڕەنگدانەوە و پەرچەکردنەوەیەکی هەمان ئەو دەسەڵاتەن کە لە بارەیانەوە دەنووسێ. واتە فۆکۆ بەوە تاوانبار دەکات کە گوتاری دەسەڵات دووبارە دەکاتەوە یان دووبارە دەینووسێتەوە و بەرهەمی دەهێنێتەوە.

بۆدریار دەڵێت "دەقەکانی فۆکۆ هاندەر و فریودەرن"(**)، چونکە شێوازی نووسینەکانی لەسەر بنەمایەکی پتەو بەندن. ئەو چەندە یاداشت دەکات، ئەوەندەش یاداشتەکانی بە هۆنینەوەیەکی مەحکەم دادەڕێژێ و ئەمە شێوازی ئەوە بۆ نووسین لە بارەی هەموو ئەو دامەزراوانەی تیشکی سەرنجی ئاراستە کردوون: هەر لە شێتخانەوە بۆ بەندیخانە و تا دەگاتە بواری سیکس.

بەلای بۆدریارەوە، دەقەکانی فۆکۆ هێندە باڵاوتەن کە دواجار بە دەوری خۆیاندا قوزاخەیان بەستووە و بەسەر خۆیاندا داخراونەتەوە. بۆیە زۆر زەحمەتە زەفەریان پێ ببرێت، یان خافڵگیر بکرێن، یاخود پەیوەندییەکی پتەوی ڕەخنەگرانەیان لەگەڵ ببەسترێت، بەڵام هەر ئەم تایبەتمەندیانەی دەقی فۆکۆن، بۆدریار (هاندەدەن) بە دیدێکی توندی ڕەخنە ئامێز لە دژیان بوەستێتەوە ئەگەرچی لەدوا ئەنجامدا ئەم کارە بۆدریار دەخاتە بەردەم هەندێ کێشەوە، بەڵام خودی ئەم دەقە بچووکە بەڵگەی ئەوەیە بۆدریار بەسەر ئەو کێشانەدا سەرکەوتنی هێناوەتە دەست و توانیویەتی زەفەر بە دەقەکانی فۆکۆ ببات. ئەو کاتەش بە لەخۆ ڕازیبوونێکەوە دەڵێ: فۆکۆ لەیادبکەین(1).

بۆدریار هەر لەسەرەتاوە، وەک پێشەکییەک بۆ چوونە نێو باسەکەی پێماندەڵێت، گوتارە جیاوازەکانی فۆکۆ لەسەر دەسەڵات خۆیان گوتاری دەسەڵاتن. ئەمە خاڵێکە فۆکۆ یەکەم کەسە ئیمزای دەکات. بەڵام بۆدریار هەنگاوێ زیاتر دەهاوێ و فۆکۆمان وەک هاندەرێکی خۆسەپێن پێدەناسێنێ. بێگومان ئەمەش ڕەخنەیەکی توندە. یاخود وەک ڕەخنەگرەکانی بۆدریار دەڵێن: ڕەخنەیەکی ئانارشیستانەیە.

ئەوەمان لەبیرنەچێت کە ئەم نامیلکەیەی بۆدریار لەسەر فۆکۆ دواجار وەک سەرەتایەک کەوتەوە بۆ کتێبێکی گەورەتر و تیورێک لە بارەی فریودان و ئیغراکردنەوە، کە بۆدریار لە ساڵی 1979 دا بڵاوی کردۆتەوە(2). بە ڕای بۆدریار (ئیغراکردن) و (فریودان) بە نیازی خۆسەپاندن، دیوی دووەمی دەسەڵاتن و هەروەها تاقە بوارێکیشن بۆ دەستنیشانکردنی هەڵوێستی ستراتیژی لە بەرامبەر دەسەڵاتدا.

ئەوەی بۆدریار لەسەر کارەکانی فۆکۆ تووشی ڕامان دەکات ئەوەیە، بەلای ئەوەوە دەقەکانی فۆکۆ (جوانترن) لەوەی حەقیقەت بن و پێیاندەڵێ: "حەقیقەتی چاوبەست لە ڕۆشنبیریی خۆرئاوادا". نووسەر لای وایە ئەم هەموو کارە چڕ و باڵاوتانەی فۆکۆ لەسەر (دەسەڵات، سێکس، جەستە و کۆنترۆڵ) لەڕاستیدا، دووبارە داڕشتنەوەی ئەو شتانەن لە کولتووری خۆرئاوادا، (ڕۆژگارێ) بەسەر زارانەوە بوون. چونکە دەقەکانی فۆکۆ باس لەو شتانە دەکەن چیدی لە ئارادا نەماون و دەڵێت: هۆی ئەوەی کە فۆکۆ توانای هەیە تێبینی هێندە سەرنجڕاکێش و سەرسوڕهێنەر لەسەر ئەو دیاردانە بخاتە ڕوو، ئەوەیە: "فۆکۆ لە سنووری سەردەمێکدا خۆی دەبینێتەوە خەریکە دادەڕمێ و لە نغرۆبووندایە". بۆیە شتێکی ئاساییە، وەک بۆدریار دەڵێت، فۆکۆ تواناکانی خۆی لە شیکردنەوەی دامەزراوە جۆربەجۆرەکانی دەسەڵاتدا تاقی بکاتەوە، چونکە دەسەڵات چیدی لە ئارادانیە و (مردووە).

باکەمێ لەم ئاستەدا بووەستین:



پۆست مۆدێرنیستەکان (لەوانەش بۆدریار) پرسیار دەکەن: چۆن دەشێ ئاگاداری جیهان بین بەبێئەوەی هیچ ڕەگوڕیشەیەکی داڕێژراومان لە جیهاندا هەبێ؟ دیارە ئەم پرسیارە، پرسیاری بێدەسەڵاتانەی بارودۆخی دۆش دامان نییە. نەبوونی حەقیقەتێکی ڕوون و ئاشکرا ناچارمان دەکات خۆمان حەقیقەتی خۆمان بەرهەم بهێنین و فڕێی بدەینە بازاڕەوە تا بۆ ماوەیەك ڕەواجی خۆی پەیدا بکات. جا ئەگەر جیاوازی لە نێوان ڕەوا و ناڕەوا، ڕاستی و درۆدا نەبێت، ئەوە هیچ جێگرەوەیەك ناتوانێ جێگەی ستراتیژی تاکەکەس کەپێی دەگوترێ (فریودان) وستراتیژی کۆمەڵ کە پێی دەگوترێ (دەسەڵات) بگرێتەوە، چونکە هەردوو جۆری ئەم ستراتیژانە (هاوشێوە)یەکی لەیەکچووی بەیەك تێکەڵبوو دەخولقێنن تا بەو جۆرە خۆیان ببنە دوا نرخ و بەها.

لەم جیهانەدا مەرج و یاسا هەیە بۆ تێگەشتن لە دەوروبەر و مامەڵە لەگەڵداکردنی ئەو دەوروبەرە. ئا لێرەوەیە کە هەردوو ستراتیژی نێوبراو، تاك و کۆمەڵ، سوێژەکتیڤ و ئۆبجێکتیڤ بە ناچاری لە ناو یەکتردا دەتوێنەوە. بۆدریار لە گفتوگۆیەکدا ئەوە بە ڕوونی باسدەکات و دەڵێ: چیدی نە تاك بە تەنێ بۆی هەیە چالاك بێت نە کۆمەڵ، جیهانی مۆدێرن و دنیای پاشەڕۆژ ناچاریان دەکا لەگەڵ یەك گەمە بکەن و سنوورەکانی نێوانیان رۆڵی خۆیان لەدەست بدەن[3]، چونکە سروشتی داسەپاندنی (دەسەڵاتی مۆدێرن) لەسەر بنەمای (فریودانەوە) وەستاوە.

فریودان ناچارمان ناکات، بەڵام سەرمان لێ دەشێوێنێ تەنانەت خەڵکانی فەردگەرا و خۆویستیش لە (فریودان) ڕزگاریان نابێت و دواجار وزە تایبەتیەکەیان لێدەدۆشرێت و دەکرێتە وزەیەکی بەکۆمەڵی. بۆدریار لەکتێبی (*Forførelse 1979*)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکا و دەڵێت: مەرج نیە فریودان شێوەیەکی بینراوی هەبێت، دەشێت خۆی لەنێو کۆمەڵ و دەستە و چینەکاندا بشارێتەوە، لەکاتێکدا ئەندامانی ئەو کۆمەڵە سەرگەرمی کار و پیشەی خۆیان بن. جا ئەگەر لە نێو ئەو کۆمەڵەدا هووشیاریەکی عەقڵی پتەو لە ئارادا نەبێت بۆ شیکردنەوەی پەیوەندییەکان، ئەوە مرۆڤ ناچارە بۆ هەموو بزاوتن و هەڵسوکەوتێکی خۆی بکەوێتە بەڵگە هێنانەوە. چونکە بەڵگەهێنانەوە بۆخۆی گرنگییەکی تێدایە و حەقیقەتیش ئەوەتا بە سوار پشتی ئەو (گرنگێتی)یەوە. دەبێ بەڵگە بهێنینەوە تا بە حەقیقەت بگەین. بۆدریار لە هەمان گفتوگۆدا دووپاتی دەکاتەوە کە "پرۆژەکەی وی هەنگاو هەڵهێنانەوەیەکی (شێلگیرانە)یە بەرەو واقیعیترین حەقیقەت"، بەڵام بەردەوام بەڵگە هێنانەوە بە مانای ئەوە نیە بوارمان بۆ دەڕەخسێ بە ئارەزووی خۆمان مامەڵە لەگەڵ حەقیقەتدا بکەین. ئەگەرچی شوێنی وا هەیە هەموو شتێکی تێدا دەگوترێ، بەڵام گرنگە ئا لەو شوێنانەدا ئامانج و ستراتیژیەتمان دەستنیشان بکەین. ئەگەرچی هەر کات لە بوارە زۆر ناسکەکان نزیك دەبینەوە، مەودای قسەکردنیشمان تەسکتر دەبێتەوە، چونکە لێرەدا هونەر ئەوەیە چۆن (سەلماندن) و قسەکانمان بە شێوەیەك دەربڕین کە گوێمان لێ بگیرێ و بڕوامان پێبکرێ.

ڕاستە جۆرەها وێنا لەبارەی جیهانەوە هەیە، بەڵام هێشتا ناتوانین بە ئارەزووی خۆمان لە بارەی جیهانەوە بئاخفین. کەچی گەمەکە هەر بەردەوامە (گەمەی بەڵگەهێنانەوە)، چونکە پڕۆژەکانی مرۆڤ نەك هەر تەنیا بە پێی یاسای واقیع خۆیان ڕاستدەکەنەوە، بەڵکو واقیعی خۆیشیان دێننە ئەفراندن. کاتێکیش حەقیقەتێکی ڕوون و ئاشکرا لە ئارادا نەبێت و حەقیقەتەکان خۆیان لە ژێر ڕووپۆشی هەمەڕەنگی و پەرژەوەندخوازانە و بەرەڵاخواز داپۆشیبێ، ئەوە "واقیعێکی بەتاڵ"

دەبێتە زەمینەی ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا بێرەگ و ڕیشە و ئەزموونە بچووکەکان.

بۆ نموونە دەبینین خواست و ئاواتی گەیشتن بە (پلەوپایە و نێوبانگ) جۆرەها لە نەریت دروستدەکات کە لە ماوەیەکی کورتدا، بەجۆرێ ببنە جێی پەسەند و لاساییکردنەوە و هەموو کەس ئاواتیان بۆ بخوازێ. جا ئەگەر هاتوو کەسانێك دیدی ڕەخنەیان لە ئاستدا (لە ئاست ئەو نەریتانەی بە پلیکانەی ناوبانگدا سەرمان دەخەن)، بەکار هێنان، ئەوە خێرا بە "مشتێ خەڵکی بە بوغز و کینە" ناو دەبرێن و لە دەستە و "گروپ" دەکرێنە دەرێ. دەشێیت ئاواتی گەیشتن بە پلەوپایە بە مانای بەردەوامی بێت لە ژیاندا، بە مانای گەشەکردن و کارنامە پێکەوەنان بێت، بەڵام لە نێوەندی ئەو بوارانەدا، حەقیقەت بریتیە لە "یەك ساتەوەخت"، ئەگەر نەمانزانی ئەو ساتەوەختە چۆن بە کار بهێنین ئەوە هەڵوێستیشمان لە بەرامبەر واقیعدا دەگۆڕێ. خەیاڵ و واقیع تێکەڵ بە یەکتر دەبن، هەر یەکەمان بواری ئەوەی بۆ دێتە پێشەوە بە ئیلهام وەرگرتن لە "حەقیقەتەکەی خۆی" وەکو مارمێلکەی حەوت ڕەنگ لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی دی، ڕەنگی خۆی بگۆڕێ و لەم هەڵوێستەوە باز بداتە ئەوی تریان. ئەم مامەڵەکردنەش وەك بۆدریار لە کتێبە گەورەکەیدا (*De Fatale*) بێبەختەکان 1983دا ڕوونی کردۆتەوە: لە بواری ئابوری، سیاسی و ژیانی تایبەتدا دووبارە دەبێتەوە، ئیدی لەم ساتەدا ئێمە خۆمان لەناو جیهانێکدا دەبینینەوە کە "گۆڕەپانی هەموو حەکایەتە مۆدێرنەکانی قڵپکردۆتەوە". بۆدریار هەموو ئەم گۆڕانە گەورەیەش لە چاوی تەکنەلۆژیای زانیاری و بوارەکانی ڕاگەیاندندا دەبینێتەوە.

بەلای بۆدریارەوە، تەکنۆلۆژیای ڕاگەیاندن بە ڕادەیەکی زۆر هەڵدەستێ بە (خۆشەکردن)ی خەڵك تا گیانی بەتەنگەوەچوون و شێلگیرانەیان لە بەرامبەر شەپۆلی ڕاگەیاندن و نیگار و ئاڵوگۆڕە خێراکاندا لەدەست بدەن و نەتوانن چیدی هەڵوێستی پتەوی بناخەداریان لە دژ پیشان بدەن. بوارەکانی ڕاگەیاندن وەك زاری ئەشکەوتێکی تاریك، هەموو ڕووناکاییەك هەڵدەمژن بەبێ ئەوەی تۆزێ ڕووناکییان لێوە دەرچێ! ئیدی ئالێرەوە پەیوەندی خەڵك بە واقیعەوە دەپسێ و مێژوو دەحەپەسێ، واتە خەیاڵپەروەری دەچێتە سەر کورسیی دەسەڵات و خۆی وەك واقیع، یان تاکە واقیعێك دەسەپێنێ و لێرەشەوە حەقیقەتی خۆی بەدەست دەهێنێ.

حەقیقەتی بوارەکانی ڕاگەیاندن ئەوەیە کە هێما بۆیەکتر دەکەن و یەکتری بە شایەت دەگرن، یاخود بە کوردیتر بڵێین: سوێند بە سەری یەکتر دەخۆن. بەم هۆیەشەوە سەرنجی کۆمەڵانی خەڵکی مەسرەفی و بەرخۆر بۆ لای یەکتر ڕادەکێشن و دەبنە دووبارە کەرەوەی (ناوەڕۆك)ی یەکتر. ئا لێرەدایە کە تۆتالیتاریەتی کۆمەڵگای مۆدێرن خۆی مەڵاسداوە.

ئەم دەستنیشانکردنەی بۆدریار هەمان چەمکی (*Intertextuality*) (ئاوێزانبوون)ی تیۆرەی ئەدەبمان بەبیر دەهێنێتەوە، کە هەر لە فۆرمالیستە ڕووسەکانەوە تا والتەر بنیامین، شتراوس و فۆکۆ و بارت، تا دێریدا و گادامێر و پۆڵ ڕیکۆر جێگەی مشتومڕ لەسەر کردنە. کاتێك "دەنگوباس"ی تەلەفزیۆن "هەواڵەکان"ی ڕادیۆ و "ستوونی ڕووداوەکانی" ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی دیکەمان بە بیر دەخەنەوە، یاخود (ڕیکلامە)کان دووبارەکردنەوەی وێنا دوورە دەستەکان و فیلمە سەرسووڕهێنەرەکان بن: شتێ ڕوویداوە و دیاردەیەك سەری هەڵداوە کە دەشێت ناوی بنێین "ئاوێزانبوونی ڕاگەیاندن" و تێهەڵکێشبوونی بوارەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری. بۆدریار لەم ئاستەی شیکردنەوەکاندا تەواو ڕەشبینە و ڕای وایە ناوەڕۆکی بوارەکانی ڕاگەیاندن لەسەر

پرنسیپی "جیاکردنەوە" و "ئەبستراکتبوون" وەستاون و ئەمەش دەبەستێ بە دەسەلاتەوە. دەسەلات ئەو کاتە دەبێت بە دەسەلات کە بە جۆرێ فەرمان دەرکات و مەبەستەکانی ڕاگەیەنێت، ئیدی نەتوانرێ ئەو فەرمانە ڕەتبکرێتەوە و بەروویدا بدرێتەوە. هەروەك چۆن تەلەفزیۆن بە ئامادەبوونی لە ژووری (دانیشتندا) ڕۆڵی کۆنترۆڵکەرێکی کۆمەلایەتی دەگێڕێ، ئاواش فەرمان دەردەکا تا خەڵکی چیتر لەگەڵ یەکتر نەدوێن و لە بەرامبەر شاشەدا بێدەنگەی لێبکەن! وەك بۆدریار ئاماژە دەکا: بەزمی سەرنجڕاکێش ئا لێرەدایە، چونکە ئێستا دەتوانرێ بەراورد لە نێوان کارکردی کلاسیکییانەی دەسەلات و کارکردە مودیرنەکەیدا بکرێت. کارکردی کلاسیکییانەی دەسەلات بریتیە لە سزادانی ڕاستەوخۆی جەستە، بەلام کارکردە مۆدێرنەکەی بریتیە لەوەی جەستە ئیغرا بکرێ و فریو بدرێ. لێرەدا بۆدریار یەکێ لە ڕستە هەرە قەشەنگەکانی خۆی دەنووسێ: ئەو هەڕەشەیەی دوێنێ ئازار و سزادانی بەدوادا دەهات، ئەوڕۆکە پەنجەی فریودانمان لێڕادەوەشێنێ".

چیدی مەترسی ڕاستەوخۆی زەبروزەنگی جەستەیی و فیزیکیمان لەسەر نیە، بەلام خۆخەڵەتاندنە ئەگەر بڵێین مەترسیی نەماوە. مەترسی هەر هەیە چونکە دەسەلات گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، بەڵکو دەسەلاتداران شێوازی خۆیان لە بەکارهێنانی دەسەلاتدا گۆڕیوە. جۆرێ لەو دانپیانانە ڕوویداوە کە "بەرزەمرۆ"ی نیتشە لە ئاست مرۆڤە بچووکەکاندا ناچار بەدان پیانان دەکات!

هۆی ئەم گۆڕانە لە شێوازی بەکاربردنی دەسەلاتدا چیە؟

ئەمە پرسیارێکی بۆدریاریانەیە: هۆکەی ئەوەیە جیهان نائارامە، واقیع نائارامە و لە جیهان و واقیعی نائارامیشدا (جیهانی مۆدرێن) بەکارهێنانی کلاسیکیانەی دەسەلات، (زەبروزەنگ و لێدان) لە دژی خۆی دەکەوێتەوە. چونکە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دژە دەسەلاتێك و بناغەکانی خۆی مینرێژ دەکات بەوەی کە خەڵکی لە خۆی دەتەکێنێتەوە و دەیانتۆقێنێ. ئەمە لە کاتێکدا بوونی ئەو دەسەلاتە بە خەڵکەوە گرێدراوە. بۆیە واچاکە دەسەلات لەم بەشەی جیهاندا (کولتووریزە) بکرێ، ببێتە کولتوور، بۆ ئەوەی چالاك و کاریگەر بێت. دەسەلاتی بە کولتوورکراویش بریتیە لە فریودان و سەرنجراکێشانی خەڵك بۆ لای پرۆژەکانی بە نیازی تێوەگلاندنیان.

بەلام بودریار ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی گۆڕانی شێواز لە بەکارهێنانی دەسەلاتدا مەرج نیە گۆڕانێکی بنەبڕکراوبێت و بۆی نەبێت بگەڕێتەوە بۆ شێوازە کلاسیکییەکەی. ئەو دەڵێ زەبروزەنگ و ئازاردان لە مشتی دەسەلاتدارەکاندا هەر هەیە، بەلام ئەو مشتەیان جارێ لە پاش خۆیانەوە حەشارداوە: تەنیا کاتێك بەکاریدەهێنین کە ئیدی بزانن وا خەریکە هەلومەرج و ڕووداوەکانیان لەدەست دەردەچن. لێرەدا وەك ئەوە وایە بۆدریار چاوێکمان لێدابگرێ و بڵێ: "خەڵکینە، خۆتان ئەمە زۆر باش دەزانن"!

بۆ نموونە ئەگەر هات و خەڵك یان دەستەیەك لە خەڵکان ئەو ئازادییەیان پەسەند نەکرد کە بۆیان (داندراوە) و خوازیاری ئازادییەکی دیکە بوون، ئەوە کارکردی کلاسیکییانەی دەسەلات لە دژی ئەو خواستەیان دەخرێتە کار. ئیدی لێرەوە مافەکانی تاك، پرنسیپەکانی دیموکراسی و یاساکانی مەدەنی لە مانا بەتاڵ دەبێتەوە، خەڵکانی ئازادیخواز بە تیرۆریست و تێکدەر دەناسێنرێن، پۆلیس خۆی تێکەڵ بە خۆپیشاندانەکان دەکات و پێکدادان دروست دەبێت. ئەمەیش ئەو ڕووداوانە بوون کە بە درێژای ساڵانی (1990–1992 و 1994) لە پایتەخت و شارە گەورەکانی جیهانی



مۆدێرندا دووباره بوونەوه: نائارامییەکانی لۆس ئەنجلس لە ئەمریکا، کپکردنەوەی ناڕەزایی دەبڕین لە دژی شەڕی کەنداو، سەرکوتکردنی ناڕەزایی دەربڕینی خەڵکی هەندێ لە وڵاتانی ئەوروپا لە دژی دروستبوونی ئەوروپای یەکگرتوو. لە دانمارك خاوەنکار و بەڕێوبەری دایەره گەورەکان بە هۆی "نامەی تایبەتەوه" کرێکار و فەرمانبەرەکانیان ئاگادار کردەوه، کە ئەگەر دەنگ بۆ "یەکگرتنی ئەوروپا" نەدەن، لە کار دەردەکرێن، لەشەوی دەنگدانەکەدا پۆلیس لەسەر شەقامەکانی کۆبنهاگن کەوتە تەقەکردنی ڕاستەوخۆ لەو خەڵکەی لەدژی "یەکگرتنی ئەوروپا" ناڕەزاییان دەردەبڕی، لە مانگی دووی (1994)دا، دوای ئەوەی تیرۆریستەکانی تورکیا، لە دانیمارك تەقەی لە لایەنگرێکی (پ.ك.ك) کرد، پۆلیس بە بێ هیچ ئاگادەرکردنەوەیەك، ڕژایە قاوەخانەی کوردەکانەوه و بەتۆمەتی ئەوەی گوایە چەکیان هەیە دەستبەسەرکران و هەر هەمان کات ئەم ڕووداوه بە هۆی تەلەفزیۆنەوه خرایە بەردەم ڕای گشتی خەڵك.

بۆدریار زۆر جەخت لەسەر ئەوه دەکاتەوه کە دەبێ لە حاڵەتی ڕوودانی ڕووداوەکاندا پرسیار لە ماهیەتی ئەو دەسەڵاتە بکەین کە خۆی دەنوێنێ. سەبارەت بەڕووداوی کوردەکان دەشێت بڵێین، هەردوو شێوازەکەی دەسەڵات ئامادە بوون: پۆلیس وەك شێوازە کلاسیکییەکە و کامێرا وەك مۆدێرنەکە! ئالێرەدایە کە (حەقیقەت)ی واقیعی پووچدەکرێتەوه، ئامادەبوونی پۆلیس و چاوی کامێرا حەقیقەتێکی ڕەسمی بەرهەم دەهێنێت.

بۆدریار هەر بەوه ڕاناوەستێ لە پرنسیپەکانی فریودان و پڤدان ئاگادارمان بکاتەوه، بەڵکو پرسیار دەکات و دەڵێ: چۆن مرۆڤ هاندەدرێ لە کاتێکدا خۆی دەزانێت کە دەشێت هانبدرێ؟ چۆن دەکرێ چەوساندنەوه و ئازاردان ڕووخسارێکی (ئاسایی و سرووشتیانە)یان پێببەخشرێت؟ بۆدریار دەڵێ ئەمکارە ئاسانە، بە مەرجێ هاندەران (دەسەڵاتداران) لە پێشەوه خەڵك لەو تاوانانە ئاگادار بکەنەوه کە دەشێت خۆیانی پێ تاوانبار ببن. خەڵك دەخرێتە بەردەم دوو بوار: یان ملکەچی پرنسیپی (فریودان) بێتن، یاخود نە ء لە باری ئەمەی دواییاندا دەبنە تاوانبار. کەواتە ترسی نەبوونە بە تاوانبار کە خەڵکی بەرەو (کەمپەکانی فریودان) ڕاپێچدەکات. ترسی جیابوونەوەیە لە کۆمەڵ و نەریتەکانی. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەمەیش، بۆدریار چوار خاڵ دەستنیشاندەکات.

–خەڵك خۆیان دەخوازن هانبدرێن. ئەوەی کە یەکێك بێت و ڕۆڵی هاندەر ببینێ، مانای ئازادبوونی ئەوانیترە لەو کارە و دەربازبوونیان لە بینینی ئەو ڕۆڵە. لێرەوه خەڵك ئۆمێد بەوه دەبەستن کە بەردەوام هانبدرێن و ئافەرین بکرێن و خۆشەویست بن، بۆئەوەی لەبەر تینی ئەم خۆشەویستییەدا خۆشیان بکەونە خۆشویستن. بۆیە بێئومێدی لەلایان تەنیا کاتێك سەر هەڵدەدات کە هاندەر بکێشێتەوه، یاخود فریودانەکە بێ ئامانج و مەبەست بوبێت. لێرەدایە خەڵك وا هەستدەکەن بەکارهێنراون و لەوەش نیگەران دەبن. هۆی ئەوەی خەڵك حەز دەکەن هانبدرێن و ڕۆڵی هاندراوان بگێڕن ئەوەیە کە دەیانەوێ لە جیهانێکی ڕوون و ئاشکرا و شەفافدا بژێن، پێچ و پەنا لە ژیانیاندا نەبێت و تا بۆیان دەلوێ ئارەزووه (چرچ و لۆچ) بووەکانیان بە شێوازێکی تایبەت، بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ئاڕاستە بکرێن، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجە بەردەوام ببێتە هۆی تازەکردنەوەی وزه و تواناکانیان. بۆ ئەمەش وا چاوەڕێ دەکەن ئافەرین و دەستخۆشانە بکرێن و ئەمەش (هانیان بدا) بۆ بەردەوامی. فریودانیش لێرەدا هەندێ چوارچێوه دروست دەکات کە مرۆڤ بەخۆ دیتنەوەی لە ناو ئەو چوار چێوانەدا هەست بە ئارامی و بەختیارییەك دەکات و ئیدی ناسنامەی خۆی بە پیێ ناسنامەی




ئەو چوارچێوانە ڕاستدەکاتەوە. چوارچێوەکانیش، بۆ نموونە دەشێت (ناو)ی کارانە بێت کە خەڵك دەیانکەن لە جیاتی ئەوەی بە من بگۆترێ (فەڕاش)، پێمدەگوترێ (بەرپرسی خاوێنی)، لەبری ئەوەی پێمبگوترێ جاسوسی موخابەراتی ئەمریکی، پێمدەگوترێ (ڕۆژهەڵاتناس)! واتە هەمیشە ناسنامەی کارەکەم لەودیو ناوێکی تایبەت یان چەمکێکی تایبەتەوە دەشاردرێتەوە و منیش دێم ناسنامەی خۆم لەسەر بنەمای ئەو چەمکەوە ڕاستدەکەمەوە. چەمکەکان بوارمان بۆ دەڕەخسێنن هەرگیز لە ماهییەتی خۆمان پرسیار نەکەین و بەردەوامبین لەبەدەستهێنانی وزەدا، کەواتە با مل بۆ هاندەران بدەین و لێیانگەڕێین فریومان بدەن.

—فریودان پابەندی ناواخنی خۆی نیە. بەڵکو بە شێوەکەیەوە گرێدراوە "هەموو شتێ دەتوانێ هاندەر بێت" و مانایەکی تایبەت بەرهەم بهێنێ، مانایەك بۆ ناچارکردن نەهاتووە، بەڵکو سەر لێشێوێنەرە و ئەمەش بە ناوی ئازادییەوە ئاراستە دەکات. واتە فریودان جۆرێك لە ڕێکخستن و "ئاسایش" دەهێنێتە ئاراوە، کە بەهۆیەوە خۆی دەسپێنێ و پاشانیش دێت ئەم خۆسەپاندنە بێزەبروزەنگەی وەك بەڵگەیەك بۆ گرنگیی خۆی، بۆ بەباوبوونی و شوێن پەسەندبوونی خۆی، بەکار دەبات!. لێرەدا دەتوانین نموونەیەك بۆ ئەمە لە دەرەوەی جیهانی مۆدێرنی ئەوروپییەوە بهێنینەوە: نموونەی کوردستانی خواروو. لەو بەشەی کوردستاندا هەموو دامودەزگا ئیدارییەکان ڕۆڵێکی هاندەرانە دەبینن لە گرێدانی سەرجەمی خەڵك بە چارەنووس و ئامانجەکانی خۆیانەوە. ئەوان وەك بانگەشەی دەکەن، بە هۆی (هەڵبژاردنی ئازاد)ەوە هاتوونەتە ئاستی ئێستایان و ئەمەش دەبەستنەوە بەهەبوونی (دیموکراسیەت) و ئازادییەوە. لێرەوە، دیموکراسیەت و ئازادی وەك دوو هێزی کاریگەر دەخرێتە بەردەستی (هاندەران) تا بتوانن سەر لە هاندراوەکان تێك بدەن. واتە هاندەر دێت پێناسەیەك بۆ دیموکراسیەت، بۆ ئازادی، بۆ مەدەنیەت و بۆ ئیدارەکردن دادەڕێژێ و هاتنی خۆشی بۆ پانتایی دەسەڵات و حوکم، بەسەلماندنی ڕاستی پێناسەکەی لە خەڵك دەگەیەنێت. دەزگاکانی ڕاگەیاندن و بڵاوکراوەکانی، بۆنە سیاسی و جەژنەکانی سەرجەم بۆ پتەوکردنی بڕوای خەڵك بە پێناسەکانی خۆی، بەکار دەهێنێت. بەمجۆرەش دەرگایان لێدادەخات تا خەڵك پێناسەی خۆیان لەبارەی دیموکراسی، ئازادی و مافەکانەوە دانەڕێژن، چونکە هەموو پێناسەکردنێکی خەڵك لە بەرامبەر پێناسە باوەکانی دەسەڵاتدا بەنەفرەت دەکرێن. ئا بەو جۆرە خەڵك نە بە ئەزموونی ڕاستەقینەی ئازادی و دیموکراسیەتدا تێپەڕ دەبن و نە خودی شێوازە کلاسیکییەکەی دەسەڵاتیش لە وڵاتی ئێمەدا بوار بە خۆی دەدات سوود لە شێوازە مودێرنەکەی دەسەڵات وەربگرێت و سێبەری زەبروزەنگ بۆ ساتێکیش لێی جیا نابێتەوە.

—لە پرۆسەی فریودانا، خاڵی گرنگ بریتی نییە لە پەیوەندیی فریودان بە حەقیقەتەوە: بەڵکو وزە و تواناییەتی بۆ بەرهەمهێنانی حەقیقەتی خۆی. هاندان، واقیعێکی خەیاڵی دەهێنێتە بەرهەم، واقیعێکی خوازراو، یاخود واقیعێکی نیشانەیی و لە واقیعچوو، کە ئەم واقیعە دەرگای واقیعی ڕاستەقینە بە ڕووی هەموو ئاراستەیەکی تازەدا دادەخات و هەندێ وزەی نەناسراوی گوماناوی ئاراستە دەکات. بۆدریار پێیوایە کە مرۆڤی زیرەك دەبێ لەناو ئەو وزە گومانلێکراوانەدا لە مانای "بەسیاسیبوون" و "بەگاڵتەجارکردنی واقیعی ڕاستەقینە" بگات، کە ئەمە دوو پرۆسەن لەلایەن هاندەرانەوە بەڕێوە دەچن. بۆدریار بەدەنگی بەرز دەڵێت: نیەتی سیاسی و پیاوانی گاڵتەجاڕ ئەوە نیە کە خەڵك لە حەقیقەت نزیك بخەنەوە، بەڵکو خەریکی ئەوەن بەرەو نامۆبوون و چاوبەستیان

دەبەن. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش دێن یەکەمجار واقیع لە ماناکانی خۆی بەتاڵ دەکەنەوە و مانای دیکەی پێ دەبەخشن بۆیە ناوی گەمەکە بۆ خەڵك گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چۆن گەمە بە خەڵك بکەیت! هاندەرەکان دەڵێن، کاتێك خەڵك خۆیان توانای ئەوەیان نەبێت چاو بپۆشن لە ئافەرین و دەستخۆشانەی سیاسەتمەداران و گاڵتەجاڕان، ئەوە پێویستە هانبدرێن و فریوبدرێن. ئەوجا خەڵك خۆیان لەوە ئاگادارن کە هاندەدرێن، هیچ زیانێکی بۆ پرۆسەی فریودان و چاوبەستکردنی خەڵك نابێت چونکە خەڵك خۆیان ناتوانن چاوپۆشی بکەن لەوەی کە هان (نەدرێن) و ئافەرین (نەکرێن). ئەوان هەرچییەکیان لەدەست بێت دەیکەن بۆ ئەوەی بەردەوام ڕەزامەندی دەسەڵاتداران بەدەست بهێنن، دەنا ناتوانن بەردەوام بن.

فریودان بە جۆرەها شێوەی لە ژمارە نەهاتوو دێتە ئەنجام. مرۆڤ بەدەست دوورییە جوگرافیایی و شوێنکە جیاوازییەکانیەوە ئەناڵێنێ. لە یەك کاتدا لە تێرییان قرقێنە دەداتەوە و لە کاتێکیشدا لە برسان دەمرێ و عەودالّی ناسنامەی خۆیەتی. ئەم خەڵکانە یان بینەرن یاخود ئەکتەر. ئەوان چیدی هاووڵاتی نین، یان لە پەراوێزدان یاخود لە نێوەندا. جا بۆیە مەرج نیە لە هەموو دراما و تراژیدییەکاندا ئاگایان لە یەکتر بێ یان جۆرێ لە تەنیایی و هەستی هاودەردی بکەوێتەوە نێوانیانەوە. کەواتە یەك جۆری فریودان نیە کە دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی دراماکانی ژیان، بەڵکو سەرجەمی فریودانەکانن. هیچ فریودانێ بە تەنیا مانای نیە و زوو کاریگەری نامێنێ. بەڵام سەرجەمی ناوەندەکانی فریودان وەك ئەندامانی شارە مێروولەیەك کاردەکەن. کەواتە سیاستمەدارانی هاندەر و گاڵتەجاڕانی سیاسی لە هەرکوێیەکدا بن، بۆ یەك مەبەست و ئاراستە کاردەکەن. دەزگاکانیان بۆ یەك ئامانج و بە زمانێك کاردەکەن. زمانێ کە دەشێ پێی بگوترێ (زمانی یەکگرتووی دەزگاکان)، یان زمانی (یەکگرتووی پۆلیسەکان).

ئا بەمجۆرە بۆدریار دەیسەلمێنێ کە دەسەڵات لە کارکردە کلاسیکییەکەی خۆی (بە کارهێنانی زەبروزەنگ و لێدانی ڕاستەوخۆ و بەرفراوانکردنی دامەزراوەکانی بەندیخانە، نەخۆشخانە، شێتخانە و هتد) دابڕ بووە و ئەمڕۆ ئێمە خۆمان لەبەردەم کارکردی مۆدێرنی دەسەڵاتدا دەبینینەوە. ئا بەم تێگەیشتنەوە لە ئاراستەی هاوچەرخانەی بەکارهێنانی دەسەڵات و شێوازەکانی، بۆدریار دنە دەدات بۆئەوەی بڵێت چیدی ناتوانین دەسەڵات بە هۆی دەزگا ناسراوەکانیانەوە (ئەوانەی فۆکۆ کاری تێدا کردوون) بناسینەوە. بەڵکو هانمان دەدات بۆ تێگەشتنێکی هاوچەرخانە لە سیمای دەسەڵات داوا دەکات تا سنووری توانا، پێویستە چەمکەکان لە واقیعەوە نزیك بن.

هەموو ئەم گەڕانەوەیە بۆ ئەوە بوو کە زیاتر ڕوونببێتەوە بۆچی بۆدریار پرۆژەی (فۆکۆ) بە پرۆژەیەکی سەردەم بەسەر چوو، یان لە پەراوێزی سەردەم و بێ کارکرد و تێپەڕیو دادەنێ. لەسەر بنەمای چ تێگەشتنێ بۆ چەمکەکان و واقیعی هاوچەرخ (بەتایبەتی واقیعی هاوچەرخی دنیای مۆدێرن)وە، چەمکی نوێ بەرهەم دەهێنێ. لە نامیلکەی (فۆکۆ لە یاد کە)یشدا، بۆدریار دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: "تەنیا هۆیەك کە بواری بۆ فۆکۆ ڕەخساندووە ئاوا بە ووردی و تۆکمەیی لە بارەی سیکسواڵیتییەوە بدوێ و بنووسێ، ئەوەیە کە ئەو بوارەش وەکو بواری دەسەڵات لە سەردەمی بەسەرچوونی خۆیدایە و خەریکە ئاسەواری لەناودەچێ". واتە بۆدریار هێما بۆ بەرگی یەکەمی (مێژووی سیکس)ی فۆکۆ دەکات کە بەناوی (ویستی زانین)وە بڵاوبۆتەوە[4]. بە بڕوای بۆدریار، کاتێك فۆکۆ لە بارەی (سیکس)ەوە دەنووسێ، قسان دەکا: لە شێوازە تەقلیدیەکەی نووسین و قسەکردن

لەسەر ئەو بوارە تێناپەڕێ. (کە ئەمە شتێ بوو دەشیا لە ئاسۆی بیری فۆکۆدا ڕووی دابا)، بۆیە ئیدی دێت بە بوارێکەوە دەگیرسێتەوە کە (هەبووە)، چەمکی تایبەت بە خۆی بۆ داندراوە و لە خانەی سەردەمی خۆیدا شوێنی بۆ تەرخان کراوە. هەر بۆیەشە مانای (ئێستایی) خۆی لەدەستداوە و بۆتە (مێژوو). مێژوویەکی تێپەڕبوو و ڕابردوو. پاشان بۆدریار دەڵێت: فۆکۆ هەرگیز پێمان ناڵێت لە (ئێستا) دا، لە (حاڵیحازر)دا دەسەڵات یان سێکس چ گۆڕانێکیان خەریکە بەسەردا بێت؟ ئا لێرە و لەبەرچاوماندا و لەم هەنووکەیەدا؟

ئەگەر ئێمە نەمانەوێت هەروا بە ئاسانی بەلای ئەم سەرنجەی بۆدریاردا تێپەڕین، پێویستە ئاگادار بین کە پرسیار لە ئێستا کردن و ئێستایی خستنە ژێر پرسیارەوە بوارێکی نامۆ نیە بە هزری فۆکۆ. فۆکۆ لە وتاری (***کانت و شۆڕش***)دا سەرجەم باسی ئەو ساتە گرنگە دەکات کە کانت تیایدا پرسیار لە ئێستایی بوونی فەلسەفە و گوتاری فەلسەفی دەکات. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە بەلای ئەو کەسانەوە کە ڕایان وایە فۆکۆ مێژووی نووسیوەتەوە، یاخود جۆرێ لە مێژووی نووسیەوە کە پێشتر نەنووسرابۆوە، ئەوە سەرنجەکەی بۆدریار ناوەڕۆکی خۆی لە دەست دەدات. چونکە ئەم سەرنجە لەسەر ئەو بنەمایەوە نەهاتۆتە ئاراوە کە فۆکۆ مێژوونووس بووە. هەرچەندە بۆدریار ئەم سەرنج و ڕەخنەیەی لە ئاست پرۆژەی فۆکۆدا ئاگایانە دارشتبێ، دواجار ئەو خاڵەی لەبەر چاونەگرتووە کە هەریەکێ لەو بوارانەی فۆکۆ لەبارەیەوە نووسیون سەبارەت بە (ئێستا) دینامێتن و لەژێر بناخەی واقیعە نەخوێندراوەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا دەتەقنەوە و لەوێشەوە (ئێستا) دەخەنە ژێر پرسیارەوە. یان هیچ نەبێت بوارمان بۆ دەڕەخسێنن دیدێکی ڕەخنەگرانەی کارا لە بەرامبەر واقیعەکانی ئێستاماندا پەروەردە بکەین. بەڵام بۆ ئەوەی ئاسۆی ئەو دیدە ڕەخنەییەمان، لەدوا ئەنجامدا دووچاری هەندێ کێشەی ئەبستیمۆلۆژیمان نەکات پێویستە جیاوازیی ڕەوتە میتۆدیەکەی فۆکۆ لەگەڵ ئەوەکەی بۆدریاردا لەبیر نەکەین.

لەکاتێکدا فۆکۆ خەریکی بەرهەمهێنانی زانستی ڕەخنەیە بەیارمەتی زیندووکردنەوەی شێوازەکانی مەعریفە لە مێژوودا، بۆدریار خەریکە هەمان زانست بەهۆی ئاخاوتن و ووردبوونەوە لە (ئێستا) بەرهەم دەهێنێ. فۆکۆ بەرەو (جینالۆژیا) دەڕوات و بۆدریار لە (هاوچەرخناسی) نزیك دەبێتەوە. ئەگەر بەلای فۆکۆوە نووسینەوەی مێژوو ئەڵتەرناتیڤە بۆ ئەوەی چیدی دەسەڵات زانستەکان بۆ مەبەستی خۆی بەکار نەهێنێت، بەلای بۆدریارەوە ئەم ئەڵتەرناتیڤە هەموو دەردێ دەوا ناکات و پێویستە دژی بەکارهێنانی زانستەکان بین لەلایەن (دەسەڵاتی ئەمڕۆ)وە و مێژووی ئەو بەکارهێنانانە لەبیرکەین.

بۆدریار لە کتێبی (کۆنترۆڵ و سزا) ی میشێل فۆکۆوە نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت، لە هەموو ئەو تێگەشتنە تەقلیدیانەی کە دەسەڵات لە خانەی (بەدی و خراپە)دا ڕیز دەکەن، فۆکۆ دێت دەسەڵات وەك هێزێکی (بەرهەمهێنەر)یش دەبینێ. بۆ نموونە خەستەخانەکان، راوێژکاری دەروونشیکاری و بەندیخانەکان، ڕاهێنەری خراپەکاران بەرهەم دەهێن. سێکس بە شێوە خۆرئاواییەکەی میکانیزمی بەرگری (لە بیر خۆبردنەوە)، (بێموبالاتبوون) و (قەناعەتپێکردن) بەرهەم دەهێنن. ڕەنگە هەروەك بۆدریار خۆی دەڵێ ئەمە بۆ ئەوە بێت کە مرۆڤی خۆرئاوایی ئاسانتر بچێتە ژێر باری مۆنۆپۆلێزەبوونەوە.

لە دژی ئەم بەرهەمهێنانەیە کە بۆدریار داوای ستراتیژیکی تازە و کارا دەکات. ئەو کولتووری خۆرئاوا بە کولتوورێکی (***خێرا چارەسەر دۆزەرەوە***

***بۆ کێشەکانی خۆی)*** ناودەبات و ڕەخنەی ئەوەی لێدەگرێ کە هەموو تێڕوانینەکانی ئەم کولتوورە، هەموو ئەزموون و بۆچوونەکانی دواجار بە خانەی تاقیگا و کلینیکەکاندا تێپەڕ دەبن، تەنانەت سێکسیش. سێکس هێندەی چێژێ بێت لە خۆشەویستی و ئیرۆتیکا، مەودایەکە بۆ خستنە بازاڕی جۆرەها ئامێر و ئامرازی سێکسیی لە پلاستیك دروستکراو، چەندەها بڵاوکراو و گۆڤار، کە هەموو ئەمانە سنوورە سرووشتیەکانی خۆشەویستی و پێکەوەبوون بە ناوی (ئازادکردن)ەوە بەرەو خانەی لەبیرچوونەوە دەبەن. ئەگەرچی دواجار وەکو بۆدریار دەڵێ: ئەو جیهانە ئازادکراوە هەر هەمان کویلەخانەی سێکسی خۆرئاوایە. نموونەیەکی بەر چاو دەهێنمەوە کە هەریەکێ لە ئێمە ڕۆژانە دەیبینین: مەبەستم ڕەسمی ڕووتی ئەودیوو شووشەبەندی دووکانەکانە. لە سەر پانتایی وێنەی گۆڤارەکانی (پۆرنۆ) کە ژمارەیان یەکجار زۆرە، خستنە ڕووی لەشی ئافرەت لە هەموو ئەو شوێنانە جیاوازە کە لەشی ئافرەتیان تیا دەخرێتە ڕوو. کاتێ تەماشای ئەمجۆرە وێنانە دەکەین (وە هیچ پێویست ناکات بەشەرمەوە تەماشایان بکەین یاخود بەدزییەوە) دەبینین کە ئافرەت جۆرێ لە پاسیڤبوونی پێدراوە، وەك (شتێ) مامەڵەی لەگەڵ کراوە کە تەنیا خاوەنی (ئەندامی مێینەیی) و (جوتێ مەمکە). وەك پانتاییەك بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووەکانی پیاو، واتە کراوەتە ئۆبژە (بابەتێکی) سێکسی.

ئەمەیە پەیامی گۆڤار و ڕەسمی ڕووت. لە ناو ئەو ڕەسمانەدا چەوساندنەوەی ئافرەت لەلایەن پیاوەوە، ئەو مەترسی و زەبروزەنگانەی ئافرەت ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بەشێوەیەك خراونەتە ڕوو کە بینەر واتێبگات ئافرەتان خۆیان خوازیاری ئەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ کردنەن. پۆرنۆگرافی پێماندەڵێ: خۆمان وەك نێرینە بەسەردەستە و ژنانیش بە ژێردەستە بزانین و بڕوامان بە پیاوەتی خۆمان، لەویشەوە بەڕەفتاری پیاوانەمان پتەو بێت. بۆدریار لەسەر بنەمای ئەم جۆرە نموونانەوە ڕەخنە لەو (ئازادکردنە) دەگرێ کە دواجار کۆمەڵێ چاڵی بۆ مرۆڤی هاوچەرخ هەڵکەندووە.

بە پێچەوانەی فۆکۆوە کە پێیوایە لە کولتووری ئەورووپیدا هیچ کاتێك ژیانی سێکسی نەشاردراوەتەوە و هەردەم قسەی لەبارەوە کراوە، بۆدریار دەڵێ: هۆکەی ئەوەیە کە ئەو ژیانە نەبووە. واتە لە ئارادا نەبووە. پاشان دەڵێت سێکسیش وەك ئابووری سیاسی وایە: جۆرێکە لە پینەکردن و مۆنتاژکردنەوە، جۆرێ لە "خەیاڵی تیۆریزەکراوە" بەڵام لە پراکتیکدا مرۆڤ هەردەم خۆی لێ پاڕاستووە یاخود هەرگیز بە جیدی نەیگرتووە. ئەوجا بۆدریار بە شێوازێکی "ئانارشیستانە" دووپاتی دەکاتەوە: زانستەکان، گوتارەکان و دامودەزگاکانیان، جگە لە کایەکردن و یاریکردن زیاتر نین. جۆرێکن لە چاوبەست و شێواندنی واقیع: "هیچ تیۆرێ ناتوانێ چارەسەر بۆ کێبەرکێکانی واقیع بدۆزێتەوە، چونکە هەمیشە تیۆرەکان لەدوای واقیعەوە هەنگاو هەڵدەهێنن. ئەو واقیعەی لە تیۆر خێرا تر و بەگوڕتریش بێت بەرلەهەرشتێ خودی تیۆر لەناو دەبات و تیۆریش تیرۆرکردنی واقیعە"! بۆدریار وەك دژوەستانەوەیەکی گاڵتەجاڕانە لە ئاست تیۆرەکانی ڕەخنەدا دەڵێ: "چیدی مرۆڤ بە ڕەخنەی نوێوە خەریك ناکات، بەڵام توانای هەیە هەندێ "خەیاڵەتیۆر" بهێنێتە ئاراوە و ئومێدی بەوە هەبێ بەرهەمێکی بدەنێ".

کەواتە بۆ ئەوەی بتوانین لە واقیع بگەین و هەروابێتەوە لەم واقیعەش بگەین کە ئێستا خۆمانی تێداین، پێویستە تیۆرەکان لە یادبکەین. جا لەبەر ئەوەی کارەکانی فۆکۆ کاری پشت بە تیۆر بەستوون، ئەوا گرنگە فۆکۆ لە یادبکەین.

**دوا وته:**

بۆدریار به "ئانارشیست" و "دەستەوەستاو له ئاست بەرهەمهێنانی تیۆرەیەکی ڕادیکاڵ"دا، تاوانبار دەکرێت. ڕەخنەی لێدەگیرێ کە خۆی لە "کاریگەریی قوتابخانەی فرانکفۆرت و ئاڵتۆسێرییەکان ڕزگار نەکردووە". بە کابرایەکی "ڕەشبینی ناعەقڵانی" ناودەبرێ. بەتەوسەوە پرسیاری لێدەکرێ ئایا ئەو "فەیلەسووفە" یان "کۆمەڵناس؟". بۆ خۆی دەڵێ لەگەڵ بڵاوبونەوەی "فۆکو له یاد که" هیچ ڕۆژنامەیەکی فەرەنسی بەرهەمەکەی هەڵنەسەنگاند وئەمەیش دەداتە پاڵ ئەو باردۆخەی ڕۆشنبیری فەرەنسا لەشەستەکاندا گیرۆدەی ببوو: کێبەرکێ و ململانێ. لە لایەکی ترەوە، بۆدریار بەڕاشکاوی لە سەرجەمی کارەکانیدا ڕۆشنبیری و کولتووری خۆرئاوا بە کولتوور و ڕۆشنبیرییەکی "دەستکرد" و "چاوبەست" لە قەڵەم دەدات. لێرەدا تەواو لەو تێزەی (ئەدوارد سەعید)ەوە نزیکە کەدەڵێ، کولتووری خۆرئاوا هەردەم بۆ دەستبەسەراگرتنی دیاردەیەك هاتووە ئەو دیاردەیەی لە واقیع دابڕیوە، چەمکێکی بۆ دروستکردووە و لە سیستەمێکی گوتاریدا دایڕشتۆتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت دواجار بیخوێنێتەوە، دادگایی بکات، دیسپلینی بکات و بیخاتە ژێر دەسەڵات و ئیرادەی خۆیەوە. بۆدریاریش هەموو پرۆسەکانی ژیاری خۆرئاوا، یان وەك بۆخۆی دەڵێ جیهانی مۆدێرن، لەو ئاستەدا دەبینێتەوە و ئەمەش بە "وونبوونی حەقیقەت" لەناو ئەو کولتوورەدا ناو دەبات و پێی دەڵێ: کولتوورێکی خێرا چارەسەر دۆزەرەوەیە بۆ کێشەکانی خۆی! تەنانەت لە یەکێ لە هەڤپەیڤینەکانیدا دەڵێ: بڕوام وایە بەناوبانگیی فۆکۆ لەوەوە هاتووە کەئەو کەسایەتییەکی دەسەڵاتمەندە. ئاخر من پەلاماری ویمداوە، کەچی پەرچەکردارێکی ئۆتۆماتیکی لەلای هەموانەوە سەریهەڵداوە. ئەمەش جۆرێکە لە یاسای مافیا، یاخود ڕەنگە مەسەلەکە دیسانەوە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە هەبێت، بەڵام لە ئاستێکی ڕۆشنبیریدا[5].

بەهەرحاڵ، کارەکانی بۆدریار بەشێوەیەکی سەخت پابەندی واقیعن، پرۆژەی ئاخاوتنێکن لە بارەی جیهانی (ئێستا)وە، بۆیە لە هەموو پانتاییەکانی فریودان "هاندەرترن". لێرەوە ئێمە پرسیار لە خۆمان دەکەین: ئایا دەمانەوێ بەرەو کامە ئاراستە بڕۆین؟ ڕۆشنبیرییەکەمان بەرەو کامە مەیدان هاندەدەین؟ چین ئەو هێزە ڕۆشنبیرییانەی تا ئێستا بە نەشاراوەیی ماونەتەوە و کامانەن ئەو میکانزمانەی ترسی دابڕانمان تێدا دروستدەکەن؟ ئایا پێویستە لە نێوان (بۆدریار) و (فۆکۆ)دا یەکێکیان هەڵبژێرین؟ یان هەردووکیان پێکەوە؟ ئایا بەناچاری دەبێ ڕۆشنبیریی ئێمەش بە هەموو ئەو قۆناغانەدا بڕوات کە ڕۆشنبیرییە دەوڵەمەندەکان بڕیویانن تا ئەوەکەی ئێمەش ببێتە ڕۆشنبیرییەکی گەورە؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە و پرسیاری لەم جۆرە هەرچۆنێ بدەینەوە، ناتوانین خۆمان لە پرۆژەیەك و ئەرکێکی گرنگ (کە شوێن پێی هەنگاوەکانی داهاتوومان پتەو دەکات) بدۆزینەوە: مەبەستم خوێندنەوەیەکی ورد و بەمەبەستی ڕۆشنبیرییەکانی دییە، بە گەورە و بچووکیانەوە، بە نزیك و دووریانەوە. پاشان دروستکردنی پردێ لە نێوان ئەوان و ڕۆشنبیریی خۆماندا. بۆ دروستکردنی ئەو پردەش دەبێ خۆمان لە هەموو ئەو میکانیزمانەی بەرگریکردن ڕزگار کردبێ کە تا ساتەوەختی ئێستا بۆ تاوانبارکردنی "ئەوان" و پاکانەکردنی خۆمان کارمان پێکردوون. هەروەها دەبێ لە هەموو ئەو "قەڵایچە ڕۆشنبیرییانە" هاتبینە خوارەوە کە زمانی کوردی لە نزمی و پلەی

مەرگدا دەخەنەڕوو. زمانی کوردی تاوانبار نیە، بەڵکو ئەو ڕۆشنبیرییە ساختەیە تاوانبارە کە ناتوانێ زمانی کوردی لە هەرێمە نەناسراوەکاندا بەکاربهێنێ و کاری پێ بکات. تا ئەو خوێندنەوەیە بۆ ئەوانی دیکە و بەکارهێنانی زمانی کوردی لە هەرێمە تازەکانە مەعریفەدا نەبێتە بەشێك لە سەرجەمی پرۆژەی ڕۆشنبیریمان، ئەوە لە توانای باری کولتووری و بەرژەوەندی ڕۆشنبیریماندا نیە داخوازیەکەی (بۆدریار) بۆ (لە یادکردنی فۆکۆ) بهێنینە دی(!). بەڵام لەدەستمان دێ، (بۆ) یەك بخەینە پێش داخوازیە هاندەرانەکەی بۆدریارەوە و بپرسین: (بۆ) فۆکۆ لە یاد بکەین؟ و بەهۆی ئەم پرسیارەیشەوە خۆمان (هانبدەین) بۆ سەفەری خوێندنەوەیەکی بەردەوامی ڕۆشنبیرییەکانی دی. دواجار بتوانین نەك تەنیا فۆکۆ بەڵکو خودی بۆدریاریش لە یاد بکەین!

### پەراوێز و سەرچاوەکان

(*)ئەم بابەتە ساڵی 1994 ئامادەکراوە و لە ژمارە (2)ی گۆڤاری (دەروازە)دا بڵاوکراوەتەوە کە بە سەرپەرشتی برای بەڕێزم هەڵکەوت عەبدوڵا بڵاودەکرایەوە. لەو ژمارەیەدا نووسەری ئەم بابەتە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی دۆسیێیەکی بە ناوی (***مێشێل فۆکۆ: دابڕانی مەعریفی***) کەوتە سەرشان کە زیاد لە حەفتا لاپەڕەی گۆڤارەکەی دەگرتەوە. ئەم بابەتە هەوڵدانێك بوو بۆ پێشکەشکردن و خوێندنەوەی نامیلکەکەی بۆدریار کە ئێستا چاپێکی فارسی هەمان نامێلکە لەبەر دەستایە. تیایدا گفتوگۆیەکی بۆدریار دەخوێنینەوە بە ناوی (بۆدریار لە یاد بکە)!. من لێرەدا بەبێ دەستکاریکردنی ناوەڕۆکی ئەم بابەتە، کەمێ بە کوردییەکەیدا چوومەتەوە.

(**)بۆ ئەوەی لەگەڵ خوێنەری ئەم باسەدا لەسەر تێگەشتنێکی چوونیەك بۆ چەمکی "فریودان یان ئیغراکردن" ڕێککەوتبم، کە چەمکێکی گرنکی پرۆژەی بۆدریارە و ناوی یەکێك لە کارە هەرە بە نێوبانگەکانیشێتی، بەپێویستی دەزانم ئەم ڕوونکردنەوەی خوارێ بنووسم.

فریودان پرۆسەیەکە، یان بریتیە لە لادانی (هاندەر) و (هاندراو) بەرەو شوێنێ کە پێشتر هیچکامیان لێی نەبوون. واتە بریتیە لە شوێنی سێیەم. بە مانا سێکسییەکەی بریتیە لە ساتەوەختی تام وەرگرتن. ئەم مانایە لەم باسەدا هێندەی کێش بۆ دانەندراوە. بەڵام بە مانا سیاسی۔ کۆمەڵایەتیەکەی بریتیە لە ئاشکراکردنی هەموو نادیار و نهێنییەکان و تیرۆرکردنی جیهانی خودێتی. بریتیە لە جووڵەپێکردنی کۆمەڵانی خەڵك بەرەو ئەو ئامانجانەی دەسەڵاتدارانی هاندەر بۆیان دەستنیشان دەکەن و لەهەمان کاتیشدا ئەو ئامانجانە بە ئامانجی خودی خەڵك خۆیان لە هاندراوەکان دەگەیەنن. واتە ڕامالینی بە لافاوی خەڵك و تێوە گلاندنیان. ئەم چەمکە لە پرۆژەی بۆدریاردا هەم چێژبەخشە و هەم گومڕاکەر، هەم وەدیهێنەری بڕێ لە خۆزگەکانە و هەم وێرانکەرەوەیانە، بۆیە پێویستە لە کاتی بەکارهێناندا هەردوو ماناکەیمان لەیادبێت.

1. *J. Baudrillard: At glemme Foucault , (Paris 1979). Kobenhavn : 1982, oversattet Af finn Frandsen . Sid 33.*

لە نووسینی ئەم بابەتەدا سوودی زۆرم لە پێشەکی ئەم سەرچاوەیە و سەرچاوەی خوارەوە وەرگرتووە:

2. *J.B. Implosion og Forforelse . kobenhavn. 1984.*

3. *J.B. forforelse. ( arhus : 1985 / paris : ) . pa dansk ved : Antonio M. , Nils G. , frans II. Og Boj Bro , (Sjakalen).*

4. *Florian Rotzer : santaler med Franske Filosoffer , 1988 kobenhavn Side : 29.*

5. میشال فؤكؤ: ارادة المعرفة، 1972، ترجمة: سالم يفوت، 2: 1987 (المركز الثقافي العربي) مشروع مطاع صفدي للينابيع.

6. *Antipolitik – hinsides al statskunst : 1981, Arhus side 53.*

# سیاسەت، ڕۆشنبیر و دەسەڵات

## خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی "فۆكۆ و سیاسەت"

لە عەرەبییەوە: هەڵكەوت عەبدوڵڵا




توێــژەری كولتــووری هاوچــەرخی خۆرئــاوا ناتوانێــت یــەكێك لــە فەیلەســووف و بیریارەكــانی نوێكاری و ئەودیو نوێكاری فەرامۆشبكات، ئەویش میشــێل فۆكۆیــە، بیریــاری خــاوەن بایەخدانــە هەمــەجۆرەكان و شــێوازەكانی كــاركردنی فیكــری، چــونكە فۆكــۆ میژووناســی بیرەكــان و فەیلەســووف بــوە، هــەروەها ڕۆشــنبیر بــوە بــەواتای ڕاســتەقینەی وشــەكە، لەبــەر هۆیــەكی زۆر ســادە، ئــەویش هێنانــەئارای گۆڕانكــاری بــوو لــە تێڕوانینــی ڕۆشــنبیردا بــۆ خــودی خــۆی و جیهــان و دانــانی لــە جێگــەی ئــەو فرەییــە كلاســیكییەی هاوشــانی بــوو.

هەروەها نابێت ئەو ڕۆڵەمان لەیادبچێت كە نەوەكەی فۆكــۆ لــە بزووتنــەوەی ناڕەزاییدەربڕینــدا گێــڕای، لــەپێش هەموویانــەوە لــە خۆپیشــاندانە جەماوەرییەكانــدا (مەبەســت ئایــاری 1968-ە). دۆلـۆز لـەم بارەیـەوە دەڵێت: "فۆكـۆ یەكـەمین كـەس بــوو كــە ئــامێرە ئایــدیۆلۆژی و سیاســییەكانی دیلكردنی ڕۆشنبیری وردوخاشكرد".

هەمیشە لێكۆڵینەوە ڕەخنەیی و فەلسەفییەكان بایەخــدەدەن بــە بەرهەمــەكانی فۆكــۆ پــڕۆژە ئاركیۆلۆژیا مەعریفیەكەی و زیاتر ئاوڕ لەو مەسەلە ناوەندیانــە دەدەنــەوە كــە بنچــینەی دامەزرانــدنی





فیکری فەلسەفیی گەردوونین، هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستا، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێستا پێشکەشی خوێنەری دەکەم دوورە لە تێزە ئەکادیمیەکانی فۆکۆو بایەخدەدات بە بابەتە جیوەییەکان کە پەراوێزی فیکر داگیردەکەن و ئەگەرچی بابەتگەلێك دەخاتەڕوو کە لە نووسینەکانی فۆکۆدا هەن، بەڵام لە بازنەی ناوەندیی بیرکردنەوەی فۆکۆییانە دەردەچن و دەچنە پەراوێزی ئەو بیرکردنەوەیەوە..

نووسەری ئەم کتێبە (فۆکۆو سیاسەت) خوێنەر دەخاتە ناو پەیوەندییەکی دیالۆگئامێزی نێوان ڕابردوو و ئێستا، ئێستاو ڕابردووەوە، نێوان ئەفلاتۆن و نێتشە، مارکس و ڤۆلتێرەوە.. ئەو ناوە ڕاگوزەرانەی ناو دێڕەکانی ئەم کتێبە لەبەردەم ئەو مەسەلانەدا هەڵوەستەمان پێدەکەن کە کتێبەکە لەسەر ئاستی بەدواداچوون و شیکردنەوەو دەستنیشانکردن یاخود ئاستی کردنەوەی دەرگاکان بۆ پرسیارکردنەوە دەربارەی ئێستای کولتوورو سیاسەتی گەردوونی و سەرەنجامەکانی دەریاندەبڕێت. بەوپێیە نووسینەکانی فۆکۆ یاخیبوونێکی شارین، "چونکە هەمیشە هەڵوێستە چەپڕەوییەکانی خۆی خستۆتە ژێر پرسیارکردنەوەوەو پیایاندا چۆتەوە. هەروەها ڕۆڵی ڕۆشنبیری دەروەستی خستۆتە ژێر پرسیارکردنەوەوە. بەو جۆرەش ڕەخنەگرتنەکەی جۆرێك لە یاخیبوونی شاریی پێکهێناوە" (ل16).

لێکۆڵەر لێکۆڵینەوەکەی خۆی بەو جۆرە ناخاتەڕوو کە هەمەلایەنانە تاوتوێی فیکری سیاسیی فۆکۆی کردوە، بەڵکو بەو جۆرە هاتۆتە قسە کە توخنی هەندێك ناوچەی تیۆریی سەرەتایی کەوتوە، چونکە ئێمە لەبەردەم بیریارێکی ڕاگوزەرو جیوەییداین کە سەختە لێکۆڵەر یاخود خوێنەر بەگشتی و هەمەلایەنانە پەی بە فیکری بەرێت. ئەو ناوچانەی فۆکۆ لە لێکۆڵینەوەکانیدا دەیاندۆزێتەوە بۆ خۆیان ناوچەی دیکەن بۆ سەرلەنوێ دۆزینەوەو پرسیارکردنەوەو خوێندنەوەو دووبارە خوێندنەوە. ئەمەش زیندوێتی فیکری فۆکۆ دەردەخات. لێرەدا ئەو بابەتانە لە ڕێگەی سێ پرسیارەوە دەردەبڕین کە تێکهەڵکێشن و بەپێی هاوسێیەتیان لە گفتوگۆدان، ئەوانەش: فۆکۆ چۆن باسی سیاسەتی کردوە؟ چۆن دەربارەی ڕۆشنبیر قسەیکردوە؟ چۆن سەبارەت بە دەسەڵات هاتۆتە ئاخاوتن؟

لەو بابەتانەی مێژووی فەلسەفە کۆششیکردوە بیان نەخشێنێت، پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو سیاسەت و شێوازەکانی دەسەڵات بوە، هەر لە پڕۆژەی یاسای شاری ئەسینای کۆنەوە بیگرە هەتا بە روسۆو مارکس و ئەو بیریارانەی دیکەدا تێدەپەڕێت کە خاوەن پڕۆژەی سیاسی بوون و خوازیاری پێگەی دەسەڵاتی فەلسەفەبوون لەبری دەسەڵاتی سیاسی. ئەفلاتون لە کۆمارەکەیدا سەبارەت بەوە دەدوێت کە خێزانەکەی سووربووە لەسەر ئەوەی بیکەنە سیاسەتمەدار، بەڵام پاش مردنی مامۆستاکەی سوکرات دەستبەرداری ئەو پڕۆژەیە بوە کە لەسەرەتاوە دەستیپێکردوە. ئەو دەربڕینە ڕاشکاوەی ئەفلاتون خواستی فەیلەسووف بۆ بەدەستهێنانی پێگەی سیاسەتمەدار لەناخی خۆیدا هەڵدەگرێت، ئەمەش لە فیکری ئیسلامیدا بەدیدەکرێت، بۆ نموونە لای فارابی. بەدەستهێنانی ئەو پێگەیەش ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاشکاوانەو زیانبەخشی فەلسەفەو سیاسەت بوە.. بەڵام ئێمە لێرەدا لەبەردەم بیریارێکی قورس و هەڵەشەو سەرچڵداین، بۆیە دەپرسین: ئایا ئەم بیریارە خاوەن پڕۆژەیەکی سیاسی بوە؟ ئایا تێۆریزەی بۆ فەلسەفەیەکی سیاسیی جیاواز کردوە؟

خوێندنەوەی بەرهەمە فیکرییەکانی فۆکۆ ئەوە دەردەخەن کە فۆکۆ دووربوە لەو جۆرە وێناکردنانەو ئەگەرچی خاوەن بیرێکی چەپڕەو

بوەو هاوكاری سەركێشەكانی دنیا بوەو دەستخۆشی لە خۆپیشاندانە جەماوەرییەكان كردوەو هەڵوێستی بوێرانەی هەبوە، بەڵام بیریارێك بوە بەناو مێژوودا گەڕاوەو ئەوەی هەڵكۆڵیوە كە لەو مێژوەدا بێدەنگیی بەرامبەر هەڵبژێردراوە، ئەوەش لەپێناو رووتكردنەوەی ئەو مێژوەو روونكردنەوەی لایەنە تاریكەكانیدا. فۆكۆ وەك لێكۆڵەر خۆی لەو كێشانە بەدوورگرتوە كە بەمیرات بۆ فەلسەفەی سیاسیی كلاسیكی مابوونەوەو "بایەخی بەو لایەنانە دەدا كە توخنكەوتنە یاساییە وەسفكارەكان فەرامۆشیانكردبوو"(ل3). مەبەست هەڵكۆڵینی پەراوێزەكانی دەسەڵاتو چۆنیەتی بەكاربردنیانە لە پانتایی هەمەڕەنگدا. نووسینەكانی فۆكۆ، وەك مێژووی شێتیو زیندانیكردنو سزادان..هتد، بەڕوونی ئەم ئاڕاستەیە دەخەنەڕوو. مێژوو گەلێك جار ناسنامەمان دەسڕێتەوە "ئازادی چەمكێكی بنچینەییو سەرچاوەییە لە توانستە فۆكۆییەكاندا، جا ئەوە لە ڕێگەی بەدەستەوەگرتنی وێناكردنی تەقلیدییەوە بێت یان وێناكردنی ئەنترۆپۆلۆژی، بەوەش ڕەخنەی ئاركیۆلۆژیانە لە چەمكەكە دەگرێت. ئەوەش نەك وەك شۆڕشێك بەسەر ئێستادا، بەڵكو بەشێوەی ئازادییەكی هەمەلایەنی بەردەوام كە تەنیا لە ڕواڵەتەكانی ئازادیدا (ئازادیی دەربڕینو ئەوانی دیكە) قەتیس نابێت، بەڵكو ئازادی بەپێی ئەوە لە هەموو دامەزراوێك رادەپسكێت.

ئەم وێناكردنە بەری كردارێكی دژ بە وێناكردنی مرۆڤانەی سەردەمی ڕۆشنگەرییە كە فۆكۆ لە كتێبی "چاودێركردنو سزادان"دا بە داهێنانی ئازادییەكانی دەزانێت، بەڵام ئەو كۆمەڵگە رێكخەرە بەخشیویەتی كە تاكو ئێستا پێوەی گرێدراوین"(ل9). فۆكۆ لە ڕێگەی هەژاندنی ئەو ئەفسانەیەوە كە دەوڵەتی دیموكراتی لە تاوتوێكردنی دەسەڵاتدا بەخۆی بەخشیوە، باسی ستراتیژەكانی باڵادەستیو دەوڵەت دەكات، بەڵكو ئەو چەمكانە دەهەژێنێت، بەو پێیەی دەسەڵات لە تاكەكان یان گرووپەكان یاخود بەرژەوەندییە هاوبەشەكانەوە سەرچاوەناگرێت، "بەڵكو دەسەڵات پەرتەوازەو فرە سەرچاوەو شێوازەكانی كاركردنەو خودێك نییە یەكیبخات"(ل10). كەواتە دەسەڵات بەشێوەیەكی نهێنی لە چەندین شوێنگەو هەڵوێستدا كاریپێدەكرێت كە سەختە جڵەوبكرێت، واتە چیدی دەسەڵات لە ناوەندەوەڕا كارناكات. كەواتە فۆكۆ ئیتر بایەخ بە كاركردنی خوارەوەی دەسەڵات دەدات.

فۆكۆ ڕەخنە لە گوتاری تەوباویو گوتاری شۆڕشگێرانە دەگرێت. لێرەشدا فۆكۆ لە ڕەخنەگرتنەكەیدا بەخواستی توێژەرانی خۆی "خۆ لە بنیاتنانی ڕێگەیەكی سیاسی بەدووردەگرێت" ناجوڵێتەوە، بەڵكو ستراتیژێك بۆ یاخیبوون پێشنیاردەكات كە ڕەچاوی فرە سەرچاوەیی دەسەڵات دەكاتو تەبایە لەگەڵ هەڵوێستگەلی جیاكارەدا، بۆ ئەوەی كۆتایی بەو تەنگوچەڵەمە تەقلیدییە بهێنێت كە هیچ دەرفەتێك بۆ ڕیفۆرمو شۆڕش ناهێڵێتەوە"(ل15). لێرەدا مەسەلەی ڕۆشنبیر وەك پرسیارێكی ڕاستەقینە لە پرۆسەی ئەم هەنگاونانە سیاسییە هەمەجۆرەو ڕۆڵو پێگەی لەناو ئەو هەنگاونانە بێشومارەدا دەردەبڕێت.

وردە وردە فۆكۆ دەستبەرداری ئایدیۆلۆژیا دەبێت، بەو شێوەیەی كە (ئالتۆسیر) لە شیكردنەوەی پراكتیكە پێكهێنەرەكانی مێژوودا شیكردۆتەوەو لەبری ئەوە باسی "ڕاستی" دەكات، چونكە ئایدیۆلۆژیا بەلای فۆكۆوە خەیاڵپڵاویو هەڵەیە، یان هوشیارییەكی زەوتكراو یاخود زەوتكارە.. بەوپێیەش مەعریفە جینالۆجیانە دەسەڵاتەو ئاخاوتن دەربارەی ئەم چەمكانە بەبێ ئامادەبوونی ڕۆشنبیر مەیسەرنابێت.. چونكە





ڕۆشنبیر پاسەوانی ڕاستی نییە، بەڵکو ئەو کەسەیە کە ڕەونەق و ڕوونی بۆ ڕاستی دەگێڕێتەوەو لەو سەرچاوانەی زۆربۆهێنان ڕزگاریدەکات کە ملکەچیان بوە. کەواتە فۆکۆ سەرلەنوێ تاوتوێی مەسەلەی ڕۆشنبیری دەکات، وەك مەسەلەیەکی بنچینەیی کە لە ڕوی تیۆرییەوە گرێدراوی چەمکەکانی دیکەی وەك دەسەڵات و مێژووە. واتە لە ڕێگەی ئەو شتانەی لە (کانت)ەوە وەریگرتون و فەلسەفە بە بیرکردنەوە لە هەنوکەیی دەزانن نەك لە هەتاهەتایی، هەنگاوهەڵدەنێت و لە ڕێگەی هەنوکەیی و ئێستاییەوە ڕەخنە لەو خەسڵەتانە دەگرێت کە ڕۆشنبیر بەخۆی دەبەخشێت و وەك پاسەوان و بانگەشەکاری بەها گەردوونیەکان دەیخەنەڕوو، لەبری ئەوە باس لە تواناو ئەزموونی خۆیی ئەو ڕۆشنبیرە دەکات کە چەندین هێڵی تێکچرژاوو ناکۆك دەیبڕن.

کەواتە سەیرنییە گفتوگۆ لەگەڵ ڕۆشنبیرێکی جیوەییدا بکەین کە هیچ پۆلێنکردنێك جڵەوی ناکات، بەوپێیەش (مایکل والزەری) ئەمریکی بە "چەپڕەوی منداڵانە" ناوزەدی دەکات و (هابرمان)یش بە "دژی نوێکاری و سروشتی پێشکەوتووی ڕۆشنگەری و ئەقڵانیەتی نوێ" ناویدەبات(ل21). فۆکۆ داوا لە ڕۆشنبیر دەکات داوەری نەکات و خۆی لە داوەریکردن بەدووربگرێت و بانگەشە بۆ ئەوە نەکات کە "ویژدانی نەتەوە"و "زمانحاڵی جەماوەر" یان "دەربڕی هەستی میللی و جەماوەری" یاخود "فریادڕەسە لە ڕێگەی چەوت"ە. وێڕای ئەوە، داوای ئەوە لە ڕۆشنبیر دەکات دەستبەرداری گوتاری گەردوونی و سەرتاپاگیرانە بێت، ئەوەی (ڤۆلتێر) یەکێك لە بەهێزترین نموونە دەرکەوتوەکانیەتی لە فیکری کلاسیکیدا.. چونکە ڕۆشنبیر بەم واتا سەرتاپاگیرە تەماهی لەگەڵ "جادووگەری مەزن"دا دەکات. هەروەها فۆکۆ بەپێچەوانەی ئەو تێڕوانینەوە کاردەکات کە پێیوایە ڕۆشنبیر ڕۆڵی هەوێنی بنچینەیی بنیاتنانی کوتلەی کولتووری و ئەخلاقی دەگێڕێت و سمبولێکی پێشڕەوی بەشداری حیزبێکی سیاسییە کە ڕابەرایەتی گۆڕانکاری و شۆرش دەکات و ڕۆڵی بنچینەیی و ناوەندیی ڕۆشنبیری گەردوونی دەکاتە ڕۆڵێکی لاوەکی و ڕۆشنبیری ئۆرگانیکی-گەردوونی دەگۆڕێت بۆ ڕۆشنبیری جیاکارە. ڕۆشنبیر بەو شێوەیەی فۆکۆ دستنیشانیدەکات، دیالەکتیکانە گرێدراوی ڕاستی و دەسەڵاتە، چونکە لە ڕوانگەی تەقلیدییەوە جڵەوکارو بانگەشەکاری ڕاستییە، بەڵام لە ڕوانگەی فۆکۆوە ڕۆشنبیری جیاکارە ئەو خەسڵەتەی نییە. ئەمەش ئەو ژێراوژوورکردنەیە کە جینالۆژیا بەسەر بابەتی ڕۆشنبیریدا هێناوە. ڕاستی بەلای فۆکۆوە "کۆمەڵێك دامەزراوو گوتار دەربارەی زانست بەشداری تێدادەکەن و ملکەچی ئاڕاستەی ئابووری و سیاسییەو لە ژێر چاودێریی دامودەزگای تایبەتیدا (سوپا، زانکۆ، نووسین، ئامڕازەکانی ڕاگەیاندن و سیستەمی پەروەردەکردن.. ئەنجامدەدرێت و لەسایەی ئەوانیشەوە بڵاودەبێتەوەو بەکاردەبرێت"(ل32). بەپێی فۆکۆ، ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە چۆنیەتی ئاشکراکردنی ڕاستیدا، وەك کایەیەکی چەندین ڕێککەوتن و پێکدادان و ململانێ و شەڕ، خۆی دەبینێتەوە کە بەپێویست دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی ڕاستییەکی دیکە. ڕاستییەکان بە زۆربوونی گوتارەکان و جێگیربوونی دەسەڵات زۆردەبن، بۆیە دەشێت ڕۆشنبیر پەیوەندی بە ململانێوە دەربارەی "بارودۆخی گرنگی ڕاستی"و "ئەو ڕۆڵە سیاسی و ئابوورییەی دەیگێڕێت"(ل33) هەبێت. ئەو ڕەوتەی فۆکۆ گرتویەتیە بەر، یاخیبوونە لە خودی ڕۆشنبیرانە کە ڕووخسارەکانی لە سەدەی هەژدەیەمەوە پێکهاتوون و هەژاندنی جینالۆژیای ئەو چەمکانە بوە کە هاوسێی بوون و

پێوەی گرێدراوبوون.. سەیر ئەوەیە فۆكۆ لەلایەكەوە بەشداریی كاریگەرانەی لە خۆپیشاندانە جەماوەرییەكاندا كردوەو لەلایەكی دیكەوە ئەوەی ڕەتكردۆتەوە یاخیبوو لەپشتی هەر ئایدیۆلۆژیایەكەوە خەندەق لێبدات كە ئامانجی كردنەوەی ڕاستییە بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی مەبەستیەتی.. بەڵام قووڵیی ڕادیكاڵبوونی فۆكۆ تا ئاستی هیچخوازی، وەك هەندێك ڕەخنەگرانی دەریدەبڕن، هانی ئەوە وتنە دەدات كە "ڕۆشنبیرو نووسەر توانیان بە زمانی ژیان لە جێگەی زمانی هەق بدوێن"(ل35).

بابەتی دەسەڵات دەكەوێتە ناو چوارچێوەی بایەخدانە بنچینەییەكانی فیكری جیاوازییەوە، جا ئەوە لەسەر ئاستی ئەو ژێراوژووركردنە بێت كە ئەمەی دوایی بەسەر تێزەكانی پێشوودا هێناویانە یان ئەوەی لە كایەی مەعریفیو سیاسیی ئایدیۆلۆژیدا دەربارەیان هێناویەتەئاراوە. فۆكۆ لە موحازەرەكانی (كۆلیژی دوفرانس)ی ساڵی 1976و لە كتێبی "ویستی مەعریفە"دا لەم بابەتە وردەبێتەوە. گرنگیو هەنوكەییبوونی مەسەلەكە لای ئێمە دەیسەپێنێت بەسەرماندا سەرلەنوێ تێزەكانی فۆكۆ دەربڕینەوەو وەبەریانبهێنین بۆ پرسیاركردنەوە دەربارەی جیهانگیریو مەسەلەكانی دیكە. لێرەشدا فۆكۆ چەمكی سەروەریی ژێراوژووركردوەو چەمكی باڵادەستی لەجێگە داناوە. ئەم گۆڕانەش لە سەروەرییەوە بۆ باڵادەستی بەپێویست ئەو وێناكردنە جینالۆژییەیە كە لەبواری مێژوودا پراكتیزەیكردوە، جا ئەوە تایبەت بێت بە سیاسەت یان دەسەڵات یاخود دەوڵەت... ئەم گۆڕانكارییەش هێماكردندنێكی بنچینەییە بۆ كردنەوەی ڕێگە بۆ جڵەوكردنی چەمكی دەسەڵات.. ئەوەش گواستنەوەیەكە لە "شێوەیەكی یاسایی سەروەرییەوە بۆ شێوەیەكی ستراتیژیی ململانێو بەرەنگاربوونەوەكان". فۆكۆ دەپرسێت "داخۆ دەشێت ئەو ستراتیژانە لەناو شێوەی دوالیستانەو چڕی باڵادەستی (باڵادەست/ژێردەست)و دواتریش لەناو پەیوەندیی جەنگدا شیبكرێنەوە؟ چی وادەكات پەیوەندیی باڵادەست پشتئەستوور بە پەیوەندیی هێز شایانی شیكردنەوە بێت؟ ئینجا چۆن دەكرێت وەك پەیوەندیی جەنگ لەو پەیوەندییە بڕوانین؟ چیش بەهانە بۆ ئەوە دێنێتەوە؟(ل56).

ڕاوەستان لەئاست ئەو پرسیارانەو ئەوانی دیكەشدا پێویستی بەوەیە پەنا بۆ وەڵامی كۆتایی یاخود وێناكردنی سەلمێنەئاسا دەربارەی بابەتەكە نەبرێت، چونكە دەشێت جەنگ لە ڕەهەندە ستراتیژییەكەیەوە یاخود لە ململانێكاندا وەبەربهێنرێت بۆ شیكردنەوەی سیاسەتو پەیوەندییەكانی دەسەڵات وەك جۆرێك لە میكانیزمەكانی باڵادەستی. فۆكۆ لە یەكێك لە وانەكانیدا دەپرسێت: "پێویستە بڵێین باڵادەستی هیچ نییە جگە لە شێوەیەكی بەردەوامی جەنگ؟"(ل56). كەواتە جەنگ دامەزراوێكی كۆمەڵگەو دەوڵەتەو ئامرازی چنینی یاساكان، دابونەریتەكان، مافەكانو بەهاكانی هەردووكیانە، بەڵكو لەوەش زیاتر گوتارەكان دەربارەی دەسەڵاتو مێژوو لە ڕێگەی جەنگەوە دادەمەزرێن. كەواتە فۆكۆ ئەو پەیوەندییە چەمكئامێزانە (وەك هێز، باڵادەستی، جەنگو دەسەڵات..) دەبەستێتەوە بە ڕاستییەوەو چەمكی ستراتیژیا ڕەهەندێكی دێكە وەردەگرێت، ئەوەش لەڕێگەی گۆڕینی كایەی بنەڕەتیی سەربازییەوە بۆ كایەی دەسەڵات. لێرەشدا نوێیی فۆكۆ لەوەدا بەدەردەكەوێت كە واتایەكی نوێی بەخشیوە بە دەسەڵات سنووری سیاسیو سەربازی دەبەزێنێتو دەچێتە ناو پەیوەندییە كۆمەڵایەتیە ئاڵۆزەكانەوە. وەك فۆكۆ دەڵێت: "دەسەڵات دامەزرا نییەو جۆرێك هێز نییە كە هەندێك هەیانبێت، بەڵكو ئەو ناوەیە كە

دەیبەخشینە بارودۆخێکی ستراتیژیی ناو کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو" (ل60-61). کەواتە مەسەلەکە پەیوەندیی بە توێژینەوەیەکی جینالۆژیانەوە هەیە دەربارەی پەیوەندییەکانی دەسەڵات، ئەوەش لە ڕێگەی جەنگ، جەنگی پاکتاوکردنی ڕەگەزیو ڕەگەزپەرستیەوە ئاشکرادەبێت. چونکە جەنگ لە ئاسۆی ستراتیژییدا، دەرفەت بۆ سیاسەتو دەسەڵات دەڕەخسێنێت، ئەمە ئەگەر نەڵێین بەردەوام خۆراکی دەداتێ، هەروەها دەسەڵاتی سیاسی وەك جەنگێکی بەردەوام کاردەکات، ئەمەش وادەکات شەڕەکە لەسەر ئاستی هەموو بەرەکان، واتە لەناو دابونەریت، جەستەکان، یاساکان، ئەخلاقو هونەرەکاندا، هەمیشە بەردەوام بێت"(ل64).

پەیوەندیی نێوان جەنگو سیاسەت پەیوەندییەکی زیندوە، ئەمەش وای لە فۆکۆ کردوە تیۆریانە وەڵامی (کلاوس ڤیتز) بداتەوە کە پێیوایە جەنگی گەورە هاوتای سیاسەتی گەورەیە( پێچەوانەکشی ڕاستە). واتە تێکهەڵکێشی ئەو دوو لایەنە بەجۆرێك کە یەکێکیان ئەوی دیکە دیاربکات. فۆکۆ پێیوایە دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگدا دەستپێدەکات، بەو جۆرەش لە دامەزرێنەرانی گوتاری جەنگو سیاسەت لە سەدەی 17و19وە، واتە میکافیلیو ئەوانی تر، هەنگاوهەڵدێنێتو جینالۆژیای جەنگیان لەگەڵ بەکاردەهێنێت، بەوپێیەی جەنگ جۆرێکە لە تیخکردنی دەسەڵاتو لێك جیاکردنەوەی دۆستو دوژمن، بالادەستو یاخیبوو...

کەواتە "دەسەڵات" یەکێکە لە گرنگترین تەوەرەکانی فیکری فۆکۆییانە، ئەگەرچی لە دووتوێی کتێبێکی سەربەخۆدا داینەناوە. لەوانەیە بایەخدانەکەشی بگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن ستالینیەتو فاشیزمەوە. لێرەدا فۆکۆ سەرەتا خۆی لە بڕیارە تەقلیدییەکان جیادەکاتەوە، جا ئەوانە بەرهەمی فەیلەسوفەکانی ڕۆشنگەری بن (هۆبز، میکافیلی، کانتو هیگڵ..) یاخود وێناکردنی مارکسیستانە بن. بایەخدانی فۆکۆ بە دەسەڵات لەو ڕوانگەیەوەیە کە "بەهەرحاڵ دەسەڵات بەلای ئێمەوە تەنیا مەسەلەیەکی تیۆری نییە، بەڵکو شتێکە پەیوەندیی بە ئەزموونی ئێمەوە هەیە (...) ئەوەی ئێمە پێویستمانە ئابوورییەکی نوێی پەیوەندییەکانی دەسەڵاتە" (ل90). کەواتە فۆکۆ، بەهەمان شێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵ بابەتگەلی وەك سێکس، مێژوو، سزادانو زیندان..هتد، بابەتەکەی لە وێناکردنەکانی پێشوو تێدەپەڕێنێت. لێرەوە لەئاست ئەو کارانەدا ڕادەوەستێت کە دەسەڵات بەدوا شێوەی هەستپێکراو ئەنجامیاندەدات. ئەمەش مانای ئەوە نییە دەسەڵات لە سنوورێکدا- وەك دامەزراوی ملکەچکردنی هاولاتی لەناو خۆی یان ناو دەوڵەتدا- ڕادەوەستێت، بەڵکو خستنەڕووی پرسیاری واتاداری فۆکۆیە: "چۆن دەسەڵات کاری پێدەکرێت؟" واتە فۆکۆ شاقوڵیانە ناڕوانێتە دەسەڵات، بەڵکو ئاسۆییانە سەیری دەسەڵات دەکات. بەدەربڕینێکی دیکە، فۆکۆ لەم وێناکردنەدا ئەو تێڕامانە پوختدەکاتەوە کە دەسەڵات ئەوە نییە لەلایەن خاوەنەکەی یاخود توێژێکی فەرمانڕەواوە بەرامبەر بە فەرمانڕەواییکراوەکان کاری پێ دەکرێت، بەڵکو لە شێوازەکەیدایە، بەوپێیەی لەڕێگەی چەند خاڵێکی هەمەجۆرەوە گرێدراوی پەیوەندیگەلی نایەکسانە کە تیایاندا تاکەکان خۆڕسکانە تاوانبار دەکرێن..."(ل96).

خواستی فۆکۆ لێرەدا، ناخودێتی دەسەڵاتە، واتە دەسەڵات هیچ سەرچاوەیەکی تاکەکەسی یان گرووپی نییە، دواجاریش چەندین ئامانجو خواستی هەیە. هەروەها دەسەڵات لە بەرژەوەندیگەلی دیاریکراوەوە سەرچاوەناگرێت،




بەڵکو لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا پرشوبڵاوە، بۆیە وەڵامدەرەوەی خواستەکانی دیموکراتییەکانی خۆرئاوا نییە. ئەمەش هەژاندنی ئەو وێناکردنانەیە کە خاوەن دەسەڵاتو دەستوپێوەندەکان دەردەبڕێتو دواجاریش سیاسەتزانی ئەنجامی ئەو وێناکردنە شاقوڵییە دادەبڕێتو بەدەستهێنانی زانستە کۆمەڵایەتیو دەروونناسیەکانو زانستی تاوانکاری بۆ دیراسەکردنی دەسەڵات لە ڕێگەی ژێراوژوورکردنی ئەو وێناکردنە شاقوڵییەوە بەکاردەبات، واتە چۆنیەتی بەکاربردنی دەسەڵات لە خوارەوە بەرەو سەرەوەو بەهۆی تیکهەڵکێشی بەیەکداچووی ئاسۆییەوە، بەو پێیەش بەدرۆخستنەوەی ئەو وێناکردنە مارکسیستانەیەی لەسەر بنچینەی پیوانەکردنی دەسەڵات بە ململانێی چینایەتی دامەزراوە. ئەوەی لە بنچینەدا بەلای فۆکۆوە گرنگە، چۆنیەتی کارکردنی دەسەڵاتە لە کەنارو پەراوێزەکاندا. لێرەشدا دەسەڵات بۆ کارکردنی پێویستی بە خودی ئازاد هەیە، "کەواتە دەسەڵات لەناو پەیوەندیی کۆیلەیەتیدایە"، بەو پێیەش پێویستی بە فریادڕەس (جەلاد)و قوربانی هەیە. مەسەلەکەش لە ئاستی قوربانیدا تەواونابێت، چونکە خودی قوربانیەکە دەسەڵاتێك دژی ئەوی دیکە بەکاردەبات. بەو جۆرە ئەگەر گریمانەکردن شیاوبێت، ئەوا بەرگریکردن بەرامبەر بە هەر دەسەڵاتێك ئامادەیەو مەرجی هەر بەرگرییەکیش ئازادییە.

بەتێروانینی فۆکۆ دەسەڵات زۆردەبێتو بەرگریی دیارو شاراوە پارچەپارچەدەکرێت، ئەمەش ئەو شتەیە کە لە زنجیرە کتێبێکدا تایبەت بە مێژووی سێکس یان زیندانو سزادان جەغتی لەسەر دەکاتەوە، بەڵام ئاخاوتنی فۆکۆ دەربارەی بەرگریکردن ئەوەیە کە دەیخاتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە.. فۆکۆ باسی چ بەرگرییەك دەکات، بەرگرییەکی موحافەزەکارانە یان پێشکەوتنخوازانە؟ لەوەڵامدا فۆکۆ دەڵێت: دەوڵەت "چوارچێوەی گشتی بۆ کارکردنی دامەزراوە سەربازیو سەرکوتکەرەکان دادەڕێژێت، بەڵام هەر ئەویش ڕێگە بە جۆرێك بەرگریی ناوچەیی دەدات یاخود تەواو پەکیدەخات" (ل108). ڕەخنەگرانی فۆکۆ هەڵوەستەیەك دەکەن، بەتایبەتی لەئاست فرمانی بەرگریکردنو واتا پۆزەتیڤو نێگەتیڤەکانیدا، بۆیە هەندێك بە هیچخوازی دادەنێن، چونکە "پێیوایە کۆمەڵگە لەلایەن دەستێکی شاراوەوە ئاڕاستەدەکرێت، لەبری ئەوەی دەسەڵاتێکی سیاسیی بەرپرسیارانەو ڕەوا ئاڕاستەیبکاتو جڵەوییبکات" (ل102)

## تێبینی

1-کتێبی خوێنراوە بریتیە لە (مستەفا ئەلحەسناوی: "فۆکۆو سیاسەت"، بڵاوکراوەی گۆڤاری "اختلاف"، چاپی یەکەم، نۆڤەمبەری 2003 مەغریب).

2-سەرچاوەی خوێندنەوەکە: سایتی *www.alriyadh-np.com* ڕۆژی 2004/3/4.

# نوسینە سەرەکیەکانی "میشیل فۆکۆ"

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد




*The Essentsal Foucault*
*paul Rabinow and nikolas Rose*
*new press – new york, 2003*
*p.416*

(نوسینە سەرەکیەکانی میشێل فۆکۆ) کتێبێکە "پۆل ڕابینۆف" و "نیکۆلاس ڕوز" پێکەوە نوسیویانە، یان بە واتایەکی تر ئەوان کۆیان کردۆتەوە و پێشەکیان بۆ نوسیووە.

"پۆل ڕابینۆف" توێژەرێکی ئەمریکاییەو مامۆستای ڕەگەزناسیە لە زانکۆی کالیفۆرنیا و بێرکلی، "نیکۆلاس ڕوز"یش مامۆستای کۆمەڵناسیە لە کۆلیژی لەندەن بۆ ئابووری.

ئەم کتێبە تێکستە سەرەکیەکانی "فۆکۆ" لە خۆدەگرێت، تێکست گەلێك کە گوزارشت لە فیکری ئەو دەکەن بە درێژایی قۆناغە جیاجیاکان، هەر لە سەرەتایەوە تا کۆتایی. "ڕابینۆف" و "ڕوز" ئەو تێکستانەیان لە فەرەنسیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و پێشەکیان بۆ نوسیوە. وەکو دەزانرێت "فۆکۆ" یەکێك بوو لە گرنگترین بیریارەکانی سەدەی بیستەم، یان وردتر بڵێین گرنگترین بیریاری نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بوو.

"فۆکۆ" ناوی لەگەڵ کەسانی وەك "کلۆدلێڤی شتراوس و ڕۆلان پارت و ژاك لاکان و.. هتد"، بە

قۆناغی بونیادگەرییەوە پەیوەستە، بەڵام ئەو ئەم جۆرە ناولێنانانەی ڕەتدەکردەوە و داوای تایبەتمەندێتی دەکرد لە بوارێکی دیاریکراوی فیکردا.

لە ڕاستیدا "فۆکۆ" بەوە لە کەسانی تر جیاواز بوو کە جەختی لەسەر بابەتگەلێکی دیاریکراوی وەک: (پەراوێزکراوەکان و زیندان و سزادان و سێکس) دەکردەوە. ئەو بە بارودۆخی پەراوێزکراوەکانی ناو کۆمەڵگاوە خەریك بوو، داکۆکی لێدەکردن و دەیویست لەو هۆکارانە تێبگات کە دەبووە مایەی پەراوێزخستن و ئافەرۆزکردنیان.

"میشێل فۆکۆ" ساڵی 1926 لە خێزانێکی بۆرژوازی لە شاری بواتیێ، کە دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای فەرەنسا هاتۆتە دنیاوە. "پۆڵ فۆکۆ"ی باوکی پزیشکێکی بەناوبانگی شاری بواتیێ بووە. "فۆکۆ" پاش ئەوەی خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات دەچێت بۆ پاریس، بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ.

ئەو هەر لە سەرەتایەوە کەسێك بوو هەڵسوکەوتی سەیر بوو، تەنانەت دووچاری کێشەی دەرونی زۆر سەخت هات، کە هێندەی نەمابوو شێتی بکات. هەر ئەمەش دواتر وایلێکرد تێزەی دکتۆراکەی بۆ مەسەلەی دێوانەیی تەرخان بکات. لە کاتێکدا لەو سەردەمانەدا وا باوبوو کارنامەی زانکۆیی بۆ بابەتی ئەقڵ تەرخان بکرێت نەك دێوانەیی، بەڵام "فۆکۆ" لەو ڕێچکا باوە لایداو ڕەسەنایەتی و ئەفراندنی ئەویش لێرەدا بوو.

ئەم کتێبە چەندین تێکستی "فۆکۆ" لە خۆ دەگرێت، لەگەڵ ژمارەیەك گفتوگۆدا کە باس لە ژیان و نوسینەکانی دەکات لەو قۆناغەدا. لەوانەشەوە تێدەگەین ئەو تەنها ئەو کاتە لە دەست دێوانەیی قوتاری بوو، کە ساڵانێکی دوورودرێژی بۆ تاوتوێکردنی دیاردەی دێوانەیی تەرخانکرد لە سەدەکانی ڕابردووی ئەوروپادا و هەزاران لاپەڕەی لەو بارەیەوە نوسی.

"فۆکۆ" لە کتێبە گەورەکەیدا (مێژوی دێوانەیی لەسەردەمی کلاسیکدا)، باس لە دەرکەوتەکانی دێوانەیی دەکات بە درێژایی ڕۆژگار.. ئەو پێیوایە شێت لە سەردەمی شازدەهەمدا بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا نەدەکرد کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئارەدا بوو.

بەم پێیەش پێناسەی جۆراوجۆری دێوانەیی هەیە.. یەکێك لەو پێناسانە دەڵێت: (دێوانەیی ناکەوێتە بەرەیەك و ئەقڵیش لە بەرەیەکی کەدابێت، وەکو هەموومان مەزەندەی دەکەین. بە واتایەکی دی سنوری جیاکەرەوە و یەکجارەکی لە نێوانیاندا نییە وەك پێمان وابوو. لەبەرئەوەی هیچ کەسێك نییە، تەنانەت گەر لە گەورەترین ئەقڵدارەکانیش بێت کە پچێك لە شێتی تێدا نەبێت!).

"فۆکۆ" ئەوەشی ئاشکرا کرد کە لە سەردەمانی پێشودا، شێت بوونەوەرێکی ئازاد بوو یاخود لە سەردەمانی پێشودا بە ئازادی لە پەراوێزی کۆمەڵگادا دەژیا، بەڵام هەر ئەوەندەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا پزیشکی دەرونی لەدایك بوو، ئیتر شێت لە شێتخانەکاندا دیلکرا و لە کۆمەڵگە جیاکرایەوە.

"فۆکۆ" ئەو کتێبەی بە قسەکردن دەربارەی دێوانەیی بلیمەتەکانی وەك: (فردریك نیچە و هۆڵدەرلین و ئانتۆنین ئارتۆ و گۆیا و ڤان کوخ) کۆتایی پێدێنێت و بە شێوەیەکی ڕۆمانسی یان زۆر شاعیرانە باسیان لێدەکات و دەڵێت: (پێویستە عەقڵی خۆرئاوا لە ئاست دێوانەیی ئەو بلیمەتانەدا کڕنۆش بەرێت، نەك هەڵوێستی پێچەوانە وەرگرێت).

پاشان "فۆکۆ" دێوانەیی بەم شێوەیەی لای خوارەوە پێناسە دەکات: (سەبارەت بە گەورە داهێنەران ئەوا دێوانەیی مانای ئەوەیە کە ناتوانێت

بەرهەمێکی هونەری تۆکمە پێشکەش بکات، بەڵام مادامەکی ئەو داهێنەرە توانای بەرهەم هێنانی هەیە، ئەوا بە شێت نادرێتە قەڵەم، تەنانەت گەر خاوەنی ئەقڵیەتێکی ئاسایی تەندروستیش نەبێت.. ئاشکرایە گەورە داهێنەران زیاد لە کەسانی تر پەشێوترن و خەڵکێکی ئاسایی نین. بۆ نمونە نیچە لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی ئاسایدا دەیتوانی تێکستی قەشەنگ و جوان بنوسێت، تێکستێك لێوان لێو لە فیکری قوڵ و شیعر، بەڵام سەر وەختێك کەوتە وڕێنەکردن و نوسینی نامەی بێ سەروبەر بۆ هاوڕێکانی، ئیتر چووە ناو خانەی دێوانەییەوە. بەمجۆرە قۆناغی بەرهەمە گەورەکان کۆتاییان هات، قۆناغێك کە بەرهەمی قەشەنگی وەك: گورانی تراژیدیا و زەرادەشت وەهای وتی تێدانوسی و قۆناغی هەڵخلیسکانە ناو شەوی تاریکی و نەبونی توانای ئەوەی تێکستێکی کۆنکرێتی بنوسێت، دەستی پێکرد).

لە دوای ئەمانە کتێبەکە (نوسینە سەرەکیەکانی فۆکۆ)، باس لە قۆناغەکانی دیکەی فیکری "میشێل فۆکۆ" دەکات، بە تایبەت ئەو قۆناغەی کتێبە بەناوبانگەکەی (وشەکان و شتەکان)ی تێدا نوسی و ئەمەش لە ساڵی 1966 دابوو. لێرەدا "فۆکۆ" خۆی ناساند و لە دوای "سارتەر" بوو بە بەناوبانگترین فەیلەسوفی فەرەنسا.

لەم کتێبەیدا تیۆریایەکەی خۆی دەربارەی مەعریفە تاوتوێکرد و ئەو تیۆریایەشی لەسەر چەمکێکی بەناوبانگی وەك: (دابڕانی ئەپستمۆلۆژی) دارشت. "فۆکۆ" پێیوایە لە مێژووی فیکری ئەوروپیدا دوو دابڕان هەیە: یەکەمیان سەردەمی کلاسیکی لە سەدەکانی ناوەڕاست جیادەکاتەوە و دووەمیشیان سەردەمی تازە لە قۆناغی کلاسیکی جیادەکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها یەك دابڕانی سەرەکی هەیە، ئەویش ئەو دابڕانەیە کە مۆدێرنە لە قۆناغەکانی بەر لە خۆی جیا دەکاتەوە.

"فۆکۆ" هەر لەو کتێبەیدا تێرمێکی گرنگی دیکە دێنێتە ئارا، ئەویش: (سستمی فیکر)ە. لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئەوە سستمی فیکرە کە ئاڕاستەی تەواوی زانستەکان دەکات لە سەردەم و ژینگەیەکی دیاریکراودا و تابڕیش بکات، وەك سستمێکی بیرکردنەوەی باڵادەست بەردەوام دەبێت، بەڵام کە بارودۆخ گۆڕا ئەوا دەسەڵاتی خۆی لە دەست دەدات و سستمێکی بیرکردنەوەی تر جێگای دەگرێتەوە). هەر ئەمەشە کە زانای ئەبستمۆلۆژی ئەمریکایی "تۆماس کوهن" بە (پارادیم) ناودێری دەکات. پارادیمیش بەمانای سستمی باڵای بیرکردنەوە یان ئەو نمونەیەی کە پەیڕەو دەکرێت و وەك ستانداردێك سەیر دەکرێت. بۆ نموونە ئەو پارادایمەی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئارەدا بوو، جیاوازە لەوەی پاش سەرهەڵدان و دروستبوونی مۆدێرنە هاتە ئارا. چونکە ئەوەی یەکەمیان پابەندی بەڵگەنەویستەکانی تیۆلۆژیای مەسیحی بوو، بەڵام دووەمیان پابەندی فەلسەفەیەکی زانستی بوو. بێگومان جیاوازیەکی زۆریش لە نێوان ئەم دوانەدا هەیە. بەهەرحاڵ کتێبی (وشەکان و شتەکان) شۆڕشێکی لە مێژووی فیکری فەرەنسیدا دروستکرد و لە ماوەیەکی ئێجگار کەمدا، "فۆکۆ"ی کردە کەسێکی زۆر بەناوبانگ. لەو کاتەدا بووە ڕکابەری "ژان پۆڵ سارتەر"، لەسەر ڕێبەرایەتی کردنی فیکری فەرەنسی. لێرەدا دەتوانین بڵێین کتێبی (ڕەخنەی ئەقڵی دیالەکتیکی) "ژان پۆڵ سارتەر"، بەراورد بە کتێبی (وشەکان و شتەکان)ی "میشێل فۆکۆ"، پیر دەینواند. چونکە جیهانبینی "سارتەر" کۆن دیاربوو وەکو ئەوەی سەر بە سەدەی نۆزدەهەم بێت نەك سەدەی بیستەم، سەرەڕای ئەوەش مارکسیستی ئەو بە دڵی زۆربەی زۆرێك نەبوو

قەناعەتیان پێی نەدەکرد، بەڵام "سارتەر" ئاڵای سپی هەڵنەکرد، بەڵکو پاش دەرچونی (وشەکان و شتەکان)، کەوتە پەلاماردانی ئەو کتێبەو لە بارەیەوە نوسی: (ئەم کتێبە دوایەمین دیوارە کە بۆرژوازیەت بە ڕووی فەلسەفەی مارکسیزمدا هەڵیدەچنێت!). ئەڵبەتە ئەم قسەیە بە خراپ لەسەر "سارتەر" کەوتەوە، لەبەرئەوەی "فۆکۆ" لەسەر چەپڕەوەکان ماڵ بوو نەك سەر بە بەرەی ڕاستڕەوەکان بێت، هاوکات وەکو ڕابردوش مارکسیزم بێ گوناه و بێ هەڵە نەبوو. بەم پێیە تەقدیسکردنی مارکسیزم لەلایەن "سارتەر"ەوە، هیچ بەهانەیەکی بۆ نەبوو، بە تایبەت کە کەلێن و کەموکوڕییەکانی لە کاتی پراکتیزەکردنی لە وڵاتانی کۆمۆنستیدا ئاشکرابوون.

لەو ماوەیەدا دەرهەق بەم مەسەلەیە، مشتومڕی فیکری گەرم کراو "میشێل فۆکۆ"ش بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە بەشداری تێداکرد.. ئەگەرچی بۆ ماوەی دووساڵێکیش پاریسی بەجێهێشت و بوو بە وانەبێژ لە زانکۆی تونس.

سەروەختێك گەڕایەوە بۆ پاریس، دەستنوسی کتێبێکی نوێی ئامادەبوو بۆ چاپ، ئەمەش بە قورسترین ئەو کتێبانە ئەژمار دەکرێت کە ئەو نوسیویەتی و بەم ناونیشانەیە: (ئارکیۆلۆژیای زانین). پاش ئەوە دەستی کرد بە چەند لێکۆڵینەوەیەك بە مەبەستی ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە، ئەویش لە میانەی شیکردنەوەی سستمی سزادان و بەندیخانەکان لە ئەوروپادا. ئەمەش لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدابوو. وەکو ئاشکرایە سەرجەم دامودەزگا مۆدێرنەکانی فەرەنسا، وەك: (دەزگای شێتخانە و بەندیخانە و قوتابخانە و مۆڵگەی سەربازی و سستمی پۆلیس)، لە دوای شۆڕشی فەرەنسیەوە دروستبوون و تا ئەمڕۆش بەردەوامن.

"فۆکۆ" زۆر بە توندی کەوتە ڕەخنەکردنی ڕووە سلبی و سەرکوتکاریەکانی مۆدێرنە و لە پای ئەمەشدا دەستەواژە بەناوبانگەکەی خۆی وت کە دەڵێت: (ڕۆشنگەری ئازادیەکانی دەستەبەرکرد و هەر خۆشی کۆتو پێوەندی بۆ دروستکرد). "فۆکۆ" زیاد لەپێویست بەرامبەر مۆدێرنە ڕەشبین بوو.

لەم سەروبەندەدا جەنگێکی فیکری بەناوبانگ لە نێوان ئەو و "یۆرگن هاپرماس"ی فەیلەسوفی ئەڵەمانیدا، دروست بوو. "هاپرماس" ئەمجۆرە ڕەخنەگرتنەی لە مۆدێرنە پێ پەسەند نەبوو، هەر بۆیە دژی ئەو شاڵاوە توندە وەستایەوە کە لەلایەن فیکرێکەوە کرایە سەر مۆدێرنە، کە لەسەر چەپ و هێزە پێشکەوتن خوازەکان ماڵ بوو.

"هاپرماس" سەرەڕای ڕەخنەی زۆری لەلادانەکانی مۆدێرنە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەفادار بوو بۆ پڕۆژەی ڕۆشنگەری و مۆدێرنە. ئەو وەکو "فۆکۆ" و هاوشێوەکانی نایەوێت دەستبەرداری پڕۆژەی مۆدێرنە بێت و وێرانی بکات. لێرەوە ئەو ململانێیەی نێوان "فۆکۆ" و "هاپرماس" بەو ململانێیە دەچێت کە لە نێوان "نیچە" و "کانت" یان "نیچە" و "هیگڵ" دا ڕوویدا.. لە ڕاستیشدا یەکەمین گەورە ڕەخنەگری مۆدێرنە "نیچە"یە نەك "فۆکۆ".. "فۆکۆ" خۆیشی دان بەمەدا دەنێت و "نیچە" بە یەکەمین مامۆستای خۆی دەداتە قەڵەم.

وەکو دەزانرێت بیرکردنەوەی "نیچە"، قۆناغی ئەقڵانیەت و نا ئەقڵانیەتی بەخۆوە بینیووە، لە یەکەمیاندا ستایشی "ڤۆڵتێر" دەکات، وەك بیریارێکی ڕۆشنگەری لە سەدەی هەژدەهەمدا، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا گومان لە هەموو شتێك دەکات: (چەمکی حەقیقەت، زانست، ئەقڵ). بەمجۆرە لە فەلسەفەی ڕۆشنگەری هەڵدەگەڕێتەوە، ئەو فەلسەفەیەی تا ئەوپەڕی ستایشی ئەقڵ و زانستی کرد. هەروەها لە تەواوی فەلسەفەی ئەقڵانی ئەڵەمانیش هەڵگەڕایەوە، ئەو ئەقڵانیەتەی بە تایبەت لەسەر دەستی "کانت" و "هیگڵ" گەیشتە ئەوپەڕی.

هەر چۆنێك بێت ئەوا "فۆكۆ" هەڵەی كرد كاتێك شالاَویَكی رەخنەیی كردە سەر مۆدێرنە، بێ ئەوەی حساب بۆ ئەو دەسكەوتە ئیجابیانەی بكات كە فەرامۆش ناكرێت. بێگومان ئەو باشی كرد كاتێك كەلێن و كەموكورِیەكانی دەستنیشانكرد، بەتایبەت لە قۆناغی كۆلۆنیالیزمدا، بەلاَم مۆدێرنە سەر لە بەری خراپ نەبووە. كەس لاری لەوە نییە سستمی مۆدێرنەی دیموكراسی تەنها سستمێكە بایەخ بە مافە سەرەكیەكانی تاكەكەس دەدات، هەر ئەویشە پلورالیزمی ئایینی و سیاسی لە كۆمەڵگەدا دەستەبەر دەكات و بواری ئازادی بلاَوكردنەوە و بیركردنەوە و رادەربرین، بۆ رۆشنبیران و رۆژنامەنوسان دەرەخسێنێت.

بۆیە نەبینینی كۆی ئەم دەسكەوتە ئیجابیانە، بەڵگەی بەشەوارە كەوتنێكی فیكری رون و ئاشكرایە. بەلاَم پێدەچێت "فۆكۆ" لە دوا دوایی تەمەنیدا وازی لەم بۆچونە عەدەمیەی هێنابێت و ئاورِی لە دەسكەوتە ئیجابیەكانی مۆدێرنە دابێتەوە.

لەم سەروبەندەدا لێكچەرێكی گرنگی لە كۆلیژدی فرانس سەبارەت بە تێكستە بەناوبانگەكەی "ئیمانوێل كانت" پێشكەشكرد كە بەم ناونیشانەیە: (رۆشنگەری چییە؟). "فۆكۆ" لەو لێكچەرەیدا كە بە ناوی (كانت و شۆرِش)ەوەیە ستایشێكی زۆری گەورە فەیلەسوفی رۆشنگەری "ئیمانوێل كانت"ی كرد و رِایگەیاند ئەو دامەزرێنەری فەلسەفەی نوێیە، فەلسەفەی حەقیقەت و ئەقلاَنیەت و كۆی بەرهەمەكانیشی (واتە بەرهەمەكانی میشێل فۆكۆ خۆی)، دەچێتەوە سەر هەمان ئەو هێڵە فەلسەفیەی "كانت" بەر لە دوو سەدە سەرەتاكانی دارِشت. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت كە "نیچە" تەنها مامۆستای نەبووە، وەك ئەوەی ئێمە لە رابردوودا پێمان وابوو.

بەمجۆرە و پاش ماوەیەكی زۆر لە رەخنەگرتن و یاخیبوون، "فۆكۆ" گەرِایەوە لای مۆدێرنە و درەنگ گەرِانەوەش لە نەگەرِانەوە چاكترە.

دواجار دەبێت بڵێین "فۆكۆ" لە رِێی رەخنەوە سودێكی زۆری بە مۆدێرنە گەیاند. رەخنەكانی ئەو كەسانی دی هاندا تا رووە گەشاوەكەی مۆدێرنە بە چاكی ببینن، ئەگەرچی ئەوە خواستی ئەویش نەبوو.

**سەرچاوە**

بیان الكتب، 2005/1/10

# چەمکی گوتار لە فەلسەفەی میشێل فۆکۆدا

محمد عەبدولواسع

لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵڵا




هێشتا فەیلەسوف و بیرمەندی فەرەنسیی هاوچەرخ میشێل فۆکۆ (1929-1984) باڵادەستییەکی گەورەی لە بواری توێژینەوە فەلسەفییەکانی خۆرئاوادا هەیە و هێشتا گوتارەکەیشی خاوەن دەسەڵاتێکی کاریگەرە لەسەر فەیلەسوفە هاوچەرخەکانی رۆژئاوا. لەم ڕووەوە، ئەو بۆ خۆی دیاردەیەکە لە فیکری جیهانیدا، ئەمەش بەوەی تێزەکانی توانیان چەند وەرچەرخانێکی گەورە لەو بوارانەدا ئەنجام بدەن کە خۆیانیان لێداون: لە بواری فەلسەفە و ڕەخنەی ئەدەبی، دەروونناسی، مێژووی سیاسی، پزیشکیو، مافەکان.. ئەو لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوە عەرەبی و بیانییانەش لە برەودان کە خۆیان لە فیکری ئەم فەیلەسوفە داوە هەتا وایان لێهاتووە لەخودی خۆیاندا بوونەتە گرفت (إشكالية) ئەمەش بەو بەدحاڵیبوون و هەڵانەی کە لە خستنەڕووی تێزەکانی فۆکۆ و هەڵسەنگاندنیاندا، ورووژاندوویانە. ئەو توێژینەوەیەش کە نووسەری مەغریبی" د. ئەلزەواوی بەغورە" پێشکەشی دەکات، نەسیجەکەی لەو هۆکارانەوە پێکدێت. لەم ڕووەوە، نووسەر، ئیش لەسەر خستنەڕووی چەمکە فۆکۆییەکان دەکات و سەرلەنوێ دەیانخوێنێتەوە





وەریاندەهێنێت و ئەوەی کە بەدبینیی تێکەوتووە یا بەڕووی تێگەیشتندا داخراوە، ڕاستی دەکاتەوە. لەم بوارەشدا توانیویەتی مامەڵە لەگەڵ بیروباوەڕە بنەڕەتییەکانی فۆکۆدا بکات لە میانەی گەشەکردنیانەوە بەهۆی کۆمەڵە دانراو و ووتار و دیالۆگەکانییەوە. ئەو گرفتەش، کە پێشتر باسکرا، لە دیدی ئەودا، بە شێوەیەکی تایبەتی، لە هەڵبەز و دابەز-ی تێگەیشتنی ئەو ڕەگەزانەوە دێت کە چەمکی گوتار پێك دەهێنن و، ئەو فرمانانەی کە ئەم چەمکە پێیان هەڵدەستێت و، ئەو پەیوەندییانەش کە بە چەمکە جیاجیاکانەوەی گرێدەدات. ئەو پێداچوونەوەیەش کە دانەر (المؤلف) پێیهەڵدەستێت لە کۆتاییدا ئاشنابوون بە وێنەی ئەو پێگەیە خۆشدەکات، کە وادیارە گوتار-ی فۆکۆ، لە فەلسەفەی هاوچەرخدا، هەیەتی، ئەمە بەبێ کورتکردنەوە و ئاسانکردنەوە و بەشبەش کردن.

دانەر لەوێوە دەست پێدەکات کە چەمکی گوتار نزیککارییەکی فەلسەفیی شیاوە بۆ خوێندنەوەی فەلسەفەی فۆکۆ لەلایەك و، هەڵێنجانی شێوازێك بۆ توێژینەوەی فەلسەفی لەلایەکی ترەوە، نزیککارییەك کە تەنها وەڵامدانەوەی هەندێ پرسیاری فەلسەفەی زمان پێك ناهێنێت، بەڵکو وەڵامدانەوەیە بۆ کۆمەڵێك پرسیاری مەعریفی و سیاسی و ئاکاری-یش. هەروەها ئەم نزیککارییە ئەوەشی بۆ دەرکەوتووە ئەو بابەتە گەورانەی کە فۆکۆ قسەی لەسەر کردوون، کە ئەوانیش زانین و دەسەڵات و ئاکار-ن، بەهۆی گوتار-ەوە شیکراونەتەوە کە جیایە لە زمان و دەق و ئاسەوار و لقی مەعریفی، ئەوەش لە چوارچێوەی دوو بواری بنەڕەتیدا کە ئەوانیش: مێژوو و فەلسەفە-ن. لە سەرەتادا تۆژەر (د. ئەلزەواوی) خۆی لە چەمکی زمان دەدات لای فۆکۆ و دیدی فۆکۆ بۆ زمان لە توێژینەوەی مێژوویی و توێژینەوەی ئەدەبی و توێژینەوەی فەلسەفیدا، ئاماژە دەکات بەوەش کە لێکۆڵینەوەکانی پێشوو خۆیان لە شوێن و پێگەی زمان، لە کارەکانی فۆکۆدا، نەداوە، یان پەیوەندیی نێوان زمان و گوتار، کە ئەمە پەیوەندییەکی گەوهەریی بنەڕەتییە لە گوتاری فۆکۆدا، فۆکۆیەك کە زۆرێك نکۆڵییان لە زمانناسییەکەی دەکرد، ڕەنگە هۆکارەکەشی، وەك نووسەر پێی وایە، بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زمان شوێنێکی سەربەخۆی لە چوارچێوەی کارە سەرەکییەکانیدا داگیرنەکردووە، بەڵکو لە دووتوێی بابەتەکانی تر و لە سایەی خۆسەپاندنەکانی گوتار و مەسەلەکانی بەسەر بابەتی زماندا، قسەی لەسەر دەکرا. لەم ڕووەوە، لە پێودانی توێژینەوە لە زمان، دانەر قسەلەسەر بابەتی شێتی/ دێوانەیی دەکات وەك ئەزموونێك لە کایەی زمانەوانیدا، یان پەیوەندیی شێتی بە زمانەوە لە سەردەمی ڕێنیسانس و سەردەمی کلاسیك و سەردەمی مۆدێرندا و سروشتی ئەم زمانە جیاکار و جیاوازە کە فۆکۆ ویستوویەتی ئاشکرای بکات. ئەگەر زمان پەیوەست بێت بە عەقڵەوە و، شێتی جودابێت لە عەقڵ، ئەوە ئەمە بە زەرووڕەت مانای ئەوەیە شێتی جودایە لە زمان، لە زمانی عاقڵەکان، کەوابێ زمانی شێتی چییە؟ لەم گۆشەیەوە فۆکۆ لە لێکۆڵینەوەی دیاردەی شێتی و لە میانەی کتێبەکەی( ووشەکان و شتەکان)، قووڵ دەبێتەوە. لەو کتێبەدا بە دوای زمانی شێتیدا دەچێت وەك ئەوەی کە لە مێژووی شێتیدا خراوەتە ڕوو و، لەم ڕووەوە ئەوەی بۆ جیا دەبێتەوە کە زمانی شێتی زمانێکی بەزێنەر و تێپەڕێنەر و نا عەقڵانییە و خۆی لە کاری هونەرمەندان و شاعیران و فەیلەسوفە ناعەقڵانییەکاندا بەرجەستە کردووە. پاشان شێتی و زمانی شێتی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوون: زمانی وێکچوون لە سەردەمی ڕێنیسانسدا، زمانی وێناکردن لە سەردەمی کلاسیکدا کە دواتر گوتار



شوێنی دەگرێتەوە، پاشان زمانی شێتی سەرلەنوێ لە سەردەمی مۆدێرن، لەگەڵ نیتچە و مالارمێ-دا، دەردەکەوێتەوە. زمان-یش وەك کەرەستەیەکی شیکردنەوە، لە مێژووی شێتیدا، ئامادەبوونی هەیە، ئەمەش لە میانەی بەدواداچوونی فۆکۆ بۆ چەمکە جیاوازەکانی شێتی وەك بابەتێکی مرۆیی کە نیشانە لە ئەزموونێکی مرۆیی تاك و دەگمەن دەگرێت کە ئەزموونی شێتی-یە. بەم شێوەیە-ش پاشخانی مێژوویی لێکۆڵینەوەکاریی، لە وێناکردنی فۆکۆدا، دەربارەی زمانی شێتی، لە کۆمەڵێك شاعیر و هونەرمەند و فەیلەسوفدا دروست دەبێت لە نموونەی دی ساد و نیرڤال و هۆڵدرین و نیتچە، کە کەسایەتیی ئەو، واتە نیتچە، بە نموونەیەك لەو ئاراستە فەلسەفییە لەقەڵەم دەدرێت کە زمان و هەبوون-ی (الکینونە) لەیەك کۆکردۆتەوە، ئەوەش لە میانەی بیرکردنەوەی ڕیشەییانەیەوە بۆ زمان و مرۆڤ، ئەم ئەرکەشە کە فۆکۆ دەیکاتە بنەما و پێودانگێك بۆ بیرکردنەوەی زمان.

هەروەها فۆکۆ هەوڵ دەدات وێناکردنە تایبەتەکان (شێتانەییەکان) بە زمان و ئەدەب و هونەر کۆبکاتەوە، ئەو وێناکردنە تایبەتانەی کە بە زمانێکی نامۆ و ووشەگەلێکی مەترسیدار-یان دادەنێت، زمان و ووشەگەلێك کە ماشێنێکی جەنگی پێك دەهێنن. مادامێکیش زمان ئەم توانایەی بەزاندن و وێرانکردنی هەیە بەبێ ئەوەی بچێتە ژێر باری هیچ یاسایەکەوە، ئەوە ئەو، واتە زمان، کەرەستەیەکە بۆ بەرەنگاری، ئەم خەسڵەتەش پەیوەندیی بە کەسایەتیی فۆکۆ-ی فەیلەسوف و، ڕاڤەکردنێکی دیاریکراو بۆ مێژوویی ئەدەبی و بۆ کەسایەتییە تایبەتییە ئەدەبییەکانەوە، هەیە، ئەدیبی سۆریالی "ریمۆن رۆسال"یش بە نموونەیەك لەو کەسایەتییانە لەقەڵەم دەدرێت، ئەوەش بە هۆی ئەو نهێنێتی و نامۆیی و تاکایەتییەی کە هەیەتی.

لەم ڕووەوە ئەو شێتی و نووسین-ی لەیەك کۆکردەوە، ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە خودی مێشێل فۆکۆ خۆی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا پێیدا تێپەڕیوە، ئەو شتەی کە وای لێدەکات لە "رۆسال"ەوە نزیك بێت و بەڵکو زۆر توند لە پەیوەندیدا بێت پێوەی. پاشان زمان، وەك فۆکۆ بۆی دەچێت، مۆرکێکی وجودییانەی هەیە کە دەکەوێتە پێش مرۆڤەوە، لێرەشەوەیە کە مەترسییەکەی و مەترسیی بیرکردنەوەی مرۆڤ لە میانەیەوە، واتە لە میانەی زمانەوە، سەرهەڵدەدات.

کتێبی (ووشەکان و شتەکان)ی فۆکۆ-ش پوختەی دیدی فەلسەفییانەی ئەوە و درەوشاندنەوەیەکیشە بۆ ئەم دیدە. کتێبەکە رەنگدانەوەی وێناکردنی فۆکۆیە لە سێ ئاستدا: رەنگدانەوەی ئاستی خودی و ئەدەبی، ئاستی زانستی و مێژوویی، ئاستی فەلسەفی. لەم ڕووەوە زمان لای فۆکۆ خۆی گرێداوە بە چەند دۆزێکی فەلسەفییەوە وەك کۆتابوون (التناهي)، هەبوون (الکینونة) و مرۆڤ. هەرلەم خاڵەشدا تایبەتمەندێتیی فۆکۆ، بە بەراورد بە نیتچە و هایدگەر و، هەردوو تەوژمی ڕاڤەکاری و فۆرمالیستی، بەدەرکەوت. ئەم تایبەتمەندێتییەش لەسەر توێژینەوەی ئارکیۆلۆژی بۆ زمان و بۆ ئەزموونە زمانەوانییە تایبەتییەکانی وەك ئەزموونی شێتی و نەخۆشی، ڕادەوەستێت. بەڵام ئەم وێناکردنە بۆ زمان شتێکی پێك نەدەهێنا تەنها قۆناغێکی فیکریی نەبێت لە ژیانی فۆکۆ، قۆناغێك کە تێیدا فۆکۆ، لە هەندێ تێزی خۆیدا، خۆی بە ئەدەب و ئەنگێزەی بونیادگەری/ ستراکتۆرالیزمەوە گرێدا تا دواتر گواستییەوە بۆ ئاستێکی تری شیکارکردن کە ئاستی چەمکی گوتارە.

لێرەدا دانەر نزیککارییەکەی خۆی پێشکەش دەکات وەك هەوڵێك کە ئامانجی دەرخستنی مۆرکی هەمەکییانەی گوتارە لە فەلسەفەی فۆکۆدا، ئەوەش



بە لێکۆڵینەوە لە میتۆدی ئەم گوتارە و دەسەڵاتەکەی و پیادەکردنە گوتاری و ناگوتارییە جیاجیاکان لە مێژوودا، یان ئەوەی کە فۆکۆ ناویدەنێت بوونی کەڵەکەبووی گوتارەکان و فرمانەکانیان لە مێژوودا ئەمەش بەوەی کە ناتوانین لێکۆڵینەوە لەگوتار و لێکۆڵینەوە لە مێژوو لە یەکدی جیابکەینەوە. لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کە فۆکۆ گوتار و چەمکی گوتار–ی لە دوو کتێبی بنەڕەتیدا تایبەت کردووە کە ئەوانیش (ئارکیۆلۆژیای زانین) و (سیستمی گوتار) و هەندێ لێکۆڵینەوەی ترن. لەم ڕووەوە فۆکۆ بەم جۆرە پێناسەی گوتار دەکات: (گوتار هەندێ جار بەمانای پانتایی گشتییە بۆ کۆی گوتراوەکان، هەندێ جاریش کۆمەڵەیەکی جیاواز–ی گوتراوەکانە، جاری سێیەمیش پەیڕەوکردنی شتێکە کە بنەمای خۆی هەیە و بەڵگەی وەسفکردنە بۆ ژمارەیەکی دیاریکراو لە گوتراوەکان و ئاماژەیە بۆیان. هەروەها لە شوێنێکی تردا وا پێناسەی گوتار دەکات (گوتار کۆمەڵێکە لە گوتراوەکان، ئەو گوتراوانەی کە پەیوەندییان هەیە بە خودی پێکهاتەی گوتارییەوە، لەم ڕووەوە گوتار، یەکەیەکی ڕەوانبێژی یان وێنەیی نییە کە قابیل بەوە بێت بۆ هەتا هەتایە دووبارە ببێتەوە و بتوانرێت دەربخرێت و بەکاربهێنرێت لە میانەی مێژوودا، بەڵکو گوتار بریتییە لە ژمارەیەکی تایبەتیی گوتراوەکان کە دەتوانن مەرجەکانی بوونی خۆیان دەستنیشان بکەن).. ئەم ڕەگەزانە کە فۆکۆ ناوی لێناون گوتراوەکان یان دەربڕاوەکان، پێکهاتە گوتارییەکانن لە بەرامبەر لقە زانستییەکاندا، ئەم پێکهاتە گوتارییانەش بە ڕۆڵی خۆیان پانتاییەکانی گوتار پێك دەهێنن و مەحکومیش دەبن بە سیستمی پێکهاتن و وەرچەخاندن. گوتراو–یش لە دەقی فۆکۆدا بە مانای گەردیلەی گوتارە، یان یەکەی یەکەمینێتی و ڕەگەزی کۆتاییەتی، بەوەش گوتراو بەشێکی بنچینەییە لە گوتار و بۆ ئەوەش دەتوانێت بۆ خۆی سەربەخۆ بێت، واتە مەرجبەند نەبێت بە گوتارەوە لەگەڵ هیچ بەشێکیدا. گوتار و گوتراو و پێکهاتەی گوتاری–یش شتگەلێکن پێکداهەڵدەپرژێن و ئەوەیش کە ڕاهاتووین، لە چوارچێوەی مێژووی فیکردا، بە دەق و شوێنەوار و دۆز و ڕستە و بواری زانستیی، ناویانبنێین، ئەوە هەموو ئەم چەمکانە، وەك فۆکۆ بۆی دەچێت، پەیوەندییان هەیە بە وەهمی بیروباوەڕە لێکگرێدراوەکانەوە (الأفكار الاتصالية)، ئەوەش کە فۆکۆ دەیەوێت دایبمەزرێنێت و لێی بکۆڵێتەوە مێژووی دابڕانەکان و لێکجیابوونەوەکانە، لەبەرئەوە پشتی بە چەمکی گوتار بەستووە وەك ڕووداوێکی مێژوویی تاکانە. پاشان شیکردنەوەی گوتار پەیوەندییەکی نییە بە شیکردنەوەی زماننناسی یان شیکردنەوەی لۆژیکی، ئیدی لە ڕووی مەرجەعییەتەوە بێت یان لە ڕووی ئامانجەوە.

خەسڵەتی بنەڕەتیی شیکردنەوەی گوتار ئەوەیە کە شیکردنەوەیەکی ئارکیۆلۆژیی ژینالۆژییە و لەسەر کۆمەڵێك پرەنسیپ و پێوەر ئیش دەکات، لەوانە ڕاپۆرت و پارێزگاریکردن و خاوەنداریێتی و پێکهاتن و وەرچەرخاندن و پێکەوەگرێدراوێتی و کەم وێنەیی و کەڵەکەبوون و دەرەکی بوون (واتە سەیرکردنی گوتراو یان گوتار لە ڕووی ئەوەی لەسەر ئاستی دەرەکی تا چەند ڕێکخراوە).

شیکردنەوەی فۆکۆ و ئەوەی کە بە هۆیەوە ناسراوە بواری داوە بە دامەزراندنی چەمکێکی نوێ بۆ گوتار کە جیاوازە لە چەمکی دۆز و ڕستە، ڕەهەندێکی بنەڕەتیشی لە گوتاردا ئاشکرا کردووە کە ڕەهەندی دەسەڵاتە، یان دەسەڵاتی گوتار، لە هەمان کاتدا ئەو میکانیزمانەشی کە گوتار هەڵدەسوڕێنن و سنوور بۆ دەسەڵاتەکەی دادەنێن، خستۆتەڕوو، وەك میکانیزمی قەدەغەکردن و

ڕەتکردنەوە و دابەشسازی و ویستی زانین و فۆرمەکانی خاوەنداریێتی و بیروباوەڕگەرایی. بۆ ئازادکردنی گوتار-یش پێویستە پشتببەسترێ بە هەندێ پرەنسیپ وەك تایبەتمەندێتی و دابڕان و دەرکەوتی دەرەکیی.

د. ئەلزەواوی دەردەچێتە سەر ئەوەی کە فۆکۆ پرەنسیپە یەکەمینەکانی، بۆ ئاراستەیەکی نوێ لە لێکۆڵینەوە زمانەوانی و مێژووییەکان و لێکۆڵینەوەی فەلسەفە، دامەزراندووە، ئاراستەیەك کە لەسەر چەمکێکی دیاریکراوی گوتار ڕادەوەستێت، چەمکێك کە بە هەمەکی و لێکجیاکەرەوە دەناسرێت و لە میانەی ئەو تۆڕی پەیوەندییانەشەوە کە لەگەڵ بابەتگەلێکی بنەڕەتیی لە بواری فەلسەفە و مێژوو پێکەوە، دایاندەمەزرێنێت، وەك زانین و دەسەڵات و ئاکار.

دانەر بەردەوام دەبێت تا دەگاتە سەر دەرخستنی پەیوەندیی گوتار بە زانینەوە و، پەیوەندیی بە دەسەڵاتەوە، یان بە کردەوە نا گوتارییەکانەوە و، لە دواییدا پەیوەندیی گوتار بە خود-ەوە. لەم ڕووەوە، لە سەر ئاستی یەکەم، ڕوو دەکاتە ئاشکراکردنی ئەو سەرزەمینەی کە زانینەکانی لە سەردەمە جیاوازەکان لەسەر ڕادەوەستێت، یان ئەو زانینەی کە کۆی گوتارەکان لە زەمەنێکی دیاریکراودا هەڵدەسوڕێنێت. بەم شێوەیەش فۆکۆ زانستی ئارکیۆلۆژیا دادەمەزرێنێت بەو پێیەی کایەیەکی توێژینەوەیە، کایەیەك کە بابەتەکەی زانینە و میتۆدەکەی باسکردنی کردەوە گوتارییەکانە و شیکردنەوەی سیستمە ئەبستمییەکانێتی. هەروەها فۆکۆ دیدێکی ڕێژەگەرانە بۆ زانین و ڕاستی/حەقیقەت دادەمەزرێنێت و هەردووکیشیان گرێدەداتەوە بە ویستی زانین و دەسەڵاتەوە.

لەسەر ئاستی دووەم، دانەر، ڕوودەکاتە باسکردنی ووردی چەمکی دەسەڵات کە لەسەر پەیوەندییەکانی هێز دادەمەزرێت و لە چوارچێوەی ستراتیژگەلێکی جیاوازدا کە لە ناوەندێکدا یان دامەزراوێکدا یان خود-ێکدا بەرجەستە نابێت ، بەڵکو کردەوەگەلێکی پەرشوبڵاو و بڵاوەکردووە بە هەموو جەستەی کۆمەڵایەتیدا. لەم ڕووەوە دەسەڵات پەیوەندییەکی هەیە بە گوتار و بە زانین و بە کۆمەڵگا وە، یان بە وێناکردنێکی دیاریکراوەوە بۆ کۆمەڵگا کە لەسەر ڕێکخەرایەتی و دەسەڵاتی پێوەرەکان و چاودێری کردن ڕادەوەستێت، پەیوەندییەکیشی هەیە لەگەڵ ئەرکەکانی ڕۆشنبیر-ی مۆدێرندا کە هەوڵی گەشەپێدان دەدات لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتیی خۆیدا.

لەسەر ئاستی سێیەمیش، دانەر لە پەیوەندیی گوتار دەکۆڵیتەوە بە خود-ەوە، ئەمەش لە میانەی گوتاری سێکس و ئاکار و جوانی. لەو ڕووەوە لە کۆمەڵێك بیرۆکە دەکۆڵێتەوە، لەوانە: ناتوانرێ سێکس لە چەمکی خود و پێکهاتنی خود و حەقیقەتی خود، جیابکرێتەوە. باسی چۆنیەتی پێکهاتنی سێکس-یش دەکات لە گوتاردا و لە ڕێگەی میکانیزمە مەعریفی و دەسەڵاتخوازییەکانەوە، باسی ئەوەش کە زانینی خود لە ڕێگەی ئەو دانپێدانانەوە دەبێت کە بواری پێکهێنانی گوتارێك و دامەزراندنی پەیوەندیگەلێکی دەسەڵاتخوازانەمان دەداتێ لەبارەی خودەوە. ڕەفتاری سێکسیش پەیوەندیی بە یەکێك لە لایەنەکانی خودەوە هەیە کە ئەویش لایەنی ئاکارە. لێرەوەیە لە فەلسەفەی فۆکۆدا جیاوازی لە نێوان ئاکار و ڕەفتاردا دەکرێت، ئەوەی کە فۆکۆ-ش بایەخی پێدەدات ئاکارە وەك ڕەفتار، ئاکار لە بەدیهاتن و پراکتیك کردنیدا، یان ئاکاری مێژوویی کە تایبەتە بە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو و، چەند بابەتێك کە لە دەوری سێکس و جەستە و سیستمی ئارەزوو دەخولێنەوە.

شـیکردنەوەکە (لـە ڕووی مێژووییـەوە) ئـەو ئاکـارە یۆنـانی و ڕۆمانییـەی ئاشـکرا کـردووە کـە مـۆرکێکی پیاوسـالارانەی هـەبووە، ئامانجیشـی، لەسەر ئاستی گوتار، زانینی خود و پێکهاتنی خود بـووە وەك خـودێکی ئاکـاری. لـە پێـودانگی ئـەو شیکردنەوە مێژوویی و فەلسەفییانەشەوە کە فۆکۆ پێیـان هەسـتاوە، چـەمکێکی بـۆ خـود گەڵاڵـەکردووە کـە وای لەقەڵـەم داوە فـۆرمێکی جـێگیری نییـە، ئەمـەش بـە ڕەچـاوکردنی گـۆڕانی پەیوەندییـەکان و جیاوازییەکانیان، ئەمەشە کە ڕێدەدات بە پێکهـاتنی مێژووییانـەی خـود لـە ڕێگـەی کـردەوە و ئەزموونـە جیاوازەکانەوە و لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی زانین بە دەسەڵاتەوە.

هەرچـی لەسـەر ئاسـتی ئـەو پێگەیەیـە کـە گوتـاری فۆکـۆ لـە فەلسـەفەی هاوچـەرخدا بـۆ خـۆی داگـیری کـردووە، ئـەوە دانـەر دەگاتـە ئـەوەی بڵێـت بابـەتی سـەنتراڵی لـەم فەلسـەفەیەدا ئـەو دابەشـکردنانەی نێـوان خـود و ئـەویتر نییـە، یـان نێـوان زانـین و دەسـەڵات و ئاکـار نییـە، بـەڵکو بـە دیـاریکراوی گوتـارە لـە مێـژوودا بـەو پێیـەی گوتـار شـێوازێکە بـۆ چارەسـەرکردنی سـەرجەمی بابەتـە فەلسـەفییەکان، ئیـدی بابـەتی زمانـەوانی بێـت یـان مەعریفی یان سیاسی، چارەسەرێکی مێژووییانە .

لەم خاڵـەوە دانـەر وای دەبینێـت کـە چـەمکی گوتـار دەروازەیەکی پێویسـتە بـۆ خوێندنـەوەی فەلسـەفەی فۆکۆ و، نزیککارییەکی فەلسەفییانەی شیاویشـە بـۆ لێدوان و شیکردنەوەی بابەتە مێژوویيە جیاوازەکان و دۆزە فیکری و ڕۆشنبیرییەکان.

**سەرچاوە**

ڕۆژنامەی "ئەلبەیان" ژمارە (1422).

# میشیل فۆکۆ وسنوورەکانی دوورترین ئەزموونی مرۆیی

### خوێندنەوەیەکی رەخنەئامێزی هەردوو کتێبی (ئارەزووەکانی میشیل فۆکۆ)ی جیمس میللەرو (میشیل فۆکۆ)ی دایدێ لیربۆرن

**مارك ليلا**

**لە عەرەبییەوە: دانا ئەحمەد مستەفا**




لە سەدەی نوێدا هیچ کەسێك ئەوەندەی فۆکۆ وەك لایەنگری نیتشە دەرنەکەوت، ئەمڕۆش دوای دەیەییێك لە مردنی فۆکۆ، گفتوگۆ کردن لەمەڕ ژیان و کارەکانییەوە بەبێ ئەوەی بمان هەژێنێ کارێکی ئەستەمە. ئەوەی زیاتر هەستیارمان دەکات لایەنگیری توندو تۆڵی شوێنکەوتووەکانێتی، لە لایەکی تر ئەو هەلومەرجە ئالۆزەی گەمارۆی مردنەکەی داوە، بەلاّم لە هەموان گرنگتر فەلسەفەی نیتشە بوو. چۆن دەتوانین کەسێك هەڵبسەنگێنین کە پێی وابێ ئەو لەودیو خێر و شەڕەوە دەژی؟

وێناکردنی ئەوەی فۆکۆ دیتی یان پێی وابوو کە دیویەتی لە مایسی 1968 دا کارێکی گران نییە، دۆزینەوە نیتشەوییەکانی تا ئێستا لە کتێبخانە نیشتمانییەکان و ژوورە داخراوەکاندا قەتیس کراوون، بەلاّم رووداوەکان زۆری خۆشنوودکردووە بەوەی کە رێنجی جیاکەرەوە لە نێوان باری مامناوەندی بۆرژوازی و ئەو ئەزموونانەی کە رۆچوون لە توندوتیژیدا لە نەوەی پێشووەوە بەتەواوەتی لەناو چوون، و خەریکە کۆمەڵگەیەکی نوێ دەست بە دروست بوون بکات،

فۆكۆ لەم وەهمەدا بەشدار بووە و تێیدا قوڵبۆتەوە بۆ ئەوەی تێی بگات، ئەوە لە دایك بوونی فۆكۆی سیاسی كە بەیانات بڵاو دەكاتەوە و بەشداری خۆپیشاندان دەكات و بەرد دەگرێتە پیاوانی پۆلیس.. هەروەكو سەرتای لە دایك بوونی فۆكۆی مامۆستای رۆحی بوو، شتەكانی پارێزراون وەك مۆمیایەكی نازیندوو لە زانكۆی ئەمریكی، چاوپێكەوتنەكانی كە پڕن لە تەموومژ و دژیەكی ماونەوە كەلەگەڵیدا ئەنجام دراون لەو قۆناغەدا كە ئێستاش بۆنەتە كانگەیەك بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان توانستی *pouvoir* بە مەعرفەوە *savoir* هەروەها پەیوەندی نێوان گوتار *discours* بە پراكتیكەوە *corps* و تەن (جەستە) بە جەستەوە *.corps*

لە فەرەنسادا ئەوە دەزانرا كە فۆكۆ پابەند نەبوو بە ماركسیەتەوە وەك (التوسیر) بەڵكو خۆی بە شوێنكەوتەی نیتشە دادەنا. ئەو بڕوایەش لە ئارادابوو كە فۆكۆ لەگەڵ ئەوەی شوێنكەوتووی نیتشە بوو بەڵام لە ناخەوە كرۆكی دیموكراتی هەڵگرتبوو.

میلەر بەو ئەفسانەیە توشی شۆك بوو كە دەڵێت: فۆكۆ پابەندە بە سەركەوتنی چەپڕەوەوە لەو ئەو دەساڵەی بەدوای ساڵی 1968دا هات...و بەڵگەیەكی پێكەوەنا كەناوەرۆكەكەی بریتییە لەوەی قایلبوونی بەوەی حەز بەئازارو توندوتیژی و شێتی بكات دەرهاویشتەی ئەو بارە سیاسییە شێواوەیە كەلەو سالأنەدا باڵیان كێشابوو، لەكاتێكدا زۆر لەهاوڕەگەزەكانی بەبەكارهێنانی مادەی سڕكەرو ژیانی كۆمۆنیستانەو ئەزموونگەرایی لەژیانی سێكسیدا تەواو قایل ببوون وەك هەڵاتنێك لەدەسەڵات، ئەوە فۆكۆ ئەو كارانەی وەك مەشقێك دەكرد بۆ كۆنترۆڵكردنی خۆی و خەڵكانی تر، پێناسەی ئەو دابە مرۆییە رۆشنگەراییانەیشی وەها دەكرد كەرقی لێیان دەبۆوە كە "ئەوانە هەموو ئەو شتانەن كەخزمەت بەئارەزووی پاوانكردنی دەسەڵات بەسەر ژیاریی رۆژاوادا دەكەن، ئەوەی لەدەرەوەی سنووری كۆمەڵگای رۆژاوادا روو دەدەن بەرادەیەكی كەمتر نا بەڵكو بەرادەیەكی زیاتر دەسەڵاتخوازین".

قسەكردنیشی لەسەر دەسەڵات و مردن بێهوودە نەبوو وەك ئەوەی لەمیانەی كتێبی (سانسۆرو سزا)و (لەساڵانی باروودا) ئەنجامیداو هەروەها ئەو بزاڤە پرۆلیتارییە مەتریاڵیستە چەپڕەوەی فۆكۆ شوێنی كەوت و دواتر لەسەرەتای حەفتاكاندا بەسەر چەندین رێبازدا پەرتەوازە بوو كەناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە لەسەر ئەوەی شوێن كام سیمبول بكەون لەنێوان سیمبولی ئیتاڵیایی و سیمبولی تیرۆریستانەی ئەڵمانیایی و دەستكردن بەكوشتنی خەڵك، (بینی لیڤی)ی سەركردەی ئەم سیمبولەیش پێی وەهابوو كەرادیكاڵانەترین رێبازی گرتۆتەبەر بەوەی داوای دامەزراندنی دادگایەكی ئاشكرای كردووە بۆ (دوژمنانی گەل)، بەڵام فۆكۆ كەئەوكات لەكۆلیژی دی فرانس پرۆفیسۆر بوو لەمشتومڕێكی بەناوبانگدا بەزاندی بەوەی ئەو جۆرە یاساڕێژییە دادگەراییەی بەتەڵەیەكی بۆرژواكرد شوبهاند، هەروەك گاڵتەجاڕانە دەپرسێت: ئەی بۆ شێوەی سزادانی هەڕەمەكییانە نەگرێتەخۆو سەرە بڕدراوەكان بەنووكی رمەكاندا هەڵنەواسرێن؟ بەوەیش بەرامبەرەكەی رەش داگەڕاندو بێدەنگ كرد، خەڵكانێكی كەم بڕوایان بەوە هەبوو فۆكۆ لەدڵەوە ئەو قسانەی كردبێت، نەعووم چۆمسكی-ی چەپڕەوی ئەمریكاییش لەساڵی 1971دا لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی هۆڵەندا چۆیە مشتومڕێكەوە لەگەڵ فۆكۆو بەرگریی بەرامبەرە فەرەنساییەكەی لەئەنجامدانی رێوشوێنی سزادانی ئاشكرا سەرسامی كرد كەمژدەی هاتنی دەسەڵاتێكی دەدا توندوتیژو دكتاتۆر، بگرە خوێنڕێژ، دوابەدوای ئەو شۆڕشەی كەدێت و هەموو



ئـەو شـتانە رەتدەداتـەوە کـەئاماژە بـەپێوەرەکانی دادپـەروەریو یاسا دەدەن "مەبەسـتم ئەوەیـە خـۆم وەك کەسـێك پێـی سەرسـامم" چۆمسـکی دواتـر ئەمەی بە(میللـەر)ی نـەرمو نیان گـوت، "بـەڵام وەها دەهاتە بەرچاوم کەلەهەمان رەگەزی ئێمە نەبێت یان شتێکی لەو بابەتە".

ئەمـە بێگومـانی ورە دەدات بەخوێنـەرانی (میللـەر) کەچـۆن ئـەو کەسـە زاتییـە نیتچـەییە بـێ پەردەیە دەخوێنێتەوە کەئەندێشە تاریکەکانی خۆی تێکـەڵ بەسیاسـەتەکانی سـەردەم دەکـات، بـەڵام میللـەر لـەوەدا راسـت بـوو کـەپێی دادەگـرت لەسـەر دەرخسـتنی کتێبـە زۆر کاریگـەرەکانی ئـەو لـەو دەمەدا، بەتایبەتیش (سانسـۆرو سـزا)، بەشێوەیەك کەپڕن لەتوندوتیـژیو سادۆماسۆشیستی.. زانینی دەرهاویشتەکانی ئەو کتێبـەیش کارێکی دژواربوو بەتایبـەت دەرهاویشـتەکانی لێکۆڵینەوەکـەی فۆکـۆ لەسـەر گرووپـی رادیکـاڵی ریفۆرمخـوازی لەزیندانەکانـدا، ئـەو خـاڵی سـەرەکی مشـتومڕەیش کـەدەیورووژێنێ (کەدەسـەڵاتی کۆمەڵایـەتیی نـوێ زیاتر فریودەرانەیە چونکە خشکییانەیەو توندوتیژ نییـە) لای هـەموو ئـەو کەسـانە ئاشـکرابوو کەشـتێکیان لـەبارەی لێبـوردەیی بەرامبـەر سەرکوتکردنی کۆمەڵایەتی بیستبوو. فۆکۆ بـەدوور لەپەنابردنەبـەر سـایەی جیاوازییـەکان یـان گاڵتـە بـەخۆکردن کەخەسـڵەتی یەکـەمین کارەکـانی بـوو، تـاوتوێی ئـەم بیرۆکەیـەی کـرد. ئـەوەتا هـەر لەگـەڵ یەکـەمین ئـەو لاپەڕانـەی کتێبەکـەی پـێ دەسـت پێـدەکات کەبەدرێژادڕییـەکی ترسـناك وەسـفی پێسـت دامـاڵینی ئـەو کەسـانە دەکـات کەلەهـەوڵی کوشـتنی شـادا بەشـدارییان کـردووەو چـۆن کـراون بەچوار پارچەوە، خوێنەر هەست بەچێژێکی گـەورە دەکـات لـەبینینی خـوێنو توندوتیـژیی جەسـتەیی، کەئـەو بینینـە لەگـەڵ هەوڵـەکانی مـل پێکەچکردنی دامـەزراوەکانی ژیـانی هاوچـەرخدا دەگونجێـت کەلەبـەر دەسـەڵاتی ئیبلیسـدا بێتوانایـە. پێشـمان دەڵێـت کـەلاوازکردنی سانسـۆری کۆمەڵایـەتیو ملکەچـکردنی لەبـەردەم سانسـۆری نێودەوڵەتیـدا جێگـەی داخـە، لەبـەر ئـەوەنا کەدەسـەڵاتی ئـەم بێکۆتایە، دەسەڵات لەهەموو جێگەیەکدا هـەر هەیە، بـەڵکو لەبەرئـەوەی دەسـەڵات بەسـەر جەسـتەدا لادەباتو دەیخاتە سەر رۆح.

(سانسۆرو سزا)یش زاخاو نـەدراوترین کتێبـی فۆکـۆ-یـە، بـەڵام کاریگەرترینیانـە لەئـەمریکادا، چـونکە ئلماعـەکانی بـۆ (دەسـەڵاتی رووپۆشـدار) لەگەڵ شێوازی شێتگیریی مەزنیدا (جنون العظمـە)دا دەگونجێـت کەخەسـڵەتی کایـەی سیاسـیی ئەمریکاییـە، لەراستیشـدا میللـەر بەجیددیـەتێکی زۆرەوە لەوە دەتوێژێتەوە. هەرچی فەڕەنسایە، ئەوە لەوێ بەدەمەوەچوونی کتێبەکە جیاواز بوو، چونکە وێـڕای دەرکـەوتنی لێکۆڵینـەوەی رەخنەگرانـەی دوورودرێـژو بـاش کەلەگـەڵ دەرچـوونی کتێبەکـەدا سـاڵی 1975 نرخـی بۆچـوونەکەی فۆکـۆ-یـان دەزانی، بەڵام کتێبێکی تـر لەهـەمان ساڵدا (1975) دەرچـوو کەئـەمیان زیـاتر کـاری کـردە جـەماوەری رۆشـنبیر ئـەویش (ئەرخـەبیلی مـەزن)ی سۆلجنتیسـن-ی نووسـەری روسـیایی بـوو، جیاوازیی نێوان ئەو دوو کتێبە زۆر زۆر بوو، لەگەڵ ئەوەیشـدا لـەو کاریگەرییـەی کـەم کـردەوە کـەفۆکۆ پێشـبینیی دەکـرد کتێبەکـەی خـۆی لەفەڕەنسـا هەیبێت. بەرامبـەر ئـەو وەسفکردنە زۆر پێویستەی ئەشکەنجەی جەسـتەییو دەروونـی سیسـتمێکیش کەزۆربـەی فەڕەنسـاییەکان بەپێشـەنگی گەشـەی کۆمەڵایـەتیی دەزانن، سـەلماندنی ئـەوەی پۆلـەکانی وانـە خوێنـدن لـەرۆژاوادا زینـدانو هێشـتایش پەسەندنو لەگەڵ ئارەزووی زۆر کەسدا دەگونجێن، کـارێکی دژوار بـوو. ماوەیـەکی کـەم دوای ئـەوە دانیشـتوانی زۆنگاوەکـان کەوتنـە بەجێهێشـتنی ڤێتنـامو کـەمبۆجیاو سـاڵانێکی کـەمی دواتـر کەڵـە





رۆشنبیرەکانی فەڕەنسا جاڕی ئەوەیاندا کەدژی هەر شتێکن پەیوەندیی بەمارکسیزمەوە هەبێت، فۆکۆ-یش کەتائەوکات وەها راهاتبوو خەڵك بەپەشۆکاییەوە بخاتە پێکەنین و کاتێك بەگاڵتەجاڕییەوە قسەی لەبارەی توندوتیژی و ئازارەوە دەکرد مەبەست حەشار بدات، چیدی توانای خەڵك خستنە پێکەنینی نەما.

ئەو گۆڕانکارییە خێرایەی بەسەر ئاقاری سیاسیدا هات لەکایەی رۆشنبیراندا، ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی رابردوو، بەتایبەت لەفەڕەنسا، کاریگەریی قووڵی کردەسەر فۆکۆ، زیاتر لەوەیش کەمیللەرو ئیربۆرن باسی دەکەن، هۆیەکەیش ئەوەیە کەفۆکۆ هەرگیز سەرکردەیەکی سیاسی نەبووە، ئەو لەوانەبوو کەفەڕەنساییەکان پێیان دەگوتن (ئیقتیفاییەکان)، ئەوەتا لەپیاهەڵدانی ستالینیزمەوە لەپەنجاکاندا باز دەدات بۆ چالاکی نواندن لەریزی گرووپی (پرۆلیتارە چەپڕەوەکان) لەحەفتاکاندا، ئەو دوای جەماوەری فەڕەنسا کەوتبوو (ئەو جەماوەرەی هێندە داخراوە نکۆڵی لێناکرێ).

ئێستایش و دوای ئەوەی جەماوەری فەڕەنسایی ئاقاری خۆی گۆڕی، فۆکۆ هەر ئەوە نەبوو خۆی لەسەر ئاستی سیاسی بەپەشۆکاوی بدۆزێتەوە، بەڵکو دیاربوو شێواوی خۆی گەیاندە قووڵایی هزریشییەوە، کاتێکیش لەساڵی 1977دا کتێبی (بیروباوەڕی مامۆستایان)ی ئەندرێ گلکیسمان-ی کۆنە ماوی بڵاوبووە فۆکۆ خوێندنەوەیەکی بۆ کرد کەتیایدا هێرشی کردەسەر، ئەگەرچی کتێبەکە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ کارێکی خودی فۆکۆی لەخۆگرتبوو، هەر خێرایش هەست بەوەکرا کەلەو وانانەی لەکۆلیژی دی فڕانسدا دەیگوتنەوە لەتوێژینەوەی پەراوێزە کۆمەڵایەتییەکان هەڵگەڕایەوەو خوویدایە بەدواداچوونی پرسیارە کلاسیکییەکانی فەلسەفەو هانی قوتابیانی دەدا کاری خەڵکانێکی نەناسراوی وەك حایەك و فۆن ملیسیس بخوێننەوە، بەپێچەوانەی ئەوەیشەوە هەڵمەتەکانی بۆ ناو دنیای سیاسەت هەر بەردەوام بوو، جارێك لەخۆپیشاندانێکدا بۆ پشتگیری کردن لەبرایەتی و جارێکی تر بۆ پشتگیریکردن لەخومەینی-ی ئێران (ئەگەرچی خومەینی کەسانی شازو پێشێلکەرانی یاساو دابە کۆمەڵایەتییەکانی تری لەسێدارە دەدا)، بەڵام وردە وردە هیوای بەوە نەما لەپاشەڕۆژێکی نزیك یان هیچ نەبێت پەسەندا لەرێی پێشێلکردنەوە گۆڕانکاری بەرپا ببێت.

رەنگە هەندێك وەهای بۆ بچن کەئەم گۆڕانە لەکاری فۆکۆ-دا تەنها لایەنێکی هەلپەرستانەی دەردەخەن، یان سواربوونی شەپۆلی بایەخدانی نوێی فەڕەنساییەکانە بەئازادی و مافەکانی مرۆڤ، ئەمڕۆیش ژمارەیەکی بەرچاوی فەڕەنساییەکان ئەم بۆچوونەیان هەیە لەبارەی فۆکۆ. بەڵام ئەگەر بەپشت بەستن بەمیللەر بگەڕێینەوە بۆ سەرگوزشتەی ژیانی دەبینین فۆکۆ لەراستیدا دەگەڕایەوە بۆ ئەرکە راستەقینەکەی کەلێکۆڵینەوەیە لەئەخلاق. چونکە بایەخدان بەسیاسەت جارێکی تر لەلای دەبوو بەبایەخدانێکی تایبەتی و تاکەکەسی، پێدەچێت ئەمجارەشیان هاندەرەکەی کالیفۆرنیا بووبێت کەلەحەفتاکانەوە زوو زوو سەردانی دەکرد، کەلەوێ زۆر خەڵکی شازو سادۆ-ماشۆسی دەبینی لەنێو کۆڕوکۆمەڵی نیمچەرۆشنبیرەکاندا، وەك ئەوەی خەیاڵە سادییە پێشێلکارییەکانی لەناکاو بووبن بەراستی کۆمەڵایەتی "ئەوانەی ژیانێکی سێکسی بەبێ گوێ پێدان بەسەر دەبەن نغرۆ لەمادەسڕکەرەکان، خەڵکانێکن ئەقڵ نایانبڕێت".

ئەوەبوو وەهمی گۆڕینی کۆمەڵگای فەڕەنسایی بەتەواوی بەجێهێشت، ئێستایش دەیبینین دەخزێتە نێو کۆمەڵگایەکی بچووکترەوە لەکەسانێك

کەلەهەمان ئاستی ژێریی خۆیدان و لەرووی ئارەزووکردنی ئازارو توندوتیژییەوە بەدوور لەکۆت و بەندەکانی بۆرژوازییەت و تەحەفوزەکانی، لەرووی کاریی فیکریشەوە گەڕایەوە بۆ (سیمە)کەی کەلەیەکەمین کتێبەکانیدا گەڵاڵەی دەکرد: ئەمە ئەخلاقیاتی سێکسییە، میللەر تەقەللایەکی بێوێنەی دا بۆ مانابەخشین بەدواهەمین دەساڵی ژیانی فۆکۆ، ئەویش بەمامەڵەکردنی ئیکتیشافە سێکسییەکانی، لەرووی هزرو مومارەسەوە، وەك دوو بابەتی پێکەوە گرێدراو، لەمەیشدا حەتمەن دروست بوو بەڵام بەشێواوی بابەتەکەی بیناکردبوو، چونکە نەیدەتوانی بەشێوەیەکی سەنگین باس لەسێکس بکات، لەم رووەیشەوە سیمبوڵی ئەمریکایی بەرجەستە دەکرد کەتێکەڵییەکە لەنێوان سەرەڕۆیی و حیشمەت، ئەوەتا بۆ نموونە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کەگەڕانەوەی فۆکۆ بۆ ناو هەلومەرجی باو لەرێی دانیشتنێکی موکاشەفەی دەروونی-سێکسییەوە بووە، لەمیانەی گەشتێکدا کەلەپەخشانێکدا رووداوەکانی دەگێڕێتەوەو پەخشانەکە دەکاتە دیاری بۆ تیرێزا-ی پاکیزە. لەلایەکی ترەوە سوورە لەسەر ئەوەی وەها دەرنەکەوێ کەجێگەی بایەخ بێت یان وەك پێشێلکەرێکی هەستیارییە سیاسییەکان دەربکەوێت، بەرادەیەك کەچەند جار داوای لێبوردن دەکات لەوەی قسە لەسەر ئارەزووەکانی فۆکۆ دەکات، دواجاریش میللەر لەژێر کاریگەریی ئەم دوو ئاقارەدا پێنج لاپەڕە تەرخان دەکات بۆ لێکۆڵینەوەیەکی وردی مومارەسە سادۆ-ماسۆشییە باوەکان و زۆر بێلایەنانەو شیکارییانە باسیان لێوە دەکات، هەموو ئەوەیش بۆ ئەوەی متمانەی ئێمە بگێڕێتەوە بۆ ئەو بنەما بنەڕەتییەی باشترین لێکۆڵینەوەکانی دەروونناسی کاری لەسەر دەکەن و دەڵێت "ئارەزوومەندانی شەڕەگا هەموویان چونیەکن" وەك هەر چینێکی کۆمەڵ (ئەمە لەکتێبێکی فۆکۆ-دا هاتووە)ئیدی زۆر سەرکەوتووە لەوەدا کەروخسارێك ببەخشێتە هەڵوێستی بۆرژوازییەت بەرامبەر پەیوەندییە سادۆ-ماسۆشییەکان کەلەگەڵ کاتدا جوانتر ببێت، تائەوەی پرسیار لەوە بکرێ کەچی فۆکۆ-ی جووڵاندووە لێیی بکۆڵێتەوە.رەنگیشە کارکردن لەژێرزەمینی کتێبخانە گشتییەکاندا جۆرێك لەرەنجکێشان و سزا بێت، بەڵام لای فۆکۆ بەزاندنی بەربەستێکی لەگۆشت و خوێن دروستکراو پێشێلکاریی حورماتەو هیچی تر.

میللەر باشترین کاتێك قسە لەسەر نووسینەکانی فۆکۆ دەکات لەو قۆناغەدا رێنومایە، بەیارمەتیی ئەویش دەتوانین کتێبەکەی فۆکۆ (مێژووی سێکس) کەخەڵك باش لێی تێناگەن بخەینە دووتوێی پرۆژەکەی لەلێکۆڵینەوەی ئەخلاقیدا. جەڵدی یەکەمیش (ویستی مەعریفە) کەلەساڵی 1976 دەرچوو لەمەڕ دۆخی (سانسۆڕو سزا) خۆی بوو، بونیادی کۆمەڵایەتیی ناسنامەو پیوەرگیری رەفتار بەپێی زانیارییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، دوو جەڵدەکەی کەتارۆژی مردنی لەساڵی 1984دا چاپ نەکران لەنووسینە سیاسییەکانی تایبەتمەندتر بوون، لەهەندێك روویشەوە بەهیچ شێوەیەك لەهیچ کتێبێکی تری ناچن، سەری پاشکەوتوەکانیشی سوڕماند کاتێك بینییان سەدەی نۆزدە بەجێ دەهێڵێت و روو دەکاتە گریکی کۆن، ئەو لایەنگرانەیشی کەزیاتر مەیلەو سیاسەت بوون ئەمەیان بەکارێکی شڵەژێنەر دانا و کەکارێکە لەوەی دوور دەخاتەوە کەلەیەکەمین کتێبەکانیدا لەسەری راهاتووە، لەکاتێکدا زۆربەی لێکەڵەرەوە کلاسیکییەکان پەسەندیان نەکردن بەو پێیەی کارامەییان تێدا بەکار نەهێنراوە. لەوەیش دەچێت هیچ کام لەو دوو گرووپە پەییان بەوە نەبردبێت کەفۆکۆ لەبەر هۆگەلێکی تەواو تایبەتی رووی بەرەو گریك وەرچەرخاندبێت و کەئەویش وەك



نیچەی مامۆستای لەبەرزییەوە بنەماگەلێك دەخولقێنێت دوور لەنەریتی خۆی.

دەیشتوانرێ نیشانەكانی ئەو ئاقارە تایبەتییە نوێیەی روونتر لەپێشەكی كتێبی (داب و چێژ)دا ببیندرێ كەجەڵدی دووهەمی مێژووە، وێڕای ئەو هەوڵە زۆرەی فۆكۆ-یش بۆ هەرچۆن دروستكردنی پەیوەندییەك لەگەڵ ڕێبازی كتێبە سیاسییەكانیدا وەك (سانسۆر وسزا) بەڵام جیاوازییەكان زۆر مەزن بوون. چونكە لەكاتێكدا ئەو كتێبانەدا هەستێكیان دەبەخشی كەبابەتی ئەخلاقی تەنها دیاردەیەكی زمان و دەسەڵاتە و سەربەخۆ نییە، كەچی فۆكۆ لافی ئەوە لێدەدا كەلای ئەو بابەتە ئەو ستراتیژانەی دۆزیوەتەوە كەیارمەتیی بابەتەكەیان داوە خۆی لەخۆیدا گەلاڵە بێت و ئەمەیش جۆرێك لەسەربەستیی ئەخلاقی لەخۆدەگرێ، ئەگەرچی ئەو پێی خۆشە ناوی بنێت (هیرمۆنتیكای خود)، بەم سەربەستییەیش، ئیدی چەند سنووردایش بێت، پێدەچێت ئێستا مرۆڤ (واتە فۆكۆ) بتوانێت هەڵوێستی هزری خۆی لەمەڕ مەسەلەی ئەخلاق لەڕێی ستاتیكای هەموو بوونەوەرەكانەوە پەرە پێبدات. ئەی ئەو ئازادبوونە لەچی؟ دیارە لەجەبرییەتی ڕەهای سیاسی، ئەی بۆچی؟ ئەمە ئەوەیە كەدەبێت بیزانین.

ئەخلاقییاتی ستاتیكیش لەمێژووی نیچەییدا شتێكی نوێ نییە، بەڵام بەپشت بەستن بەمیللەر دەبینین كەئەخلاقە تایبەتییەكانی فۆكۆ بەش بەشن و بەگژ یەكدا دەچنەوە، فۆكۆ لەلێكۆڵینەوەكانیدا ئاوێنەی ئەو میانرەوییەیە كەلەدنیای هیلینیدا هەستی پێكردووە ناوی دەنێت (ئەندێشەی خود) یان (پاشەكەوتكردنی چێژ)، كەچی بەردەوامیش بەنهێنی كالفۆڕنیا تەی دەكات وەك نەوسنێك بیەوێت دیمەنە سێكسییەكەی بخاتەروو، خۆیشی دەخاتە مەترسیی ئەوەی نغرۆی جیهانە وێرانكەرەكەی بێت. پرسیارەكەیش بەكراوەیی دەمێنێتەوە، ئایا فۆكۆ دەیزانی كەئەزموونە تایبەتییەكەی خەریكە بچێتە بازنەی نەخۆشیی درمەوە. ، میللەر هیچ هەوڵی ئەوە نادات وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، ئەوەیشمان وەبیر دەهێنێتەوە كەخەڵك درەنگ بەمەترسیی نەخۆشیی ئایدزیان زانی لەسەرەتای هەشتاكاندا، ساردترین ساتەكانی كتێبەكەیش ئەوەیە كەمیللەر تیایدا گومانەكانی فۆكۆ دەگێڕێتەوە لەو بەڵگە زانستییانەی مەترسیی ئەم نەخۆشییەیان دەردەخست تائەو رادەیەی خوێنەر هەستی بەمووچڕكێك دەكرد لەكاتی خوێندنەوەیاندا.

فۆكۆ دەست دەكات بەرەخنەگرتن لەكۆمەڵەكانی نێربازان كەبەدوای دامەزراوەی تەندروستیدا دەگەڕان تا یارمەتییان بدات وەك ئەوەی هاوڕێیەكی خەڵكی سان فڕانسیسكۆی باسی دەكات. لەساڵی 1983یشدا كەباری تەندروستیی بەرەو خراپی ملی نا، ساڵێك بەر لەمردنی، كەوتە گەڕان بەو یانەو گەرماوانەی دەرگایان لەنێربازان دەكردەوە، بەگاڵتەجاڕیشەوە بەهەر بیرۆكەیەك پێدەكەنی لەمەڕ (سەلامەتیی سێكسی)و دەگێڕنەوە دەیگوت "چ شتێك لەوە خۆشترە لەحەزی مندالان -لووسكەلان-دا مرۆڤ بمرێت".

میللەر ئەم وتانە وەها وەردەگرێت كەگوزارشتن لەئارەزووی فۆكۆ لەخودكوژی، ژیارنەترین لێكدانەوەیش ئەوەیە كەگومانەكانی لەچارەسەرییە ناوەناوەكانی نەخۆشی و بایەخی پزیشكی وەهایان لێكردبێت گوێ بەچارەنووسی بایۆلۆژی و لێكدانەوە كۆمەڵایەتییەكانی نەدات، چونكە ئەگەر مرۆڤ باوەڕی بەوە هێنا كەدەسەڵاتی كۆمەڵایەتی هەموو چارەسەرییەكانی پەیوەست بەنەخۆشی داهێناوە، ئەوە خۆ هەر خۆی دەتوانێت لەرووی ستاتیكەوە دژەی ئەو چارەسەرییانەیش دابهێنێت، ئەوسا ئاسانە بڕوا بەوە بهێنین

کەبەرەنگارییەکی نەخۆشی بەجۆرێك لەجۆرەکان بوونی هەیە، بەڵام فۆکۆ بەرەنگاریی نەبوو، میللەر ئەوەیش بەموفارەقە دەبینێت کەئەم فەیلەسووفە بەئایدز بمرێتو لەهەمان ئەو نەخۆشخانەیەدا چارەسەر بکرێت کەوانەی (شێتیو گالتەجاڕی)ی تێدا دەگوتەوە.

فۆکۆ ئەگەر زیندوو بوایە چیی دەنووسییەوە؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کەدەمێنیتەوە دوای خوێندنەوەی کتێبەکەی جێمس میللەر (لێهاتوو)، دەتوانین لەوە دڵنیا بین کەگەشەی بەرێبازێکی نوێ نەدەدا بۆ لێکۆڵینەوە لەمێژوو، چونکە هیچ رێبازێکی هاوشێوە نییە بەهیچ شێوەیەك کەخەڵکانی دی بتوانن بیگرنەبەر، ئەوە تاکە جێدەستێکە کەبیریارێکی بێوێنە جێی هێشتووە لەکاتێکدا بەدوای رێگای خۆیدا ویڵ بوو. هەروەك مرۆڤ ناتوانێ ئەوە بێنێتە بەرچاوی خۆی کەهەڵمەتێکی نوێ بکات بۆ ناو کایەی سیاسی وەك ئەوەی کردی. وەك ئەو دواتر دەیبینێ پەیوەندییە سیاسییەکانی فۆکۆ بێگومان ئاڵۆز بوون، بەڵام ئارەزووی بەرەو گریك ئاڵۆز نەبوو، بەڵکو سەرەتای شتێکی نوێو جیددی بوو، ئیدی تەنها دەتوانین ئەوە بقەبڵێنین کەئەگەر بەردەوام بوایە لەلێکۆڵینەوە لەم رووەوە دەیتوانی چی لەبارەی خۆیەوە بدۆزێتەوە.

لەدواهەمین وانەیدا فۆکۆ دەڵێت "بەدایۆجینس کەبڕوای بەفەلسەفەی کەلبی هەیەو بەهەڵوێستی گاڵتەجاڕانەی بەرامبەر ژیان سەرسامە، پتر لەوەی بەسۆکرات سەرسام بێت، چونکە دایۆجینس فەیلەسووفێك بوو شەرمی لێ نەدەهات لەو مومارەسە سێکسییەی لەگۆڕپانی گشتیی شاری ئاتن-دا پێی هەڵدەسا". ئەگەر لەلایەنی ستاتیکیشەوە حوکم بەسەر ئەم قسەیەدا بدەین ئەوە دەڵێین ئەمە ناواخنی ئاشکرا دەکات. بەڵام ئەگەر فۆکۆ بایی ئەوەندە بمایەتەوە زۆر بیی لەستاتیکا بەرامبەرەکانی سۆکرات دەکردەوە (ئەندێشەو خود) کەپێشێلکاری تێکەڵ بەئازادی یان چێژ تێکەڵ بەبەختەوەری ناکاتو کەتەنانەت چێژی جەستەییش لەلای ئەو بەبێ رۆڵی هزرو میانەرەوی مومکین نییە، ئەم جۆرە میانەڕەوییەش ئەخلاقیاتی بۆرژوازی نییە، هەروەك بەهیچ شێوەیەك بۆ ئەو ئەخلاقییاتە ناگەڕێتەوە. رەنگیشە پرسیار بکرێ: ئایا فۆکۆ لەمیانەی راکردنیدا بەدوای بەختەوەریی راستەقینەدا خۆی وەها نەبینیوە کەلەو دیوی (ئەو دیوی خێرو شەڕ)دا بێتو.. کەلەو دیوی خودی نیچە-یشەوە بێت؟

**سەرچاوە**

رۆژنامەی (الصباح) 2004/8/4.

# فەلسەفەی ڕۆشنگەری لە نێوان کانت و فۆکۆدا

**سولەیمان بەختی**

**لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد**




تێکستەکانی کتێبی "ڕۆشنگەری چییە" (کە لە ساڵی 2002 لە دار الانوار چاپکراوە) گرفتی ڕۆشنگەری، بە پێی بۆچوونی پێشەنگانی ڕۆشنگەریی ڕەخنەگرانە لە چەرخی نوێدا، چارەسەر دەکات. ئەم کتێبە تێکستێکی کانت لە خۆ دەگرێت کە یوسف سدیق و جەمیل قاسم وەریانگێڕاوە، دوای ئەوە تێکستێکی میشێل فۆکۆ دێت کە بریتییە لە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی تێکستەکەی کانت و ئەمیشیان شەربل داغر وەریگێڕاوە. جەمیل قاسم پێشەکییەکی بۆ کتێبەکە نوسیوە لە بارەی بابەتی ڕۆشنگەری و چوارچێوە مێژوویی و فیکرییەکەی و هەروەها ئەو پرسیارەی کانت دەیخاتە ڕوو: ڕۆشنگەری چییە؟

کانت وەڵامی ئەم پرسیارە لە دەرچوونی مرۆڤ لە کۆشکەکان و لە دۆخی بێتوانایی بەکارهێنانی فیکردا دەدۆزێتەوە، ئەمە بانگەشەیەکە بۆ بەکارهێنانی بوێرانە و سەربەخۆیانەی فیکر "با ئازایەتییەکی وات تیادا بێت خۆت فیکری خۆت بەکاربهێنیت: ئەمەیە دروشمی چەرخی ڕۆشنگەری" (ل 30)، بەڵام لە نێوان مرۆڤ و ئەو سیفەتەدا مەودایەك هەیە. کەواتە مەرجە داواکراوەکان سەبارەت بە ڕۆشنگەری، چییە؟

کانت پێیوایە جگە لە ئازادی بە مانا هەرە بێگەردەکەی، شتێکی تر داواکراو نییە، واتە ئەو شتەی ڕێگە دەدات ئەقڵ بە ئاشکراو لە هەموو بوارەکاندا بەکاربهێنرێت. سەرباری ئەمە، کانت جیاوازییەك لە نێوان بەکارهێنانی گشتیی ئەقڵ و بەکارهێنانی تایبەتیدا دادەنێت. بەکارهێنانی گشتیی ئەقڵ بریتییە لەو کارەی مرۆڤ – ئەو کاتەی زانایە – ئەنجامی دەدات بە ئاراستەی جەماوەرێك

که دەخوێنێتەوە، کەچی بەکارهێنانی تایبەتی ئەقڵ پتر تەرکیز دەکاتە سەر پرۆسیسەکردن و کارپێکردنی ئەقڵ لە شوێنگەیەکی مەدەنیدا، لە نێوان گشتی و تایبەتیشدا، پەیوەندیی کۆمەڵگە بە دەسەڵاتەوە دەردەکەوێت، کانت وایدەبینێ ئەم پەیوەندییە لەسەر پەیمانێك دادەمەزرێ، بەردی بناغەی ئەم پەیوەندییەش لەبەرژەوەندیی میللەتدا لە فۆرمێکی یاساییدا بەرجەستە دەبێت و هەروەها لە داڕشتنی ئەم پرسیارەشدا: "ئایا ئەو میللەتە رازییە خۆی بەیاسایەکی لەو چەشنە بسپێرێت؟"، ئەمە بوارێك بۆ بۆچوونی جیاواز و بۆ رەخنە و بۆ تێبینی لە بارەی کەموکورتییەکان دەکاتەوە و ئەمەیش دەروازەیەك بۆ گۆڕانکاری دەکاتەوە. بێئەوەی ناوی بهێنێت. لە ئاستی خودیشدا دەبینین کانت پشتگیریی دەسەڵات و فریدریکی پاشا دەکات و بە "رۆشنگەر" ناوی دەبات و دروشمەکەی بەم شێوەیە دادەڕێژێت: "بیربکەنەوە بەڵام قایل و گوێ رایەڵیش بن".

پاشان کانت ئەم پرسیارە دەکات: "ئایا ئەمڕۆ لە چەرخی رۆشنگەریدا دەژیین؟" وەڵامی ئەم پرسیارە مەرجدارە بە چەند رەگەزێك – ئەگەر چی بەرەو رۆشنگەری دەچین – کە خەڵکی بەرەو ئەوە دەبەن بیرکردنەوەی تایبەتیی خۆیان لەکاروباری ئاینیدا پرۆسە بکەن و بە ئیرادە و تواناوە ئەو پرۆسەیە ئەنجام بدەن بەبێ پەنابردن بۆ یارمەتیی ئەوانیدی. لە دێری کۆتاییشدا کێشەی رۆشنگەری لەلای کانت پابەندی ئەقڵ و ئازادییە. مەیلی مرۆڤیش بۆ بیری ئازاد کاردەکاتە سەر بنەماکانی فەرمانڕەوایی کە پێیوایە بەرژەوەندیی فەرمانڕەوا لەوەدایە بەپێی ماف و کەرامەت و تواناکان رەفتار لەگەڵ مرۆڤدا بکات نەك وەکو ئامێرێك مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

سائەگەر ئەمە لەساڵی 1784دا وەڵامی کانت بوبێت بۆ پرسیاری "رۆشنگەری چییە؟"، ئاخۆ بەدواداچوونی بیریار و فەیلەسوفێکی نوێی وەکو میشێل فۆکۆ، لە بارەی ئەم مەسەلەیە، چی بێت؟

فۆکۆ وایدەبینێ بیرکردنەوە، لە دەرکەوتەی هەنوکەیی و لە لێکۆڵینەوەیدا، سێ فۆرمی سەرەکی وەردەگرێت: یەکەم – لە نواندنی "ئێستا" بە سیفەتی ئەوەی بەشێکە لە چەرخێك لەم جیهانەدا، دووەم – لە لێپرسینەوەی "ئێستا" بۆ دەرخستنی نیشانەکانی لە چەشنێك لە هیرمینۆتیکیی مێژوویی‌دا، سێیەم – لە لێکۆڵینەوەی "ئێستا"دا وەك خاڵی گواستنەوە بەرەو هەڵهاتنی جیهانێکی نوێ.

فۆکۆ لە بارەی چەندین کێشە پرسیار لە کانت دەکات و رۆشنگەریی کانت دەخاتە ژێر پرسیارەوە، بە تایبەتی لە بارەی کێشەی جیاوازی و ئەو دەریچەیەی رۆشنگەری جیادەکاتەوە و هەروەها لە بارەی ئەو دوو مەرجەی کانت بۆ جیاکردنەوەی نێوان وزە و ئەقڵ لە "تایبەتی" و "گشتیدا" دایناوە.

فۆکۆ لە بەدواداچونەکەیدا دەگاتە کێشەی مۆدێرنەو دەپرسێت: ئایا مۆدێرنە تەواوکەری رۆشنگەرییە یاخود پێشکەوتنی رۆشنگەرییە؟ بە پشتبەستن بە تێکستەکەی کانت، پێیوایە مۆدێرنە پتر هەڵوێستێکە وەك لەوەی قۆناغێکی مێژوویی بێت، لێرەدا فۆکۆ دەمانباتە سەر تازەگەریی بۆدلێر بەو پێیەی ئەمە هوشیارییەکە زەمەن دەبڕێت و دابڕانێکە لەگەڵ لاساییکردنەوەدا، کۆششێکە بۆ ئەوەی "ئێستا" بکات بە پاڵەوان، فۆکۆ بە جۆرێك وەسفی تازەگەریی بۆدلێری دەکات کە ئەمە راهێنانێکە رووبەڕووی واقیع دەبێتەوە و دەبێ لێرەدا پرۆسەیەکی ئازاد ئەنجام بدرێت، واتە چەند رێزی واقیع دەگرێت ئەوەندەش زەوتی دەکات (ل 62) یان دەشێت مرۆڤی نوێ ناچار بکات ئەرکی گەڵاڵەکردنی خودی خۆی جێبەجێ بکات. فۆکۆ وایدەبینێ ئەم مەسەلەیە پێویستی بە زنجیرەیەك




لێپرسینەوەی وردی مێژوویی هەیە کە بەرەو سنورە هەنوکەییەکانی "پێویستی" دەچێت. پاشان خودی خۆمان بخەینە سەر مەحەکی واقیع و ڕووداوەکان لە پێناوی بینینی خاڵەکانی گۆڕان و فۆرمەکانی ئەو گۆڕانە.

ئێمە لە بەرامبەر دوو تێکستی دوو بیریاری گەورەداین کە هەڵوێستێکی فەلسەفی تۆکمەیان تیادا دەبینیین. کانت تێکستەکەی خۆی بە ئەقڵ یان ئەقلانییەت و ئازادی گرێ دەدات، هەروەها بە ئیرادەی دەسەڵاتی کۆشکی پاشا فریدریکی "ڕۆشنگەر"، لە کاتێکدا فۆکۆ لە ئاستی ئیپستیم و جیاوازی و گۆڕانکاری و مۆدێرنەدا دەوەستێت.

لە نێوان کانت و فۆکۆدا، ئێمە لە بەرامبەر چێژی بیری فەلسەفیی بەراوردکاریداین (ئەگەر بشێ ئەو دەستەواژەیە بەکاربهێنین)، ئێمە لە بەرامبەر دوو زەمەن و دوو تێکست و دوو قۆناغداین، دەبینین تا چ ئەندازەیەك بیر و مانا و چەمکەکان لە یەکتر نزیك دەبنەوە، تا چ ئەندازەیەك پێشدەکەون و کارلێك دەکەن تا دواجار برژێنە ناو پرەنسیپی سەرتاپاگیری هیومانیستی و ڕەهەندەکانیەوە، هەروەها برژێنە ناو زیادکردنە فیکرییەکان و، بۆ ناو گەشتێك لە ئەقڵ و ئازادییەوە بەرەو ئیرادەی مەعریفە، بێگومان لە سیاقێکی گەورەی ڕۆشنگەریدا. لە کۆتاییدا ئاماژە بۆ پێشەکییەکەی قاسم دەکەین کە جەخت دەکاتە سەر ڕۆشنگەری و ڕێنیسانس و ریفۆرمی ئایینی وەك سێ بنەمای سەرەکیی مۆدێرنە، هەوڵیداوە ئەم مەسەلەیە لە گۆشەی واقیعی عەرەبی نزیك بکاتەوە. بیرۆکەی ئەم کتێبە بیرۆکەیەکی ڕەسەن و قووڵە ئەگەرچی تەنها لە 74 لاپەڕەی قەوارە بچووك پێك دێت.

بەڵام دوو تێبینیم لە شێوەی کتێبەکەدا هەیە، یەکەم: دەبوایە مێژووی دەرچوونی کتێبەکەو سەرچاوەی هەردوو تێکستەی کانت و فۆکۆی لەگەڵدا بوایە، لە کام سەرچاوەوە وەرگیراون و لە چ سیاقێکدا وتراون.

دووەم: باشتر وابوو کورتەیەك لە ژیانی کانت و فۆکۆ و گرنگترین بەرهەمەکانیانی لەگەڵدا بوایە.

**سەرچاوە**

النهار، سێشەممە 2002/11/26.




# میشیل فۆکۆ و بەندیخانە

فرانسوا بولان

لە عەرەبییەوە: ئازاد بەرزنجی




فرانسوا بولان تۆژەرەوەیەکی فەرەنسییە لە بواری فەلسەفە نوێیەکاندا بە گشتی و فەلسەفەی میشیل فۆکۆ بەتایبەتی و خاوەنی کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەیە.

"میشیل فۆکۆ"یش یەکێکە لە گرنگترین فەیلەسووفە فەرەنسیەکانی سەدەی بیستەم و خاوەنی کۆمەڵێك کتێبە کە لە بواری خۆیاندا بوون بە سەرچاوە، هەر لە کتێبی "مێژووی شێتی لە چاخی کلاسیك"دا (1961) تا "کۆمەڵێك وتە و نووسین" (1994) کە پاش دەساڵ لە مەرگی فۆکۆ چاپ کرا. لە نێوان ئەم دووانەشدا چەند کتێبێکی تر هەن، لەوانە: "وشەکان و شتەکان" 1966، "ئارکیۆلۆژیای زانین" 1969، هەروەها یەکێك لە گرنگترین کتێبەکانی چاخی خۆی، واتە "چاودێری و سزا" 1975 کە بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبەیە، واتە کتێبی "میشیل فۆکۆ و بەندیخانە".

خۆ قەرەدانی فۆکۆ لە بابەتی "چاودێری و سزا" کارێکی دانسقە بوو هەم لەسەر ئاستی فەلسەفی، چونکە هەر لە "ئەفلاتون"ەوە تا فەیلەسووفە هاوچەرخەکان بابەتێکی نائامادەبوو لە شیکردنەوە فەلسەفییە بەناوبانگەکاندا، و هەم لەسەر ئاستی مێژوویی، چونکە کارە مێژووییەکان، بە هەموو شێوەکان و ڕێبازەکانیانەوە توخنی دەزگای "بەندیخانە" نەکەوتوون، بەو بیانووەی ئەوە بەتەنها "شتێکی ورد"ە لە ڕەوتی فراوانی مێژوودا.

نووسەری ئەم کتێبە وایدەبینێت کە ئەو دەقەی میشیل فۆکۆ لە بارەی "چاودێری و

سزا"ەوە نووسیویەتی بووەتە مایەی "ڕاتەکانێکی گەورە" لە ڕێی لێدوان لەسەر "مەسەلەی حەرامکراو"ی پەیوەست بە "بەندیخانە"وە.. ئەم ڕاتەکانە گەیشتە خودی "دەزگای بەندیخانە"ش، گەرچی ئەو چوارچێوە گشتییەی کە کتێبەکەشی تیا بڵاوکراوەتەوە چوارچێوەیەکە گیانی ڕەخنە بەسەریدا زاڵە، بەڵام میشیل فۆکۆ یەکەم کەس بوو کەوەکو شێوازێکی هەڵبژێردراوی سەرپەرشتیارانی ئەنجامدانی سزا لە مەسەلەی "زیندانیکردنی ئەوانی تر" دوا، هەروەها کتێبی "چاودێری و سزا" دەچێتە ناو چوارچێوەی بزاڤێکی فراوانەوە کە ئامانجی دژایەتیکردنی جیهانی بەندیخانەو گرتنە لە ئاست و پلەی جیاوازدا، هەر لە "ڕەخنەگرتن لە هەلومەرجی بەندیخانە" تا دەگاتە هەڵوێستی ڕادیکاڵیی وا کەڕەخنە لەخودی پرنسیپی بەندیخانە دەگرێت و داوای داخستنی بەندیخانەکان دەکات.

هەڵبەت میشیل فۆکۆ یەکەم فەیلەسووفە لە چوارچێوەی "مێژوویەتیدا" لە دیاردەی "بەندیخانە" بدوێت. هەر لە پەیدابوونیەوە تا چەمکە نوێیەکانی.. تا ئەم دیاردەیە هاتە ناو لێدوانی فیکری و فەلسەفیەوە، هەروەکو ئەو کتێبە زۆرانە بەڵگەی ئەمەن کە لەم بارەیەوە چاپ بوون.

جێی ئاماژەیە کە جیهانی بەندیخانە لەسەرەتای لیستی بایەخەکانی فۆکۆدا بوو، تا کۆچی دوایی کرد. هەرچۆن کتێبی "چاودێری و سزا" لای بووە "ئامراز"ێك بۆ قووڵکردنەوەی لێکۆڵینەوە لە تەواوی دیاردەکە و لە شێوە جۆراوجۆرەکانیدا، بەو پێیەی یەکێکە لەو مەسەلانەی کە پەیوەندیی بە ژیانی تایبەتیی خۆیەوە هەیە، ئەمە جگە لە توێژینەوە لە دیاردەی شێتی و دیاردەی سێکس.. فۆکۆ دەڵێت: "کتێبەکانم بەردەوام بریتی بوون لە کێشە تایبەتییەکانی خۆم لەگەڵ شێتی و سێکس و بەندیخانەدا".

هەروەها بە بۆچوونی نووسەری ئەم کتێبە، ئەو دەقەی کە فۆکۆ سەبارەت بە "چاودێری و سزا" نووسیویەتی، بە شێوازێکی "نوێ" و "دانسقە" مەسەلەی ئەو پەیوەندییە دەخاتە ڕوو کە "مێژوو لەگەڵ هەنووکەدا کۆدەکاتەوە". فۆکۆ دەڵێت: "کاتێ لە دەزگاکانی دەروونپزیشکی و دەزگاکانی سزادان بە زیندانیکردن دوام، لە هەمانکاتدا گریمانەی ئەوەم خستەڕوو کە دەکرێ خۆمانیان لێ ڕزگار بکەین، ئەوەش لە ڕێی سەلماندنی ئەوەی کە ئەو دەزگایانە بریتین لە هەندێ فۆرمی مێژوویی کە لە بارودۆخێکی دیاریکراوو چوارچێوەیەکی دیارکراودا هاتوونەتە ئاراوەو، بە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەش کە دەشێ ئەم کردەوانە لە چوارچێوەیەکی تردا ستەمکار و ناکارابن". فۆکۆ هەوڵی دا ئەو میکانیزمانە شی بکاتەوە کە بوونە هۆی پەرەسەندنی دیاردەی بەندیخانە بەو شێوەیەی کە هەبووە تا دەگاتە حاڵی حازر و چۆن "مەسەلەی بەندیخانە" گۆڕا بۆ"گرەوێکی فەلسەفی".

لەو تایبەتمەندییە بنەڕەتییانەش کە نووسەر بە بایەخەوە لە هزری "فۆکۆ"دا جەختی لەسەر دەکات "پێشنیازکردن"ی تێزە فیکرییەکانێتی هاوشان لەگەڵ ئاقاری "خەبات"یدا، تا ئەو ڕادەیەی ئەو دەیویست کتێبەکانی وەکو "نارنجۆکی مۆلۆتۆڤ" یان "کێڵگەی مین" بن. بە واتایەکی تر، جۆرێك لە "بەناویەکداچوون" هەیە لە نێوان "کاری فیکری" و "چالاکی کردەیی"دا. ئەو بەردەوام ویستوویەتی جۆرێك لە پەیوەندی و پێکەوە گرێدان هەبێت لە نێوان چالاکییە کردەییەکان و کاری تیۆری یان ئەو کارە مێژووییەی کە ئەنجامی ئەدات. ئەو دەڵێت: "من وایدەبینم بەڕادەیەك ئازادم کە ئەتوانم تا سەرچاوە دوورەکانی، شوێن پێی مێژوو هەڵبگرم، بەڵام لە هەمانکاتدا هەندێ مەسەلە دەبنە جێی بایەخم کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە پراکتیکەوە هەیە".





"میشیل فۆكۆ" ڕۆژی 8ی شوباتی 1981 دامەزراندنی "گروپی بە دەستهێنانی زانیاری سەبارەت بە بەندیخانە"ی ڕاگەیاند. هەر خۆی بەیاننامە سەرەتاییەكانی داڕشت. ئەم گروپە كۆمەڵێك ڕۆشنبیری "بەناوبانگ" یان "فەرامۆشكراو"ی گرتە خۆی كە چالاكیی وایان ئەنجام ئەدا كە پەیوەندییان بە جیهانی بەندیخانەوە هەبوو.. وەكو دروستكردنی پەیوەندی لەگەڵ كەسوكاری زیندانیكراوەكاندا.

هەروەها نووسەری ئەم كتێبە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە لێدوانی "میشیل فۆكۆ" لە بابەتی "بەندیخانە" شەقڵێكی مێژوویی بە خۆیەوە گرتووە، پتر لەوەی كە مێژوویی بێت. ئەمە هاوكات لەگەڵ ئاماژەكردندا بۆ ئەوەی كە كتێبی "چاودێری و سزا" لە هەموو كتێبەكانی تری ئەم فەیلەسووفە مێژووییترە كە تیایدا پشتی بە كۆمەڵێك دەق بەستووە كە پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆیان بە دونیای بەندیخانەوە هەیە، وەكو "پەیڕەوی ناوخۆی بەندیخانە" و "بەسەرهاتی زیندانیەكان" و "مەحزەری سەردانەكان" و "ڕاپۆرتەكانی لیژنەكانی پشكنین". نووسەری ئەم كتێبە دەڵێت: "بۆرجوازیەت بە بێ پەردە نەدواوە و لە كارەكانی هیگل و ئۆگست كۆنتدا گوزارشتی لە ستراتیجەكانی خۆی نەكردووە، بەڵكو لەو بەڵگەنامە نەناسراو و ئاساییانەدا گوزارشتی لە خۆی كردووە كە فۆكۆ بەكاری هێناون".

میشیل فۆكۆ دەڵێت: "سەبارەت بە بەندیخانە، هیچ مانایەكی نییە گەر تەنها پشت بەو گوتارانە ببەستین كە سەبارەت بە بەندیخانەكان نووسراون.. بەڵكو ئەبێ بایەخ بەو بڕیار و پەیڕەوە ناوخۆیانەش بدەین كە لەلایەن ئەو خەڵكانەوە داڕێژراون كە لەناو ئەو دەزگایانەدا ژیاون و بەڕێوەیان بردوون".

"میشیل فۆكۆ" لە ڕێی شیكردنەوەی پێگەی "بەندیخانە"وە لەناو سیستمە كۆمەڵایەتییە مرۆییەكاندا، ڕەهەندێكی نوێی خستە سەر مەسەلەی "سزا". میشیل فۆكۆ دەڵێت: حەزم كرد لەسەر ئەو مەسەلەیە بدوێم –بەندیخانە–، بەڵام لە گۆشەنیگایەكی ترەوە، ئەویش ئەوەیە كە ڕادەی كاریگەریی گوتارێك دیاری بكەم كە لافی زانستێتی لێدەدات. كاریگەریی گوتارە پزیشكی و سایكۆلۆجی و كۆمەڵایەتیەكان لەسەر سەرجەم كردەكانی سیستمی سزادان.. بەم مانایەش بایەخی سەرەكیی میشیل فۆكۆ نووسینەوەی مێژووی بەندیخانەكان نەبوو، بەڵكو نووسینەوەی مێژووی "كردەی سزا لە ڕێی بەندیخانەوە" تا جەخت لەسەر ئەوە بكاتەوە كە لە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدەوە وا دەركەوت كە "بیرۆكەی بەندیخانە بەشێوەیەكی گشتی باشترین و كاراترین و ئەقڵانیترین ئامرازە بۆ سەپاندنی سزا بەسەر سەرپێچیكردنەكانی سیستمدا لە كۆمەڵگایەكدا".

میشیل فۆكۆ لە كتێبە بەناوبانگەكەیدا "مێژووی شێتی لە چاخی كلاسیكدا" لە بابەتی شێتی دواوە و ئەمەش وای لێكرد هەر لە سەرەتاوە بەو بیرمەندە بناسرێ كە دیاردەكانی نەفیكردن و پەراوێزكردنی خستۆتە سەرووی لیستی بایەخەكانیی خۆیەوە. ئەو دەڵێت: "سەرەتا بایەخم بە نەخۆشخانەی دەروونی و دیوارە بەرزەكانی و ئەو پانتاییە ترسناكەدا كە لە نزیك بەندیخانەكانەوە لەناو دڵی شار یان لەسەر سنوورەكانی داگیری دەكات. ئەو شوێنانەی كە مرۆڤ ناتوانێت پیایاندا بپەڕێتەوە و ئەو پانتاییانەی كە خەڵك دەچنە ناوی، بەڵام بە دەگمەن لێی قوتاریان دەبێت. بەڵام لێكچوون لە نێوان "بەندیخانە" و "نەخۆشخانەی دەروونی"دا زۆر دوور ناڕوات و جیاوازییەكی گەورە لە نێوان "ئامانجەكانیان" و مێژوویێتیان" و "میكانیزمی سزادان" لە ئاستیاندا هەیە.

ئەمە وێڕای ئەوەی كە هەردووكیان بریتین لە پرۆسەیەكی "دابڕاندن"ێكی ئەنقەست لە كۆمەڵگا.

بەڵام "بەندیخانە" لە هەندێ قۆناغی مێژووییدا وەکو هەنگاوێکی پێشکەوتوو بە ئاراستەی مرۆڤایەتیدا خۆی پیشانداوە، بەڵکو داوایەکیش بووە لە پێناوی ڕزگاربوون لە "جیلۆتین – مقصلە" کە نیشانەی ئەوپەڕی هۆڤێتی بوو. میشیل فۆکۆ دەربارەی ئەرکی یاسای سزاکان لە کۆمەڵگادا وتوویەتی: "پێویستە لەسەر یاسای سزاکان بە تەنها ڕێ بە چاکسازیی ئەو زیانە بدات کە بەر کۆمەڵ دەکەوێ. دەبێ بەشێوەیەکیش دابڕێژرێ ئاسەواری ئەو زیانانەش نەهێنێت کە تاکە کەس بۆ کۆمەڵگای دروست دەکات (...) و ئەو زیانانە بسڕێتەوە یان ڕێگە لە دووبارەبوونەوەی هەمان ئەو خراپانە بگرێت دژ بە جەستەی کۆمەڵایەتی". هەروەها "فۆکۆ" لە چوارچێوەیەکی "هاوتەریب"دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نەخۆشخانەکان خۆیشیان لە سەدەی هەژدەدا چ نەبوون جگە لە "کۆمەڵێك دەزگا بۆ یارمەتیی هەژاران". ئەوسا نەخۆشخانە شوێنێك نەبوو بۆ چارەسەر بەڵکو پێشوازیی ئەو کەسانەی تیا دەکرا کە لەسەرەمەرگدا بوون، پزیشکیش بە تەنها لە کاتی "قەیران"دا خۆی تێهەڵدەقورتاند. دەبێ ئاماژە بدەین بەوەی کە سەدەی هەژدە لە فەرەنسا "چاخی ڕۆشنگەری" بوو.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەم کتێبە هەر بە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکان سەبارەت بە بەندیخانە و دونیای بەندیخانە دەژمێردرێ، چونکە ئەم فەیلەسووفە پتر لە شەست دەقی بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان کردووە، هەر لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەوە تا کۆتایی ژیانی. ئەم بەشداریکردنەشی بە تەنها شێوەیەکی تیۆریی بەخۆوە نەگرت، بەڵکو ویستی ببێتە چالاکێك لە چوارچێوەی ئەو بزاوتانەدا کە بایەخ بە بارودۆخی بەندیخانەکان و زیندانیەکان ئەدەن. "خەباتگێڕەکە ڕێنمایی توێژەرەوەکەی کرد و توێژەرەوەکەش ڕێگای بۆ خەباتگێڕەکە ڕۆشن کردەوە"، ئەمە هەروەکو نووسەری ئەم کتێبە هەڵوێستی "فەیلەسووفەکەی" وەسف دەکات. هەر لە ڕوانگەی "بەندیخانە"وە فۆکۆ وەکو ئەو بیرمەندەی کە لە هەموو بەرەکاندا "خەبات دەکات" خستە ڕوو "ئەو هەموو شتێکی خوێندەوە و هەموو شتێکی زانی و چووە ڕیزی هەموو شتێکەوە".. هەر لێرەشەوە داوەرییەکانی خۆی سەبارەت بە کۆمەڵگا خۆرئاواییە هاوچەرخەکان ڕەوتی "دانسقە"ی ئەو دێت.. هەر لێرەشەوە توانیی لە نێو فەیلەسووفانی سەدەی بیستدا پێگەیەکی "دانسقە" بەخۆی هەبێت.

**سەرچاوە**

بیان الکتب 24 مارس 2003 العدد 255.

# فۆكۆ لەمرۆدا

## بلاندین كرێجێل

### لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع




دانەری ئەم كتێبە خانمی توێژەری فەرەنسی (بلاندین كرێجێل)ە، كە مامۆستای زانكۆ و فەیلەسوفێكی ناسراوە لە فەرەنسا، ئەمڕۆ سەرۆكی ئەنجومەنی باڵای تێكەڵكردنی بیانییەكانە بە كۆمەڵگەی فەرەنسی. پێشتر چەند كتێبێكی گرنگی بڵاوكردوەتەوە. لەوانە: "فەلسەفەی كۆماری 1998". "خوێن، عەدالەت، سیاسەت 1990". "تێڕامان سەبارەت بە عەدالەت 2001".

خانمی دانەر لەم كتێبە تازەیەدا قسەوباس سەبارەت بە بەناوبانگترین فەیلەسوفی فەرەنسی لە سەدەی بیستەم دوای سارتەر: میشێل فۆكۆ، دەكات. هەر لە دەستپێكەوە دانەر ئاوا دەڵێ: میشێل فۆكۆ ساڵی 1984 كۆچی دوایی كرد، بەڵام فیكری نەمرد لەگەڵیدا، بگرە بە پێچەوانەوە، تاكو ئێستا گفتوگۆی زۆر گەرم دەوروژێنێ و خۆراكی تێڕامانە فەلسەفییەكانە. هەندێ دژایەتییان ئەكرد و هەوڵیاندا وەك فیكر ڕەتیبكەنەوە، بەو بیانووەی ئەو لە لایەنی سیاسییەوە كەسێكی هەرزەكار بووە، بگرە كەسێكی توندڕەوی ئەنارشیزم بووە، نەك كەسێكی بەرپرس. هەندێكی دیكە زۆر بە سادەیی دەیانوت با لە بیر بكرێ، بەو پێودانگەی زەمەنی ئەو بەسەرچووە و تێپەڕبووە و چیتر فیكری ئەو بۆ ئەم سەردەمەمان دەست نادات.

پاشان دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: لەگەڵ ئەم هەموو ڕەخنە لێگرتنە، كەچی كاریگەرییەكەی هێندە درێژ بووەوە تاكو هەردوو كەناری ئۆقیانوسی ئەتڵەسی گرتەوە: واتە ئەمریكا و ئەوروپا. لە زانكۆكانی ئەمریكادا بەشێوەیەكی



فراوان بڵاوبوەتەوەو، لەویٚ زۆرێك پێیان وایە فیکری فۆکۆ بە دروستی نوێنەری فەلسەفەی فەرەنسییە.

خانمی دانەر وایدەبینیٚ فۆکۆ لە لایەنی فیکری و فەلسەفییەوە بەرجەستەکەری رۆحی سەردەمەکەی بووە، هەندیٚ شت لە کارەکانیدا بەسەرچوون و هەندیٚ شتی دیکە تاکو ئێستا کاریگەرییان ماوە. لەبەرئەوەی خانم (بلاندین کرێجێل) لە کۆلیج دوفرانس یاریدەدەری فۆکۆ بووە و ماوەیەك لەگەڵیدا ئیشی کردووە، ئەوا ئەو لە خەڵکانی دیکە زیاتر فۆکۆ دەناسیٚ و دەزانیٚ باسی چیدەکات.

گرنگترین بەشەکانی کتێبەکە دووبەشە: یەکەمیان باس لە فۆکۆ دەکات وەك فەیلەسوفێك، دووەمیان وەك بیرمەندێکی سیاسی باسی دەکات کە خەریکی کاری تێکۆشان و مومارەسەی عەمەلییە، لای خانمی دانەر ئەوەی تایبەتە بە لایەنی یەکەمەوە وایدەبینیٚ فۆکۆ بەهۆی بەهێزی فیکری و توانای قەناعەتپێکردن و جوانی شێوازی، هەژمونی بەسەر هەموو فەیلەسوفەکانی سەردەمەکەی خۆیدا هەبووە.

لە ڕاستیدا فۆکۆ بە تەنها فەیلەسوف نەبوو، بەڵکو ئەدیبێکی شاعیری باڵادەست بووە، مرۆڤ هێندەی بەسە کتێبەکەی لەسەر (مێژووی شێتییەتی) یاخود (وشەکان و شتەکان) بخوێنێتەوە، تاکو تەواو لەوە دڵنیابێت. فۆکۆ خاوەنی شێوازێکی نیتشەییانەی بورکان ئامێزە . لەبەرئەوە وایدادەنێن نەك تەنها فەیلەسوفێك یاخود بیرمەندێکی گەورەیە، بەڵکو یەکێکە لە نوسەرە گەورەکان لە زمانی فەرەنسیدا.

گرنگترین سیماکانی فۆکۆ بریتییە لەوەی توانی دوو ڕەوتی فیکری دژبەیەك کۆ بکاتەوە! ڕەوتی نیتشەییانەی ڕۆمانسییەت و ڕەوتی لۆجیکی عەقڵانی، توانی لەلایەکەوە نیتشە و لەلایەکی دیکەوە باشلار و ئەلیسکەندەر تۆلێری و بیرمەندە گەورەکانی لۆجیك پێکەوە کۆبکاتەوە. بە مانایەکی تر توانی گەرم و سارد یاخود ئاو و ئاگر پێکەوە کۆبکاتەوە. ئەمەش شتێکە زۆر بە دەگمەن بیرمەند پێدەگات.

تایبەتمەندییەکی دیکەی فۆکۆ بریتییە لەوەی: فۆکۆ خاوەنی رۆشنبیرییەکی ئەدەبی و هونەری فراوان بوو، هەروەها لە هەمان کاتدا خاوەنی رۆشنبیرییەکی زانستی و ئەبستمۆلۆجی فراوانی بوو. لێرەوە سودی لە زانستە سروشتییەکان یاخود فیزیاییەکان کردووە و میتۆدی ئەو زانستانەی بەسەر زانستە مرۆڤایەتییەکاندا پراکتیك کردووە.

گەورە فەیلەسوفانی پێش خۆی لە نمونەی (ئۆگست کۆنت) کە خاوەنی فەلسەفەی وەزعییەت بوو، هەمان شتی کردووە. پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەیت کە فۆکۆ کوڕی پزیشکێکی بەناوبانگ بووە لە شاری "پواتییە"، هەر بۆیە پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ پزیشکی و توێکاریدا (التشریح) هەبووە. لە هەمان کاتدا یەکێك بووە لەوانەی زۆر سەرسام بووە بە ڕامبۆ و مالارمیٚ و ئەنتوان ئارتۆو ئەوانی دیکە.

پاشان خانمی دانەر دەڵیٚ:

بەڵام مەنتقی سەرەکی لە فەلسەفەی فۆکۆ لە شوێنێکی دیکەدایە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ خودی کەسایەتییەکەی، پێویستە ئەوەش بزانریٚ فۆکۆ لەلایەنی سێکسییەوە کەسێکی لادەر بووە. ئەم مەسەلەیە لە سەرەتای گەنجییەوە کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەری. بەهۆی ئەم ناتەواوییەوە کە نەیدەتوانی خۆی لێدەرباز بکات، ناڕەحەتی زۆری چەشتووە. هەر لەبەرئەم هۆیەشە هەموو فەلسەفەکەی بەرگری کردنە لە نەفرەت لێکراوەکانی – المنبوذین– ناو کۆمەڵگا: چ ئەوانەی شێتن یاخود بەندکراوەکان یان هەژارە پەراوێز کراوەکان،

یاخود لادەرەکان یان ئەوانەی بەهۆیەك لە هۆیەکان نەفرەتلێکراون.

تایبەتمەندی سەرەکی لە فەلسەفەکەیدا ئەوەیە: فۆکۆ گەشەی فیکری پێش خۆی پێچەوانە کردەوە ، زۆربەی فەیلەسوفانی پێش خۆی لە گۆشەنیگای عەقڵ و سەنتەرەوە لە کێشەکانیان دەڕوانی، بەڵام ئەو لە گۆشەنیگای شێتی و پەراوێز یاخود پەراوێزگەراییەوە تەماشای دەکرد. بەم شێوەیە هەندێ شتی تازەی ئاشکرا کرد کە ئەوانی پێش ئەو نەیانبینی بوو، ئەو لە دەروازەیەکی ترەوە لە شتەکانی دەڕوانی.

جگە لەوانە ئەم پیاوە بەهۆی لادانە سێکسییەکەیەوە لە گەنجیدا گیرۆدەی نەخۆشییەکی دەرونی ترسناك هات و بەمەبەستی چارەسەرکردنی خۆی پیشانی چەندین پزیشك داوە. بگرە کار گەشتە ئەوەی لە یەکێ لە نەخۆشخانە عەقڵییەکان بۆ ماوەیەك بەندیان کرد. لەبەرئەوەیە دواتر گرنگی بە دیاردەی شێتی دەدات و تێزە گەورەکەی زانکۆی بۆ تەرخانکرد. بێهودە نییە ئەو لە خەڵکانی دیکە باشتر لە گرفتی شێتی تێگەیشتبوو.

کاتێ دەگاتە دۆزینەوە گەورەکەی کە سەبارەت بە سنوری لێکدابڕانی نێوان شێتی و عەقڵە، توانی لە شێت بونەکەی خۆی چاك ببێتەوە. هەر ئەمەش بوو (ئاڵتۆسێر)ی هاوڕێی گوزارشتی لێکردو وتی: من و فۆکۆ لەسەر لێواری کەوتنە خوارەوە بووین، ئەو لێی دەرباز بوو، بەڵام من کەوتمە ناوییەوە!

ئاشکراشە (ئاڵتۆسێر) دواجار ژنەکەی خۆی خنکاند و بە تەواوی شێت بوو و عەقڵی لەدەستدا. لێرەوە هەموو فیکری میشێل فۆکۆ لە ئەزمونی تایبەتی خۆیەوە بەرهەم هاتووە، ئەزمونێك خەریك بوو لە ناوی ببات. بەڵام کاتێ توانی لێیدەربازبێت، بووە بە بەهێزترین پیاوی سەردەمەکەی و گەورەترین فەیلەسوفی نەوەکەی، مرۆڤ کاتێ بەسەرخودی خۆیدا سەردەکەوێ دەتوانێ بەسەر هەموو شتێکدا سەرکەوێ.

ئا لێرەدا گەورەیی فۆکۆ دەردەکەوێ، لە کەسێکی ڕیسوا، ئاڵۆز، دەرون نەخۆش، توانی ببێتە نوسەر و بیرمەندێکی بلیمەت و مامۆستا لە گەورەترین زانکۆکانی فەرەنسا و جیهان، ئەمەش شتێکی کەم نییە.

پاشان خانمی دانەر ئەم پرسیارە دەخاتە ڕوو: ئەو تیۆرە مەعریفییە تازەیە چییە کە میشێل فۆکۆ هێنایە ئاراوە؟ بە بۆچونی دانەر ئەو تیۆرە مەعریفییە بەشێوەیەکی رون و ئاشکرا لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا: (وشەکان و شتەکان) دەردەکەوێت. لەو کتێبەدا ئەوە ئاشکرا دەکات هەموو سەردەمێك خاسیەتی زانستی و دەسەڵاتی پراکتیکی خۆی هەیە، کە یەکەمیان بۆ شەرعییەت دان بە دووەم بەکاردەهێنرێ.

لێرەوە حەقیقەتێکی ڕەها کە بۆ هەموو سەردەمەکان بشێ لە ئارادا نییە. فۆکۆ وایدەبینێ سەدە تازەکان، زانستە مرۆڤایەتییەکان بۆ شەرعییەتدان بە دەسەڵاتی خەساندن و ئەو سەرکوتکردنەی تێیدایە، بەکاردەهێنێ. لێرەوە هاوکارییەکی ژێربەژێر هەیە لە نێوان هەموو دامودەزگاکانی کۆمەڵگادا، وەك دامودەزگای کردە عەقڵییەکان و دامودەزگای زیندان و دامودەزگا سەربازییەکان و دامودەزگای قوتابخانەو دامودەزگای ئیشە دەستییەکان یاخود کارگەکان، تەنانەت دامودەزگای پۆلیس و هەواڵگری.

لە ڕابردودا قەشەی مەسیحی شەرعییەتی دەبەخشییە دەسەڵاتی سیاسی، بەڵام لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا کە پاش شۆڕشی فەرەنسی دروست بوون، زانستە مرۆڤایەتییەکان شەرعییەت دەبەخشن بە دامودەزگاکانی دەسەڵات.

بە مانایەکی تر زانستی دەرونشیکاری و شیکردنەوەی دەرونی و زانستی کۆمەڵناسی و

زانستی ئابوری و زانستی زمان یاخود زمانەوانی و زانستی ئەنسرۆپۆلۆجیا، ئەمانە بونەتە مەعریفەی حەقیقی و شوێنی لاهوتی مەسیحی کۆنیان گرتەوە. کاتێ فەرەنسییەکی هاوچەرخ هەست دەکات گرفتێکی لەگەڵ ویژدانی خۆیدا یاخود لەگەڵ عەقیدەکەیدا، هەیە. ناچێت بۆ لای قەشە تاکو لەسەر کورسی دانپیانان دانیشێ و دان بە هەموو ئەو شتانەدا بنێ کە جێبەجێی کردوون، بەڵکو دەڕوات بۆ لای شیکەرەوەی دەرونی، ئالێرەدا جیاوازی نێوان کۆمەڵگا تەقلیدییەکان و کۆمەڵگای مۆدێرنەکان دەردەکەوێ.

فۆکۆ هەموو ئەم شتانەی لێکداوەتەوەو بەشێوەیەکی باش رونیکردونەتەوە. پاشان نادیاری دەسەڵاتی بۆ هەموو جۆرەکانی مەعریفەی باو ئاشکرا کرد. لێرەوە مەعریفە لەلایەک نییە و دەسەڵاتیش لە لایەکی دیکە. بەڵکو مەعریفە خۆی بۆ خۆی دەسەڵاتە و دەسەڵاتیش دەتوانێ مەعریفە ڕاکێشێتە لای خۆی.

مرۆڤ کاتێ لە کۆمەڵگادا مەعریفەیەك بەدەست دێنێ، ئەوا دەتوانێ ببێ بە جۆرێك لە دەسەڵات و، ئەوانی دیکە سڵی لێدەکەنەوە و زیاتر ڕێزی لێدەگرن. بگرە گەر بییەوێ دەتوانێ مەعریفەکەی یاخود ناوبانگی بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی مادی بەکاربهێنێ. ئەو مرۆڤەشی دەسەڵاتی هەبێ، گەر بیەوێ دەتوانێ زانا گەورەکان بەلای خۆیدا ڕاکێشێت و مەعریفەکەیان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتەکەی بخاتەگەڕ.

لێرەوە پەیوەندییەکی دیالەکتیکی ئاشکرا لە نێوان دەسەڵات و مەعریفەدا هەیە، ئەم دووانە یەك لەوی دیکەیان دانەبڕاوە وەك ئەوەی هەندێ جار وا تێدەگەین. ئێمە وایدەبینین دەسەڵات هەر لەبەرئەوەی دەسەڵاتە کەواتە نەزانە یاخود کوێرە، مەعریفەش تەنهایە و هیچ ئامانجێکی نییە تەنها حەقیقەت نەبێ و هیچ دەسەڵاتێکیشی نییە. ئەمەش هەڵەیە و دەبێ ڕاستبکرێتەوە.

دواتر دانەر قسە لە بارەی گەڕانەوەی فۆکۆ دەکات بۆ لای کانت و دەڵێ:

فۆکۆ لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا لە کەسێکی نیتشەییەوە دەگۆڕێ بۆ کەسێکی کانتی، بەبێ ئەوەی سەرسام بوونی خۆی بۆ نیتشە لە دەستبدات. لێرەوە ئەوە ڕاست نییە کە دەڵێن فۆکۆ دژی ڕۆشنگەرییە وەك ئەوەی هەندێ پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن. بگرە بە پێچەوانەوە، فۆکۆ گەرچی ڕەخنەیەکی بریندارکەری لە مۆدێرنەی ئەوروپی و دامودەزگاکانی گرتووە، بەڵام هەرگیز ڕۆشنگەری ڕەتنەکردوەتەوە.

بەڵام ئەو شتەی کە لە فیکری فۆکۆدا مردو بۆ ئەم سەردەمەمان ناشێ ئەمەی خوارەوەیە:

چیتر لە دامودەزگاکانی مۆدێرنەدا تەنها ئەوە نابینین کە دامودەزگایەکی سەرکوتکەربن و ئامانجیان تەنها سەرکوتکردنی تاکەکان یاخود خەساندنیان بێ. بەڵکو دەبینین ئەوانە دامودەزگایەکی پۆزەتیڤ و ئامانجیان پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتییە. پاراستنی سەلامەتی و ئاسایشی هاوڵاتیانە. گەر دەوڵەتی یاسا نەبوایە، ئەوا لە ئەوروپادا یاسای گورگ بڵاو دەبووەوە و هەموو تاکێ لە ژیانی خۆی دەترسا، دەترسا لەوەی لە هیچ و خۆرای بیگرن یاخود بەبێ هیچ هۆیەك لەلایەن دامودەزگاکانی هەواڵگرییەوە ڕاوبنرێت و بکەونە شوێنی، بۆ نمونە وەك ئەوەی لە جیهانی سێیەمدا روودەدا. بەڵام دەزانین لەبەر هۆیەکی سادە ئەمە لە ئەوروپادا قەدەغەیە: ئەویش ئەوەیە دەوڵەت پابەندی کۆمەڵێ یاسای دیاریکراوە کە ناتوانێ پێشێلیان بکات یاخود لێیان لابدات. تەنانەت سەرۆك کۆمار یاخود سەرەك وەزیران ناتوانن یاساکان پێشێل بکەن یاخود بەهۆی شەخسی یان بەبێ هۆ کەسێك ڕاوبنێن.

لێرەوە ئەو دەوڵەتە شەرعییەی بەناوی یاساوە حوکم دەکات، هاوڵاتیانی لە سەرەڕۆیی یان جەوروستەم یاخود چەوساندنەوەیەکی بێ هۆ، دەپارێزێ. گومانی تێدا نییە فۆکۆ زیاد لە پێویست رەخنەی لە دامودەزگاکانی مۆدێرنە دەگرت و زیاد لە پێویست دیوە نێگەتیڤەکەی دەبینی. بەڵام سودێکی زۆرمان لێبینی بۆ ئاگادار کردنەوەمان لەلایەنە نێگەتیڤەکانی مۆدێرنە، لێرەوە فۆکۆ یارمەتی داین بۆ ڕاستکردنەوەی و تێپەڕاندنی. ئەمەش مەسەلەیەکی کەم نییە. لێرەوەیە بیرمەندە رەخنەگرەکان زیاتر سود بە کۆمەڵگا دەگەیەنن لە بیرمەندە گوێڕایەڵەکان کە هەموو کاتێ دەڵێن بەڵێ.

خانمی دانەر قسەکانی کۆتایی پێدێنێت و دەڵێ: لەبەرچی فۆکۆ لە بیرمەندە گەورەکانی دیکە زیاتر سەرسامان دەکات؟ لەبەرچی کاریگەری ئەو لە کاریگەری ئالتۆسێر یاخود لاکان یان دێریدا یاخود دۆلۆز یان ئەوانی دیکە زیاترە؟ لەبەر هۆیەکی سادە: کە بریتییە لەوەی فۆکۆ هونەرمەند و نوسەرێکی گەورە و وانەبێژێکی نایاب بوو. پاشان ئەو زۆر بە سادەیی بلیمەتیش بوو. دەیزانی ئاگری بلیمەتی یاخود –شێتی– لە ناخیدایە و ڕاسپێردراوە کە هەندێ لە هەقیقەتە گەورەکان بۆ مرۆڤایەتی ئاشکرا بکات.

**سەرچاوە**

بیان الکتب 2005/1/31

- **ئەمین مەعلووف و.. ئۆپێرا**

له عەرەبییەوە: شیرین ك.

- **گەشتێك بۆ ماڵی لۆرێنس**

پێشەوا عەبدولخالق

- **هەژاری و توندڕەوی ئایینی**

عەفیف ئەخزەر

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **کێشەی کالاس**

جانین گاریبسۆن

له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

- **دۆنکیخۆته لە کتێبەوە بۆ ئەفسانە**

جان کانافا جیو

له عەرەبییەوە: سەردەم

# ئەمین مەعلووف و.. ئۆپێرا

لە عەرەبییەوە: شیرین. ك




ئەمــە یەكــەمجارە ئــەمین مــەعلووف بچـێتە نێـو دنیـای ئــۆپێراوە لەســەر شــێوازی تراژیـــدیا گۆرانیئامێزەكـــان چـــیرۆكی خۆشەویســـتیەكی موســـتەحیل دەچـــنێ لـــەنێوان شـــازادەیەكی فەرەنســـی كـــە شـــاعیرێكی گەڕۆكـــە بـــەناوی (جۆفری)ـــــەوە لەباشـــووری ڕۆژئـاوای فەرەنسـا نیشـتەجێیە لەگـەڵ كۆنتێسـە كلیمانسـدا كـە لەقـەڵای تـەرابلس لـەباكووری لوبنـان نیشـتەجێیە. ئـەو دەقـەی مـەعلووف نوسـیویێتی بەپشـت بەسـتن بەخەیاڵـە فراوانەكـەی ناونیشـانەكەی (خۆشەویسـتی لەدوورەوە)یە جەماوەری لوبنانی لەمیانەی فیستیڤاڵی (البستان)دا بینیان و گوێیان لەمۆسیقاكەشی بوو كە ژنە دانەرێكی موسیزیانی جیهـانی بـەناوبانگ داینـاوە بەناوی كایا سارياهۆ، هـەروەها ئـەو جـەماوەرە چـێژی لەدەنگـە ئۆپێرالییـە ناوازەكـان گـرت (سـۆبرانو، میزۆسـۆبرانۆ، باریتۆن) بۆ ژەنینی مۆسیقاكەش جۆقـەی كۆنسـێر ڤـاتواری ستراسـبۆرگ و ئۆركەسـترای یـونگ جنسـیك بەشـدارییان كردبـوو، ئـەم ئۆپێرایـە بـۆ یەكـەمجار سـاڵی 2000 لەفیستیڤاڵی سالزبوگ لەنەمسا پێشكەشـكرا، دوای ئـەوە دەستیكرد بەگەشتێكی جیهانی تـا گەیشـتە ویلایەتـە یـەككگرتووەكانی ئـەمریكاش، پیتـەر سـلارز دیمەنـەكانی ئۆپێراكەی بۆ شانۆ دەرهێنا كە لـەمڕۆدا یەكێكـە لەدەرهێنـەرە گەورەكانی ئۆپێرا لەجیهاندا.

لـەم ئۆپێرایـەدا ئـەمین مـەعلووف كەسێتی شـازادەی (بلای) دەهێنێتـەوە كە (جۆفری ڕۆول)ی شـاعیرو گەڕۆكـە، ئـەم شـازادەیە بەشـیعرە غەزەلییـە جوانـەكانی ناسـراوە كـە لەسـەدەكانی ناوەڕاسـتدا بڵاوبـووە، بـەڵام مـەعلووف چیرۆكی خۆشەویستییەكی سەیر دەچنێ كە لـەنێوان ئـەو شـازادە شـاعیرەو یـەكێك لـەو خانمـە فەرەنسییە جوانانەدا ڕوودەدا كە ئەویش كۆنتێسە كلیمانس-ە كە لەگەڵ خاچپەرستەكاندا هاتووە ئەو كاتەی هێرشیان كردۆتە سەر ڕۆژهـەڵات و لەتـەرابلس نیشتەجێ بووە وەكو خانمی ئەو قـەڵا بەناوبانگـە، كەواتـە ئـەمین مـەعلووف سـەدەی دوازدە هەڵدەبـژێرێ، سـەدەی جـەنگی خاچپەرستەكان، ئـەو جەنگـەی لەكتێبـە پـڕ بایەخەكەیدا باسـی دەكـات كـە بـەناوی (الحـروب الصـلیبیە كمـا رأهـا العرب)ـە، بـەڵام لەكـەش و هـەوای جـەنگ و بەرەنگاربوونـــەوەكان دووردەكەوێتـەوەو تراژیدیایـەكی بچكۆلانەو گـەرموگوڕ دەنووسێ، تراژیدیایـەك كـە شـازادەیەكی فەرەنسـی و كۆنتێسـەیەك تیـا ژیـاون، پانتاییـە دوورەكـان لەیـەكیان دائـەبڕێ، ئـەو مەسافەیەی هـەرێمی ئـەكتین-ی فەرەنسـی و قـەڵای تـەرابلس جیا دەكاتـەوە، بـەڵام ئـەو خۆشەویستییەی هەر لەدوورەوە لەنێوانیانـــدا ڕوودەدا (موسـافیرێك) یارمـەتی چـنینی دەدا، ئـەو موسـافیرەی بـەرەو ڕۆژهـەڵات حـەج دەكـات و بـەردەوام دێتـەوە بـۆ ڕۆژهـەڵات غەزەلیاتەكانی شازادە دەبات بۆ كۆنتێسەو شەیدایی كۆنتێسـەش دەگەیـەنێ بەشـازادە، ئەمـە چـیرۆكێكی نیمچـە خورافییـە هەروەكو حیكایەتەكانی (هـەزارو یـەك شـەوە)و (تریسـتان و ئەزۆلت)و (ڕۆمیۆ جولێت).. ئەم خۆشەویسـتییە تەمومژاوییـە شازادە هاندەدا تا بەرەو لوبنان لەڕێگەی دەریاوە سەفەر بكات و

بـــەرەنگاری گـــەلێك مەترســـی دەبێتـــەوە، بـــەڵام دواجـــار لەســـەر پاپۆڕەکـــە نـــەخۆش دەکـــەوێ و لەســـــــــەرەمەرگا بەســـــــەر نەقالەیەکـــــەوە دەیگەیەننـــــە تـــەرابلس، بینـــینی کۆنتێســـەش لـەو مەرگـە رزگـاری ناکـات، ئـەو دڵـدارەی هەمیشـە خـەونی پێـوە دەدی و شـیعری بـۆ دەنووسـی، بـــەڵام دواجـــار بەبەختـــەوەری دەمرێ، چونکە ئەو ژنە دەبینێ کـە گومـانی لـەبوونی هـەبوو، بەدرێـــژایی ئـــەو رۆژگارانـــە بەخـــەیاڵێکی لەقەڵـــەم دەدا لـــەو خەیاڵانەی هاوڕێ موسافیرەکەی دەهاتـە بەرچـاوی، دوای مردنـی شازادە، کۆنتێسە تووشی خـەم و پەژارەیـــەکی تـوونـــد دەبـــێ رایدەگەیـەنێ کـە ئـیتر لەژیانـدا گۆشـەگیر دەبـێ و بـەرگی رەش لەبەردەکاو لەکۆتاییدا دەڵـێ (مـن بێـــوەژنی پیـــاوێکم شـــووم پێنەکرد).

لـــەم ئۆپێرایـــەدا ئـــەمین مـــەعلووف پشـــتی بـــەزمانێکی فەرەنسی شیعریی بەستووە، کە وردە وردە دەڕژێ ئینجـا وەکـو گۆرانی هەڵدەکشێ تا گوزارشت لـەو خۆشەویسـتییە پـڕ ئـازارە بکـات، ئـەو خۆشەویسـتییەی بەســـــیحرو تامـــــەزرۆیی و شەیداییەکی نادیار دەورە دراوە.

دەقـــە ئۆپێرالییەکـــە زۆر بەچـــڕی دەســـتپێدەکاو هـــیچ پـەراوێزێکی تیـا نییـەو لەسـەر ریتمـــی دەقـــە ئۆپێراڵییـــەکان داڕشتووە، دیالۆگەکانی لەنێوان هـــەر ســـێ کارەکتەرەکـــەو کۆرسـەکەدا دابەشـکردووە کـە ئامـادەبوونێکی تایبـەتی هەیـە. وەکـو دراماو گـۆرانی پێدەچـێ مـــــەعلووف دەســـــتبەرداری گێڕانەوەی مێژوویی بووبێ وەکو لەڕۆمانەکانیـــــدا دەیبیـــــنین گرنگییـــــەکی گـــــەورەش دەدا بەلەحزەی شیعریی.

لێرەدا بەتەنیا شیعر دەتوانێ گوزارشت لـەحاڵ و ئـەحواڵی ئـەو خۆشەویستییە بکات کە بەئازارو دووریی تێکەڵە وەکو لەدێڕێکدا دەڵـــێ (قـــژی رەش و نەرمـــە لـەتاریکی شـەودا بـەدیناکرێ، بـەڵکو وەکـو خشـەی گـەڵاکان دەبیستریێ) موسافیرەکە بەمجۆرە باس لەکۆنتێسە دەکات.

لوبنانییەکان لەم ئۆپێرایـەدا کـە لەفیســـتیڤاڵی (البســـتان)دا بینیـان روویـەکی تـر لـەڕووەکانی ئـەمین مـەعلووف-یـان بـینی کـە رۆمـــانووس و مێـــژوونووس و رۆژنامەنووسـە، مۆسیقاو دەنگە تاکـەکان و کۆرسـەکە کەشـێکی ئاهەنگســـازی و ســـروتێکی جوانیـــان بـــۆ ئـــەو چـــیرۆکی خۆشەویســـتییە پـــڕ ئـــازارە زیـادکرد رەنگـە سـەرکەوتنی مـەعلووف لـەم ئۆپێرایـەدا هـانی ئەو ژنە دانەرە مۆسیقیەی دابێ واتە کایا سارياهۆ کە هاوکاریی بکات بۆ نووسینی ئۆپێرایەکی تـر کـە سـاڵی 2006 پێشـکەش دەکرێ.

**سەرچاوە**

الحياة، شوباتی 2005

## گەشتێك بۆماڵی لۆرێنس

**پێشەوا عەبدولخالق**



لەوکاتەوەی لەزانکۆ رۆمانی (کوڕان و عاشقان)ی د. ه لۆرێنسم خوێند، ئیتر خولیای ژیانی لۆرێنس بووم، دەمویست نهێنییەکانی ژیانی بزانم و بشزانم بۆ ئەو نەیتوانی بگاتە (دڵنیایی ئەبەدی) نەلەعەشق و نەلەژیانیش دا.

ئەوکە لە ساڵی 1885دا و لە دایکێکی زەلیل بەدەست تورەییەکانی باوکیەوە هاتەدنیاوە، نەیدەزانی سبەینێ (دایك) وێنەی عەشقی لاجوان و

لا تەڵختریش دەكات، ئەو هەمیشە نەیدەزانی و نەدەگەیشتە یەقین كەئایا (هەموو كچانی دنیا) یان تەنها (دایك)ی ببنە هی ئەو.. ئەو هەمیشە جەنگێك لەناخیدا هەڵگیرساو بوو، جەنگێك لەنێوان جوانی سروشتو تورەیی و ئازارەكانی كە شۆڕشی پیشەسازی هێنابویە بوون، ئەو سروشتەش وەك دایكی هێمای دەكردو باوكی ناوكانەخەڵوزەكانیش هێمای تورەیی و ئازارو ڕەشیەكانی پیشەسازی بوو..

ئەو كەدەڵێ (هەموو شتێكت دامێ، خۆت نەبێ) دڵخوازەكەی ئیدی تێدەگات لۆرێنس بەدوای مانای ڕاستەقینەی (عەشق)دا دەگەڕێ، ئەو لەمێژە دەیەوێت بزانێ تەنها (جەستەیە یان رۆح)ە یان (هەردووكیان)ن ئەویان عاشق كردووە.. ئەو دەگەڕێ تا بزانێ (جەستەی سپی یان ڕۆحی پاكی) دڵخوازەكەی دەروونی ئەویان شەكەت كردووە، ئەی باشە بۆ وێنەی (دایك) تێكەڵ بە (جەستەو ڕۆح) ی كچانی تر دەبێ؟!

ئاخر ئەو بەدایكی دەڵێ: (خۆزگە باوكم دەمردو منیش تەنها لەگەڵ تۆ دەژیام). دایكیشی كەنەیدەویست لۆرێنس باسی خۆشەویستی هیچ كچێك بكات، ڕقی لەو كچانەش بوو كە كوڕەكەیان خۆشدەویست..

من دەمزانی د.هـ لۆرێنس لە شارۆچكەی "*Eastwood*"ی بەریتانیا لەدایك بووەو هەر لەوێش سەرەتاكانی ژیانی دەست پێكردو دركی بەئالۆزیەكانی دەرون و ژیانیشی دەكرد.. بۆیە خەونم بوو، زێدی لۆرێنس ببینم- ئەو سروشتەش ببینم كە وایان لەو كردبوو جەنگ لەگەڵ هەموو شتێك بەرپا بكات تەنانەت باوكیشی.

وا ڕێكەوت، لەیەكێك لەزانكۆكانی بەریتانیا بۆ خولێكی شەش مانگی بانگهێشت كرام، لەگەڵ چەند هاوڕێیەكمدا لەسلێمانیەوە بەرەو لەندەن بەرێكەوتین.. هەر لێرەوە لەبیری ئەوەدا بووم چۆن بگەمە ماڵی لۆرێنس؟!

بەیانی زوو بوو، سەرما گۆنای هەموو كیژە ئینگلیزەكانی سور هەڵگەراندبوو، بەڵام بۆ منی ئەسمەر ئەو سەرما توندە تەنها ئاوی لەچاوو لوتم هێنابوو. لەشاری(لیدز)ەوە بەڕێكەوتم بەرەو(*Eastwood*)، لەرێگەمداو لەكاتی نزیك بوونەوەم لەو شارە پرسیارم لەچەند كەسێك كرد تا ماڵەكەی لۆرێنسم نیشان بدەن، بەلای ئەوانەوە سەیر بوو منێكی رۆژهەڵاتی بەپەرۆشەوە پرسیار لەبارەی (لۆرێنس)ەوە دەكەم.

هەرچۆنێك بێت گەیشتمە بەردەم ماڵی(لۆرێنس) كە ئێستا بووە بە مۆزەخانەو تایبەتە بەكارو بەرهەمەكانی خۆی و سەرچاوەیەكیشە بۆ زانینی چیرۆكە سەیرو پڕ سەركێشییەكانی نوسەر..

چوومە ژورەوەو سڵاوم كرد، بەڵام دەستبەجێ بێدەنگ بووم و نەمدەزانی چی بكەم، هەموو رۆمان و بەرهەمەكانی لۆرێنس لەوێ بوون. منی عاشقی كتێب دەمویست لەكوردستان ئەو كتێبانە بكڕم، بەڵام كۆنترینیانم دەست نەدەكەوت.. وێنەكانی لۆرێنس ژوری پێشوازی مۆزەخانەكەیان جوانتر كردبوو، ئیدی من بڕوام نەدەكرد لەو جێگەیەدا بم كە لۆرێنس چاوی لێ هەڵهێنا بێ.. پاشان شێتانە كەوتمە هەڵدانەوەی لاپەڕەكانی كتێبەكان و تەماشای شتە تایبەتیەكانی لۆرێنسم دەكرد، لەناكاو دەنگێك وتی( *Where are you from?*) واتە "خەڵكی كوێی؟"

كە ئاورم دایەوە زانیم بەرێوەبەری پرسگەكەیە و لە روخساریدا سەرسامیەكیشم هەست پێدەكرد، منیش وتم: "لەكوردستانەوە هاتووم و كوردم". بەلایەوە زۆر سەیر بوو گەنجێكی رۆژهەڵاتی بەو شێوەیەو بەخۆشییەوە هاتووە

بۆ ئەوێ، لێی پرسیم: "باشە چۆن لەو خاکە دورەوە ویستوتە بێیتە ئێرە؟" لە وەڵامدا وتم: "لۆرێنس نوسەرێکی گەورەیەو ئێمەش لەزانکۆ رۆمانەکانیمان خوێندوە، باسم کرد چۆن لەزانکۆی سلێمانی چەندین (باسی دەرچوون) لەسەر لۆرێنس‌و ژیانی ئەو کراون، مامۆستای بابەتەکەشمان نامەی ماستەرەکەی لەبارەی یەکێك لەرۆمانەکانی ئەوەوەیە.

بەر لەچوونم بۆ ئەوێ، کامێرای تایبەتم ئامادە کردبوو تا لەوێ لەگەڵ شتە بەجێماوەکانی لۆرێنس وێنە بگرم، بەڵام کە گەیشتمە ئەوێ بۆم دەرکەوت وێنەگرتن لەو مۆزەخانەیەدا قەدەغەیە.

نیگەران بووم، بەڵام داوام لەبەڕێوەبەری مۆزەخانەکە کرد تا رێگەم بدات وێنە بگرم. سەرەتا رەزامەند نەبوو، بەڵام کە باسم کرد چۆن هاتوم‌و بۆچی دەمەوێت ئێرە ببینم، وتی: "من ئامادەم خۆم وێنەکانت بۆ بگرم". لەگەڵمدا هات‌و لەگەڵ باسکردنی بەشە جیاجیاکانی مۆزەخانەکە وناساندنی بەرهەم‌و شتە بەجێماوەکانی لۆرێنس ناوبەناو وێنەشی بۆ دەگرتم..

دوای گەڕان بەناو هەموو مۆزەخانەکەدا، لەگەڵ ستافی مۆزەخانەکە پێکەوە دانیشتین‌و باسمان لەژیان‌و نهێنییەکانی لۆرێنس کرد، رامان لەوەی من لەکوردستانەوە هاتووم و نهێنی ژیانی لۆرێنس‌و گرێکانی ژیانیم دەزانی.. دواتر باسی گرنگی و بایەخی (ئەدەب)م لەشاری سلێمانی بۆ کردن‌و پرۆگرامی بەشی ئینگلیزی زانکۆی سلێمانیشم بۆ روون کردنەوە.. بەر لەگەڕانەوەم بەڵێنی هاوکاریان پێدام و هەر لەوێش چەند کتێبێکیان بەدیاری دامێ و هیوایان خواست جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ لایان‌و زانیاری زیاترم لەسەر ئەو کەڵە نوسەرە بدەنێ.

گەشتەکەم بۆ لای لۆرێنس کۆتایی هات لەدوای ئەوەی کە چوومە (زانکۆی نۆتینگهام)و پەیکەری لۆرێنسم دی، چوومە سەر گۆری خێزانی لۆرێنس و هەستم بە تورەیی (باوك) و زەلیلی (دایك)ی کرد، بەڵام هێشتا درودم بۆ ناردن چون لۆرێنس-یان خستەوە..

لۆرێنس رزگارکەرە، دەرگای بە رووی دەیان نوسەری تردا کردەوە تا بوێرن لەسەر مەسەلە تابۆو حەرامەکان بنوسن. بوێرن لەوەی چۆن بیردەکەنەوە، ئەوە بخەنە سەر لاپەرەی کتێبەکانیان.. ئەو دەیویست بڵێ ئێمە ناگەینە یەقین، ویستی مانای راستەقینەی ژیان‌و عەشق بدۆزێتەوە، ئەو ویستی گومانەکانی خۆی‌و ئێمەش نەهێڵێ... لەگەڵ ئەوەی نەیتوانی بگاتە عەشقی حەقیقی، بەڵام هەر ئەو عاشقترین مرۆڤە لەجیهاندا!

## هەژاری و توندڕەوی ئایینی

**عەفیف ئەخزەر**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**


عەفیف ئەخزەر

لە ماوەی کۆنگرەی رۆشنبیری قاهیرەدا کە مانگی تەموزی ساڵی 2003 لە میسر بەڕێوەچوو، رۆژنامەنوسێك پرسیاری لە چاکترین رێگایەك بۆ بەرگرتن لە توندڕەوی ئایینی لێکردم و منیش لە وەڵامدا پێم گوت: بۆ بەرگرتن لە توندڕەوی ئایینی پێویستمان بەمانە هەیە:

1-دیاریکردنی رێژەی منداڵ بوون.

2-چاککردنی بواری پەروەردەی ئایینی.

3-نەهێشتنی هەژاری.

هەستمکرد وەڵامدانەوەکەم توشی نائومێدی کردبێت، لەبەرئەوەی چاوەڕێی نەدەکرد وەڵامێکی وای بدەمەوە، بەڵام پاش سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە وەڵامەکانم، پێموابوو کە وەڵامێکی واقیعیانەیە و ئەزموونی وڵاتی تونسیش کە ئەزمونێکی تایبەت و کەم وێنەیە لەو بوارەدا، پشتگیری قسەکانم دەکات..

ئەگەر لە تونسدا ڕێژەی منداڵبوون دیارینەکرایە، ئەوا ژمارەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە لە ئێستادا لە بری ئەوەی 10 ملیۆن کەس بێت، دەگەیشتە 25 ملیۆن کەس. هەروەها گەر لە ساڵی 1990دا چاکسازی لە بواری خوێندندا نەکرایە، ئەوا خوێندنگاکانی تونس وەك خوێندنگەی زۆربەی وڵاتانی عەرەبی، دەبوونە مەڵبەندی دەمارگیری ئایینی و تیرۆر، هاوکات ئەگەر سندوقی نەتەوەیی بۆ هاوکاریکردن نەبوایە کە ساڵی 1993 "زەینەلعابدین بن عەلی" سەرۆکی ئەو وڵاتە پێشنیاری کرد، بۆ نەهێشتنی ئەو هەژاریەی کە لەسەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا 13٪ دانیشتوانی تونس واتە نزیکەی ملیۆنێك کەس تیایدا دەژیان، ئەوا لە ئێستادا ئەو ڕێژەیە زیاتر دەبوو.

بەڵام بوونی ئەو سندوقە وایکرد لە سەرەتای ساڵی 2001 ڕێژەی هەژاری لەو وڵاتەدا بۆ 4٪ دابەزێت و پێشبینیش دەکرێت لە سەرەتای ساڵی 2005دا هەژاری لەو وڵاتەدا بۆ پلەی سفر دابەزێت.

ئەرکی ئەو سندوقە نەتەوەییە کە هاوڵاتیانی تونس سندوقی (26–26) پێ دەڵێن، ئەوەیە کە لاوانی تونس بە کۆمەڵگاکەیانەوە ببەستێتەوە، یەکێك لە گرنگترین خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی دینامیکی ئەوەیە بتوانێت لە ڕێی دۆزینەوەی هەلی کارکردنەوە گەنجەکانی بەخۆیەوە گرێ بدات، ئەمەش هەستێکی قوڵی ئینتیماکردن بۆ کۆمەڵگا لای ئەو گەنجانە دروست دەکات. هەستکردن بەو ئینتیمایەش بە مەرجێکە، هاوڵاتی و بە تایبەتی گەنجان، هەست بکەن کە ماف هاوڵاتی بونیان هەیە، لە پێش هەمووشیانەوە ماف دابینکردنی داهاتووی خۆیان، واتە ماف کارکردن و بوونی شوێنی نیشتەجێ بوون و دروستکردنی خێزانیان هەبێت.

لە نەبوونی ئەم پەیمانە کۆمەڵایەتییە هاوچەرخەدا، گەنج ئەو هەستە قوڵەی ئینتماکردنی بۆ کۆمەڵگە لا نامێنێت و بگرە مەیلی تۆڵەسەندنەوەی لەلا دروست دەبێت، بۆ ئەمەش پەنا دەباتە بەر توندڕەوترین و عەدەمیتیترین گروپ، وەك گروپە ئیسلامگەراکان. گروپە ئایینیە توندڕەوەکان لاوازی هەستکردن بە ئینتیما بۆ کۆمەڵگە لای گەنجان دەقۆزنەوە، بە تایبەت ئەو گەنجانەی زۆر هەژارن و لە ڕووی سۆزداریەوە وێرانن و لە ڕووی سێکسیشەوە چەپێنراون، ئەمانە پەلکێش دەکەنە ناو پرۆژە خۆکوژیەکەیانەوە. ڕۆژنامەی (الأحداث المغربية) لە یەکێك لە ژمارەکانیدا ئەوەی دوویات کردبووەوە کە سەرجەم ئەوانەی لەکارە خۆکوژیەکانی شاری (الدار البيضاء)دا بەشداربوون، لەناوچە هەژارنشینەکانی شارەکانی مەغریبەوە هاتوون. لە ڕووی ستراتیژییەوە گروپە ئاینییە توندڕەوەکان ئەو بۆشاییە پڕدەکەنەوە کە گەنجان بەهۆی بێ ئینتیماییەوە هەستی پێ دەکەن، بەڵام چۆن؟ بێگومان لە ڕێی ئەوەی مژدەی ئایندە بەو گەنجە نائومێدانە دەدەن و لە بری نەبوونی هیچ ئینتیمایەك بۆ نەتەوەکەیان، ئەو نەتەوەیەی نەیتوانی ئەمانە تێکەڵ بە کۆمەڵگە بکات، ئینتیمایان بۆ (نەتەوەی ئیسلامی) لا دروست دەکەن و قوربانیدانیان لە پێناو ئەو نەتەوەیەدا لا جوان و پیرۆز

دەکەن، نەتەوەیەك کە هەمووان گوێ بیستی دەبن و کەسیش لە واقیعدا نایبینێت، ئەو گروپانە فیزای چونە بەهەشت دەدەنە ئەو گەنجانە، گەر بێتو ئامادەی قوربانیدان بن بۆ (نەتەوەی ئیسلامی) و لەو پێناوەدا خۆیان بە کوشت بدەن.

گروپە ئایینیە توندڕەوەکان بە پێشکەشکردنی یارمەتی مادی بەوانەی نەدارو هەژارن، ئەوانەش زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی ولأتانی عەرەبی پێکدێنن، توانیان ئەوانە بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و بیانکەنە هەواداری خۆیان. ئەو گروپانە لە کۆمەڵگا عەرەبیەکاندا لە پای غیابی ڕۆڵی دەوڵەتدا، بەکاری دەوڵەت هەڵدەستن.. فێندەمێنتالیزمی شیعە لە ئێران، بەهۆی زەکاتدانەوە توانی هاوسۆزی دانیشتوانی باشوری تاران بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و هەر ئەوانیش توانیان ئاخوندەکان بگەیەننە دەسەلأت، بەلأم هەر کە گەیشتنە سەر کورسی حوکمڕانی، ڕێژەی هەژاری 19٪ بووبە 65٪ و لە ماوەی جەنگی هەشت ساڵەی ئێران – عێراقیشدا، مەلاکانی ئەوێ 70 ملیار دۆلاریان ڕەوانەی دەرەوەی ولأت کرد. لەلایەکی ترەوە بەرەی ئینقازی ئیسلامی توانی هەڵبژاردنی شارەوانیەکان و پەرلەمانی جەزائیر بباتەوە، ئەویش بەهۆی ئەو یارمەتیە زۆرانەوە بوو کە پێشکەشی هەژارانی ئەو ولأتەی کرد و سەرچاوەکەشی ئەو لێشاوە دۆلارە بوو کە هەندێك لە دەسەلأتدارانی ولأتانی کەنداو تەرخانیان کردبوو بۆ ئەو پرۆسەیە.

ئیخوان موسلمینیش لە میسر بەدەرنین لەم حاڵەتەو لەمڕۆشدا جەماوەریان لە تەواوی حیزبە دیموکراسیەکانی ئەو ولأتە زیاترە، هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و ڕۆڵی ڕاگەیاندن و سستمی پەروەردە (بەتایبەت پەروەردەی ئایینی) و هەژاریەکی لە ڕادەبەدەر، لەگەڵ ئەو هێندە یارمەتیانەی ئەم گروپە دەیداتە هەژاران لە بری دەوڵەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکان. لە تونس ئەگەر سندوقی نەتەوەیی بۆ هاریکاریکردن نەبوایە، ئەوا گروپی (النهضة)ی توندڕەو دەیتوانی هەژاران بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و کۆمەڵگەی تونسیان پێ‌ وێران بکات، وەك چۆن "خومەینی" کۆمەڵگەی ئێرانی و بەرەی ئینقازی ئیسلامیش کۆمەڵگەی جەزائیری وێرانکرد. لە ماوەی سالأنی 1993–2000، پلانی سندوقی هاریکاریکردن توانی ئەو خانوانە نەهێڵێت کە شایستەی ژیانی مرۆڤ نەبوون و نزیکەی 181 هەزار خانەوادەی تێدا بوو. هاولأتیانی تونس تەنانەت ئەوانەشی کە دەست کورتبوون بڕی 500 ملیۆن دیناریان کۆکردەوە و دایانە سندوقی هاریکاری، وەك پشتیوانی کردنێك لەو پڕۆژەیە بۆ ڕیشەکێشکردنی هەژاری لە ولأتدا. ئامانجی پلانی ئەو سندوقە ئەوەبوو دانیشتوانی ناوچە هەژارنشینەکان لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە و شالأوی کۆچکردن لەلادێ وە بۆ شارەکان ڕابگرن، ئەم کارەشیان بەوەکرد کە سەرچاوەی نان پەیداکردن لەو ناوچانەدا دەستەبەر بکەن و هەلومەرجی ژیانی خەڵکەکەش چاك بکەن. دوای ئەوە حکومەت لە نێوان سالأنی 2001–2004، دەستی بە جێبەجێکردنی پلانی چوار ساڵی کرد کە ئامانج لێی تێکدانی خانووە کۆن و سەرەتاییەکانە و گۆڕینیانە بە خانوو گەلێك شایستە بێت بە مرۆڤێك کە لە بەراییەکانی هەزارەی سێهەمدا دەژی و ڕێگاوبان و ئاوی خواردنەوە و.. هتد، بۆ دابین بکرێت.

سەرکەوتنی ئەو ئەزموونە لە تونس، وایکرد ببێتە نمونەیەکی

جیهانی و نەتەوە یەکگرتووەکان لە شێوەی سندوقی هاریکاری کردنی نێودەوڵەتیدا تەبەنی بکات، بۆ نەهێشتنی دیاردەی هەژاری کە زیاد لە نیوەی دانیشتوانی سەر زەوی بە دەستیەوە دەناڵێنن. خۆزگە سەرجەم وڵاتانی عەرەبی پەیڕەوی ئەو ئەزمونەی وڵاتی تونسیان دەکرد، بۆ ئەوەی هەژاریان لە وڵاتەکانیاندا پێ ڕیشەکێش بکردایە، ئەو هەژارییەی کەرەستەیەکی لەبارە بۆ توندڕەوی ئایینی.

لەڕووی مێژووییەوە نەهێشتنی هەژاری لە ئەوروپادا بەدوو قۆناغدا تێپەڕیووە:

قۆناغی یەکەم/ ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەناوی هاوکاری ئەخلاقی لەگەڵ هەژاراندا شانیان دایەبەری و ڕووبەڕووی بوونەوە، بەمجۆرە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی چەندین ڕێکخراوی کۆمەککردن بە هەژاران دروستبوون و کاریان ئەوەبوو، سەرشانی هەژاران کەمێك سوککەن و لە ڕێی چاککردنی گوزەرانی ژیانیانەوە کەمێك هیوایان بۆ بگێڕنەوە.

**قۆناغی دووەم/ لە** سەروەختی جەنگی دووەمی جیهانیەوە دەست پێدەکات، کاتێك ئەم ئەرکە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی پێی هەستا، بەتایبەت کە لە ڕووی ئابووریەوە بەهێز بوو دەیتوانی کۆمەك بە هەژاران بکات، لێرەوە یارمەتیدانی نەداران لە ئەرکێکی ئەخلاقیەوە بوو بە ئەرکێکی یاسایی، واتە گۆڕا بە مافێك لە مافەکانی مرۆڤ.

**سەرچاوە**

www.Elaph.com

# کێشەی کالاس

**جانین گاریسۆن**

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع**




دانەری ئەم کتێبە خانمی توێژەر و مێژونووسی فەرەنسی بەناوبانگ (جانین گاریسۆن)ە، کە پێشتر چەند کتێبێکی لەسەر تراژیدیای پرۆتستانتەکانی فەرەنسا لە سەدەکانی شازدە تاکو هەژدە، بڵاوکردۆتەوەو، بە تێروتەسەلی قسە و باسی لەسەر ئەو جەنگە مەزهەبییانە کردووە کە بەدرێژایی چەندین سەدە فەرەنسای نوقمی خوێن کردبوو.یەکێك لە کتێبەکانی کتێبی: پرۆتستانتەکان لە فەرەنسا لە سەدەی شازدەدا.

دانەر لەم کتێبە تازەیەدا دەگەڕێتەوە سەر هەمان بابەت و، کتێبێکی تەواو لەسەر یەکێك لە گرنگترین کێشەکانی دەمارگیری ئاینی لە مێژوی فەرەنسادا، دەخاتە ڕوو: واتە کێشەی خێزانی جان کالاس، کە خێزانێکی پرۆتستانتی بوون و لە شاری تۆلۆز دەژیان کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کاسۆلیك بوون. ئەم خێزانە پێکهاتبوو لە باوك و دایکێك و سێ منداڵ، کوڕێك و دووکچ. پاشان بەهۆی دەمارگیرییەوە توشی کارەساتێکی گەورە هاتن.

ئەم خێزانە لە ڕووکەشدا مەزهەبی کاسۆلیکییان هەڵبژارد بوو، بەڵام بە نهێنی باوەڕیان بە مەزهەبی باو باپیرانیان هەبوو: واتە مەزهەبی پرۆتستانتی کە ناحەزی مەزهەبی کاسۆلیك بوو. لە سەرەتادا خانمی توێژەر سەرنجێکی گشتی دەربارەی ململانێی ئەم دوو مەزهەبە لە

فەرەنسادا پێشکەش دەکات و دەڵێ: دوای ئەوەی "کالفان" لەسەر شێوەی "لۆسەر" بزوتنەوەیەکی چاکسازی ئاینی ڕاگەیاند، فەرەنسا و تەواوی ئەوروپا دابەش بوون بۆ دوو بەش: بەشێ لە ژێر سایەی کڵێسای ڕۆمانی پایەوی کاسۆلیکدا مانەوە، بەشێکی دیکە کەوتنە دوای مەزهەبە تازەکە: واتە مەزهەبی چاکسازی ئاینی یاخود مەزهەبی پرۆتستانتی. وشەی پرۆتستانت لە زمانە بیانییەکاندا مانای مەزهەبی نارەزایی دەگەیەنێ: واتە ئەو کەسەی ناڕازییە بە بیروباوەڕی کڵێسای کاسۆلیکی چەق بەستوو و دەیەوێ بیگۆڕێ یاخود چاکسازی تێیدا بکات.

هەرئەمەش بوو کە (لۆسەر) و دوای ئەو (کالفان) جێبەجێیان کرد. زۆربەی بیروباوەڕی کاسۆلیکییان ڕەتکردەوە کە لە دێرزەمانەوە کەڵەکەببوون. لە نێویدا بۆ نموونە ئەو بیروباوەڕەی کە دەیووت پاپا کەسێکی مەعسومە، یاخود نوێنەرایەتی پیاوانی ئاین لە نێوان مرۆڤ و یەزداندا، یاخود هەندێ سروت و ڕێوڕەسم کە هیچ مانایەکیان نەمابوو. لۆسەر وتی پاپا مەعسوم نییە، بگرە ئەویش وەك هەر کەسێکی دیکە مرۆڤە و ڕەنگە ڕاست بکات و ڕەنگە هەڵەش بکات، هەروەها وتی هیچ نوێنەرایەتییەك نییە لە نێوان مرۆڤ و پەروەردگاریدا، لێرەوە هەرکەسێ بییەوێ دەکرێ ببێ بە پیاوی ئاینێ، گەر بتوانێ هەندێ زانستی پێویست بۆ ئەو مەبەستە بەدەست بهێنێ و، وتی پابەندبوون تەنها بۆ کتێبی پیرۆزە نەك قسەی پاپاکان یاخود فەتواکانیان.

بێگومان ئەم قسانە بەدڵی پاپای ڤاتیکان نەبوو. هەر بۆیە بە توندی وەڵامی مەزهەبە تازەکەی دایەوەو بە زەندەقە و دەرچوون لە ڕێگای ڕاست یاخود دەرچون لە تێگەیشتنێکی ڕاست بۆ ئاینی مەسیحی، تۆمەتباریکردن. ئیدی جەنگێکی مشتومڕ ئامێز و جەنگێکی ڕاستەقینە لە نێوان باوەڕدارانی مەزهەبی نارەزایی یاخود چاکسازی تازە، لەگەڵ ئەوانەی لەسەر بیروباوەڕی کاسۆلیکی کۆن مابوونەوە، هاتە ئاراوە و خوێنێکی زۆر لە نێوان شوێنکەوتوانی ئەو دوو مەزهەبەدا ڕژا. ئا بەم شێوەیە لە تەواوی هەموو ئەوروپادا شەڕێکی تایفی لە نێوان کاسۆلیکەکان و پرۆتستانتەکاندا ڕوویداو، ئەڵمانیا بەدەستییەوە ناڵاندنی، هەروەها فەرەنساش. مەزهەبی پرۆتستانتی لە هەندێ پارێزگا و هەرێمی فەرەنسادا زۆر بەخێرایی بڵاوبووەوە و بووە هەڕەشەیەك بۆ سەر ئاینی ڕەسمی دەوڵەت یاخود مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت: واتە مەزهەبی کاسۆلیك. ئیدی کێشەو گرفتی تایفی لە فەرەنسا سەریهەڵداو. کوشتوبڕی (سانت بارتیلیمی) بەناوبانگ ڕوویدا کە هەزاران کەس لە پاریس تێیدا بوونە قوربانی،هەروەها لە شارو هەرێمەکانی دیکەی وەك تۆلۆز و بۆردۆ و ئەوانی دیکە هەزاران کەسی تریش بوونە قوربانی. زۆرینەی کاسۆلیکەکان لە نیوەشەودا هەڵیان کوتایە سەر گەڕەکە پرۆتستانت نشینەکان و سەرلەبەریان کوشتن، کەس تێیدا دەرباز نەبوو تەنها ئەوانەی خوا ڕەحمی پێکردبوون، کوشتوبڕەکە گەورەو بچوك، ژن و منداڵ و پیاوانی گرتەوە.

ئالەم کەشو هەوا سیخناخ بە ڕقوکینەی مەزهەبیو تایفەگەری، کێشەی کالاس ڕوویدا. لێرەدا دانەر چاوپیاخشاندنێکی مێژوویی بە بارودۆخی شاری تۆلۆزدا دەخشێنێت کە کارەکەی تێدا ئەنجامدەدرێ، ئەوەش لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدە یاخود کەمەکێك دوای ئەو مایەوە.

خێزانی کالاس لە باوەڕدارانی مەزهەبی کاسۆلیکی تازەبوون، ئەم باوەڕدارییەیان تەنها بەشێوەیەکی ڕووکەش

بوو، چونکە بە زۆرەملە سەپابوو بەسەریاندا، لێرەوە ئەو باوەڕدارییە لە واقعدا هیچ نرخێکی نەبوو، چونکە ئەو خێزانە بە نهێنی سروت ڕێوڕەسمە پڕۆتستانتییەکانیان جێبەجێ دەکرد. دانیشتوانی تۆلۆز بەمەیان دەزانی و گومانیان لەم خێزانە و هاوشێوەکانی ئەم خێزانە هەبوو. هەربۆیە بەردەوام فشارییان دەخستە سەر خێزانەکەو منداڵەکانیان.

کوڕە گەورەکەی جان کالاس گەنجێك بوو بە ناوی "مارك ئەنتوان کالاس"، ئەو گەنجە کوڕێکی خانەدان دیاربوو، حەزی لە خوێندن و فێربوون بوو، خەریکی خوێندنی ماف بوو، دەیویست ببێت بە پارێزەر.

پاشان خانمی نووسەر ئاوا دەڵێ: بەڵام کێشەکە ئەوە بوو مارك ئەنتوان نەیدەتوانی کاری پارێزەری نە لە تۆلۆز و نە لە هیچ شارێکی دیکەی فەرەنسادا بکات، چونکە ئەو کاسۆلیکێکی ڕاستەقینە نەبوو. ئاشکرایە لەو سەردەمەدا پڕۆتستانتەکان بە هاوڵاتی پلە دوو بگرە پلە سێ دادەنران. هەر بۆیە زۆربەی ئیش و کارەکانیان لێ قەدەغەکرابوو، تەنها ئیشکردن لە بازرگانی و کشتوکاڵدا نەبێت. ئێمە ئەوە دەڵێین و دەزانین کە جان کالاس لە یەکێ لە شەقامەکانی تۆلۆز دوکانێکی هەبوو بۆ فرۆشتنی قوماش و لۆکە و شتی تر.

لێرەوە قەشە کاسۆلیکەکان فشاریان دەخستە سەر کوڕە گەورەکەی کالاس (مارك ئەنتوان) تاکو بە زۆری زۆرداری بێتە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی و دەستبەرداری مەزهەبی باوباپیرانی ببێت: واتە مەزهەبی پڕۆتستانتی، بەڵام ئەو ئەوەی ڕەتکردەوە. چونکە گۆڕینی مەزهەب وچوونە سەر مەزهەبێکی نەیاری دیکە کارێکی سەخت بوو، ئەو کارە وەك جۆرێك لە جۆرەکانی ڕۆح کێشان یاخود خۆکوشتن وا بوو. ئەو کارە لە گۆڕینی زمان زۆر سەخت تر بوو.

بەم شێوەیە مارك ئەنتوانی گەنج توشی ناکۆکییەك هات کە هیچ چارەیەکی نەبوو. ئەو لە لایەکەوە دەیویست لە شاری تۆلۆز ببێتە پارێزەر و بۆ ئەو مەبەستەش شارەزایی و بڕوانامەی پێویستی هەبوو، لەلایەکی دیکەوە نەیدەتوانی ئەوە بکات، چونکە نە کاسۆلیك بوو نە سەر بە مەزهەبی زۆرینە بوو. ئەم ناکۆکییە توندە و فشاری شەقام و دەرو دراوسێ پاڵیان بە مارك ئەنتوانەوە نا ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆی بکوژێ: واتە لە 13 ئۆکتۆبەری 1761، بەڵام چیرۆکەکە لەوێدا کۆتایی نەهات، بەڵکو ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی بوو. باوکی کاتێ کوڕەکەی بینی لە ژورێ لە ژورەکانی خانوەکەدا خۆی کوشتووە، شێت و هار بوو. لە ناوزڕان و ئابڕوچوون دەترسا، چونکە لەو سەردەمەدا خۆکوشتن وەك کوفر حسابی بۆ دەکرا و خۆکوشتووەکە هیچ سروتێکی دینی بۆ ڕێکنەدەخراو وەك سەگ دەنێژرا. لێرەوە باوکی هەوڵیدا ڕاستییەکە لە خەڵك بشارێتەوە و دەیووت کوڕەکەی بە مردنێکی سروشتی مردووە. کەچی دوژمنەکانی ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە تاکو بە کوشتنی کوڕەکەی تۆمەت باری بکەن. گوایە کوڕەکەی ویستویەتی ببێتە کاسۆلیك و باوکەکەی ڕێگەی لێگرتووە!

ئابەم شێوەیە ئەوتۆمەتە خرایە پاڵ جان کالاسی داماو کە نەیتوانی خۆی لێ دەرباز بکات. ئەو لە تێڕوانینی خەڵکی ڕەش و ڕوت و قەشەکاندا پیاوێکی دەمارگیری مەزهەبەکەی پێشووی بووە، واتە مەزهەبی پڕۆتستانتی، هەربۆیە پێویستە دادگایی بکرێ. هەر ئەمەش ڕویدا. دادگاییان کردو، فشاریان بۆ هێناو ئازارێکی زۆریاندا تاکو دان بەوەدا بنێ کە ئەو کوڕەکەی خۆی کوشتووە، بەڵام ئەو دانی بەوەدا نەناو تاکو دواسات سوێندی بە مەسیح و بە ئینجیل

دەخوارد کە کوڕەکەی خۆی نەکوشتووە، بەڵکو بە مردوویی لەماڵەکەدا دۆزیویەتییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بەردەوام بوون لەسەر ئەشکەنجەدانی و بە پانکەیەکەوە هەڵیانواسیی و تاکو دوا هەناسە هەر دەیووت من بێتاوانم..

شاری تۆلۆز چونکە لەو سەردەمەدا هێشتا هەر شارێکی دەمارگیری بوو، هەروەها بە عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست و دادگاکانی پشکنین بەڕێوە دەچوو، کەوتنە ڕاوەدونانی سەرجەم ئەندامانی خێزانی جان کالاس و جامی توڕەبونی خۆیانیان بەسەردا قلْپ دەکردنەوە، دوای کوشتنی "جان کالاس" ی کۆڵەکەی ماڵەکە، دەستیان کرد بە ڕاونانی ژن و کوڕ و کچەکانی.

کاتێ "ڤۆڵتێر"ی فەیلەسوف چیرۆکەکەی بیست، وەك زانراویشە ئەوکات ڤۆڵتێر لە شوێنێکی دووری سەر سنوری سویسرا/فەرەنسا دەژیا، ئەو هەلەی قۆستنەوە تاکو حساباتی خۆی لەگەڵ فەندەمینیتالیستە کاسۆلیکە دەمارگیرەکاندا یەکلا بکاتەوە، ئاشکراشە ئەو ڕقی لەوان بوو، ئەوانیش ڕقیان لەم بوو. ئیدی دەستی کرد بە نامەنوسین بۆ هاوڕێ دەسەلاْتدارەکانی لە پاریس، بگرە نامەی بۆ هەموو ناوچەکانی ئەوروپا نوسیی، تاکو ئەوەی لە تۆلۆزدا ڕوویداوە ڕیسوا بکات و، سەرلەنوێ دادگایی کردنی "جان کالاس"ی داماو دووبارە بکاتەوە، گەرچی دوای مردنەکەشی بێت بۆ ئەوەی ڕێزی بۆ بگەڕێتەوە.

ڤۆڵتێر لەو سەردەمەدا بەناوبانگترین فەیلەسوفی ڕۆشنگەری بوو، لە هەموو ناوچەکانی ئەوروپادا هاوڕێی هەبوو، لە نێویاندا پاشا و وەزیر و ئەرەستۆکرات و بیرمەندێکی زۆر هەبوو، هەر خۆی بە تەنها ئاژانسێکی تەواوی هەواڵ بوو، بەو مانایەی ئەو دەیتوانی ڕای گشتی بوروژێنێ وەك ئەوەی کەناڵە ئاسمانیەکانی ئەمڕۆ دەیکەن. پێشوازی لە ژنەکەی جان کالاس و منداڵ و کچەکانی کردو دڵنەوایی دانەوە و داوای لێکردن وردو درشتی چیرۆکەکەی بۆ بگێڕنەوە. دوای ئەوەی گوێی لە وردەکارییەکانی چیرۆکەکە گرت و دڕندەیی فەندەمینتالیستە مەسیحییەکانی شاری تۆلۆزی بۆ دەرکەوت، زۆر توڕە بوو.

ئاشکرایە لەو کاتەدا فەرەنسا پێی نابووە ناو قۆناغی ڕۆشنگەرییەوە و چیتر وەك قۆناغی جاهیلییەتی تاریك بین نەمابووەوە، وەك ئەوەی پێشتر وابوو. یاخود دەکرێ بڵێین توێژە بەرزەکانی کۆمەڵگا، توێژە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکەی ببونە توێژێکی ڕۆشنگەر و دەستیان کردبوو بە خوێندنەوەی کتێبی فەیلەسوفەکان زیاتر تاکو کتێبی پیاوانی ئایینی و قەشە مەسیحییەکان. هەر ئەمەش بوو یارمەتی سەرکەوتنی ڤۆڵتێریدا لە بردنەوەی کێشەی جان کالاس دوای سەرلەنوێ دادگای کردنەوەی.

پاشان خانمی دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ:دوای ئەوە کێشەی کالاس بووە وێردی سەر زمانی هەموو کەسێ، بووە نموونەیەك بۆ پیشاندانی ناشرینی و دڕندەیی دەمارگیری ئاینی مەسیحی، ئیدی بە درێژایی زیاد لە دوو سەد ساڵ لە بارەیەوە قسەو باسیان دەکرد: واتە بە شێوەیەکی عەمەلی تاکو ئێستا قسەی لەسەر دەکرێ.

لە سەدەی نۆزدەدا و دوای ئەوەی شۆڕشی فەرەنسی شکستی بە دەمارگیری و توندڕەوەکانی هێنا، کەچی خەڵکی لە فەرەنسادا سەبارەت بەو کێشەیە بۆ دوو بەرە دابەش ببون: بەشێ لایەنگری جان کالاس بوون و دەیانوت بێ تاوانە، بەشێکی کۆنەپارێز یان ڕاستڕەوی کاسۆلیکی دەیانوت تاوانبارە و سوربوون لەسەر

ئەوەی بە کوشتنی مارك ئەنتوانی کوڕی تۆمەتباری بکەن. بگرە دوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ یاخود سەد ساڵ بەسەر ڕووداوی کێشەکەدا کەچی خەڵك سەبارەت بە کێشەکە ئامبازی یەك دەبوون و پەلاماری یەکتریان دەدا: هەندێ جار خێزانێك لەناو خۆیدا بۆ دوو بەش دابەش دەبوون: بەشێ لەگەڵ کالاس بوون و بەشێکی دیکە دژی بوون. ئەمەش وایدەکرد ژەمی خواردن بەشەڕ کۆتایی پێدەهات کە قاپ و قاجاخی تێدا دەشکا! ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە بۆ گرنگی ئەم کێشەیە لەسەر هۆشیاری فەرەنسی و چۆنییەتی ڕۆچونی ئەم کێشەیە بۆ قوڵایی ناخی خەڵکەکان.

دانەر قسەکانی ئاوا کۆتایی پێدێنێت و دەڵێ: خۆشبەختانە فەرەنسا بە هۆی پێشکەوتنی ڕۆشنگەری و خوێندنی مۆدێرن و بڵاوبوونەوەی لە ڕیزەکانی گەلدا، لە تاریك بینی دەمارگیری ئاینی و تایفەگەری هاتە دەرەوە، هەر بۆیە کێشەی کالاس ڕوداوێکە لە پشتمانەوە نەك لە پێشمانەوە. بەڵام بەداخەوە تا ئێستا هەندێ وڵات هەیە ئەگەری ڕودانی ئەم کێشەیەی تێدایە، چونکە دەمارگیری جاری لە هەموو شوێنێکدا کۆتایی پێ نەهاتووە. گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەوە، ڕودانی ئەو کارە دڕندانەو تەقینەوانەیە کە لەمرۆکەدا ڕوودەدەن و چەندین خەڵکی مەدەنی بێوەی و بێتاوان پێوەدەبن.

**سەرچاوە**

بیان الکتب 2005/5/2

## دونکیخوتە لە کتێبەوە بۆ ئەفسانە

**جان کاناڤاجیو**

لە عەرەبییەوە: سەردەم




نووسەری ئەم کتێبە (جان کاناڤاجیو) پسپۆرە لە سیرڤانتس و بەرهەمەکانیدا، پێشتر کتێبێکی لەسەر "ژیاننامەی سیرڤانتس" نووسیوە، پاشان ساڵی 2001 سەرپەرشتی لە چاپدانی هەموو کارە ڕۆمانییەکانی سیرڤانتسی کرد لە کۆمەڵەی بەناوبانگی "بلیاد"دا کە بە تایبەتی بەرهەمی نووسەرو بیرمەندەکانی دنیا لە کۆنەوە تا ئێستا بڵاو دەکاتەوە.

ئەم کتێبە تازەیە مێژووی "ژیاننامەی" دونکیخوتە – یان دونکیشوت وەك هەندێك وای دەنووسن – واتا پاڵەوانی ڕۆمانەکەی سیرڤانتس کە هەمان ناونیشانی هەیە و پێش چوار سەدە (ساڵی 1505) دەرچووە. "دونکیخوتە" یەکێکە لە کەسایەتیی ڕۆمان و ئەدەب کە بوون بە کەسایەتی ناو واقیع، هەروەك "سکاریت ئوهارا" لە ڕۆمانی (ذهب مع الریح)ی مارگریت مێشال و (ئۆرباگان)ی پاڵەوانی شانۆگەریی پیسکەی تەرپیری مولیر، چونکە خودی ناوەکە لە فەرهەنگی زمانی فەرەنسیدا دەلالەتە بۆ کەسانێکی پیسکە.

لە پێش چوار سەدەدا دونکیخوتە لە گوندە بچکۆلەکەی خۆی هاتە دەرێ بۆ پەلاماردانی "ئاشەکانی هەوا" و توانی هەموو دنیا داگیر بکات. وەك "ئەسکەندەری گەورە" لە مەکدونیاوە هات بۆ بەدیهێنانی خەونەکەی کە فراوان کردن و بەربڵاویی وڵاتەکەی بوو تا هەموو دنیا بگرێتەوە.

ئەگەر ئەسکەندەر خاوەنی لەشکرێکی گەورە و گرانی بە ئەزموون و شەڕکەربوو. ئەوا دونکیخوتە بێجگە لە هاوڕێیەکی کەرسوار کەسی تری لەگەڵدا نەبوو، بەڵام ئەم دوانە توانیان هەموو سنوورەکانی جیهان ببڕن. لە هەمووی گرنگتر ئەوەبوو کە بۆ بەدیهێنانی پرۆژە گەردوونیەکەیان سەدەکانی داهاتوو ببەزێنن. چونکە هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە تا ئێستاش "دونکیخوتە" پاڵەوانی ئەم سەردەمەمانە تەنیا لەگەڵ جیاوازیەکی گەورەو گرنگدا کە ئەوە بەسەرنووسەری ئەم کتێبەدا دەسەلمێنێت کە چیرۆکی ئەو دوانە "تا سەدەی حەڤدەهەمیش سەرچاوەی خۆشی و شادمانی خوێنەرانی بوەو لەوەبەدوا رەهەندێکی جیویی لە خۆگرتوە"

فەیلەسووف گەورە "فریدریك نیچە" لە کارێکیدا بەناوی "شەجەرەی رەچەڵەکی ئاکار" لەمەدەدوێت و دەنووسێت: "ئەمڕۆ ئێمە دونکیخوتە دەخوێنینەوەو دەممان پڕدەبێت لە تاڵیی، بەڵکوو تارادەیەك چێژی ئازاردەکەین، گومانیش لەوەدانیە کە نووسەر هاوسەردەمەکانی ئەمەیان بەلاوە سەیرە و تەنانەت تێی ناگەن، چونکە ئەوان بەوپەڕی دڵپاکیەوە دەیان خوێندەوەو بڕوایان وابوو کە کتێبێکی دڵخۆشکەرەو ئەمەندە پێکەنین هێنە تاڕادەی مردن" رەنگە چاکترین تایبەتمەندی کتێبی "دونکیخوتە" لەوەدا بێت کە ناتوانرێت لە هیچ جۆرە ئەدەبێکی پێش خۆیدا پۆلێنی بکرێت.

جان کانافاجیو دەڵێت: "ئەم کارە پۆلین ناکرێت، هەوڵێکە لە دەرەوەی هەموو پێوانەکان، ناتوانیت بیخەیتە ئەو خانانەی کە ئەرستۆ لە پێوانە شیعریەکانیدا دایناوە، کارێکە نامۆ بەڕیزبەندیە تەقلیدیەکانی جۆرەکانی ئەدەب. نووسەرەکەی خۆی نەبەستۆتەوە بە هیچێك لەو تەقلیدە پێشینانەی کە هەبوون. بۆیە ئەم بەرهەمە "قوتابخانە"یەکی تازەو سەربەخۆیە.

بەم جۆرە لە ساڵی 1506وە تا دوای ساڵێك لە دەرچوونی کتێبی دونکیخوتە کە نووسەرەکەی "گلین دوناسترو" پاڵەوانەکەی سیرڤانتسی لەسەر کێشەکانی دەرودەشتیەوە هێنایە ناودیوان و سەرشانۆ. نووسەر لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ گەلێك کاری دواتر دەکات کە ئیلهامی بابەت و بارودۆخەکەیان لەو سوارچاکە وێڵەوە هێناوە. کتێبەکە دوانزە جار چاپ و بەهەزاران تیراژ کراوە، ئەمەیش لە نێوان بەرگی یەکەمی سەرکێشیەکانی دونکیخوتە ساڵی 1505 و بەرگی دووەمی لە ساڵی 1615دا.

ئەم کتێبە زۆر زوو وەرگێڕرایە سەر گەلێك زمانی دنیا. لە هەرە پێشەوەی ئەو زمانانەدا ئینگلیزی ساڵی 1612 بە نیسبەت بەرگی یەکەمەوە و بەرگی دووەمیش لە ساڵی 1620دا، بۆ زمانی فەرەنسی بەرگی یەکەمی لە 1614دا و بەرگی دووەمی لە ساڵی 1618دا، هەردوو بەرگەکە لە ساڵی 1622دا کرا بە ئیتالی و پاشان لە ساڵی 1648دا کرایە ئەڵمانی. دوای ئەوەیش بۆ زمانی هۆڵەندی و دانیمارکی و پاشان لە ساڵی 1791دا کرایە رووسی. پێش ئەویش لە 1784دا کرابووە پۆڵەندی.

هەر لە چوارچێوەی قسەکردن لەسەر بڵاوبوونەوەی "دیاردە"ی دونکیخوتە و زاڵ بوونی کەسایەتیەکە بەسەرناوی خودی نووسەرەکەیدا، پاشانیش کردنی بە شانۆگەری، کە لەسەر گەلێك لە شانۆکانی ئەوروپاداو بەڕوانینی جیاواز و بەرگی خۆماڵیەتیەوە نمایش کرا. گەلێك لە شێوەکارەکان دونکیخوتەیان کردە نموونە بۆ خۆیان. ئەمەیش بە درێژایی

ئەو سەدانەی دوای نووسینی کتێبەکە هاتن. لە گەورە ئەدیبانیش کەس نەمایەوە، لەسەرو هەموویانەوە ولیەم شکسپیر کە دەست بۆ مەسەلەی "دونکیخوتیەتی" نەبات. هەروەها فەیلەسووفانی سەردەمی ڕۆشنگەرایی سەدەی هەژدە و دوای ئەوانیش هەر کاری لەسەرکراوە. بە تایبەتی (نیچە) کە زۆر دەستی لەسەر "تالاَو"ەکەی ئەم کارە "پێکەنین هێنەرە" داگرت. بەهەرحاڵ بەردەوام ئەم کتێبە لە هەڵسەنگاندندا بووە بەپێی سەردەم و قۆناغەکان و ئەو بیروباوەڕە باوانەی هەبوون و ئەو دیدەی بۆ دونکیخوتیەتیان هەبووە.

لە یەکێك لە فەسڵە کۆتاییەکانی ئەم کتێبەدا نووسەر باس لەوە دەکات کە "ئایا سوارچاکەکەی سیرڤانتس چەندە ئامادەگیی لە سەدەی بیستا هەیە" چونکە سیمای دونکیخوتە لە تابلۆکانی گەورە هونەرمەندی دنیا پاپلوبیکاسۆدا دەبینرێت. هەروەها لە فیلمە سینەماییە بێدەنگ و دەنگوارەکانیشدا بەردەوام وەك پاڵەوان ئامادەگیی هەبووە. ئەمە بێجگە لەو ئامادەگیە هەرە زۆرەی لە شانۆدا هەیبوەو، ئەو چاپە تازانەی کراون، تا ئەو ڕادەیەی کە دەتوانین بڵێین کە دونکیخوتە یەکێکە لەو کتێبە هەرە دیارانەی کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەرادەیەکی زۆر بڵاوبۆتەوە و تا ئێستایش وەرگێرانی تازەی دەکرێت. بە کورتی و پوختی دەتوانین بڵێین کە "دونکیخوتە" پاڵەوانێکی ئەم سەردەمەی ئێمەیە.. لە پێستی هەموو ئەوانەدایە کە پێ لەسەر شەڕی ئاشەهەواییەکان دادەگرن.

**سەرچاوە**

بیان الکتب، 2005 /4/26

ژمارە 9078.

